رۆمان



مەمەد ئوزون

وەرگێرانی وریا غەفووری

# ڕووناک وەک ئەوین تاریک وەک مردن

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: دانا مەلا حەسەن
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام




ناوی کتێب: ڕووناک وەک ئەوین، تاریک وەک مردن
ناوی نووسەر: مەمەد ئۆزون
وەرگێڕانی لە کرمانجییەوە: وریا غەفووری
بابەت: ڕۆمان
نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٤
چاپخانە: رجایی/ تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (١٠٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١٧٠٠)ـی ساڵی (٢٠١٤)ـی پێدراوە.

ISBN: 978-1-63068-983-4

ناوەندی ڕۆشنبیریی و هونەریی ئەندێشە/ئەندێشە بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە
سلێمانی-شەقامی مەولەوی-تەلاری سیروانی نوێ-نهۆمی چوارەم
www.endeshe.org ● andesha.library@yahoo.com
http//www.facebook.com/Andeshacenter
07501026400

# پێشەکی

سەبارەت بە بەرهەمەکە وەک دەقێکی ئەدەبی یان باشتر بڵێین ڕۆمانێک لە زمانی سەرەکیی خۆیدا، دەتوانین بڵێین خاوەنی شێوازێکی دەربڕینی تایبەت و میتۆدێکی تایبەتە. هەڵبەت گوتنی «تایبەت بوون» لەو مانادا نا کە بچینە حاڵەتی خۆ بواردن لە لێکدانەوەی بەجێ و زانستییانەی تێکستەکە و خۆ نەبان کردن لەو هەموو وردەکارییە ئەنقەست و وشیارانەی لە پانتایی زمانەکەیدا کراوە، چونکە دواتر بە باسکردن لە سەرجەم ئەو ڕووکردانەی بۆ وەرگێڕانەکە گیراونەتە بەر و سەرپاکی ئەکتەکانی پەیوەست بە گواستنەوەی زمانەکە، ڕووناکییەکمان بەشبەحاڵی نووسینی پێشەکییەک و ڕەچاو کردنی ئەوەی کە ئەم پێشەکییە لە لایەن وەرگێڕ خۆیەوە نا بەڵکوو تەنها لە سەر دەستی هاوکار و هاونەفەسی شەو و ڕۆژانی وەرگێڕەکەوە نووسراوە، پێشکەش بە خوێنەری بەڕێز کردووە. کەواتە ئەوەی هەر لەم سەرەتاوە تا کۆتایی بەرچاوتان دەکەوێت قسە کردنە لە ڕوانگەیەکی دیاریکراو بۆ ئەم وەرگێڕانە یان باشتر بدوێین؛ «ڕوانگەیەکی دیاریکراو بۆ وەرگێڕانی ئەدەبی». ئەوەی دەبینین لێکدانەوەی ڕەوتی چوونە نێو پرۆسەی وەرگێڕانەکەیە وێڕای ئەو پێش مەرج و پێش گریمانانەی هەم بە شێوەی تیۆریک و هەم بە شێوەی ئەزموونی لە کارەکەدا ڕەچاو کراون. هەوڵدان بۆ ڕەخساندنی هاوکێشییەک لە سەرپاکی دەقەکەدا و تا ئەو ئاستەی

دەگونجێت نزیک بوونی وەرگێڕانەکە لە دەقی سەرەکی و تێپەڕین لە «وەفاداریی مێکانیکی» بۆ «کاریگەریی یەکسان» ئەو ئامانجانەن کە گەر تاقە مەبەستی وەرگێڕیش نەبووبێتن بەڵام بێگومان دەکەونە ڕیزی مەبەستە سەرەکییەکانییەوە.

زیادڕۆیانە نییە گەر بڵێین وەرگێڕانی ئەدەبی خۆی بەرهەمێکی ئەدەبییە. واتە بە پێی پێوەرەکانی زمانی دووهەم بە بەرهەمێکی ئەدەبی دێتە ئەژمار. خوێندنەوەی نوسخەی وەرگێڕدراوی بەرهەمێکی ئەدەبی، چەشنی نووسینێکی ئەدەبی (بەشێوەی تالیف) چێژی تایبەتیی خۆی هەیە و هاوشێوەی تالیفی ئەدەبی، ئەم چێژەش بەر و ئەنجامی سەریەکخستنی ئەندێشە و شێوازی دەربڕینە. کەواتە بە لە بەر چاوگرتنی سەرجەم ئەو مەرج و پێناسە ناوسراو و پەسنانە، دەتوانین بڵێین وەرگێڕی ڕۆمانیش دەبێ بارستایی ڕۆماننووسەکە خۆی، هەڵبەت بە پابەندبوونی وشیارانە بە مەرج و یاسا دانراوەکان، سەبارەت بەم جۆرە لە گواستنەوەی زمان، دەستی ئاوەڵا بێت و سەلمێنەرێکی ڕاستەقینەی ئەو وتەش بێت کە گوایە وەرگێڕانی ئەدەبی ئافراندنێکی دیکەیە لە زمانی دووهەمدا.

لە نێو ڕووکردە جۆراوجۆرەکانی وەرگێڕاندا ئەدەبییەکەی، لە هەموو شوێنێکدا و لە هەر زمانێکەوە بۆ زمانێکی دی خاوەنی ئیعتبارێکی تایبەتە و هەروەها هەڵگری کەپاسیتییەکی بێوێنە. بە شێوەیەک کە لە چاو سەرجەم بوارەکانی دیکەی تایبەت بە وەرگێڕان زیاترین و گەرم و گوڕترین گوتاری هەیە و هەر لە لێکدانەوە و لە بارە و لە سەر نووسینەوە بگرە بۆ ڕەخنە و بەم دواییانەش بەراوردکردنی هەمان دەق و تێکست کە لە سەر دەستی دوو یان چەندین وەرگێڕی جیاواز کاری وەرگێڕانیان بۆ کراوە، ئەو ئاقارانەن کە دیسکۆرسی ئەم بوارە بەهێزتر دەکەن. وەرگێڕی بەڕێز لەم کارەدا بە باشی دەرکی بەو مەسەلە واقیعییە کردووە

کە خوێنەری بەرهەمی ئەدەبی جیاوازە لە خوێنەری لق و زانستەکانی دیکە. زۆر جار خوێنەری بەرهەمی ئەدەبی بە دوای وشەی تازەشەوەیە و ئەوە دەکەوێتە سەر نووسەر و یانیش وەرگێری ئەو بەرهەمە کە چی پێشکەش دەکات. لێرەدایە کە بۆمان هەیە بڵێین هەر لە بەر ئەوەی پانتایی ئەدەب پانتاییەکی هێند فراوانە، کەواتە خزمەتی فراوانیشی دەوێ. ئێستا ئەم خزمەت کردنە دەتوانێ بە هێنانی دوو وشەی هاوواتا بێت لە پاڵ یەکدیدا و یاخود گەڕاندنەوەی وشەیەکی لە بیرکراو یان تۆراو بێت بۆ نێو زێد و هەرێمی خۆی! ئەی ئەوە نییە ئەڵێین ئەدەبیات جیهانی ئاشتی و ئاوەڵایی و ناسین و فراوانییە؟! کەواتە ئەدەبیات هەروەکچۆن دەتوانێ خوێنەر بباتە نێو هەرێمە هەرە نهێنییەکانی ژیانی مرۆڤەکانەوە و ئەو جیهانە تایبەتییانەیان پێ بناسێنێت، هەر بەو شێوەش دەتوانێ پانتاییەکی فراوان لە زمان و وشەی جوان و نوێ ئاراستە بکات و لێرەوە دەتوانین بڵێین برۆزیی ئەدەبیات ئەو نیشانەیە کە زمانەکەشی دەکاتە زمانێکی بڕۆر و هەمەگیر. سەبارەت بە وەرگێرانی ڕۆمان بە گشتی و ئەم ڕۆمانەی بەردەستیشتان بە تایبەتی هەر ئەوەندە بەسە کە بزانین پڕۆسەیەکە ئەگەری ئەوەی هەیە لە ڕەوتی ڕوودانیدا دەقی سەرەکی تووشی باش ناسین یان خراپ ناسین بێت و ئەمەش بە تەواوی ئەرکی وەرگێڕە و چۆنێتیی ئەنجامدانی ئەکتی گواستنەوەی زمانەکە. وەرگێڕ هەیە دەتوانێ لە ڕێگەی وەرگێڕانەکەیەوە ئاشنای چەندین بواری دیکەی مانایی و زمانەوانی و ئەدەبیت بکات و بتهەوێ جگە لەوەی وەک لایەنی شاراوەی چەمک و زمان و ناوەڕۆک لەو بەرهەمەدا پێشکەشت کراوە، خۆشت دوای ناسین و مەعریفەی زیاتر بکەویت لە مەڕ ئەو میتۆد و نووسەرە و هەروەها ئەو جیهان و پانتاییە. بە شانازی و خۆشحاڵییەوە ئەم کارەی دەستتان داوەتە خوێندنەوە، بەشێکی زۆر لەو چاوەڕوانی و تایبەتمەندییانە دەگرێتەوە و هیوادارم خۆشتان دوای خوێندنەوە و ڕامانی

تـەواو، وتەکانـی ئـەم پێشـەکییە پشتڕاسـت بکەنـەوە. بـەڵام لـە بـەر ئـەوەی ڕانەهاتووین تەنیا پشت بە هیوا و ئاوات خواستن ببەستین لە درێژەدا لە چەند بڕگەیەکدا باس لە هەندێ میتۆدی کاری لە وەرگێڕانەکەدا دەکەین تاوەکوو خوێنەری بەڕێزیشمان لەم لێکدانەوانە بێبەش نەکردبێت و زانیارییەکانیشمان ناخۆشیار نەوەشاندبێت! بۆیە لێرەدا هاوکات لەگەڵ ناساندنی نووسەر و ئەم کتێبەی واتە «ڕووناک وەک ئەوین تاریک وەک مردن» ئاماژە بە چەند خاڵێکیش دەدەین کە وەرگێڕ لە ڕەوتی وەرگێڕانەکەدا بە هەستیارییەوە بەرەو ڕوویان بۆتەوە و وشیارانە مامەڵەی لەگەڵ کردوون.

ناسین و دەرک کرنی نووسەرە گەورەکان کارێکی ئاسان نییە و کلیدێکی دیاریکراو بۆ ئەم ناسینە بوونی نییە بەڵام ئەم پرسە بە نیسبەت محەمەد ئۆزۆنەوە و بە تایبەت لەم ڕۆمانەیدا وا نییە. ئەم بەرهەمە بەرهەمێکە هەندێجار بە زمانێکی سادە و ڕوون و ڕاشکاو و هەندێجار بە زمانێکی داهێنەرانە و خوازەیی دەدوێ. ئەو تەعبیرانەی نووسەر بۆ دەربڕینی هزری خۆی بەکاری دێنێت بە شێوەیەک وەرگێڕدراوە کە لە زمانی دووهەمیشدا دەرک و پەسن بکرێت. جاری وا هەیە کە مەبەستی نووسەر ڕوون و ڕاشکاو بەیان دەکرێت و هەندێجاریش پێوەندیی نێوان پاژ و بەشەکانی ڕستە سووک و سانا دەست نادات. لەم بەرهەمەدا وشەکان بە هەستیاریی تەواوەوە هەڵبژێدراون و بە شێوازێکی نوێ و دەگمەن ئاوێتەی یەکدی کراون. بەگشتی کتێبەکە خاوەنی نەسرێکی ئاهەنگین و وەک دەگوترێ (مسجع)ە و وشە دەوری تەواوی تێدا دەگێڕێت. نەک تەنها وشە بەڵکوو نوقتە و ویرگوول و نوقتەویرگوولەکان بوونەتە کەرستەیەکی کارساز بۆ لە یەکتر گرێدانی ئەو هەموو وشە و ڕستە کورت کورتانە. کەواتە لێرەدایە کە کاری وەرگێڕ و هەڵبژاردنی ئەو وشانەی دەبێ لە شوێنی وشەیەکی تایبەت دابنرێن، دەکەوێتە ڕوو و خوێنەری بەڕێز خۆی

لە ڕەوتی چوونە ناو بەش و پاژەکانی چیرۆکەکاندا و تێکەڵ بوونی لەگەڵیان بە باشی لەم ڕاستییە دەگات.

ڕەخساندنی هاوکێشی لە وەرگێڕانەکەدا بە مانای بەدیهێنانی کاریگەریی دوو لایەنە و وەک نواڕین لە بەرهەمەکەش بە گشتی دەبێ بڵێین دەستخستنی دەستکەوتێکی جیددی لە بواری وەرگێڕان و زماندا، دەکرێ وەک دوو پرەنسیپی بنەڕەتیی شیاو چاوی لێ بکرێت و بەرهەمێکی وەرگێڕدراو کە ئەم مەرجانەی تێدا بینرا بێگومان دەبێتە هەڵگری ناو و خسڵەتی کارێکی باش و جێگەی خۆی دەگرێتەوە.

حاڵەتەکان زۆر بە جوانی وەسف کراون و سەرباری ئەوەی کە کردەیان کەمە، کە ئەمە خۆی خاڵێکی باڵکێشە و جەختکردنەوە و گرنگی پێدانی زیاتری لە ناخی خۆیدا هەڵگرتووە،

توانراوە لە لایەن وەرگێڕەوە بە باشترین شێوە وەربگێڕدرێت.

جیاکاری کردن لە نێوان زمانی نووسین و ئاخاوتن لە وەرگێڕانی دەقە ئەدەبییەکاندا ئێجگار گرنگە و دەبێ لە لایەن وەرگێڕەوە بە چاوێکی وردبین و هەستیارەوە سەیر بکرێت. وەرگێڕی ئەم کتێبەی بەردەستتان زۆر شارەزایانەی ئاگای لەم حاڵەتە زمانییە بووە و بە جوانی هەوڵی بۆ داوە، واتە لەو شوێنانەدا کە دیالۆگی نێوان پێرسۆناژەکان لە ئارادایە، هەست بە گۆڕینی شێوازی دەربڕینەکان دەکەین و وەکیتر کاتی وەسف و پێناسەکان کە ڕاوی خۆی دەدوێ، زمانێکی ئەدەبیی چڕتر بەدی دەکەین.

هەروەک ئاماژەی پێدرا، نووسەر خاوەنی میتۆدێکی تایبەت بە خۆیتی و گواستنەوەی ئەم میتۆد و ئەو چەمکە تایبەتییانەی کاری پێ کردووە بە یەک لە ئەرکە سەرەکییەکانی پرۆسەی وەرگێڕانەکە دانراوە و چۆنێتیی یەکدەست بوون و لە یەک دانەبڕانی سەرپاکی تێکستەکە لەم وەرگێڕانەی ئێستایدا سەلمێنەری بە درووستی بەجێهێنانی ئەرکەکەیە.

خاڵێک یان باشتر بڵێین میتۆدێک کە زۆر بە وشیاری و بە ئەنقەست لە وەرگێڕانەکەدا ڕەچاو کراوە گرنگیدان بە هەر دوو جۆری سۆرانی، واتە ئەوەی لە باشوور و ڕۆژهەڵات بەم ناوەوە دەناسرێت بێ لە بەرچاو گرتنی شێوەزارەکانی تایبەت بە ناوچە جیاجیاکانە. بۆئەوەی لە لایەک با خەڵکی باشوور بۆ نموونە لە مانۆڕی وشەکان بە ئاگا بن و لە لایەکی دیکەش با ڕۆژهەڵاتییەکان بزانن کە شێوازی ڕاست و زۆرینە کامەیە. هەرچەندە بە نیاز نەبووم لەم پێشەکییەدا هیچ نموونەیەک بهێنمەوە و نموونە هێنانەوەی و باسکردنی زیاترم دانابوو بۆ ئەو هیوا و ئاواتەمان کە گەر لێکدانەوەیەکی گەرم و گوڕ لە لایەن خوێنەر و ڕەخنەگر و زمانناسەکانمانەوە هاتە ئاراوە، ئەو کات نموونە هێنانەوە بکەمە کەرستەی بەشداری کردن لەو فەزادا، بەڵام یەک دوو نموونەی سادە باس دەکەم؛ بۆ نموونە لە ڕۆژهەڵاتدا «قەناعەت» بە مانای «بە کەم ڕازی بوون و قانع بوون»ە بەڵام لە ئاخاوتنی باشووریدا «قەناعەت پێ هێنان» یان «قەناعەت کردن» واتە «ڕازی کردن» یاخود «ڕازی و قایل بوون». یان نموونەیەکی دیکە وشەی «زەحمەت»ە کە لە لە باشوور زیاتر بە مانای قورسایی و گرانیی کار یان بابەتێک کەڵکی لێ وەردەگیرێت بەڵام لە ڕۆژهەڵاتدا هەر ئەم وشە هەڵگری مانای تکا کردن یان داوا کردنێکی بە ئەدەبە؛ «دەکرێ زەحمەت بکێشی...». زۆر جاریش حاڵەتی بەینابەین بە هێنانی دوو هاوواتا لای یەک پارێزراوە؛ «ترافیک قورس و خنکاوە» بریتی لە خنکاوی باشوور و قورسی ڕۆژهەڵاتی. دیارە لەم وەرگێڕانەدا هەر دوو شێوازی بەکارهێنانی وشەکان کاریان پێ کراوە تاوەکوو لەو حاڵەتە پتەو و بەستووە دەرکرابێتن و جێگیرییەکی فراوانتریان بە نەسیب بێت. ئەمەش هێند ڕێک و پێک و بەدەستوور مسۆگەر نەدەبوو گەر وەرگێڕەکە ڕۆژهەڵاتیی ئاشنا بە باشوور و باکوور نەبووایەت. چونکە ئێستا وەرگێڕی ڕۆژهەڵاتیی ئاشنا بە باشوور و باکوور

توانیویەتی پردێکی پێوەندیی جوان و ڕازاوە لەم نێوانەدا دابمەزرێنێت.

جیاوەک یان ئیمتیازێکی تایبەتیی ئەم دەقە وەرگێڕدراوە ئەوەیە کە بەشێکی زۆری فەزا و بەسەرهاتەکان ئەزموونی ژیانکردی وەرگێڕن و بێگومان لەو حاڵەتەدا کاریگەریدانان و وێناسازییەکان گەلێک زیندووتر و بەرهەستتر دەبن. ناسینی سرووشت، گەڕان لە نێو هەمان دۆڵ و دەشت وچیا و هاوکاتی ئەمانە ڕاگواستنی فەزا و هەستەکان بە شێوەی نووسین هەر لە هاوار و بانگ کردنێکی سادەوە تاوەکوو ئەوەی وا لە خوێنەر بکات هەر بە هێنانە پێش چاوەوە نەوەستێت و خۆی لەو شوێن و زەمەنەدا ببینێتەوە، تایبەتمەندییەکی سەیرتری ئەم بەرهەمە وەرگێڕدراوە پێک دێنێت.

بەکارهێنانی پاشکەوتەکانی زمان یەک لەو ڕێکارانەیە وەرگێڕێکی بەتوانا دەتوانێ بە مەبەستی ئاراستەکردنی بەرهەمێکی چڕوپڕ و تەواو سوودی لێ ببینێت و هەروەها هاوڕێ لەگەڵ ئامازەدان بە هەموو کەپاسیتی و دەوڵەمەندییەکی ئەو زمانەی وەرگێڕانی تیدا ئەنجام دەدات، دەستکەوتی کارەکەی خۆشی جوانتر و بەپێزتر بگەیەنێتە دەستی خوێنەران.

خاڵێکی دیکە کە هەم وەک پرەنسیپ و یاسایەک پێویستە بەردەوام لە وەرگێڕانی لەم چەشنەدا ڕەچاو بکرێت و هەم دەتوانم بڵێم وەرگێڕی ئەم تێکستەی کە ئێستا ئێمە قسەی لە سەر دەکەین پڕاوپڕ بە هەندی وەرگرتووە گرنگیدان بە ئاقاری مانایی یان با بڵێین ئاقاری واتایی وشەکانە. چونکە بە شێوەیەکی پەسن هاوئاسۆ کراون و هەوڵ دراوە بونیادی ڕێزمانی و توانا بەیانییەکان یەکانگیر بکرێن. بە گشتی گواستنەوەی ئەم جۆرە میتۆدە لە وەرگێڕاندا کارێک نییە بە سووک و ئاسان سەیر بکرێت و بدرێتە بەر دادوەرییەکی سادە و سەرپێییەوە.

گرنگ بەدەست هێنانی مەعریفەیەکی بەجێیە لە بارەی ئەم بەرهەمە

وەرگێڕدراوە و سەرجەم ئەو ڕووگە و ڕوانگانەی کە پەیوەست بەم کارە ڕەچاو کراون.

بە نیسبەت ئەم کەیسەی ئێستاشمان کە وەرگێڕانە لە کرمانجییەوە بۆ کوردیی سۆرانی بابەتەکە تا ڕادەیەکی زیاتر دەکرێ بەیناوبەینیی زمانی یان هاوڕیشەیی زمانیی پێوە بەدی بکرێت و هەروەک دواتر خوێنەری بەڕێز خۆی لە درێژەی خوێندنەوەی کتێبەکەدا لێی ڕوون دەبێتەوە، پرۆژەی وەرگێڕانی ئەم بەرهەمە پرۆسەیەکی مەبەستدار و خاوەن پلان و بەرنامەی تایبەت بە خۆی بووە و توانیویەتی بە ڕێگایەکی درووست و شایستەدا ڕێگە ببڕێت و ئامانجێکی شیاو و بمێنیش بپێکێت. لانیکەم لەم بازاڕە بێ سەر و بەرییەی وەرگێڕانی کوردیدا و لەم بشێوییە نازانستییانەدا کە تەنانەت گۆڤارێکی تایبەت بە وەرگێڕان و وەرگێڕەکان بوونی نییە کە تەنیا بپەرژێتە سەر تەوەرە پێوەندیدارەکان بەم بزاڤەوە، لە شوێنکاتێکدا کە هەر کەس هەڵدەستێت و خۆی بە نوخبەی بوارەکە دەزانێت و جگە لە خۆی کەسی قبووڵ نییە، لەم ئاژاوەگێڕییەی نووسیندا کە یەکەم هۆکاری بۆ وەک دەگوترێ «قحط الرجال» لە پانتاییەکەدا دەگەڕێتەوە، و لە لایەن دەزگا و بە ناو کارناسی دەزگاکانەوە ڕێگەی هەموو داهێنانێکی درووست و بەجێ لە وەرگێڕی کوردی داخراوە، لەم بەرچاو تەسکی و بیرکورتییەدا کە بە نیسبەت زمانەوە لە ئارادایە، کتێبێکتان پێشکەش دەکرێت کە وەرگێڕێکی دەست ئاوەڵا توانیویەتی بە یارمەتیی ئەوکەسایەتییەی بە ساڵانێک هاتۆتە بەرهەم، بە سەر هەموو لەمپەرە بینراو و نەبینراوەکاندا تێپەڕێت و ڕووداوێکی نوێ لە دونیای ئەدەبی سۆرانیدا بخولقێنێت.

چنوور فەتحی

گلگامش بە قسەی «دووپشك - مروڤ»ی کرد؛
لە ناو دارستاندا، کەوتە سەر ڕێی هەتاو،
بەرەو ئەو کەژەی خۆری لێ هەڵدەهات.
ڕۆژە ڕێیەك ڕۆیشت،
ئەو تاریکییەی ئەمی داڵدە دابوو، ڕوو لە زیاد بوون بوو.
ڕووناکی نەبوو، گلگامش بەر و دوای خۆی نەدەدی.
دوو ڕۆژەڕێی بڕی و تاریکی زێدە دەبوو.
ڕووناکی نەبوو، گلگامش بەر و دوای خۆی نەدەدی.
سێ ڕۆژەڕێی بڕی و تاریکی زێدە دەبوو.
ڕووناکی نەبوو، بەر و دوای خۆی نەدەدی.
چوار ڕۆژەڕێی بڕی و تاریکتر بوو.
ڕووناکی نەبوو، ئەو بەر و دوای خۆی نەدەدی.
پێنج ڕۆژەڕێی بڕی، دیسان تاریکتر.
ڕووناکی نەبوو، بەر و دوای خۆی نەدەدی.
شەش ڕەژەڕێی بڕی و تاریکتر،
نەیدەتوانی بەر و دوای خۆی ببینێ.
حەوت ڕۆژە و دیسان تاریکی؛
کاتێك بوو بە هەشت ڕۆژەڕێ، دەستی کرد بە هاوار؛
نە بەر و نە دوای دیار نەبوو.
دوای ڕۆژەڕێی نۆیەم، فێنکایی بای شەماڵ لە ڕوومەی خزا؛

بەڵام تاریکی قووڵتر بوو، نە بەر و نە دواى دیار نەبوو.
پاش دەهەم قۆناغ ئیتر گەشتبووە کۆتایی ڕێگە.
دواى یازدەهەمین ڕۆژەڕێ، سپێدەی بەیان دەرکەوت و
پاش ڕۆژەڕێی دوازدە، تیشکی خۆر وەك لافاو بەڕێکەوت.

داستانی گلگامش

# ١

## مەرگ

باز.

کۆتر.

ئێمە بە یەکیان دەڵێین باز و بەویدی؛ کۆتر.

باز و کۆتر. دوو ناو، دوو ئینسان، پیاوێکی مامناوەند و ژنێکی جوان. دوو ناو. دوو کەسایەتیی سەرەکیی ڕۆمانەکەمان. ئەم ڕۆمانە باسی بەسەرهاتی باز و کۆتر دەکات.

بەڵێ، باز و کۆتر. باز؛ ئەفسەرێکی تەمەن نزیکەی چل و دوو ساڵە. کۆتر؛ ئەو ئەوینەیە کە هاتۆتە سەر ڕێی باز، ئەوینداری ڕۆژانی شکست و بێهوودەیی، و تەمەنی بیست و دوو ساڵە. باز و کۆتر پەیوەندییەکی باڵکێش- تەنانەت ئەشقێکی باڵکێش- کە لە بێچارەیی سەرچاوەی گرتووە. بێچارە ژیاوە و بێهوودەش دەمرێ. باز و کۆتر دوو هەڵاتوو، دوو زیندانی، دوو قوربانی. باز و کۆتر دەمرن، ئێمە بە مردن، بە مردنی ئەوانەوە دەست بە بەسەرهاتیان دەکەین. ئەوان دەکوژرێن، ئێستا بەرەو مردن دەڕۆن. باز ئاگای لەمە هەیە. بە ئەزموونی خۆی دەزانێ کە بەرەو مەرگ دەچن. کۆتر ئاگای لێ نییە هەروەک ئاگای لە زۆر شت نییە، هەروەک نایەوێ بە زۆر شتی تر بزانێ نایەوێ بەمەش بزانێ.

ئێمە لە وڵاتێکی مەزن و فراواندایـن کە لە چەند وڵاتی بچووکتر پێک هاتووە. لە لایەکەوە بە دەریای سەوز و شین، لە لایەک بە شاخی بەرز و بڵند و لە لایەک بە بیابانی گەرم و بێکۆتایی سنووردارە. ئێمە لە وڵاتێکین بەردەوام چوار وەرزی ساڵی تێدایە. ئێمە ئێستا لە پایتەختی گەورەی ئەم وڵاتە لەگەڵ باز و کۆتر سواری پاسێکی ڕەش بووین و دەڕۆین. چوار تەنیشتی ئەم پاسە تەنراوەتەوە و تەنیا لە ژوورەوە دوو پەنجەرەی بچووکی تێدایە. پەنجەرەش بە ئاسن، قایم تەلبەند کراوە. لە پاسەکەدا جگە لە باز و کۆتر، حەوت کەسی تر هەن. شۆفێرەکە، دوو کەس لە لای ئەوەوە، چوار کەسی تر دووان دووان، هەر دوو لای باز و کۆتریان گرتووە. جلی مەدەنییان لە بەردایە. شۆفێرەکە، و دوو کەس، سیانییان سمێڵیان هەیە. ئەم حەوتە باز و کۆتر بەرەو مەرگ دەبەن. کۆتر؛ باڵندەیەکی سەرکز و داماو، کچێکی هەژار، ماندوو و نەخۆش. بێدەنگ سەیری بەردەمی خۆی دەکات. چاو بە قووڵا چوو، سەرکز و زەردهەڵگەڕاو. پەلکەکانی بە سەر شانیدا بەربوونەتەوە. پەلکەی درێژ و ڕەش وەک شوێن پێی دوو ئەستێرە کە لە شەوێکی ئەنگوستەچاودا دەدرەوشێنەوە. کۆتر بێدەنگە. هەمیشە بێدەنگە، وەک خۆڵی ڕەش، وەک ئەستێرە و مانگی پرشنگدار، وەک گۆڕی سارد، وەک کێلی گۆڕستانێکی خامۆش.

باز و کۆتر؛ نزیکەی حەفتەیەکە لە نزیکی دەریاکانی ئەم وڵاتە دەستگیر کراون. ئەوەندەی حەفتەیەکە خەو نەبۆتە میوانی چاوەکانیان. و بازیش ژانەسەری گرتووە، ژانێکی وێرانکەر ئەوی دیل گرتووە. سەری لە کێژەوە دێ، وەک بە سوژن، سوژن ئاژن بکرێ لە بەر ئێش تەزیوە. باز زیندانییە. بەڵام زیندانی بوون نا، بەڵکوو ئازاری میگرێن (شەقیقە) ماندووی کردووە. مەگەر هەر لە بەر ئەم ئێشی میگرێنە نەبوو کە دەستبەسەر کران؟

یەک حەفتەی ڕەبەقە گیراون. ئەوان لە گوندێکی بچووکی ماسیگر کە کەوتۆتە کەناری دەریا دەستگیر کران. هەر لەوێشەوە لە شەوێکی تاریکدا، کەلەبچەکراو، لە ناو جیپێکی سەربازیدا هێنرانە پایتەخت، وڵاتی هەموو شت، دڵی هەموو کەس. حەفتەیەکە، ئەوان لە دوو ژووری تاریکدا لێکدابڕاو چاوەڕوانی وەڵامێک، بڕیارێک دەکەن. ئێستا حەفتەیەک دەستبەسەری و گیراوی کۆتایی هاتووە. ئەوان کەوتوونەتە ڕێ، کەوتنە سەر ڕێی کۆتایی.

کێ دەیزانی کە ئەوان وایان لێدێت، کێ دەیزانی ڕێگەی پڕکەند و کۆسپیان ئاوا کۆتایی پێدێت!

باز بە ئازارەوە، ماندوو، مەلوول و نەرم دەڵێ: «کۆتر، کۆترەکە» بە دەنگێکی نزم و تووڕە. کۆتر سەر هەڵدێنێ. ئارام و نەرم بۆ باز دەڕوانێ. «کۆترەکەم!»

کۆتر بە ئارامی لێوە وشکەکانی دەبزوێنێ- وەک خاکی وشکی چاوەڕێی باران، وەک خاکی تینوو- کۆتر دەیەوێ پێبکەنێ، سەرەڕای هەموو شتێک پێبکەنێ. بە ئەوینەوە و بە گەرمی پێبکەنێ، پێکەنینی ئەوین نیشان بدات. باز سەیری دەکات؛ تا دوا ڕادە نەرم، یەکجار گەرم، تەواو بێچارە. سەیری چاوەکانی کۆتر دەکات، سەیری بیلبیلەی چاوان و قووڵایی نیگاکانی دەکات. بە تەماشاکردنیدا وا دیارە دەیهەوێ بە چاو، کۆتر بخاتە قووڵایی دڵییەوە. تا ئێستا بە درێژایی ژیانی، باز هەرگیز هەستێکی ئاوا زیز، ئاوا قووڵ و تەنک لە دەروونیدا سەری هەڵنەداوە. هەگیز لە ژێر شەپۆلێکی ئاوا بەهێزدا بەمجۆرە گیرۆدە و بێچارە نەبووە. کۆتر، هۆکار کۆترە. کۆتر؛ چارەنووسێکی تێکەڵ، چارەنووسێکی گەش، چارەنووسێکی ڕەش. سەرچاوەی ژیان، سەرچاوەی مەرگ و نەمان. کۆتر سەرچاوەی سەبر. کۆتر بەردەوام سەبری کرد. لە هەموو جێیەک و لە هەر دۆخێکدا، لە شەوانی ڕووناکی خوێندن و زانستگادا؛ ئەو کاتەی

فرمێسکی لێکدابڕان لە دەروونیدا سەرەوخوار بۆوە، سەبری کرد. کاتی بەفر و بۆران، ئەو دەمەی سەرمای سەر چیاکان بەسەریدا دەهات، سەبری کرد. کاتێک لە ناو شاخەکاندا لە ناو گاشەبەرد و تەختەبەردە ڕەشەکاندا، لە ژێر گەرمای هەتاودا، لە ژێر تیرێژی وەک بڵێسەی ئاگردا مایەوە، سەبری کرد. کاتێک بریندار بوو و خوێنی گەرم و سووری لێ دەچۆڕا سەبری کرد. لە زیندانی تاریک و سارد و نمداردا، ئەو کاتانەی ژیان واتای خۆی لە دەست دەدا سەبری کرد. لە ژێر ڕەنگی مەیلەو سووری خۆرئاوای ئێواران کاتێک هەڤاڵان هاتنە کوشتن، ئەو سەبری کرد. کاتێک دەنگ و تارمایی هەڤاڵانی مردوو وەک سێبەری خۆی بەدوایەوە بوون، سەبری کرد. لە ڕەو و مردوو ناشتن، ترس و گرتن و کوشتنی کۆرپەلە ساواکان سەبری کرد. هەنووکەش لە سەر ڕێی مەرگ، دیسان بێدەنگ سەبر دەکات. کۆتر سەرچاوەی سەبرێکە بە مەرگ تێکئاڵاو و ڕێسراوە و تەنیا بە مەرگ کۆتایی دێت.

تێڕوانینی باز، ئێستا لە ڕێی کۆتایی؛ باز خۆی پێناگیرێ، چاوی تەڕ دەبێ، فرمێسک لە چاوانییەوە دێ. چەند دڵۆپ لە چاویەوە بەرەو خوار دەبێتەوە. باز بە چاوی تەڕەوە لە کۆتر دەڕوانێ و پێدەکەنێ. نا پێناکەنێ، ئاگری پێکەنینێک بە ڕوویەوە دەگرێ. پێکەنین و گریان. پێکەنینێکی پڕ خەم و کەسەر. ژیان، گەمەکانی ژیان. بۆسە و کەمینی ژیان. بێچارەیی و بێ دەرەتانیی ژیان.

شەرم؟ نا، باز ئیتر شەرم لە چی بکات، ئەو دەزانێ؛ ئەو ڕێگەی دەیبڕن بێ گەڕانەوەیە، ڕێگەی بەرەو مەرگ، دۆڵی قووڵی مەرگە. ئیتر هەموو پەیوەندیی ژین و ژیان بەجێ ماون. ئەو کاتی سەرکەوتوویی خوێندن، ئەو کاتە بەختەوەرانەی ژیان، شەوانی ئەویندارێ، جۆش و شەوقی نزیک بوونەوەی جەستە ڕووتەکان، شەهوەتی مردن و کوشتن. شەپۆلەکانی کین و نەفرەت، ئەو تەماح و ڕق و قینە، دوژمنایەتیی

بێکۆتایی، شەوانی بێکۆتایی. ئەو ژیانە تاریکە و شەوانی خوێناوی، گریان و هاواری ئینسانی، ئەو چاوە بێ ئەژمارە پڕ سام و ترسانەی بەرەو مەرگ چوون، ئەو جەستانەی دەکەوتنە بەر گوللەی وێڵ و وەک بێژنگ کون کون و تێکەڵی خۆڵ دەبوون، ئەو خواستی هەڵوەشان و وێران کردنە، ئەو خواستی یەکیەتی و ئاوەدان کردنە، بەرپرسیاریی پیرۆزی پاراستن، سووتان، هەستە سوتووەکان، ئیتر هەموو ئەمانە تەنیا شوێن پێیەکی باریک و نادیاری دوو کەسی بێکەس و بێ دەرەتانن. بەڵێ ئیتر ئەمانە تەنیا بیرەوەریی زەردهەڵگەڕاوی دوو کەسی بێکەس و غەوارەن. ئیتر هەموو شت بەجێ ماوە. ئیدی بۆچی شەرم؟

باز ناتوانێ خۆی بجووڵێنێ، نە دەتوانێ بجمێ نە دەتوانێ فرمێسکەکانی بسڕێ و نە دەتوانێ دەست ببا بۆ پەلکەکانی* کۆتر و پەلکەکانی بخاتە پشتەوە. هەر دوو دەستی باز لە پشتەوە بەستراون، هەروەها دەستی کۆتریش. دەستیان بە پایە ئاسنینەکانی ئەو پاسەی تێیدان، کەلەبچە کراوە. هەر دوو بەرامبەر بە یەک، قۆڵبەستە و دانیشتوو بۆ یەک دەڕوانن، وەک ڕوانینی ئەویندارن، وەک ڕوانینی برینداران.

بەڵام کۆتر یەکجار ماندووە. کۆتر ئازاری هەیە. بێخەوی، سەرگێژە و سەرسامیی ڕۆژگار ئازاری دەدات. ئەو کەلەبچەی گیراوەتە مەچەکی دەستی، ئازاری دەدات. ئەو پاسە کە دەئاژوێ ئازاری دەدات. ئەو حاڵەی باز هەیەتی، ئازاری دەدات، یەکجار ئازاری دەدات. هۆکاری ئەم دۆخە کۆترە، کۆتر وا بیر دەکاتەوە. ئەگەر کۆتر نەبوایە، ئەگەر نەبوایەتە بار، ئەگەر چاوەڕوانی بەڵگەی ساختەیان بۆ کۆتر نەکردبایە و باز بیتوانیبا پاسپۆرتێکی ساختە کە هەموو شتی لە کۆتر بچووبا، بەدەست بخات، نەدەهاتنە گرتن و ئەو هەموو بەسەرهاتە خراپە لە خۆی و لە باز ڕووی نەدەدا. کۆتر دیسان چاو دادەخات.

---

* قژێک کە دەهۆنرێتەوە. بە هەر شتێکی هۆنراو و چنراو دەگوترێ، بۆ نموونە پەلکە زێڕینە.

پاس دەئاژوێ. نە بە پەلە، هێدی هێدی. وەک سەیارەی تەرمهەڵگر، قورس. باز بە دەنگدا دەزانێ کە بە بازێڕی گەورە، بە پایتەختدا ڕادەبرن. ئا ڕانابرن، هێدی هێدی لە شار دەردەچن. دەنگی شەمەندەفەر، ئۆتۆمبێل، تاکسی و سەیارە دێ. دەنگی لۆرییەک دێ. شۆفیرێک دەقیڕێنێ. یەکی دی، هی تاکسییەکە، بانگ لە موسافیری خۆی دەکات. دووکاندارێک بە دەم هاوارەوە هەرزانیی میوەکانی بە گوێی مشتەریدا دەدات. یەکێک بۆینباخی هەورێشمینی هەرزان دەفرۆشێت، ئۆتۆمبیلێک لە ناکاو ڕادەوەستێ. زیڕەی دەنگی ستۆپ دێت. دەنگی پێی ڕێبواران دێت. لە ڕادیۆ و بڵندگۆکان دەنگی مارشی سەربازی دێت. دەنگی تێکەڵاوی شاری مەزن دێت. ئەوان لە ناو ئەم دەنگانەدا، بێدەنگ دەڕۆن.

ئەوان دەڕۆن، لە ناو دەنگی ڕۆژانەی شاری کەونارا و مێژوویی، بەرەو بێدەنگیی مەرگ دەڕۆن.

باز ئێستا بیر دەکاتەوە: ئایا هاوار بکات؟ چ دەرەنجامێکی دەبێ؟ کێ دەنگی ئەم دەبیستێ؟ ئەگەر دەنگیشی ببیسترێ کێ دەتوانێ بە هاواریانەوە بێت؟ ئەو بەسەرهات و کردەوەی ڕابردووی خۆی دەزانێ؛ هیچ کەس، ئیدی هیچ کەس ناتوانێ بێت و یارمەتیی ئەوان بدات. لەم وڵاتە یەکجار بەرفرەدا کە لە لایەک هەمیشە با و گێژەڵوکەیە و لە لایەک هەتاو و تیشکی، ئیتر کەس ناتوانێ ئەوان ڕزگار بکات. دەبوو نەگیرابا، ئێستا دوای گرتن، ئیدی کەس ناتوانێ هاوکارییان بکات. سزای ئەوان دیاری کراوە، ئیتر چارە نییە. بەڵام کۆتر؟ هەر نەبوایە با کۆتر ڕزگار بوویا.

چۆن؟ ڕێیەک پێویستە، چارەیەک پێویستە. بەڵام چۆن؟

سەر لە ئێوارەیە، لە دەرەوە لە لای ڕۆژئاوای شار، لە سەر ئەو چەمە خوڕەی کە سەرانسەری شار بە درێژایی دەبڕێ، ڕۆژ دادەچێ. تیرێژی خۆر لە نێوان تەلبەندی ئاسنینی پاسەکەوە خۆی دەکوتێتە ژوورەوە.

پەنجەیەک تیریژ بە سەر زولف و ناوچەوان و سەر ڕووی کۆترەوە شەوق دەداتەوە. سەر ڕوومەتی کۆتر ڕووناکە، وەک «فریشتە»، باز بێدەنگ بیر دەکاتەوە. گەرمە، وێڕای ڕۆژداچوون هێشتا گەرمە، سەیارە، ناوەوەی سەیارەکە گەرمە. کۆتر ئارەقە دەکات. ژێربال و بەرزگ و ئەستۆی کۆتر شەلالی ئارەقە دەبێت. ئارەقەی لێ دەڕژێ، کراسەکەی نووساوە بە جەستەیەوە. چەن دڵۆپێک ئارەقە لە ناوچەوانییەوە بەردەبێتەوە.

شار، پایتەخت، شاری کۆن و مێژوویی. شاری چەمی زێڕین. شاری باز، شاری سەردەمی منداڵیی باز. باز لەم شارە گەورە بوو و پێگەیی، خوێندی و هاوسەرگیری کرد. ئەو لەم شارە لە مەیدانی یاریی، ڕای کرد، گوێی لە چیرۆکی قارەمانی گرت، لە شەڕ و تێک ئالۆزاندا سەری لە چەند لاوە شکا. هەر لێرە بۆ یەکەمجار لە پیاسەی قەراخ چەمدا تام و گەرمای لێوی ئەو کچەی بالای کەمێک لەم بەرزتر بوو، بەدەنی ئەمی ئاشنای گەرمای شەهوەت کرد. هەر لەم شارە لە ڕێستورانت و مەیخانەکانی قەراخ چەم، خەیالی گەورەی ڕۆژانی داهاتووی خۆی دادەڕشت. باز لە شەقام و بولوار*ی پان و بەرین و کۆلانی تەنگی ئەم شارەدا، زۆرجار سەرخۆش و هەندێک جار کەیفخۆش، جارنەجاریش نیگەران، گەڕاوە. لە گەڕەکەکانی دەرەوەی شار دەکەوتە شوێن کچی گەنجی مێردنەکردوو، دەچووە ڕووسپیخانەکان**. لە گەورە ڕووسپیخانەی ئەم شارە، چووە ئامێزی مادەر، دۆستی کۆنی خۆی، دۆستی ئاخیرەتی خۆی. لەم شارە

---

* وشەیەکی فەڕەنسییە کە بریتییە لە جادەیەکی دوو ساید و شوستەکانی کەناری و سەوزایی ناوەڕاست.

** ناوێك كە بۆ ئەم وشە لە شێوەزارەكانی كرمانجی و سۆرانیدا بەكار دەبرێت، بە چ شێوەیەك شیاو نییە و لێرەدا لە شێوازی بەكارهێنانی لە زمانی فارسیدا كەڵك وەرگیراوە كە هەم حاڵەتیكی مێتافۆڕی هەیە و هەمیش سووكایەتییەكانی وشە سۆرانی و كرمانجییەكەی تێدا بەدی ناكرێت. شیاوی ئاماژەپێدانە كە چەند وشەیەكی وەك «قەحبەخانە» و «لەزەتخانە» و «كەرخانە» لەم دوو شێوەزارەدا بوونیان هەیە. و.ك

بە دیسیپلینێکی بێکۆتایی، پەروەردە بوو، خۆی ناسی و دڵ و مێشک و ڕۆحی خۆی خستە ژێر بەندی دیسیپلینێکی بێکۆتاییەوە. لەم شارە هەمیشە لە مەلا بانگدان، لە نیوەشەوان، بە دەنگی بەرز، مارش و سروودی سەربازیی وت و شوکری خۆدا و وڵات و میللەت و دەوڵەت و ئەرتەش و سەرۆکی وڵات و سەرۆکی دەوڵەتی کرد. لەم شارەدا ئەوینی شەوان، ئەوینی مانگ و ئەوینی ئەستێرە کەوتە دڵی و بوو بە پیاوی شەوان. لەم شارە بۆ یەکەم جار جل و بەرگی ئەفسەری پۆشی و کڵاوی ئەفسەرانی لە سەر نا. ماڵەکەی، منداڵەکانی کە لە مێژ بوو نەیانیدیبوو، هەنووکەش لەم شارە بوون.

بازێر خاوەنی ڕووبارێکی قەشەنگ و نازەنین، خاوەنی گەرمای هەتاو و ڕووناکیی مانگ. شار خاوەنی گۆڕ و گۆڕستان.

بەڵی ئەم شارە بوو بە چارەنووسی باز، بوو بە ڕەنگی چارەنووسی باز، بوو بە دڵخۆشی و دڵتەنگییەکانی، ژان و ئازارەکانی، ساڵانێکی دوور و درێژ لە بەفر و باراندا، لە با و گەردەلوولدا، لە گەرما و هەتاودا، ئەم شارە هەنگاو بە هەنگاو بازی خستە سەر پێ و بازی کرد بە باز. بازی کردە بازێکی نێچیرڤان. ئێستاش لە سەر ڕێی مردن ئەو شارەی ئەمی کرد بە باز، شاهید و شایەتحاڵی ڕۆشتنی بازە. ئیستاش ئەو مێژووەی باز لەم شارە بوویەتی لە مێشک و دڵی بازدا بۆتە هەستێکی تەنک، ناسک و زیز؛ بۆتە هەستێکی کەم تەمەنی دەمێکی زۆر کورت.

کۆتر؟ پەیوەندیی کۆتر و ئەم شارە؟ کۆتریش لەم شارە خوێندی. پێنج ساڵ لە تەمەنی گەنجی، پێنج ساڵی فێربوون و خوێندنی قوتابخانەی لەم شارە تێکەڵ و باڵکێشەدا بە سەر برد. لەم شارە ئەو تووشی ئەشقی بەهێزی خۆی هات کە دواتر لێی ون بوو؛ جۆش و خرۆشێکی سەیر کەوتە جەستەی. یەکەم جار لەم شارەدا جەستە و

دڵ و گیانی دایە بەر هەڵمی ئەشق و خۆشەویستی، دەست و پەنجەی دەزگیرانی پەی بە تەواوی جەستەی برد. لەم شارەدا بۆ خۆی و ڕەگ و ڕیشەی خۆی گەڕایەوە. یەکەم جار لەم شارەدا هەستی ترسێکی بێسنووری کەوتە دڵ، لە ناو حەشیمەت و خەڵکێکی زۆردا، هەستی بە تەنیایی خۆی کرد، چەندین جار تای ساردی ترسێک هەموو جەستەی لەرزاند. ئێواران لە ژێر ڕووناکیی گڵۆپی شەقام و کۆڵاناندا، هزر و ئەندێشە و گومانی نوێ وەک ئەو تنۆکە بارانەی لە ناو ڕووناکیی گڵ دەدرەوشێتەوە، دڵی داگیر دەکرد. لە ژووری بچووکی پانسیۆنی خوێندنگای ئەم شارەدا لە بەر تروسکایی تووڕە و بێزاری چرایەکدا، ئەو لاپەڕە بە لاپەڕە، گۆڤار بە گۆڤار و کتێب لە دوای کتێب دەیخوێندەوە و بیر و بڕوا و ڕوانگەی نوێی دەناسی. لەم شارە ئینسانی نوێ، جڤاتی نوێ، زمانی نوێ و فەرهەنگی نوێی ناسی. لەم شارە، کۆتر بە دیدێکی نوێوە سەیری ڕێ و ڕێچک و بوون و هەبوونی خۆی کرد و زۆر باش خۆی ناسی، ڕێگەی خۆی ڕاست کردەوە و کەوتە سەر ئەو ڕێگەی کە ئیتر ئێستا کۆتایی دێت.

ڕێگە کۆتایی دێت، ڕێگەی تەواو دەبێت، ڕێگەی دوو کەس کە هەرگیز وێک ناچن، وەک شەو و ڕۆژ کە وێک ناچن، بەڵام لە سەر ڕێگە تووشی یەک هاتن و چارەنووسیان کردە یەک، ئێستا ئیتر کۆتایی دێت.

ئێستا ئەوان لە کوێن، لە کام لای ئەم شارە مەزنەن؟ باز گوێ هەڵدەخا بۆ دەنگەکان، دەنگی سروودی لەشکەری کە ئێواران دەست پێدەکات، ئێستا کەوتۆتە سەر هەموو دەنگەکانەوە. لە دەنگەکان وا دەردەکەوێ حەشیمەتێکی زۆر لە هات و چۆدان. لە دەرەوەی پاسەکە، خەڵک کار و باری ڕۆژانەیان تەواو دەکەن و دەچنەوە ماڵی خۆیان. شار خۆی بۆ ئێوارە ئامادە دەکات. ئێوارە دادەگەڕێ. خۆر هێدی

هێدی بە تیرێژی مەیلەو سوور ئاوا دەبێ. بێدەنگ، مات. خۆر لە پەنجەرەکانەوە دوایین سڵاوی خۆی دەنێرێتە ناو پاسەکە. ڕۆژ، ڕووناکیی سەر ڕوخسار، ماڵئاواییان لێ دەکات. باز دەزانێ؛ ئەوان دەکەونە ئامێزی شەو و ئیتر خۆر و خۆرەتاو نابینن.

پێدەچێ ئێستا لە نزیکی هۆڵی ئەفسەرانی ئەرتەش بن؟ باز بە ئارامی سەری بەرز دەکاتەوە و لە شیشی باریکی پەنجەرەی ناو پاسەکەوە دەڕوانێ. بێگومان لە شەوقی تیشکی هەتاو زێدەتر هیچ نابینێ. پەنجەرەکە زۆر بەرزە. دەنگی سروود دێ. هۆڵی ئەفسەرانی ئەرتەش... لە کەناری مەیدانی هەرە گەورەی شارەکە، ناوەندی شار، چوار تەنیشتی بە دیواری قایم و پتەو و بەرز، گیراوە. لە چوار لاوە سەرباز و پاسەوانی هەیە. قەڵایەکی قایم لە مەیدانی ناوەڕاستی شار. لە مەیدانەکەشدا هەیکەلی سەرۆکی وڵات و دەوڵەت دانراوە. هەیکەلێکی گرانیتیی ڕەشی چوار مەتری کە ڕووی کردۆتە هۆڵەکە و جلی سەربازیی لە بەردایە، سەرۆک پەنجە گەورەی دەستی ڕاستی بەرەو لای شار ڕاکێشاوە و ڕێگە نیشانی خەڵکەکەی دەدات. بە ڕوانین و ئاوڕێکی توند، بە سمێڵێکی ئەستوورەوە. باڵندەیەکی گەورەی دڕندە لە سەر شانی ڕاست، سەرۆک ... باز چەندین و چەند جار بە پێکەنینەوە، بە سەربڵندییەوە، بە ڕێزەوە لەو هەیکەلە مەزنەی ڕوانیبوو. چەندین جار لە هۆڵی ئەفسەران دانیشتبوو، خواردبووی و خواردبوویەوە! چەندین جار لێرە هەڤاڵانی ئەفسەری دیتبوو و لە گەڵیان لە سەر چەک و بۆسەدانان، مردن و کوشتن، ئەشق و خۆشەویستیی ژنان و کچان پەیڤیبوو. چەندین و چەند جار باس هاتبووە سەر قارەمانێتی، هاوڕێیەتی و برایەتی، دوژمنانی وڵات و دەوڵەت و فیداکاری و لە خۆبردوویی و بەهێزیی بەرامبەر بە دوژمن و ... و هەروەها هاوسەرگیرییەکەی و مەراسیمە ڕەنگین و خۆشەکەی ئەو، لێرە لە هۆڵی ئەفسەران.

ئێستا بە گریمانەیەکی مەزن ئەوان بە بەر دەمی هەیکەل و دیواری باخچەی هۆڵدا ڕادەبوورن و دەڕۆن. هەتیوخانە، ئەو ماڵ و خانووەی بازی تێدا گەورە بوو، ئێستا دێتەوە بیری. ئەگەر نها ئەوان لە دەورو بەری هۆڵی ئەفسەران بن، ئینجا هەتیوخانە دەکەوێتە ئەوبەری چەم و لەوبەری شاردایە. لە مێژ بوو باز دەیخواست بچێت بۆ ئەو ماڵە، وارگەی منداڵییەکەی، لەگەڵ بەرپرسیاری ماڵەکە دیدار بکات و هەندێ دیاری ببات بۆ منداڵانی هەتیو، ئەو ژوورە گەورەی کە خۆی تێیدا دەنووست، ببینێ، لەگەڵ منداڵانی بێ دایک و باوک لە چێشتخانەی ماڵەکە نانی نیوەڕۆ بخوات و چەند سەعاتێک لە لایان بمێنێتەوە. ئەو پڕ حەزی دەکرد سەر لە ئێوارەیەک کاتێک خۆر هێدی هێدی ئاوا دەبوو لە باخچەی هەتیوخانە لە ژێر دار چنارە کۆن و مەزنەکان پاڵ بداتەوە و بە دەنگی گەڵا و شنەی ئێوارە خەو بیباتەوە و دیسان خۆی بگەیەنێتە خەون و خەیاڵی پاک و زوڵاڵی منداڵی. بەڵام نەبوو، وەها نابێت، ئیدی هەرگیز ناکرێت.

ژنەکەی کە ژیانی لێ تاڵ کردبوو، و هەر دوو کوڕەکەی کە ئێستا پێدەچێت لەو بەری چەمی شار لە ماڵەوە بن، چی دەکەن؟ ئایا منداڵەکانی ئاگایان لێیە باوکیان گیراوە و نها بە دەستی هەڤاڵانی پێشووی خۆی دێتە کوشتن؟ مەگەر چەند ساڵە منداڵەکانی نەدیوە؟ دوو؟ سێ؟ بێگومان ئێستا باڵای کوڕە گەورەکەی بە قەد باڵای بازی لێهاتووە. دەبێ ڕیش و سمێڵی لێ هاتبێ. کوڕە بچکۆلەکەی کە هەمیشە لە ناو جێ و نوێنیدا دەهاتە ئامێزی باوکی و دەیویست لە پاڵ ئەودا بنوێ، باڵای کردووە؟ دوا جار کە باز هاتبووە سەردانی ماڵێ، باڵای دەگەیشتە دەستگیرەی دەرگای ژووری خەوتنەکە. ئەی ئێستا؟

دوای ئەو ئێوارە؟ ئیدی ئەوان یەکدی نابینن هەرگیز. ئەمە

مسۆگەرە. لێ دوای ئەو ئێوارە چۆن بیر دەکەنەوە؟ ئەوان دەزانن باوکیان ئەندامی ئەرتەش بوو، ئەفسەرێکی بژاردە بوو، گیان فیدای وڵات و دەوڵەت بوو، خاوەن بەرپرسیاریی مەزن و قورس بوو. بەڵام ئەو خەریکی چی بوو، بۆچی نەدەهاتەوە بۆ ماڵ؟ بۆچی ون بوو؟ منداڵ لە بەرانبەر ئەم پرسیارانەدا چی دەڵێن، چ بەرسڤێک دەدەنەوە؟ کاتێ منداڵان گەورە دەبن ئایا وەک ئەم دەبنە ئەفسەر؟ ئەوانیش ئیش و ئەرکی پاراستنی وڵات – میللەت- دەوڵەت دەگرنە ئەستۆ؟ و ئەی دوایی؟ دوایی چۆن دەبێت؟

مادەر، دۆستی سەردەمی چوون بۆ ڕووسپیخانە کە ئیتر پیر بووە، ئێستا چ دەکا؟ بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئەو مادەرەی کە جارجار بە سرووودی سەربازی و جارجارەش بە سترانی سووکی ڕووسپیخانە ئەمی دەلاواندەوە، ئێستا هەست بە چارەنووسی باز دەکات؟

ئەو سروودە سەربازییەی هەنووکەش وەک خوێنی خۆی، وەک ترپەی دڵی، لە ڕەگ و دەمارەکانیدا، لە ڕۆح و مێشکیدا دێت و دەچێت و دەنگ دەداتەوە ... باز بەم سروود و سترانە سەربازییانە خۆی ناسی، بەوانەوە مەزن بوو و ئەمڕۆش وەک گەمەی ئاڵۆزکاوی بەخت بەوانەوە بەرەو مەرگ دەڕوا. ڕۆژی منداڵان بەم سروودانەوە دەستی پێدەکرد، بەم سروودانەشەوە دەچوونە ناو نوێنی خەو. پاش ساڵانی منداڵیش، لە قوتابخانە و دەبستان، لە ئاکادیمیای سەربازی و ژیانی لەشکەریدا، ڕۆژ و شەوی باز بەردەوام بە دەنگی سروود و سترانی لە خۆبایی شەڕ، قارەمانی و گیان فیدایی داڕێژرا. هەمیشە باز، ژیانی باز، تەمەنی باز بە سروود، بە شوکر و سوپاسی وڵاتێک کە لایەکی دەریای بێ کۆتایی، لایەکی چیا و شاخی سەربەرز بوو، بە سترانی لەشکەری تێپەڕ بوو. بەردەوام ئەو لە بەرانبەر ئاڵای سێ ڕەنگی سوور و سپی و سەوز کە لە هەر لایەکی وڵات، لە سەر سنوورەکانی، لە سەربانی

لەشکرگە و لە بڵندایی ماڵەکاندا هەڵکراوە، هەستاوەتە سەر پێ و ڕاوەستاوە و بە دەنگێکی بڵند و بەهێز، بە بڕوا، بە حەزەوە، بە جۆشەوە سروودی وتووەتەوە.

بەڵام ئێستا لە ژێر پەردەی بڵندی دەنگی سروودەکاندا، هیچ دەنگێک لە باز نایە. نە بڕوا نە حەز و جۆش و خرۆشیش ماوە. ئێستا تەنها هەستێکی ئاڵۆزکاوی زیز و زویر ماوە. کۆتر ماوە. هەستێک کە کۆتر و بوونی کۆتر ڕایانگواستۆتەوە، ماوە. هێرشی مەرگ ماوە. ترپەی دڵی کە بەرز دەبێتەوە ماوە. باز دیسان لە کۆتر، لە ڕوخساری کۆتر و لە باڵای دەڕوانێ. ناو پاسەکە تاریک بووە. نە خۆر، نە ڕووناکی و تیشکی هەتاو ماون. لەم تاریکییە تەنکەدا، ڕوخساری بە ڕەنگێکی ئەسمەر دەدرەوشێتەوە. کۆتر بەو زوڵف و پەلکە درێژانەوە، بە ڕوانینی ئارامی، چاوی ڕەشی، برۆ و برژۆڵی درێژی، لێوی قەڵەو و پڕی، گەردنی کە وەک غەزاڵ دەچێتەوە، ئێستا وەک پەرییەکی داستان، پەرییەکی خەون، خۆی نیشان دەدا. وەک ئەوەی کە باز لە خەوێکدا بێت، وەک ئەوەی لە ناو دەریای سەیراندا بێت، وەها دۆش داماو و زیز لە ئەویندارەکەی دەڕوانێ. بولێڵ و سەرەتای ئێوارە کە ڕەنگێکی قاوەیی ڕوونی ڕژاندۆتە ناو پاسەکە، کۆتری کردۆتە پەرییەکی جوانی ئەفسانەیی. کۆتر ماندوو و نەخۆش، ئێستا لە ناو جوانییەکی بێ وێنەدایە. لە چاوی بازەوە ئاوا دەبینرێ. پیشتریش باز دەیزانی کە کۆتر جوانە. بەڵام ئەوەندە ئەو نازەنینییە، ئەو نازەنینییە، ئەو جوانییە ساکار و نەگۆڕە! ئەو شیرینەی هەمیشە لە بەر دڵە، بێدەنگە! ئەو گوڵە سوورەی لە ناو خوێن شین بووە!

کۆتر؛ هەستی ئەشقی بێسنوور و لە ڕادەنەهاتووی باز؛ گەرمای ئاگری ئەشقێک کە کەوتۆتە دڵی باز. کۆتر؛ دڵێکی ماندوو وەک دڵی خۆی ئێستا لە بەرانبەریدا ترپەی دێت؛ ئاواتی باز، ئیتر

هەموو شتی باز، بەڵای گیانی باز، مەرگی باز. کۆتر ئەسیرێکی بەستەزمان؛ بەختەوەریی باز، بەڵگەی ژیانی باز و مۆری مەرگی باز. باز سەرسوڕماو؛ ئەو هەستە غەریبانە چین لەم سەرهەڵدەدەن؟ ئەوانە خەونن خەونی مرۆڤێک کە تای ئەوینی گرتووە؟ ئەوە ئاوازی مەرگە بەسەریدا دێن؟ ئەم چی بکات؟ چی بڵێ؟

باز بە ئارامی دەڵێ: «کۆتر، کۆترەکەم...» کۆتر گەردنی کەمێک ڕاست دەکاتەوە و بە چاوێکی کراوەتر بۆ باز دەڕوانێ. باز دیسان دەڵێ: «کۆتر»، هەر ئەوەندە. قسەکەی تەواو ناکات. باز چی بڵێ، چۆن هەستی خۆی بێنێتە زمان؟ ئەوان تەنیا نین. ئەوان زیندانین. ماندوو و نەخۆشن. پەیڤێکی تر لە زاری نایە. کات، نە کاتی قسەیە. بەهای قسە لە بەرانبەر ڕاستیی مردنێکی سارددا چییە؟ کات، کاتی هەست و سۆزەکانە، کاتی بێدەنگییە. هەست و سۆزی نادیار کە لە دڵ و ڕۆحدا شەپۆلانیەتی، بە شەپۆلانی خۆی هەناسە لە قوربانی دەبڕێ.

باز بیر دەکاتەوە، ئەگەر ئەوان نەگیرابان و نەکەوتایەتنە ئەم دۆخەوە تا کۆتر دەبووە دایک. تاوەکوو کۆتر منداڵێکی جوان هەر وەک خۆی، منداڵی بازی دەهێنایە دونیاوە. لە ناو هات و چۆ و ترس و ڕەوی ئەم مانگانەی دوایی، داخوازی هەرە مەزنی باز ئەمە بوو؛ منداڵێکی ڕووناک کە بەر و ئەنجامی هەستی بێکۆتایی و جۆش و خرۆش و ترسی بێهاوتا بوو. ئەوان لەم وڵاتە کە جۆگەی خوێنی تێدا بەڕێ کەوتووە، دەڕویشتن. لە وڵاتێکی نوێی دوور و غەریب مالێکیان دەکردەوە. کۆتر منداڵە شیرینەکەی، لەم وڵاتە تازە بهێنایەتە دونیا. شەڕ، پێکدادان، مەرگ، کوشتن، ڕەو، ترس و هەموو شتەکانی ژیانی ڕابردوو لەوێ بەجێ دەما. تەنانەت ناو و پاشناویان، هەموو شتێکیان نوێ دەبوو. ئەوان ناو و پاشناوی خۆیان دەگۆڕی و ژیانێکی

نوێیان دەست پێدەکرد. باز دەستی بە کارێکی نوێ دەکرد. کارێکی نوێ کە هیچ پەیوەندی بە کار و فەرمانی پیشوویەوە نەدەبوو. باز پاش کاری نوێی وڵاتی نوێی بگەڕایەتەوە بۆ ماڵ،، لە چێشتخانە بۆنی شێوی گەرمی کۆتر هەڵچووبا. شێو ئامادە بووایە. دوای ئەوە کۆتر لە ژووری خەو، لە خەودا بووایە. کۆتر بە ئارامی هەناسەی بگرتایە و بیدایەتە دەرەوە، بە گریمانەیەکی زۆر سکی پڕی هێواش و لە سەر خۆ لەگەڵ هەناسەکانیدا دەهاتە سەرەوە و دادەچۆوە. بۆنی خۆشی ژنێکی دووگیان ژوورەکەی پڕ کردایە. باز بە ئارامی بێ ئەوەی کۆتر خەبەر کاتەوە بهاتایە و دەستی بە زگی گەرمی کۆتردا بهێنایە. زگی بماڵیبا و هەستی بە بزواندنی منداڵی ناو زگی بکردایە. هانای جەستەی کۆتر و بزوانی منداڵ، دەست و جەستە و ڕۆحی بازی گەرم بکردایە. باز بە ڕاموسانێکی بچووک کۆتری بە خەبەر بهێنایەتەوە. پێکەنینی ژیان بکەوتایەتە سەر ڕوخساریان و دەستیان بە ئێوارەیان بکردایە. خەونێکی ئاوا، خەونێک لە خەونەکانی دەمانی کۆتایی.

لەم ئێوارەی گەرمی ڕۆشتنەدا، لە باتیی پەیڤ، ئەم بیرۆکانە کە باز بە جاران بیری لێ کردۆتەوە، ئێستا، دەهاتنەوە یادی. باز بزەیەک دەیگرێ.

و باز دەگری چەند فرمێسکی تازە بە ڕوومەتیدا سەرەوخوار دەبنەوە.

لێ نا. باز دەبێ نەگری. دەبێ خۆی ڕابگرێ لە لای ئەو کەسانەی کە تا دوێنێش هاوکاری ئیش و فەرمانی بوون. تا پێش چەند مانگێک، باز، بەهێز، بێترس، قایم، بە ئیقتیدار و ژیرانە ئەوانی بەڕێوە دەبرد. کار و باریانی دەسووڕاند، باز ئەمری بە ئەوان دەکرد. ئێستا ئەوان، گریانی باز لە سستی و بێدەرەتانیی بازەوە دەبینن. نا، باز دەبێ نەگری، وەک تۆراو لە خۆی نەکات. باز و کۆتر بە وشیارییەوە

هاتبوونە سەر ئەم ڕێگە. ئەوان دەیانزانی لەم ڕێگەدا مردن دەبێتە تووشیانەوە. ئەوان مەرگیشیان لا پەسەند بوو. ئێستا دەبوو ئەویش بە ئارامی وەک کۆتر مەرگ پەسەند بکات. مەگەر پەیوەندیی ئەوان لە هێرشی مەرگەوە پێک نەهاتبوو، بە هێرشی مەرگ دانەڕێژرابوو؟ مەگەر ئەوان لە بەر بۆن و سامی مەرگ خۆیان لێک نەئاڵاندبوو؟ مەگەر لە بەر ترس و سامی مردن نەبوو هەر جارەی چاویان بەستبوو و کردبۆوە و هەناسەکانیان تێکەڵ ببوو، هەر بیریان لە مەرگ کردبۆوە؟ مەگەر سێبەر و تارمایی مەرگ هەمیشە لە ڕۆژان و شەوانی گەرمی خۆ شاردنەوە و ساردی هەڵهاتندا دەورەی نەدەدان؟ مەگەر لە مەرگ؛ لە سام و ترسی مەرگ و سەرما و ژانی مەرگ بەولاوە و بەئاوەژو بوونی، لە ئەشقەکەیان بەولاوە، لە ژیانی ئەواندا چی مابوو؟ ئەو کاتە؟ باز خۆی کۆ دەکاتەوە. چاوە تەڕەکانی چەند جار دەنووقێنێ و دەیکاتەوە، گەردنی خۆی توند بەرەو هەر دوو شانی دەتەقێنێ و سینگ و باڵای خۆی ڕاست دەکاتەوە.

چاوی باز ئیدی تەڕ نابن، خەم لە بیلبیلەی چاوانی نانیشێ، ڕەنگی زەردی خەمباری پاییز ئیتر ڕوخساری داناگرێ. ئەو ئیتر بیر لە ساتەکانی کۆتایی دەکاتەوە کە سەرەڕای هەموو شت، واتایەکی نوێی دابووە ژیانی. ئەو بیر لە ئەویندارێ ماندووی خۆی دەکاتەوە. ئەو بیر لەو سترانە زوڵاڵانەی کۆتر دەکاتەوە کە لێیان تێنەدەگەیی. ئیتر بیر لە چرینی گۆرانیی گەرمی شەوانی درێژی خۆیان و لە سترانەکانی با و سرووشت دەکاتەوە.

ئەو دەزانێ؛ ئەوان بە دەنگی سترانی با و سرووشت، تێکەڵی خۆڵی ڕەش دەبن. ئیدی سترانی با و سرووشت دەبێتە کفنی ئەوان و لە خۆیان دەگرێ...

ئەو حەوت کەسەی ئەمان دەبەن، قسە ناکەن و لەمان ناڕوانن.

باز ئەوان ناناسێ. وێڕای ئەوە کە ئەوان و باز بە جۆرێک لە جۆرەکان پەیوەندییان پێکەوە بوو و هەڤاڵی یەک ڕێباز بوون، باز ئەوانی نەدیبوو. لە سەرنج و دانیشتنی وشکیانەوە وا دەردەکەویت کە پسپۆڕی کارەکەیانن. ئەوان دەزانن باز و کۆتر کێن و دەبێ چییان لێ بکرێ. باز لەوان دەڕوانێ، بەڵام دەزانێ قسە کردن لەگەڵیان کەڵکی نیە. یاد کردنەوەی هەڤاڵانی کۆن و باسی قارەمانی و گیان فیدایی یەککگرتووی ڕۆژانی ڕابردوو بێواتایە. تکا و ڕجا سوودی نییە. باسی بەخت و ویژدان یەکجار بێمانایە.

ئێستا ئەوان گەیشتوونەتە کوێ؟ لە شار هاتوونەتە دەر، دەنگی ڕۆژانەی شاریان لێ دوور کەوتۆتەوە. دوو چرای بچووک لە هەر دوو لای پاسەکە داگیرساون و ڕۆشناییەکی بێزار و تووڕە دەڕژێننە ناو پاسەکە. هێشتا دەنگ دێ، کووفەکووفی دەنگی شار کە لە دەنگی حەیوانێکی درندە دەچێ، هەنووکەش دەگاتە بەرگوێی ئەمان، بەڵام ئەمان ئێستا زۆر لە شار دوورن. وێڕای ئەوەی یەکجار لە شار دوور کەوتوونەتەوە هێشتاش دەنگی سروودی لەشکەری، بەرزتر لە هەموو دەنگێک دەگاتە گوێیان. باز نازانێ پێبکەنێ یان بگری. «لەم بەختە گەوادە بڕوانە»، باز بیر دەکاتەوە لە ناو هەموو ڕۆژانی خودا ئەوان ئەمڕۆ دەچن بەرەو دیاری ڕەحمەت! ئەمڕۆ! دەنگی ئاهەنگی سروودی لەشکەری بێهۆ نییە، ئەمڕۆ ساڵڕۆژی دەسەڵاتداریی سەرۆکی وڵات، دەوڵەت و میللەتە. بیست و سێ ساڵ پێش ئێستا لە ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆدا سەرۆکی ئەرتەش واتە سەرۆکی دەوڵەت و میللەت — کە پێی دەڵێن ژەنەڕاڵ سەردار- دەسەڵاتی دەوڵەتی گرتە دەست و بووە سەرۆکی دەوڵەتیش.

ئەو ڕۆژی شادی و سرووره وەک دوێنێ دێتە پێش چاوی باز. ئەو کات باز تازە ببوە ئەفسەر. ژەنەڕاڵ سەردار هاوڕێ لەگەڵ برا ژەنەڕاڵەکەی و دوو زاوا و هەندێ خزمی سەرباز و ئامۆزایەکی کە

سەربازێکی ناودار بوو و هەڤاڵ و دۆستە ئەفسەرەکانی ئەم ئامۆزایە، لە کازیوەی بەیانییەکی پاییز بە توندی هێرشیان کردبووە سەر قەسری پاشا، پاشا و ژمارەیەک لە دەست و پێوەندەکانی پاشایان دەست بەجێ کوشتبوو، کۆنترۆڵی ئەرتەش و دەوڵەتیان گرتبووە دەست و بوونە دەسەڵاتدار. هۆکاری سەرهەڵدان و کودەتاکە زۆر ساکار بوو؛ وڵاتی مەزن و بەرین بڵاو دەبۆوە، وڵات لە دەست دەچوو. وڵات کە ئێمە بە وڵاتی مەزن ناوزەدی دەکەین. کە لە گەلێک وڵاتی بچووکتر-وڵاتی ڤووو، وڵاتی خواروو، وڵاتی بیابان، وڵاتی دەریا، وڵاتی شاخەکان ... - پێک هاتبوو، بە وتەی ژەنەڕاڵ سەردار و هاوڕێکانی، لە ژێر مەترسیی پارچەبووندا بوو. یەکیەتیی وڵات پێویست بوو، پاراستنی یەکیەتیی وڵات پێویست بوو.

ئەو ڕۆژی حەشرانە کە ئاڵا دەشەکاوە، تانک دەهاتن و دەچوون، دەنگی فڕۆکەی جێت هەموو جێگەیەکی دەگرت، مەفرەزەی بێ ژوماری سەربازی لە هەر لایەکی وڵات بە پۆستاڵی خۆیان زەوییان دەهەژاند، ئێستا دێنەوە یادی باز. باز بڕوای بە ژەنەڕاڵ سەردار هەبوو، لە هەر کەسێک زیاتر بڕوای پێی هەبوو. بە دڵ و گیان، بە ڕۆح و هەبوونی خۆی گرێدراوی بوو. لە برا، ئامۆزا و خزم و کەسی ژەنەڕاڵ سەردار زیاتر. لە ژن و کچەکەی پتر. لە باوک و دایکی پیری زێدەتر، باز گیانفیدای ژەنەڕاڵ سەردار بوو. هەموو قسەیەکی ژەنەڕاڵ، هەموو ڕوانینێکی، هەر دەست هەڵبڕینێکی، بۆ باز، فەرمان و ئەمرێکی مسۆگەر، ئایەتێکی پیرۆز بوو. بەڵێ وەها بوو.

بەڵێ ئەمڕۆ، ساڵڕۆژی دەسەڵاتداریی ژەنەڕاڵ سەردارە.

بەڵێ ئەمڕۆ لە ڕۆژی پیرۆز و پیرۆزباییدا کەمێک دوورتر لە کۆشکی ژنەڕاڵ کە ئێستا پیر بووە، باز و کۆتر دێنە کوشتن.

باز بێ ئەوەی ئاگای لێ بێ هەناسەیەکی قووڵی خەمناک

هەڵدەکێشێ، سەر دادەخا و تەماشای بەردەمی خۆی دەکات. چەن خولەکێک وا دەمێنێتەوە و دوایی سەرهەڵدەبڕێ و بە ئارامی لەو کەسە مەزنەی تەنیشتی کە وەک پاڵەوانان، بێدەنگ دانیشتووە، جگەرەیەک داوا دەکات. بەڵام کەسەکە هیچ ناڵێ. چەند ساتێک تێدەپەڕێ، هیچ دەنگ و جووڵەیەک ناکات. کەسەکەی تەنیشتی لەم ناڕوانێ و گوێی ناداتێ.

باز دەبێ چی بکات؟ هەرگیز هیچی لە دەست نایە.

دەمێکی درێژ بە هەمان بێدەنگی ڕێگە دەبڕن. لە دەنگی مەکینەی پاسەکە پتر دەنگێک نایە. کۆتر چاوی بەستووە، پەلکەکانی لە سەر هەردوو شانیەوە ڕژاونەتە سەر کراسە هاوینییەکەی، گەردنی بەرەو خوار بووە- وەک ئەوەی چووبێتە خەو. وەک ئەوەی لە ئێستاوە چووبێتە خەوی قووڵی مردن، نە ئازاری جەستە، نە ماندویەتیی مانگ و ساڵان بە ڕوخسارییەوە دیار نییە، نە شۆپی* چرچ و لۆچیی گومانێک، نە دوودڵی و نە جۆش و خرۆش و سەفایەک بە ڕوخسارییەوە دیار نیە. هیچ دەنگ و هەرایەکی لێوە نایە. ساکاری، خاوێنی و ئارامیی ڕوانینی کۆتر دیسان سەرنجی باز ڕادەکێشێ. «لێ بێگومان ئێستا سەری ئەویش وەک سەری من دێشێ» باز لە کۆتر دەڕوانێ بیر دەکاتەوە، «سەری قورس بووە، سەری دێشێ، سەری ئەو قەت ناتوانێ ئەم ڕووداوانە لە خۆ بگرێ ...».

باز هێشتا لەم بیرانەدایە کە پاسەکە لە ناکاو ڕادەگرێ. ئایا گەیشتوونەتە ئەو جێگەی کە دەبوو بگەن؟ چەند خولەکێک هەروا ڕادەوەستن. دوایی ئەو دوو کەسەی لای شۆفێرەکە دانیشتوون، دادەبەزن و دێن هەر دوو دەرگا مەزنەکەی دوای پاسەکە دەکەنەوە. ڕووناکییەکی بێزارکەر دەڕوونی پاسەکە دادەگرێ. ئەمجار کۆتریش چاوەکانی

* شوێن پێ.

دەکاتــەوە. ئەوانــەی لــە تەنیشــت بــاز و کۆتــر دانیشــتوون، کەلەبچــەکان دەکەنــەوە و لــە پاســەکە دایــان دەبەزێنــن. ســەرەتا بــاز و دواتریــش کۆتــر.

ئێوارەیــە، ئێوارەیەکــی گەرمــی هاوینێکــی ســوور. ئــەوان گەلێــک لــە شــار دوور کەوتوونەتــەوە، هیــچ دەنگێکــی شــار ناگاتــە گوێیــان. لــێ لــە دوورەوە ڕۆشــنایی گڵۆپــی بــێ ژمــاری ناوشــار، وەک پەپوولــەی ڕەنگاوڕەنگــی بەهــار دەدرەوشــێنەوە. شــارێکی ئەوەنــدە خاوێــن و مــەزن! بــاز نەیزانیبــوو شــار ئەوەنــدە گــەورە بــووە. تــا چــاو بــڕ دەکات لــە هەمــوو لایەکــەوە بێکۆتــا گڵــۆپ دەدرەوشــێنەوە. بــاز و کۆتــر جــێ تــەزووی بازنــی کەلەبچــەی دەســتیان دەماڵــن و بــۆ شــار دەڕوانــن، لــە خــوارەوە درەوشــانەوەی بێکۆتایــی گڵۆپــەکان و لــە سەریشــەوە بێپایانیــی ئەســتێرەکان، خــۆ دەنوێنــن. ئاســمان ســاماڵە، پەڵــە هەورێــک نابینــرێ، کــۆ و دەســتەی ئەســتێران بــە ڕەنگــی شــاد و گــەرم دەدرەوشــێنەوە. و مانــگ ... مانگــی ڕوونــاک وەک ڕێبــەری ئۆرکێســترایەک، بزافــی ڕووناکــی بەڕێــوە دەبــات. ڕووناکیــی قەشــەنگی ســەرێ و خــوارێ بوونەتــە دەســتەخوشکی یەکــدی و سرووشــت. ڕووناکــی بۆتــە هاوڕێــی بــاز و کۆتــر.

لــە ئاســمانی ســاماڵدا، ئەســتێرەیەکی زەرد و زراف، هێڵێکــی زێڕیــن لــە شــوێن خــۆی بەجــێ دەهێڵــێ و دوای کەمێــک دەڕوا. لــە دوور دەنگــی ســەگوەڕ دێ. دەنگــی ســەگێک چەنــد چرکەیــەک ئــۆلان* دەدات. دەنگــی بــۆق دێ. لــە دەور و بەریــان هەندێــک مێشــوولە ویزەویزیانــە. بــاز دەڵــێ: «کۆتــر» لــەم شــەوە ئــاوا خۆشــە بڕوانــە ... لــەم شــەوە خۆشــە و لــەم چارەنووســە گــەوادە ...».

ئــەو حــەوت کەســە بەدەور و بەریانــەوەن، ســێیانیان کەمێــک دوورتــرن، بــەڵام ئــەو چــوارەی لــە نــاو پاســەکە لــە تەنیشــتیان دانیشــتبوون، زۆر لێیــان نزیکــن و دەمانچەکانیــان بــە دەســتەوە گرتــووە و ئەنگوســتیان لــە

* دەنگدانەوە.

ناو قەوانی دەمانچە و قامکیان لە سەر پەلەپیتکەی دەمانچەکانە.
لەگەڵ ئەوەش کە دەمانچەکان دیار نین، باز جۆرەکەیان دەناسێ:
دووانیان بارێتا (جۆرێک دەمانچەی ئیتالیایی)و یەک ڤۆلتێری ئەڵمانی
و یەکیشیان وەک دەمانچەکەی خۆیەتی؛ بارێتا. ئەوان لە کەناری
جاددەیەکی قیرتاو کە بۆنی قیری لێ دێ ڕاوەستاون. باز ئەم ڕێگەیە
دەناسێ؛ ئەوان لە لای باکووری شارەکەن. چەمی بێهاوتا کە بە
شارەکەدا تێدەپەڕێ و دەیکاتە دوو بەشەوە، تەنیا کەمێک دوورتر لە
جاددەکە، هاوتەریبی ڕێگە، دەڕوا. باز بۆ ژوور لە مانگ و ئەستێرە،
بۆ دوور، بۆ بریقانەوەی شارەکە، بۆ دەور و بەری خۆی، بۆ ئەو
کەسانەی لەگەڵ ئەمانن دەڕوانێ. بە چاوی تەڕ و بە نیگایەکی
پڕهاوار. بان، هاریکارییەک دەخوازێ، حەز بە لێبوردنێک دەکات.
بە هیوای موعجیزەیەکە. باز دەڕوانێ، بۆ چاوی کەسەکان دەڕوانێ.
بەڵام هیچ سوودێکی نییە. لەم ئێوارە ڕۆشنەدا ترووسکایی هیوا
بەدی ناکرێ. لە بن ئەم ڕۆشناییەدا، دەروونێکی تاریک هەیە، تەنیا
تاریک، تاڵ، تژی لە ترس و شکست. دەرفەت نییە، چارە نییە،
ڕێگە نییە. بەڵام دیسانیش خۆی کۆ دەکاتەوە و ڕوو دەکاتەوە ئەو
دوو کەسەی لە بەر دەرگای پشتەوەی پاسەکە ڕاوەستاون و دەیهەوێ
شتێک بڵێ. تاوەکوو شتێک ڕووبدات. ڕەنگە موعجیزەیەک ڕوو بدات.
«هیچ تاوانێکی نییە» باز وا دەڵێ؛ «ئەو بە چارەنووسی خۆی ڕازی
بوو، لێ من ناچاری هەڵهاتنم کرد، ئەو بەردەن، نەخۆشە ... کۆتر بەر
دەن...» هیچ دەنگێک نایە، هیچ جووڵەیەک نییە. باز هیچ بەرسڤێکی
دەست ناکەوێ، وەک ئەوەی لالانەوەی ئاسمانێکی ڕووناک لە خاکی
ڕەش کردبێت. جارێکی تر، دیسانیش، باز بۆ ئەوان دەڕوانێ، قسە
دەکات، تکا دەکات، لێیان دەپاڕێتەوە. بەڵام قەت لە دەنگی بۆق
و دەنگی دووری حەیوانەکان زیاتر هیچ دەنگێک نایە. بێدەنگییە،

بێدەنگیی مردنە، ئیتر بێدەنگیی مەرگ باڵی بە سەریاندا کێشاوە، بە سەر ئەو خاکەی ئەمان پێی لێ دەنێن، بێدەنگیی مەرگ، ئەوان لە ژیان، لە ڕووناکیی ژیان دوور دەخاتەوە و بەرەو مردنیان دەبات. مانگ و ئەستێرە ئیتر بە تەنیا شاهیدی مردنن.

دەرد و کوڵ، خەم، دڵپڕی، مات بوون، بێچارەیی، زیزی و هەستی تێکەڵی دی ... باز لەوەدایە بگری، چاوە تەڕەکانی پڕ دەبن لە فرمێسک و خێرا دەڕژێنە خوار. باز نایەوێ ئەوان بە گریانی بزانن، بەڵام ناگرێ. باز دەگری، سەرەتا بێدەنگ، دواتر بە دەنگەوە. جەستەی باز دەلەرزێ، لە سەر ئەژنۆ ئارام دەکەوێتە سەر زەوی. لەگەڵ ئەوەی خۆی وەک تەلیسێکی بەتاڵ، لاشەیەکی ئاوساو، هەست پێ دەکات، ڕا دەبێتە سەر پێ. بە خۆیدا دێتەوە و جارێکی دی لەوان دەڕوانێ. بەڵام ئیتر ناپەیڤێ. ئیتر هیچ پەیڤێک بە زاریدا نایە. تەنها بیر دەکاتەوە: «دەبێ هەستی مردن، ژان و پەژارەی بێ پێناسەی هەستی مردن بێ ئەمانە». بێدەنگ بە خۆی دەڵێ: «بڵێی ئەو مرۆڤانەی منیان بەرەو مەرگ نارد، پێش مەرگ هەست بەم شتانە بکەن...».

دووان لەو چوار کەسە دێن و دیسان لە پشتەوە مەچەکی دەستی باز و کۆتر کەلەبچە دەکەن و بێ ئەوەی هیچ بڵێن پاڵیان پێوە دەنێن.

ئەوان دەکەونە ڕێ. دوو کەسی دەمانچە بە دەست لە پێشەوە و دووانیش لە پاش، ئەوان لە ڕێگەکە دوور دەخەنەوە. ئەوانی تەنیشت دەرگای پاسەکە لە لای پاس دەمێننەوە. باز و کۆتر و ئەو چوار کەسە دەگەنە زەوییەکی بەردەڵانی و بێدەنگ دەڕۆن. زەوی پڕە لە کڵۆ و بەرد. جێ جێش دەور و بەریان لە بەرد و خیزەڵان پێک هاتووە. گژ و گیا و کڵۆش کە بە چەند بستێک لە زەوی بەرز بوونەتەوە، دەئاڵێتە پێیان. دەنگی هەنگاوەکانیان دێ. لە دەور و بەریان بۆنی گیا و پوش و ڕووەک دێ. کۆتر لای چەپ و هەنگاوێک لە پێش بازەوە دەڕوا. وەک

ئەوەی ئاگای لە هیچ نەبێ سەری بەرز گرتووە و سەیری پێش خۆی دەکات، بە هەنگاوی گەلێک بچووک و ئارام، بەرێدا دەڕوات. بە پێڵاوە خۆڵەمێشییە وەرزشییەکەی بە ئارامی پێ بە خاکدا دەنێت، کراسە درێژ و ناسکەکەی لە بادا دەشەکێتەوە. مورووی پیرۆزەیی ملوانکەکەی و گەردەنبەندی زێوینی بە ئارامی دەنگیان لێ دێ. شەوقێکی تەنک لە سەر ڕوخساری ئەسمەری، وەک ئەوەیە ڕووناکیی مانگ، ڕوخسار و چاو و لێوی ڕابمووسێ؛ وەک ئەوەی ئەستێرە بە تیری خۆی قژ و زوڵف و پەلکەکانی شانە بکات. کۆتر؛ کچێکی وەحشی، کێوی، کچێکی بێ عەیب، کچێکی ئەسمەری ئەشقی ڕووناک و مەرگی تاریک. کۆتر؛ کچی ڕێز و ڕێزداری، کچی شەهوەت. کۆتر؛ کچی مانگ، کچی ئەستێران، کچی ئەسمەری خاکی ڕەش.

لە ناکاو باز شتێکی دەکەوێتەوە یاد؛ ئەو هەرگیز بە ئاخاوتن حەز و خۆشەویستی و ئەشقی خۆی بۆ کۆتر دەرنەبڕیوە! سەرەڕای ئەوەی کە ئەوان کەوتوونەتە ڕێی مان و نەمان. لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا باز لە بەر کۆتر بەرەو مەرگ دەڕاوت، هەنووکەش پێی نەوتووە کە خۆشی دەوێ. ئێستا؟ ئێستا بیڵێ؟ دەڵێ: «کۆتر» «کۆتری من...» هەر ئەمە، جگە لەمە هیچ شتێک نایەتە زاری. «کۆتری من...».

کۆتر دیسان چەند جار زمانی بە سەر لێوە وشکەکانیدا دەگەڕێنێت و لێوی دەبزوێنێ، بێ ئەوەی بەرسڤ بدات لە باز دەڕوانێ، بەو چاوانەی کە بوون بە دوو ترووسکەی ئاگر، بە ڕوخسارێکی ئارام، بە بزە، بە داخوازی و تەمەنناوە.

نها لە دوورەوە چەم دیارە و دەنگی ئاوەکەی دێ. چەم لە ناو زەردییەکی بێکۆتادایە، ڕوناکی لێ هەڵدەقوڵێ. مانگ و ئەستێرە بە سەر ئاوی چەمەکەوە کۆڤەندیان گرتووە؛ چەم بووەتە کانی گەش و ڕووناکی. ئەوان بەرەو چەم دەچن. ئەوەندەی پەنجا مەترێک دوورتر لە

چەمەکە ڕادەوەستن. دیسان باز جارێک بە لاڵانەوە، لەو چوار کەسە دەپاڕێتەوە. بە پەژارەوە، بە ئازارەوە، بە هاوار، بەگریان، بە نەرمی، بە پێکەنینەوە بە هەموو شێوەیەک کە ئێستا دێتەوە یادی، باز قسە دەکات و دەخوازێ پەیڤێک، هەر نەبێ وشەیەک لە دەمی ئەو کەسانەوە بێتە دەر. بەڵام هەرچی دەکا نابێ، دەنگیان لێ دەرنایە. هەرچی کۆترە هیچ خۆ نابزوێنێ. بێدەنگ، بێ جموجۆڵ ڕادەوەستێ، جارێک سەرنج دەداتە سەر شەوقدانەوەی چەم و جارێکیش سەر ڕووناکیی مانگ و ئەستێران. بۆنی خاک، گیا، چەم و ئەو داروبەردەی بە دەورو بەریانەوەن، بە هەناسەی قووڵ هەڵدەکێشێتە ناو هەناوی خۆیەوە. بۆنی سروشت بۆ کۆتری زۆر ماندوو لە هەموو ئەو قسانە، مرۆڤانە، هات و چۆیانە، پێکەنین و گەمەکردنانە و ژان و ئازاری ئینسانەکان باشترە. سروشت دایکی یەکەم کە هەموو شت لەوەوە پەیدا دەبێت. سرووشت؛ دوایین دایک کە هەموو شت لە باوەشی خۆیدا دەکاتە خەو.

لێ ئێستا دەنگی تەقەیەک بێدەنگیی سروشتی ئارام دەشکێنێ. دەنگی تەقەی فیشەکێک، ئارامیی دەورو بەریان تێک دەدات. باز و کۆتر بۆ یەک دەڕوانن. باز؟ کۆتر؟ لە ناکاو کۆتر دەهەژێ وەک ئەوەی کارەبا گرتبێتی، جەستە و قاچەکانی دەهەژێ و دەتەزێن. ڕوخساری ڕەنگی ئازار دەگرێت، سووتانێک دەکەوێتە سەر ڕوخساری و دواتر ئارام لە زەوی دەگلێ. سەرەتا لە سەر ئەژنۆ و دواتر لە سەر ڕووخسار دەگلێتە ناو پووش و گیا. بۆنی گیا و پووش و ڕووەک... بۆنێکی ترشۆکی خۆش و زیندوو وەک بۆنی هەرمێ و سێوەکانی گوندی منداڵییەکەی. سەر و دەم و لووتی چەقیوەتە ناو گیا و چەند چرکەیەک هەناسە دەگرێ و دەیداتەوە، مێشی تووڕە بە دەوری سەریەوە ویزەویز دەکەن. سووتانی سەر ڕوخساری، شەپۆل بە شەپۆل هەموو جەستەی

دادەگرێ. بەڵام سەیرە، وێڕای سووتان هەست بە هەموو شت دەکات و بیر دەکاتەوە. سەری کۆتر هەر وەکوو سرووشتی ئەم ئێوارە زۆر زوڵاڵ و ئارامە. کەمێک سەری بڵند دەکات. پەژارەی چی دایبگرێ ئەستێرە بە سەر سەریەوەن، ئەو نزیکییە، ئەو جوانییە، ئەو خەونە! ... کۆتر دەبێ ئەستێران لە ئامێز بگرێ، دەستیان پیادا بێنێ، هێز لە خۆی دەکا کە ڕابێتە سەر پێ. نابێ، تازە دێتەوە یادی کە دەستیشی لە پشتەوە کەلەبچە کراوە. لێ دەبێ ڕابێتە سەر پێ. ئەگەر تەنانەت نەتوانێ بە دەستی ئەستێرەکان بگرێ، خۆ دەتوانێ هەستێتە سەر پێ و بە ڕوخسار و لێوی هەستیان بکات و رایانمووسێ. بە ئازارێکی بێدەنگی بێکۆتا، بە هەستی تێکەڵی ترس، ڕق و حەسرەتەوە هەڵدەستێتە سەر پێ. سەر و جەستەی چەند جار بۆ بەر و دوا دەڕوا و دێ. بەڵام دوایی بە بەژنێکی ڕاستی وەک سێبەری درێژی ناو مژ و دووکەڵ بە پێوە ڕادەوەستێ. سەیری کەسانی دەور و بەری دەکات. بازیش لەوێیە، دەڵێی یەکەم جارە دەیبینێ، وەها بە سەرنجەوە، بە مەراقەوە لێیان دەڕوانێ. ئینجا قیرە و هاواری بازیشی دێتە بەر گوێی؛ «کۆتر! ... کۆتر...»بەڵی کۆتر بەم دەڵێ، ئەم، کۆترە. باز لە نێوان دوو کەسدا کە ڕێگەی نادەن بجووڵێ و خۆی بگەیەنێتە کۆتر، هاوار دەکات؛ «کۆتر...!»، کۆتر بە ئارامییەکی قووڵ، یەکجار قووڵ و بەبزەوە بۆ باز دەڕوانێ، بە بزەوە؟ کۆتر لە بەر ئازاری ڕوخسار بە باشی ناتوانێ، بەڵام دەخوازێ بە بزەوە بۆ باز بڕوانێ.

ئەمجار دەنگی تەقەیەکی تر دێ. کۆتر تررووسکەی بەربوونەوەی ئاگر دەبینێ. لەگەڵ تررووسکەی ئاگر ئەمجار سووتانێکی تر دەکەوێتە قوڕگی. شتێکی ڕوون و گەرم لە گەرووییەوە بەڕێ دەکەوێت. چەند چرکەیەک هەروا بە پێوە دەمێنێتەوە و دوایی لە ناکاو لە سەر پشت بەردەبێتەوە سەر زەوی. پاش ئەوەی دەکەوێ، دەنگی تەقەیەکی تر ئۆلان دەداتەوە.

چوار کەسی دەمانچە بە دەست، باز کە بە هاوارەوە دەگری پەلکێش دەکەن و دەگەڕێنەوە بەرەو لای پاسەکە کە لە کەناری جاددەکە چاوەڕوانیان دەکات و لە کۆتر کە لە ناو گژ و گیادا لە سەر پشت خەوتووە، دوور دەکەونەوە و بەجێی دەهێڵن.

کۆتر لە سەر زەوی لە ناو گژ و گیا و پووشدا ڕاکشاوەو لە مانگ و ئەستێرانی ئاسمان دەڕوانێ بێ ئەوەی ئیتر هیچ ببینێ یان هەست بکات یان شتێک بژی.

# ٢

# کۆچ

باز...

کۆتر...

کۆتر کوژرا، بازیش بەرەو جێگایەکی نادیار دەبرێ. بۆچی؟

باز؟ کۆتر؟ ئەوان کێن؟ بۆچی دەستگیر کران؟ بۆچی سێ گوللەی مەرگ دەم و چەنەی کۆتریان پەرش و بڵاو کردەوە، کانییەکی خوڕی خوێنیان لە قوڕگیدا کردەوە، کاسەی سەریان تەقاند و ناردیانە دیاری ڕەحمەت؟ پیاوکوژەکان باز بەرەو کوێ دەبەن و چی بە سەر دێنن؟

لە بازەوە دەست پێدەکەین. لە سەرڕا، لە دەستپێکەوە. وەک دەگوترێ؛ هەموو ژیانێک، هەموو بەسەرهاتی ژیانێک سەرەتایەکی هەیە. ئەگەر لە سەرەتاوە دەست پێبکەین، دەبێ ئەمە بڵێین: داستانی بەسەرهاتی باز، شەوێک لە شەوانی تەڕ و تاریک دەست پێدەکات.

لە کوێ؟ دیسان لەم وڵاتە گەورە. لە وڵاتی مەزن، لە وڵاتێک لەو وڵاتە بچووکانە کە پارچەکانی وڵاتی مەزنن: لە وڵاتێکی تەرا و لە بیرکراو. لە وڵاتی چیا. هەروەک لە چیرۆکە ئەفسانەییەکاندا دەگوترێ؛ هەبوو، نەبوو، لە پشت حەفت چیا وڵاتێک هەبوو... چیرۆکی بەسەرهاتی بازیش لە وڵاتی پشتی حەوت کێوان، لە وڵاتێکی خاوەن شاخی بڵندی

سەرکەش، دەست پێدەکات.

ئەی کەی؟ چل و دوو ساڵ پێش ئەو ئێوارەی کە کۆتر لە ژێر ڕووناکیی مانگدا بێدەنگ و تەنیا بە نیگای پڕحەسرەتی چاوەکانی ماڵئاوایی لە باز کرد. ڕێک چل و دوو ساڵ پێش ئەوەی کە کۆتر بەو سێ گوللەیەی بە چاو، دەم و گەروویدا تەقین و کەوتە سەر زەوی و سەری نایە سەر خاکی ڕەحمەت.

واتە چل و دوو ساڵ بەر لە شەوی مەرگ. چل و حەوت ساڵ پێش نووسینی ئەم دێڕانە. بەسەرهاتی باز چل و حەوت ساڵ پێش لەوەی ئەم دێڕانەی ئێستا هەوڵ دەدەن بەسەرهاتی ژیانی باز بگێڕنەوە. دەست پێدەکات.

ئێمە دەست پێدەکەین و ئێستاش لەو ئێوارەی مانگەشەوی چوون و مردنە، دوور دەکەوینەوە و دەچینە شەوێکی تاریکی سالانی ڕابردوو. ئەوکات تەمەنی باز ئەوەندەی دوو ساڵ یان دوو ساڵ و نیوە و ئێمە لە وڵاتی چیا بەرزەکان لە گوندێکی بناری چیاین؛ دونیا شەوەزەنگە. شەوێکی تەڕ و تاریک باڵی بە سەر وڵاتی چیای بڵنددا کێشاوە. باران نم نم دەبارێ و زوڵفی دارستانی وڵاتی بێ ڕێگە و ڕێچکە و سەخڵەت دادەهێنێ، ڕەحمەت دەخاتە زگی خاکی هەزاران ساڵە. خاکی وشک باران قووت دەدا، بۆنێکی تازە لە خاک هەڵدەستێ. خاک دەناڵێنێ.

دانیشتووان و خاوەنانی هەزاران ساڵەی ئەم خاکە، گوندەکەیان، خاکەکەیان، بەجێ دەهێڵن. ئەوان، ئەمشەو دڵ سووتاو، کۆچ دەکەن و دەڕۆن. ئارام، بێدەنگ، خەفەتبار. ئیدی هیچ چارێکیان نەماوە، دەبێ گوند بەجێ بهێڵن و بڕۆن؛ بەرەو دڵی چیا و شیو و دۆڵەکانیان. دەبێ خۆیان بسپێرنە ئەو شوێنانە، جێی حەیوان و باڵندە. ئەوان تاوەکوو ئەمڕۆ سەبریان کرد، دانیان بە خۆیاندا گرت، بەڵام لە ئەمڕۆ بەدواوە ئیتر هیچ ڕێگەیەکیان نەماوە. دوژمنەکانیان، واتە سوپای وڵاتی مەزن

کە ئەمان پێیان دەڵێن «بیانی» کە بە زمانێکی دی دەپەیڤن، بە زمانێکی دی فەرمان بە ئەمان دەدەن، بە زمانێکی دی لەمان بە قیندا کەوتوون و تەنگیان پێ هەڵچنیون. ئەوان ئیدی نە دەتوانن دان بە خۆدا بگرن، و نە لە گوندیش بمێنن. ئەوان بێچارە ماون، بێچارە کەوتوون. تەنیا دوو ڕێگەیان هەیە: ڕێگەی مەرگ و ڕێگەی شاخ و دۆڵی ئاشنا.

واتا ڕێگەی ڕەو و هەڵهاتن.

ئەوان دەڕۆن. پیر و منداڵەکانیان سواری ئەسپ و ئێستر، توویەرە و تێر و فەردەی ئارد، گەنم، جۆ، گەنمەشامی و دانەوێڵە و دەخڵ و دانی دی، فەردە شەکر، خوێ، برنج، ساوەر، دێزە و گۆزە و مەشکە، ڕۆن ، هەنگوین و دۆشاویان باری سەرپشتی بارگین، هێستر و کەر کردووە و لەگەڵ سترانی دەنگی باران و شنەبا دەڕۆن. لە چوار ڕیزدا: ڕیزی پێشەوە کە هەم ڕێگە دەکەنەوە و ئەگەریش مەترسییەکی نادیار بێتە سەرڕێیان، ئەوانی دی دەپارێزن. ڕیزی دووهەم پیر و ژن و منداڵن. واتا ڕابردوو و داهاتووی ئەوانن. ڕیزی سێهەم؛ پیشەساز یان پسپۆڕانی پیشەیی، شوان، گاوان و پاسەوانەکانن کە هەندێک مەڕ و دەواریان، ئەوەندەی کراوە لەگەڵ خۆیان ببەن، داوەتە پێش و بە شوێن ئەو دوو ڕیزەی دیدا دەڕۆن. ڕیزی دواییش دیسان لاو و گەنج و چەکدارن. لێ سەرۆکی عەشیرە، گۆرانی بێژ و مۆسیقاری گوند، پێشەوای ئایینیی پیر، دارتاش، ئاسنگەر، پینەچی، پێشگۆ، دوو کوێخای گوند و چەند پسپۆڕ و زانا و بیریاریش لە ڕیزی دواوە جێ دەگرن.

کاروانەکەیان ڕێکەوتووە، دەڕۆن: تێکچوو، بریندار، بێکەس، داماو و بێهیوا. ئەوان تەنیا دەیانەوی بژین، زیاتریان ناوێ، بەس بژین. لە سەر خاکی خۆیان، وەک ڕابردوو. بەڵام ئێستا بۆ ژین و ژیان دەبێ ڕەو بکەن و هەڵبێن، دەبێ خاکەکەیان بەجێ بهێڵن. دەبێ لە وڵاتی خۆیان، لە خاکەکەیان، گوندەکەیان، گۆڕ وگۆڕستانەکەیان هەڵبێن. کەس دەنگی

لێوە نایە. لە شتێکی پێویست زیاتر کەس هیچ ناڵێ و هیچ ناکات. چما دەست و پێیان کۆت و زمانیان قوفڵ کرابێت. لە باتیی ئەوان با و باران دەپەیڤن. باران نم نم دەبارێ، با خۆی بە باوە دەکات، ئەسپ، مایین، کەر، بارگین و ئێستر دەنگیان دێ، مەڕ و دەوار دەجمن. چەند منداڵ، منداڵانێک کە ئاگایان نە لە ڕق و سووتان، نە لە کۆچ و ڕەو هەیە، دەگرین. منداڵانێک کە نازانن خاک و وڵات، دەورە و زەمانە، مەرگ و مانەوە چییە و خەریکی منداڵێتیی خۆیانن. سەگ و تاژی، بەڵێ سەگ و تاژی و تووتکەکانیان هەن. پێویستە مرۆڤ سەگ و تاژییەکان، دۆستی هەرە نزیک، هەرە بە وەفا و هەرە کۆنی لە بیر نەکات.

زستان بە باو و باراندا هەواڵی هاتنی خۆی دەنێرێ: چلە لە ڕێدایە. پێش هاتنی چلە دەبێ بگەنە جێگەیەکی پارێزراو. شوێنێک کە بکرێ لە سارد و سەرمای زستاندا بیانحەوێنێتەوە. شوێنێکی پارێزراوی نزیک لە باڵدار و ئاژەڵان و دوور لە بێگانە بە جۆرێک کە دەستی بێگانەیان پێ نەگات. دوو ساڵە، دوو ساڵی ڕەبەقە کە خۆیان ڕاگرتووە، جارێک دەچنە هەواری دراوسێ و دوژمنەکانیان، جارێک لە سەر ڕێگەی هات و چۆ، بێگانە کەمین دادەنێن، دەمرن، دەکوژن. لێ ئێستا ئیدی دەبێ بڕەون و هەڵبێن. چونکە ئەرتەش یانی بێگانە بەڕێوەن و پێش هاتنی زستان دەگەنە گوند. لە سەرەتای پاییزێکدا، سوپای وڵاتی مەزن بە چەک و تۆپ و تەقەمەنیی خۆیانەوە هاتن، ئەوان بۆچێ هاتن؟ دەیانویست چی بکەن؟ کەس بە ئەمەی نەدەزانی، لێ ئەوان هاتن؛ بە توند و تیژی، بە فەرمان و فەریاد. بۆچی توندوتیژی، بۆچی بەم شێوە؟ کەس نەیدەزانی. بەڵام تفەنگ دەستی بە تەقە کرد، لە لوولەی تۆپ و ڕەشاشەوە، ئاگر بەریووە دار و دارستان و دار و بەردی گوندان. مەرگ کەمینی نایەوە. ئەو بێدەنگییەی بە سەدان ساڵ بوو باڵی بەسەر وڵاتی چیاکاندا کێشابوو، بە جارێک ڕەوییەوە و جێگەی خۆی دا بە هاوار و قیڕە:

هـاواری ئەمـان و قیـڕەی بیانـی کـە لـە زمانـی یـەک نەدەگەیشـتن؛ قیـڕەی لاو و گەنجـان کـە بـە گولـلـەی زۆرداری مـەرگ لـە زەوی دەگلان؛ قیـڕەی ژن و پیـران کە لـە بـەر چالاکیـی شـەڕ هـەر ئەوەنـدەی کات بـوو کـە ڕەش بپۆشـن و لـە جێگـەی خۆیـان دانیشـن؛ قیـڕە و هـاواری جەنـگاوەران کـە وەک پڵنگی ئـەو چیایـە لـە نـاو شـیو و دۆڵ و کەندەڵانـدا جارێـک دادەگـەڕان و جارێـک هەڵدەکشـان، جارێـک بـە پەلـە دەڕۆیشـتن تاوەکـوو ڕێ لـە هاتنـی بیانـی بگـرن؛ هـاواری باڵـدار و باڵنـدان کـە لـەو دار و دارسـتانەی لـە سـووتاندا بـوو، دوور دەکەوتنـەوە. هـاوار و قیـڕە و دەرەنجامەکانـی، لـێ لەگـەڵ هەمـوو ئەمانـەش، دانیشـتووانی خاکی کۆن بـە هیـوا بـوون؛ ئـەوان لـە سـەر خاکـی خۆیـان لـە جـێ و مەسـکەنی بـا و باپیرانیانـدا بـوون. بـاو و باپیـران لـەم شـوێنە هاتبوونـە دونیـاوە و هـەر لـەم خاکەش ماڵئاواییـان لـە دونیـا کردبـوو. لـە حـەوت، لـە حەفتاوحـەوت پشـتەوە، ئـەوان خاوەنـی ئـەم وڵاتـە بـوون. هەتـاوی گـەرم، مانگـی ڕووناک، ئەسـتێرەی درەوشـاوە، نەرمـە بـاران، بەفـری سـپی، چیـای سـەرکەش، خاکـی بەپیـت، کانیـاو و لافـاوی بەهـاران، هەڵـۆ و تـەواری عالـەم شـایەتحاڵی ژیانـی ئـەوان بـوون. دەنگـی ڕەنـج و کاری ئـەوان هەنووکـەش لـە شـیو و دۆڵـی چیاکانـدا ئـۆلان دەدات. شنەی بەربەیـان، هەنووکـەش دەنگـی ستران و داسـتانی ئـەوان دەگەیەنێتـە هەمـوو شـوێنی چیـا بـەرزەکان. لـە کام بنەبـەردا چـی گیانلەبـەر هەیـە، لـە کام هێلانـە و ئاشـیانەی کـون و قوژبنـدا چـی هێلکـەی باڵنـدە هەیـە، لـە سـەر کام تاشـەبەردی چیـا چـی باڵنـدە هەیـە، لـە بـەر کام چـەم و ڕووبـار چـی ڕووەک دەڕوێ، لـە کام ئـاودا چـی ماسـی هەیـە... ئەمانـە هەموویـان بـە گشـت ئـەو شـتانەیان دەزانـی. بەڵـێ وڵات، وڵاتـی ئـەوان بـوو. بێگانـە مانـدوو دەبـوون و دەچـوون. ئـەوان ئـاوا بیریـان دەکـردەوە، ئـەوان ئاواتیـان ئەمـە بـوو.

ئـەو پاییـزەی بێگانـە هاتـن، گەیشـتە زسـتان. زسـتان بـووە بەهـار،

بەهار گەییە هاوین، هاوین دیسان گەیشتە پاییزێکی دی، لێ بێگانە نەچوون. بەپێچەوانەوە زۆر زیاتر، زۆر قووڵتر و زۆر نزیکتر هاتنە ناوەوە. ئیدی دەنگی غەریبی بێگانە و زمانی بیانییان دەگەیشتە بەر گوێی ئەمان. بای سارد، دەنگی سترانی بیگانەکانی دەگەیاندە گوێی ئەمان. لە ماوەی دوو ساڵدا بێگانەکان کە هەواڵی شەڕ و پێکدادانیان بیستبوو لەگەڵ دەوڵەت و ئەرتەش بە چەک و تەقەمەنییەکی زۆرەوە، شکستیان بەوان هێنا و هەناسەیان لە ژیانی مێژوویی چیاییەکان بڕی. خاوەن خاکی وڵاتی چیا بەهێز بوون، خۆڕاگر بوون، هەڵیان دەبڕین، دەیانتاراندن. بەڵام نەزان و بێچارە بوون. بێتەدبیر وبێ ئیمکان بوون. ئەوان بەشێوەی ماڵ ماڵ، بنەماڵە بنەماڵە، باپیرە باپیرە، عەشیرە عەشیرە و ناوچە ناوچە دەژیان. وەک ڕابردوو، وەک هەزار ساڵ پێش ئێستا. نە یەکیەتییان هەبوو نە زانستی شەڕ و پێکدادان لە دژی سوپا، نە چەک و تەقەمەنییەکیان هەبوو نە ئاگاشیان لە دونیا بوو. کەمینی ئەوان، کەپر و سێبەر و قەڵغانی ئەوان، هیوا و ئاواتەکانیان دانە دانە لە بەر یەک هەڵدەوەشان. دانە دانە تێکدەچوون. بێگانە وەک عەشیرەکانی دراوسێ نەبوون. شەڕی بێگانەش وەک شەڕە ناوخۆییەکانی ئەمان نەبوو. بازنەی دەوریان ڕۆژ بە ڕۆژ تەنگتر دەبۆوە.

ئێستا لەم بارانە شەوەدا بێگانە ئەوەندەی هەنگاوە ڕێیەک لەمان دوورن، واتە بێگانە ئەوەندە نزیکن لەمانەوە! بەرخۆدانی دوو ساڵیان شکستی هێنا و بۆنی خوێن جێگەی بۆنی بارووتی گرت. دار، دارستان، دار و بەرد و شیو و دۆڵان بوونە گۆڕ و گۆڕستان. لە هەموو جێگەیەک خزم و ئاشنا، کەس و کار و دۆست و هاوڕێ مردن. ڕەنگی خوێن تێکەڵی ئاوی سپیی ڕووباران بوو. دار و دارستان، گوند و ئاواییەکان سووتان. سێدارە بەرپا بوون، هەرکەس دەستگیر دەکرا بە فەرمانێک کە لێی تێنەدەگەیشت، دەخنکێندرا.

بێگانە هاتن و ژیانی ئەوانیان، کە هەزاران ساڵ بوو وەک خۆی مابوو، بە زۆر تێکدا و لە شوێن و خاکی خۆیان دووریان خستنەوە.

شەو، شەوێکی ئاوەهای کۆچ و ڕەو؛ لادێیی، خاوەنی ئەم خاکە، لە گوند دوور دەکەونەوە. ڕیزی یەکەم گەلێک لە گوند دوور کەوتۆتەوە، ئەوەندی تۆزقاڵێکی ماوە بگەنە پشت ئەو کەژ و شاخانە کە بەرەو ئاسمانی تاریک هەڵکشاون. ڕیزی دووهەم و سێهەم لە نێوان ڕێزی یەکەم و گونددا بە ئارامی، بێدەنگ ڕێدەکەن. ڕێزی چوارەم لە گوند دێتە دەر. هەروەک هەموو ڕیزەکانی دی کردیان، کەسانی ڕیزی چوارەمیش ئێستا پێش ئەوەی دوور بکەونەوە، ئاوڕێک لە گوند دەدەنەوە. لە ناو تاریکایی شەودا، وەک سێبەر، وەک خەیاڵ، ماڵ و خانووەکانیان، حەوش و بەرەیان، بیر و ئاوی سروشتی، داری سپیندار، گوێز و هەنجیر، بیر و بیرەوەرییەکانیان، دەنگ و سەدای ڕۆژانی ڕابردوویان، تەمەنیان، ڕۆحیان لێرە لە گوند بەجێ دەمێنێ. ئەوان لە خانووە بەردینەکاندا چاویان پشکووت. بۆنی میز و پشکەڵی مەڕ و دەوار لە ئاخوڕ و گەوڕەکانی گونددا گەیشتە لووتیان. ئەوان لە زەوییەکانی گوند زەویی بەپیتیان هەڵبژارد، ئەسپ و ماینیان لە سەر ئەم خاکە غار دا، چوونە پشتی ئەو شاخانە بۆ ڕاوی ئاسک و غەزال و گیانلەبەری تر، چوون بۆ نێچیری باڵدار و باڵندە، لە پشتی گوند لە بناری چیاکان بۆسەیان بۆ گورگ و ڕێوی، باز و هەڵۆ دانا. بە ماسیی چەمی ئاوایی منداڵەکانیان تێر کرد. لە شەوانی ئەم گوندەدا، دوای خەوتنی زارۆکان و خوێندنی گوندەبەبو، دڵیان دایە بەر شەپۆلی خۆشی و گەمە، جۆش و کوڵی جەستەیان حەواندەوە. لە ڕۆژانی گەرمی هاوینی ئاواییدا زەماوەند و ئاهەنگیان گێڕا و دەستیان بە شایی و دیلان کرد، دەنگی سترانی گۆرانی بێژەکانیان گەیشتە ئەستێرەکان. لێ ئەوان ئێستا دەڕۆن، ئەو شتانەیان؛ دەنگ، بیرەوەری و هەبوونی خۆیان، هەر هەمووی بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن.

لە ماڵەکانەوە هێشتا بۆنی دووکەڵ و دوومانی کوانوو و تەنوورییان دەگاتە ئەوان. هەنووکەش پشیلە، سەگ، مریشک، کەڵەشێرەکانیان لە ناو خانووە بێ دەرەتانەکاندا، تەمبەڵ و تەوەزل دەگەڕێن. هەندێکیان بە ئارامی دەگرین، هەندێکیش؛ شەرمۆک و بێدەنگ؛ پەژارەیەکی قووڵ دەکێشن و بۆ دواجار بۆ گوند دەڕوانن.

گەڕانەوە؟ ڕۆشتنی ئەم تاریکە شەوە گەڕانەوەیەکی هەیە؟ ئەوان کەی دەگەڕێنەوە بۆ ماڵ و شوێنی خۆیان، بۆ ڕۆح و ژیان و تەمەنی خۆیان؟

کاتێک بێگانە ڕۆشتن. بەڵێ ئەوکات ئەمان دەگەڕێنەوە سەر ماڵ و خاکی خۆیان. دیسان خۆشی و شادی دێننەوە گوند، دیسان ئاگری ئاگردانەکان دەگەشێننەوە. دیسان شەوان بە هاواری ئەمان جەستەی بێدەنگ و بێ ترووسکاییان دەکەوێتەوە هاوار. تیانە و مەنجەڵیان دیسان لە سەر ئاگر دەکوڵێنن، دووکەڵ دەگاتە سەر چیاکان، دەگاتە ئاسمان.

بێگانە دەڕۆن. ئەوان لەم وڵاتە کەندەڵان و بەردەڵانە کە لە جیهان و چاخی دییەوە دوورە چی دەکەن؟ ئەوان دەڕۆن. ئەمڕۆ نەبوو، سبەینێ، سبەی نەبوو دوو سبەی، سێ سبەی. ڕۆژێک زووتر یان درەنگتر، دەڕۆنەوە بۆ شارە مەزنەکەی خۆیان، دەچنەوە ماڵە گەرمە ئاپارتمانییەکانیان. ئەوان دەچنەوە لای خۆشەویستە نازدارەکانی خۆیان. مەگەر بێگانەکان یار و ئەویندارییان نییە؟ مەگەر ئەوان یار، ئەوین، ئەشق و خۆشەویستیان ناوێ؟ ئەوان دەڕۆن. کۆچەر لەم باوەڕەدان.

ئەوان هیوایان ئەمەیە و ئەمە بە ئاوات دەخوازن.

کۆچی گوند دەڕوا. ئەوان بە خاک و زەوی و زاری خۆیاندا تێپەڕ دەبن. بۆنی خاکی تەڕ لە زەوی هەڵدەستێ. تاوەکو ئەم پاییزەش لە سەر خاکی خۆیان بوون، زەوییان کێڵا، خەرمانیان داگرتەوە، ژێرخان و عەمباری ماڵەکانیان بە زەخیرەی زستان پڕ کرد، بەڵام ئێستا زەوی و

زار، زەخیرە و خواردنەکانی زستانیان بەجێ دەهێڵن.

باران دەبارێ؛ هەم دەر و دەشت تەڕ دەکات و هەم دونیا دەشوات و خاوێنی دەکاتەوە. ئەگەر مرۆڤ دەنگی دووری هەندێک ئاژەڵ و لوورەی چەقەڵ نەیەنێتە ئەژمار، تەنیا دەنگی باران هاوڕێیەتی دەنگی پێی ئەوان و ئاژەڵەکانیان دەکات. تاریکە، شەوەزەنگە. ئەو ئاسمانەی بەردەوام زۆر جوامێرانە ڕووناکی دەڕژاندە [سەریان]، ئەمشەو لە ئامێزی تاریکیدایە. ئەوان چاوەڕوانی شەوێکی وەها بوون بۆ کۆچ و ڕەو. شەوی ڕەو دەبوو تاریک بێت؛ کەس پێیانی نەدەزانی، کەس نەیانی دەدیت، لێ ئەگەر کەسێکیش بیانیدیبا؛ دەیانتوانی خۆیان لە پێش چاو ون بکەن. چیا، چیای ئەوان بوو، ئەمانیش بەقەد ورچ، گورگ و ڕێویی ئەم کەژانە شاخەکانیان دەناسی و ئاگاداری هەواڵەکانی بوون. بەڵام باران، بارانی ڕەحمەت پێش بینی نەکرابوو. شەوی تاریک بە بارانەوە هات. چارەیەک نەبوو، کات بۆ ئەوان درەنگ بوو. دەبوو بەڕێ بکەون.

باران؛ خاوێنی، شوشتنەوەی هەموو جۆرە ناپاکییەک، ڕەحمەت، بەرەکەت، نەرمییەکی تایبەت. باران؛ لە دڵۆپەکانیدا ڕووناکی، کۆڵکە زێڕینەی ڕۆشن. تۆوی ژیان. دایکی ژیانەکان. باران جۆگە و جۆبارەکانیان پڕ ئاو دەکات. پشتی شاخ و کێوەکانیان دەشێلێ. ڕەحمەت دەخاتە زگی خاک و شیو و دۆڵەکان. باران هاوڕێیەتیی ئەوان دەکات. لە کەند و کۆسپ، لە بۆسە و کەمین دەیانپارێزێ. باران بۆنێکی تازەی تایبەت دەداتە خاک و هەوا. بۆنی خاک، دار و بەرد، پووش و پەڵاش، گژو گیا، پەیین و پشکەڵی ئاژەڵان لە دەور و بەر هەڵدەستێ. لە ژێر باراندا ئەوان ئاوایی بەجێ دەهێڵن، حەوش و گەوڕ، ئاخوڕ و لەوەڕ، زەوی و زارێک کە تۆویان تێدا دەچاند و سونبول*یان لێ هەڵدەگرت، باخچە و ڕەزێک کە ترێیان لێ دەخوارد، بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن، ڕێگەیان درێژە.

---

* گوڵەگەنم.

سەرەتا بە دوو ڕێچکەی درێژ و خزی نێوان چیاکاندا تێدەپەڕن، دواتر هەڵدەکشنە سەر چیایەکی بەرز و بڵند و پاشانیش بەرەو ژێر دەبنەوە ناو دۆڵێکی بێ بن. ئەوان دادەگەڕێن و دادەگەڕێن تا بگەنە ئەو جێگەی دیارییان کردووە بۆ خۆیان.

باران دەبارێ، بای دێ، شەو دەڕوا و ئەوان لە وڵاتی خۆیان دادەبڕێن و دەڕۆن. ڕێگە دیار نییە، تەنگە، نییە، پڕی بەردە، ئاستەنگ، دڕوو و دڕک و داڵە، خیزەڵانە، بەردەڵانە، ڕێگە دژوارە، درێژە؛ ئاڵۆزکاو و تێکچڕژاوە، کلۆبەردە، گاشەبەردە، دوای گاشەبەرد، تەپۆڵکە، دوای تەپۆڵکە گرد، لە دوای گرد بەرزی، لە دوای بەرزی بەردەڵان بە بەردەڵان، چاڵ لە دوای چاڵ، دارو دەوەن دوای دار و دەوەن، جۆگە و ڕووبار دوای جۆگە و ڕووبار دێتە [سەر ڕێیان]. هەندێک ڕێوی و چەقەڵ و گورگ دەلوورێنن، چەند باڵندە بەردەوام لە دەر و دەشت دەجریوێنن. کوندەبوو دەخوێنن، کوندەبوو دەبنە هاوڕێی کۆچەرانی شەوی تاریک.

شوکری خودا کە بارگین و قاتریان هەیە. ڕێناس و قارەمانی هەرە ژیری ئەوان بارگین و هێسترن. بارگین و هیستر ڕێگە دەکەنەوە، ڕێگەیان بۆ ڕاست دەکەنەوە و ئەوان لە هەڵخلیسکان و بەربوونەوە بۆ ناو شیو و دۆڵەکان ڕزگار دەکەن. هەندێک لەوان پیر و بەساڵاچوو، ماندوو دەبن. هەناسەیان سوار دەبێ، ژن و پیرەژن، بێدەنگ دەگرین و سترانی کۆچ و دابڕانی خەمگین، بێدەنگ دەڵێنەوە، جەنگاوەر، عەگید* و لاو لەگەڵ سەگ و تاژییەکان، لە نێوان ڕیزەکاندا دێن و دەچن، جارێک ڕوو لە پێش، جارێک ڕوو لە دوا. لاو و پیاو جار جارە هاریکاریی سوارەکان دەکەن لە سوار بوون و دابەزیندا. لە ناو بۆنی تێکچڕژاوی شەودا، کاروان بە گرانی دەڕوا.

مژ و دوومانێکی تەنک، ئارام ئارام بەرەو خوار دەبێتەوە. چاوی

---

* قارەمان.

ماندوو و بێخەم، بەردەمی خۆی نابینێ. کاروان درێژە. مەڕ هەیە، دەوار هەیە. پیر و بەساڵاچوو هەن، منداڵ هەن، ژن هەیە و ئەوان دەبێ پێش ئەوەی تیریژی هەتاوی ڕۆژێکی نوێ هەڵبێت، بگەنە پەناگەی خۆیان. چەند کاوڕ و شەک* لە شیوەکان بەردەبنەوە. جوانوویەکی تاقانەی خۆش ڕەو و ئەسپێکی کەحێڵ، ئیدی توانای ڕۆشتنیان نەماوە. سم و قولاپەیان شەلاڵی خوێنە. چەند زارۆک دەکۆخن و دەلەرزن.، بۆ ئەوان ساردە، کڵاو و جل و بەرگی بەن و ڕێسراو بەشی با و باران ناکات. چی پێویستە؟ لە سەر لووتکەی شاخێکی بەرز، لە سەر گاشە بەردێکی نیوە وشک ڕادەوەستن. ئیدی لێرە بە دواوە ڕێگەیان بەرەو خوارە، بەڵام ڕێگە تەنگەبەر و درێژە، زۆر تەسک و لە لایەک هەڵدێرە. هەنگاوێکی هەڵە مەرگە، سوار دادەبەزن، دایک شیر دەدەنە منداڵی شیرەخۆر و بەرمەمکان. پیر و لاویش لە تووتنێکی تازە کە بۆنێکی خۆشی لێدێ جگەرەیەک دەپێچنەوە. هەندێک جەنگاوەریش لە سەر ڕاخەرە ئەستوورەکانیان ڕادەکشن و دەحەسێنەوە. شوان و گاوان چارۆکەی نان، پەنیر، تۆراخ و سەوزەی خۆیان دەکەنەوە. سەرۆک عەشیرە، ڕیش سپی، پیاوی بەئەزموون و ڕێناس کۆ دەبنەوە و دەست بە ڕاوێژ دەکەن؛ چی پێویستە؟ گەڕانەوە ڕوو نادات، هەرگیز. پەلە کردن ناکرێ، ڕێگە ناهێڵێ. بەجێ هێشتنی هەندێ شت، پەز و دەواریش ناکرێ. زستانێکی درێژیان لە پێشە، داهاتوویەکی نادیارو نائاشنا لە پێشیانە، بێگانە لە دوویانن. ئەو کات؟ ئەو کات دەبێ ببنە دوو بەش. بەشێکیان دەبێ بە زووترین کات بگەنە جێ، بەشێکیش بکەوێتە دوای ئەوان.

ڕیزەکان دووبارە پێک دێنەوە. پیر و بەساڵاچوو، ژن و منداڵ، نەخۆش و ناساخ، سواری ئەسپ و مایین لەگەڵ چەند عەگید و جەنگاوەر بەڕێ دەکەون. ئەوان شتی زۆر پێویستیش لەگەڵ خۆیان دەبەن. ڕیزی

* بەرخی نێر و مێ.

دووهەمیش دەکەوێتە شوێن ئەوان. ئەوان دەڕۆن، بەرەو دۆڵ و شیوی قووڵ دادەگەڕێن.

شەو دەڕوا. کات دەڕوا. لە دوای ڕێپێوانێکی درێژی تەواوی شەو، لە دوای پێوانی گرد، شاخ و چیای سەرکەش، خەرەندی قووڵ و شیوی تەنگ، ڕیزی پێشەوە لە سپێدەدا، کاتێ دونیا و سرووشت بەخەبەر دێن، دەگەنە جێگەی خۆیان. دوای چەن ساتێک کە تیرێژی خۆر دەگاتە پشت و پاڵی چیا و داران، ڕێزی دووهەمیش دێت. باران ڕاوەستاوە، دونیا ڕووناکە، تیرێژ شەوق دەداتەوە، لە بەختی باش ئیدی با نایەت. ئەوان ماندوون، ئیستا تینوون، برسین، کوڵمەکانیان سوور هەڵگەڕاوە، لێویان قڵەشی بردووە، گەروویان وشکە، دەمیان تاڵە. ئیدی دەست و پێیان هیچ ناگرێ. جل و بەرگ، پۆستاڵ و پێڵاوەکانیان دڕاوە، تەقیوە، کون بووە، جل و بەرگی ڕەنگینی ژنان، کڵاو و سەرپێچ، شاڵ و چەکمەی پیاوان تەڕ بوون و لە دەرەلنگیانەوە دڵۆپە ئاوی شەوی ڕابردوو دەڕژێتە خوار.

بەڵام نابێ بوەستن، دەبێ بە زووترین کات دابمەزرن و جێبەجێ ببن. ناکرێ بێتەدبیر بمێننەوە. دوای حەسانەوەیەکی کورت، بارەکانیان دەکەنەوە، منداڵەکانیان لە ئامێز دەگرن، پەز و حەیوانەکانیان تاقەت دەکەن، چەند کەسێکیان ئەسپ و حەیوانەکان دەبەنە سەر ئاو و لەوەڕ و دواتریش، سەیرێکی دەور و بەریان دەکەن. ئەوان لە بنەوەی دۆڵێکی یەکجار قووڵ و درێژدان. هەر دوو لایان بە شاخ و چیای بەرز و بڵند داڵدە دراوە. پشت و داوێنی چیا دار و بەردە. گەلێک لە دار و دارستانەکە ڕووتە، گەڵاکانی وەریوە. دار کراسی بەهار و هاوینیان لە بەر داکەندووە. بەڵام هەندێک شوێنی لووتکەی چیا و کەلێنی خەرەند شینایییەکی تۆخ، ڕەنگێکی تایبەت دەداتە دەر و دەشت؛ داری چەم کە هەمیشە خۆیان لە هات و چووی ڕۆژگار پاراستووە، دەر و دەشت دەنەخشێنن: زیندوو،

سەربڵند، بە باڵایەکی شۆخ و جوان و ڕەنگینی مەیلەوە سەوز.

ئاسمان دووری کۆچەرانە، ئەوان دەبێ سەرهەڵبڕن تاوەکوو بتوانن لە نێوانی چیاوە ئاسمانی ساف و زوڵاڵی ئەم بەیانییە ببینن. ئاسمان ساماڵە، تەنیا دوو پەڵە هەوری بچووک بە ڕەنگێکی خۆڵەمێشی بە ئاسمانەوەیە.

لە بەر دەمیان لە نێوانی شیوەکەدا، ڕووبارێک دەڕوا. ڕێچکەیەکی تەنگ لە زگی زنجیرە چیاکاندا کراوەتەوە. ڕووباریش لە سەردا لە زگی شیودایە. ڕووبار سەرتاسەری دۆڵ دەبڕێ. چەم دەڕوا، وەک لافاو نا، بەڵام بە هاریکاریی بارانەکەی دوێنێ شەو، خوڕ دەڕوات. لەگەڵ ئەوەش ئاو ڕۆشنە، ئەوەندە ڕۆشن و ساف کە کۆچەر دەتوانن بێچووە ماسی و زیخ و چێوی بن ئاوەکە ببینن. هەر دوو کەناری چەمەکە تاشە بەردی بەرز و بڵندە. لە ناو چەم هەندێک درز دەکرێنەوە و تیشکی بچووک لێرە و لەوێ پێک دێن. لەو کەنارەی کە ئەوان بارەکانیان دادەنێن، لە بەر پێی خەرەندەکە ئەشکەوت و موغارەی لێیە. دۆڵ پڕی ئەشکەوتە. ئەوان لێرە لە ناو ئەم ئەشکەوتانەدا جێگیر دەبن. تاوەکوو بیانی بڕۆن و ئەمانیش بچنەوە گوندەکەیان، ئیدی لەمڕۆ بەدواوە؛ ماڵ، شوێن و وڵاتی ئەوان ئێرەیە.

لە لای ڕۆژهەڵاتی شیوەکەوە، هەتاو وەک سینییەکی سوور هەڵدێ، تیرێژەکەی لە سەر چیاکان لە سەر ئاوی زوڵاڵی چەم و داری چەم دەدرەوشێتەوە. ڕووناکی و شەوقێکی بێ هاوتای وەها کە لە چیرۆک و ئەفسانەکاندا هەیە، ئەمڕۆ بەخێرهاتنی ئەوان دەکات. دەر و دەشت تەڕ، ڕۆشن، زوڵاڵ و ئارامە.

ئەوان گەیشتنە جێگەی خۆیان. گەیشتنە بەهەشتێکی شاراوەی دڵی چیا سەرکەشەکان. لەوان زیاتر کێی دی بتوانێ خۆی بگەیەنێتە ئەو شوێنانە؟ کێ دەتوانێ ئەوان لێرە، لە ناو ئەو بەرد، گرد، چیا، شاخ،

دار و دارستانەدا ببینێ؟ بەڵام ئەوان دەتوانن خۆیان بگەیەننە هەموو شوێنێک. ئەوان بەڵەدی هەموو ڕێگە و شاڕێگە*، هەڵدێر و خەرەند، حاڵ و هەواڵی وڵاتەکەیانن، هەر کاتێک بیانهەوێ دەتوانن وەک پەلەوەری درندەی ئەم وڵاتە لە ناو شاخ و چیادا بفڕن و بێن و بچن.

سەرۆک عەشیرە و ڕیش سپیەکانیان بە بزە و سەرفەرازییەوە لە یەک دەڕوانن. ئەوان ئەم شوێنەیان دەسنیشان کردبوو. ئەوان سەرکەوتوو بوون، بێ قەزا و بەڵا، بێ ئەوەی خوێن لە قامکی کەسێکەوە بێت، گوندیان هێناوەتە ئەم بەهەشتە شاراوە. پێویستە بە زووترین کات جێگیر بن، وەک ئەو کات و ساتانەی لە گوند لە ژوورە بچووک و تاریکەکانیان دادەنیشتن، دەبێ لە ناو ئەشکەوت دانیشن و ژیانی ڕۆژانەیان دەست پێبکەنەوە. وەک پێشوو، وەک ئەوەی لە هەزاران ساڵ پێش ئێستاوە ئەنجامیان داوە. پیاو و لاو، بارەکان هەڵدەگرن و دەیبەنە بەر دەرگای ئەشکەوتی مەزن. سەرۆک عەشیرە، بیرمەند، چەند پیاوی ڕیش سپی، گۆرانی بێژ، دارتاش و چەند کەسی دی دەکەونە ناو ئەشکەوتەکان و دەگەڕێن. ئەشکەوت، موغارە، چاڵ، قوڵکە، درز و قڵەش گەلێکن. ئەوان لە کوێ و چۆن جێگیر بن؟ لە دەرەوەی ئەشکەوتەکاندا، لە سەرەوە ئەشکەوتێکی ئێجگار گەورە، درێژ و قووڵ هەیە. ئەشکەوتەکە زۆر لە ئاوەکەش نزیکە. دەرگای ئەشکەوتەکە زۆر گەورە و ڕووناکە، ئەم ئەشکەوتە نەک بۆ گوندێک بەڵکوو بەشی دە گوندیش دەکات. پاش ئەوەی سەیری هەموو لایەک دەکەن و بیر و ڕای یەک وەردەگرن و دەکەونە ڕاوێژەوە بڕیار دەدەن: ئەم ئەشکەوتە گەورە دەبێتە شوێنی مانەوەیان. لە باتیی ئەوەی کەل و پەلەکانیان لە ناو ئەشکەوت، کەپر و چەپەر و کەژەکاندا، بڵاو و پەڕاگەندە بکەن، وا باشترە لە لای یەک بن. زستان و چلە بەڕێوەیە. جانەوەری درندەی کێوی، ورچ، پڵنگ،

* ڕێگەی سەرەکی.

گورگ، کەمتیار و بەراز هەن. سام و مەترسیی بیانییەکان هەیە. بەڵێ ئاوا زۆر باشترە، ئەشکەوتی مەزن بە گوێرەی خۆیان ڕێک و پێک بکەن و لێرە بژین.

بڕیارەکەیان وەهایە، ئەم بڕیارە دەبێتە یەکەم هەڵە و غەڵەتییان.

ئەشکەوت قووڵ، تاریک و درێژە؛ ساردە، ترسناکە. چەند هەنگاوێک دوورتر لە دەرگای ئەشکەوت جێ کوانوویەک هەیە، هەندێک خۆڵەمێش و چەند ئێزنگی ڕەشی نیوە سووتاوی تێدایە. بێگومان ماسیگر، ڕاوچی و نێچیرڤان هاتوون و لەم ئەشکەوتە ماونەتەوە. لە ئەشکەوتەوە بۆنێکی گەنیو، بۆنی خاک، بۆنی پووش وپەڵاش، کەڕوو، ئارەقە و میز دێ. ئەوان ئەم بۆنە دەگۆڕن بە بۆنی گەرمی ئینسان.

ئەوان دەست پێدەکەن؛ زەویی ئەشکەوت تەخت دەکەن، لقی داران، دەسەک*، پووش، گژو گیا و لە سەر ئەوانەش ڕاخەرەکانیان ڕادەخەن. بۆ ماڵ و خێزانەکان و بە هاوکاریی بەردی ڕەش، دیوار و ستوون لە نێواندا ساز دەکەن. لە بەر دەرگای ئەشکەوت کوانوویەک، ئاگردانێک و چێشتخانەیەک ساز دەکەن؛ هەندێک شوێن لە دیواری ئەشکەوتەکە سواخ دەدەن؛ لە دەرگای ئەشکەوت بەرهەیوانێکی درێژ ساز دەکەن و گلێمە و قاڵی و دۆشەکی خۆیان ڕادەخەن.

ئاگرێکی گوڕ پێدەخەن. ئاگرێک کە قەت نەکوژێتەوە، جارێک بە ئێزنگ گوڕتر دەبێت و ڕووناکی دەڕژێنێت بە سەر ئەشکەوتدا. جارێکیش لە ژێر ژیلەمۆی بەری بەیاندا، پاسەوانی خەوی قووڵ دەکات و بە هیوای گەشانەوە دەبێت. ئەوان، کۆچەر و دەرکەوتووانی وڵاتی خۆیان دەتوانن، لە ئەشکەوتێکی قووڵی بنی خەرەندێکی وڵاتدا لە تەنیشت ئاگری بەتین زۆر زیاتر لێک نزیک ببنەوە، زۆر زیاتر دەنگی ناڵین و ئاخ هەڵکێشان، زۆر پتر خەون و خەیاڵەکانیان بگەنە یەک، زۆر زێدەتر ژیانی ناچارییان

* داری ڕاست و بێ گرێ.

ببێتە یەک کە ئیدی کەس نەتوانێ لێکیان بکات.

و زۆر زیاتر چارەنووسیان دەبێتە یەک.

ئاویان هەیە، نانیان هەیە، پەز و دەواریان هەیە، لە دەور و پشتیان ماسی، ئاسک و غەزاڵ، کەو و باڵندە، دار و دارەبەریان هەیە، ئەوان لێرە دەژین. لە ژێر باڵی ئەم چەمەی کە لە دڵی هەڵدێرەکاندا مانۆڕ دەدات و خۆ نمایش دەکات و ڕادەکشێ و بە ڕەنگی ساف و زوڵاڵ و ڕۆشنی بەردەوام تراویلکە درووست دەکات. ئێرە، ئەو چیایانەی بەردەوام لە دڵی یەکدان، لە پشتی یەک، بەرەو ئاسمان هەڵدەکشێن، ئەو هەڵدێر و دۆڵە بێ بنانەی کە بە دەنگی چۆلەکەیەکی بچووکیش دەنگ دەداتەوە. داری بەرزی سپیندار و بی بە ڕەنگی خۆڵەمێشی وەک تاڵی سپی قژێکی گەش، ڕەنگێکی کەونارا لە ڕەنگەکان زیاد دەکەن. ئەو باڵدار و باڵندانەی کە بەردەوام دەجریوێنن، ئەو سرووشتە وەحشییە، ترسناک و ڕەنگینە، بەڵێ ئەو شوێنە دەبێتە وڵاتی ئەوان.

ڕۆژان و شەوانیان، هەستان و دانیشتنیان ئاوا دەست پێدەکات. جارجارە مشتێک تیرێژی هەتاوی بەربانگ، لە بەر دەرگای ئەشکەت، بە ڕوخساریانەوە شەوق دەداتەوە. جارجارەش شنەی فێنکی بەیانییان دەیانتەزێنێ. جاری واش هەیە دڵۆپی بارانی بە لێزمەی پاش نیوەڕوان لە قژ و سمێڵی بۆزی پیاوانیانەوە بەر دەبێتەوە، هەندێک جار مەغریبی سووری ئێواران دەیانهێنێتە بەر گریان، جارێک ئەستێرەی شەوان دەبنە هەواڵ و گوێگری سترانەکانیان، گەلێک جاریش هەتاوێکی نە زۆر گەرم ڕەنگی ئەسمەری ڕوخساریان بەرەو ڕەنگێکی قاوەیی تۆخ و تاریک دەبات.

ڕۆژان دەڕۆن، شەوان دەڕۆن، هەفتە تێدەپەڕن، مانگ ڕادەبرن، سەرەتا باران دەبارێ، بێ وەستان، بێ ڕاوەستان. ساردە، بۆرانە. دواتریش بەفر دەست پێدەکات. سەرەتا ئارام، کەم، وەک ئاردە دار، دواتر هەر

کلوویەکی بەقەد گوێزێک، مەزن، قایم و قورس، کە دەکەوێتە سەر زەوی، ئیتر ناجمێ. ڕەنگی سپی دەر و دەشت دادەپۆشێ. بەفر ڕاخەرێکی خۆڵەمێشی و سپی ڕادەخاتە سەر جەستەی دەشت و دەر و سرووشت دەکاتە بووکێکی جوانی ڕازاوەی سپی پۆش. بەفر؛ لە دڵی وڵاتی چیا سەرکەشەکانی ناو جیهانی کەونارای چیرۆکەکان، تروسکەی ڕووناکی سەر ئاو و لافاوان، تاجی ڕۆژگاری تەنیایی، بێچارەیی و ترسنۆکی، حەشارگەی ڕۆحی دوودڵ و بێچارە، و کراسی سپیی خەونەکانیان، خەونەکانی ئەوان.

و ئەوان لە ئەشکەوت و موغارەی خۆیاندان، لە لایەک، دیوار بە دیوار، ڕوو بە ڕوو، چاویان دەبەستری، خەویان لێ دەکەوێ، چاویان دەکرێتەوە، لە خەو ڕادەبن. لە تاریکیی ئەشکەوتدا دەلەرزن، لە تاریکیی شەودا ڕادەچڵەکن. کەم دەخۆن، کەم دەخۆنەوە، کەم خۆیان دەشۆرن، کەم دەپەیڤن، کەم دەچنە سەرئاو، جگە لە منداڵ و پیر و بەساڵاچوو کەمتر لە یەک دەڕوانن. ئەوان لە جیهان، لە جیهانێکی نائاشنا و فەرامۆش کراودا دەژین. کێ ئاگای لەمانە؟ گوند و خەڵک و عەشیرەی دەر و جیران چییان بەسەر هاتووە؟ گوندەکەیان چی لێهاتووە؟ ئێستا کێ ئەوانی بیر دەکەوێتەوە و ناویان بانگ دەکات؟ کێ هەیە خەمی ئەمانی ببێت و بیر لە خۆیان و چارەنووسیان بکاتەوە؟ بیانی ئێستا لە کوێن و چ دەکەن؟ بیانی چییان لەمان دەوێ؟ بێگانە... پێشتریش ئەمان گوێیان لێ بوو کە وڵاتەکەیان پارچەیەکی وڵاتێکی مەزنترە، وڵاتەکەیان بندەستی بێگانەکان بووە، بێگانە لە وڵاتی ئەمان بوونەتە دەسەڵاتدار. بەڵام ئەمان دوور لە بێگانە و بێگانەش لەمان دوور بوون، لە ئەستێرەکانی ئاسمانیش دوورتر. ئەوان نە بێگانەیەکیان دیبوو، نە جەندەرمە و سەربازێک. لە ناو چیاکانی خۆیان لە گوندی خۆیان، لە حاڵی خۆیاندا دەژیان. لێ لە دوو ساڵ پێشتر بەملاوە بیانی هاتبوونە سەریان، لە ناکاو و دواتر هێدی هێدی، قورس، قورس.

نها ئەوان لە ئەشکەوتدا بەسەر دەبەن؛ لەگەڵ دەنگی گۆرانیبێژ ڕۆشنایی ئەستێرەکان دەگەیەنە ڕووناکیی هەتاوی بەیانان. لەگەڵ دەنگی چیرۆکبێژان شەوانی درێژی زستان لە دوای یەک ڕیز دەکەن و بەسەر دەبن.

قسە و ئاخاوتنیان کەمە، پەیڤ و وتەیان کەمە، بەڵام گۆرانیبێژ ستران دەچڕن، چیرۆکبێژان چیرۆک دەگێڕنەوە، ئەوان نا، بەڵام گۆرانیبێژ و چیرۆکبێژەکانیان، مامۆستای گوتنن؛ کە خاوەنی بە سەدان و هەزاران ستران و چیرۆکی ئەوان دەربارەی ناچاری؛ بێچارەیی، تەنیایی، پەژارەی قووڵ و ئەویننداری؛ کە بە ئاواز و ئاهەنگی گوتنی زۆر کۆنی دیرۆکی، شەوانی تاریک و چارەنووسی ڕەشیان دەنەخشێنن؛ کە بەیتی باڵکێش و ڕیز ڕۆحی خەمباریان بە ڕەنگی کەونارا دەخەملێنن. ڕۆژانە ڕاو و نێچیر؛ تەڵە، داو و کەمین دانان، شەوانە ستران و داستان وتن. ڕۆژانە ڕووناکیی بەفر، هەتاو و بۆران، بە شەو گەرمای گێڕانەوەی بەسەرهات و پەندی باو و باپیران، چارەنووسی کەونارایان. ستران، بەسەرهات و گێڕانەوەی تەنیشت ئاگری بەتینی ئێزنگ کە دڵ دێنێتە جۆش، بێکۆتایین. هەروەک چەمەکەی بەردەم ئەشکەوتەکەیان. هەروەک ژیانیان لە ئەشکەوتەکە، کاتەکەیان لە بنی دۆڵ و هەڵدێران. لە کات و زەمەنی بێکۆتاییاندا چاوەڕوانن؛ چاویان لە دەرگای ئەشکەوتە، لە چەم، لە بناری چیا، لە خۆرەتاوی چیاکان، لە دار و دارستانەکان، لە لووتکەی چیاکان، لە ئاسمان، ئەوان بەردەوام چاوەڕوانن. لەو ئەشکەوتەی کە بە هەڵم و بۆنی جەستەیان گەرمی دەکەن، چاوەڕوانن بگەڕێنەوە کوخەکانی خۆیان لە گوند، بگەڕێنەوە سەر زەوی و زاریان، باخ و باخچەکانیان.

لە بەرەبەیانی ڕۆژێکدا، کاتێک پیاوێکی لاو، کەمێک دوورتر لە ئەشکەوت، چووە ئاودەست، لە چاڵ و قوڵکەکاندا گیایەکی تازە پشکووتوو دەبینێ. گیا شین بووە؛ بەهار بەڕێوەیە، گەرمی، گەشی

و وشـیاری، بەخەبەرهاتنـەوە لـە ڕێیـە. تیریـژی هەتـاو کەپەنکـی سـپیی بەفـر دەفڕێنـی، بەفـر ئـارام ئـارام دەتوێتـەوە و دەچێتـەوە، بـاران دەبـارێ، خۆناوکـەی وەرزی گەرمـا دەبـارێ. ئـاو و لافـاو هەڵدەسـتن و تـەزوو و سـەرما و دار و پـووش و پەڵاشـی وشـک دەداتـە بـەر و دەیبـا. ڕەگ و ڕیشـەی دار و درەخـت دەژییەتـەوە، دار کراسـێکی نوێـی شـین لـە بـەر دەکات. گـەڵا شـین دەبـن، شـکۆفە و چـرۆ دەپشـکوێن، و ڕۆژێکیـش کاتێـک کچـەکان جـەڕە و گـۆزە بەدەسـت دەچنـە سـەر چـەم، دەسـتەیەک باڵنـدەی خۆڵەمێشـی و بەڵـەک لـە بـەر ئاوەکـە هەڵدەفـڕن، باڵنـدەی کۆچـەر وەک کۆچبـەر هاتـوون. چەم هەسـتاوە، دەڕوا، بێدەنگـی و خـەم و کەسـەری چەندیـن مانـگ بەجـێ دەمێنـێ. چـەم، ماسـیی پشـت بەڵـەک لـە ناویـدا بـە کایـە، بەجـۆش و خـرۆش، بـە هاژەهـاژ، بەڕەنگێکـی کەمێـک سـپی، دڵـی شـیو دەقڵەشـێنێ و بـەرەو خـوار، بـەرەو ڕووناکـی دەڕوا. ئـەو چەمـەی بـە مانـگان بـێ جمـە و بـێ بـزاڤ بـوو، ئێسـتا بۆتـە کانـی ژیـان، لـە ژێـر تیشـکی مەیلـەو سـووری هەتـاودا بۆتـە سـەرچاوەی ڕەنگامـەی ژیـان.

ژیـان گەڕاوەتـەوە بـۆ کۆچبـەران، ئەوانیـش ئیـدی دەبـێ بگەڕێنـەوە بـۆ ژیـان. دەسـتەیەک لـە گەنـج و لاو پێـک دێـت. لاوان جـل و بـەرگ و پێـڵاوی خۆیـان تونـد دەبەسـتن، تفەنـگ و فیشـەکدان هەڵدەگـرن و بـەرەو لووتکـەی چیاکان هەڵدەکشـن. ئـەوان دەچنـەوە بـۆ گونـد، بزانـن لـە گونـد چ باسـە، هەواڵـی دونیـا بزانـن. پێدەچـێ بێگانـە لـەوێ نەمابێتـن و ڕۆشـتبێتن. لەوانەیە کاتـی گەڕانـەوە هاتبێـت. دوای چەنـد ڕۆژێـک دەسـتە بـێ کـەم و کـووڕی، هەندێـک مەنجـەڵ و شـتی پێویسـتیان سـواری پشـتی بارگینەکانیـان کـردووە و دەگەڕێنـەوە. کەسـیان نەدیـت، هیـچ جموجۆڵێکیـان نەبینـی، گونـدی دەور و بەریـش هەموویـان چۆڵـن، تووشـی کـەس نەهاتـن. بـەڵام وا دیـارە هەندێـک کـەس هاتوونەتـە گونـد. دەرگای ماڵـەکان کراوەتـەوە، سـندووقەکان شـکاون، لـە کوانووەکانـدا ئاگـر کراوەتـەوە، خـواردن سـاز کـراوە، زەخیـرەی

ناو کووپەکان کەم بوونەتەوە، کادێنەکان بەتاڵ کراون. بێگومان ئەو کەسانە بێگانە بوون. بەڵام ئەوان چ بێگانەیەکیان نەدیت، و بۆ ئەوەی کەس بیانبینێ، بەدزییەوە چوون و بەدزییەوە هاتنەوە.

ڕاستە کەس نەیبینیوون، بەڵام لاوێک لە دەستە کارێکی کردووە، پێش ئەوەی دەستە لە گوند بێتە دەرەوە، ئەو عەگیدە لە کەناری دیواری خانوویەک دادەنیشێ و دەست ئاو دەکات، دواتریش بە بەردێک خۆی پاک دەکاتەوە، هەڵدەستێتە سەر پێ، پانتۆڵەکەی هەڵدەکێشێ و دۆخینەکەی گرێ دەدا. لە کۆگای گەرمی پیساییەکەی کە هەڵمی لێ هەڵدەستێ دەڕوانێ و بۆ ئەوەی بە بەرد یان گەڵا و پووش و پەڵاش دایپۆشێ، سمێڵی با دەدا و بەڕێدەکەوێ و خۆی دەگەیەنێتە هاوڕێیانی... دەستە، عەگیدانی دەستە، یەک بە یەک باسی هاتن و چوونی خۆیان دەکەن، بەڵام لاوەکە ئەم کارە ناگێڕێتەوە، پێدەچێ بە پێویستی نەزانێ، پێدەچێ شەرم بکات.

ئاودەستی ئەم لاوە سمێڵ بادراوە دەبێتە دووهەمین هەڵەیان.

چی پێویستە؟ ئەوان دیسان کۆ دەبنەوە و ڕاوێژ دەکەن. گوێ لە یەک دەگرن، پێشکۆکەیان، فاڵ دەگرێتەوە، «ئەز ئەو باڵدار و باڵندە و پەڕەسێلکانەی کە ئەمساڵ زووتر هاتوون، دەبینم» فاڵبین وا دەڵێ. «کەروێشکی ئاوس دەبینم، هەڵۆ لە سەر چیا بڵندەکان دەبینم، دونیا لە شادی و خۆشیدایە، لە بەر گیا، گوڵ و خونچەی ڕەنگین، لە بەر بۆنی خۆش، دونیا هار بووە. ئەوەندە خۆشی، ئەوەندە جوانی، ئەوەندە دەلالی... نا، نا، بەختی ئێمە هەرگیز ئەوەندە ڕێک، ئەوەندە باش نەبووە... نا، ئێمە دەبێ بە تەدبیر بین» . و ئەوان بڕیارێکی نوێ دەدەن؛ ئەوان لە جێگای خۆیان بمێننەوە و چاوەدێر بن و بنوارن.

تاوەکوو ئێستا، بێ گلەیی و گازندە، بێدەنگ، ئەوان بە پێوە خۆیان لە بەر با و باران، بەفر و بۆران ڕاگرت. سەبر و خۆڕاگرییان

وەک چیاکانیان بوو؛ مەتین و لەسەرخۆ. لەو ڕۆژەوەی هاتوونەتە ئەم ئەشکەوتە، دوو پیرەمێرد و سێ پیرەژنیان مردوون. دوو لاوی گەنج بوون بە ژێر هەرەسی بەفرەوە و ون بوون. عەگیدێکیان لە خلیسکێن بەربۆوە و پشتی شکا. سێ منداڵ، دوو کچ و کوڕێک لە دایک بوون. هەرگیز دەنگیان دەرنەهات، سەریان نا بەیەکەوە و بیریان لە چارەنووسیان کردەوە، گوێیان لە دەنگی گۆرانیبێژ گرت و چاوەدێرییان کرد و ئێستاش دیسان هەر دەنواڕن.

و ڕۆژێک لە ڕۆژەکانی چاوەڕوانی، شتێک ڕوودەدات. ژیانی ڕۆژێکی نوێ بە تیشکی هەتاوی بەیان دەست پێدەکات. تیرێژ دیسان لە سەر ئاوی چەم دەبریقێتەوە. خۆشییەکی بێهاوتا، بە ڕەنگەکان، بە بۆنەکان، دەر و دەشت سەرخۆش دەکات. کچ و ژن بە جل و بەرگی ڕەنگینەوە، کراس، دەرپێ، جل و بەرگی خاوێن لە بن دەستیاندا، بەرەو چەم دەڕۆن. ئەوان وەک ئاسکێکی نازدار بە لەنجەو لار بە سەر بەردانددا هەڵدێن. وەک گلۆڵە بەفرێک بە نەرمی لە سەر چاڵ و قوڵکەکاندا دادەگەڕێن. ئەوان دەچن سەری خۆیان بشۆرن. تۆزێک دوورتر لە ئەشکەوت و لە حەشارگەیەکی بناری چیا، لە بەر چەم جلەکانیان دادەکەنن، بە کراسەکانیانەوە، خۆیان بە سابوون و ئاوی ساردی بەیانی، کە دەڵێی سەهۆڵە، دەشۆرن.

لێ لەو کاتەدا هەندێک دەنگ دێ، دەنگی سەیر، وەک دەنگی با و باهۆز و گەردەلوول، دەنگێک کە هاژە و گفەی دێ، دەنگێکی غەریب کە لە دەنگی دەر و دەشت ناچێ. لە باکوور، لە سەر چیاکان، دوو شتی ڕەش کە وەک هەڵۆ دەچن، دیارن. بەڵام ئەوانە زۆر لە هەڵۆ مەزنترن، قەڵەوترن. لە نێوان چیاوە بەرەو خوار دەفڕن، گەورەتر دەبن، ئەوانە چین، چ شتێکن، چ حەیوانێکی دڕندەن؟ ژن و کچ لەو شتە سەیرەی کە بەرەو ئەوان دێن دەڕوانن، پیاو و لاوەکانیش لە ئەشکەوت و بنە

بەرد و شیوەکان دێنە دەر و سەیری ئەو شتانە دەکەن. کەسیان لەو شتانەی نەدیوە، نەیبیستووە. ئەوان دەست لەو شتە باڵدارانە هەڵدێنن، کچ و ژن جل و بەرگی دەستیان بەرز دەکەنەوە و دەیشەکێنن. شتەکان لە بەرزایی چیا و دۆڵەکان بە سەر ئەواندا دەفڕن و دەڕۆن. بەڵام دیسان ئەمجار لای باشوورەوە دەگەڕێنەوە و بەسەریاندا دەفڕن. لەو کاتەدا بیرمەندێکیان پەی بە شتە باڵدارەکان دەبات؛ «فڕۆکە...» ئەو وا دەڵێ، «ئەوانە فڕۆکەن و هی بێگانەکانن... با نەمانبینن، زوو خۆ بشارنەوە... خۆ بدەنە لایەک...» لێ ئیدی درەنگە. فڕۆکە وەک هەڵۆ دووجار بەسەریاندا دەسووڕێنەوە، دەفڕن و دەڕۆن.

ئەو دەست ڕاوەشاندنە دەبێتە سێهەمین هەڵەیان.

ڕۆژێک بە سەر فڕینی فڕۆکەکاندا تێدەپەڕێت، لێ هیچ ڕوونادات. دوو ڕۆژ دەڕوات، سێ ڕۆژ، حەفتەیەک، دوو حەفتە، بەڵام هیچ نابێ، کەس دیار نیە. پاش حەفتەی سێهەم عەگیدی زێرەڤانی سەر گۆپکی شاخەکانی بەردەم شیوەکە، دەگەڕێنەوە، شوان پەزەکانیان دەبەن بۆ لەوەڕ، ڕاوچی دەچن بۆ ڕاو، گۆرانیبێژ لە بەردەمی چەمەکە تەمبوور دەژەنن و کچ و ژن دیسان دەچنە بەر ئاو و خۆیان دەشۆن. ژیان دیسان وەک پێشوو لە ژێر ئاسمانی ساف و زوڵاڵ و مانگ و ئەستێرەی ڕۆشندا بەردەوام دەکات. هەڵاڵە و سوێسن دەپشکوێن، گوڵ دەکرێنەوە و دار دەنەخشێن.

ئەوەندەی بیست ڕۆژی دی ژیان ئاوا بەردەوامە، بەڵام دوای بیست ڕۆژ دەگەنە ڕۆژی کۆتایی ژیانیان. دەتوانین بڵێین ڕۆژی کۆتایی ژیانیان ئاوەهایە؛ دونیا ئیدی تەواو گەرم بووە، ئیدی مێش هەنگوین لە دەوری ئەشکەوت دەفڕن، ماری جووت خۆیان ئەلقە دەکەن و خۆ دەدەنە بەر خۆرەتاوی هەتاوی گەرم. ڕۆژێکی نوێ بە ڕۆحێکی زیندوو و بە جوانی دەست پێدەکات. هەتاو بە ئارامی هەڵدێ. ژیان لە سەر ئاوی

چەم و خۆرەتاوی چیا شەوق دەداتەوە. ئەو ئاوەی بە تیشکی هەتاو دەدرەوشێتەوە و دەڕوا، شەوقی خۆی دەگەیەنێتە سەر خۆرەتاو و ناو دۆڵەکان. ڕۆژی کۆتایی بە جموجوڵی ڕەنگە سروشتییە زوڵاڵ و سافەکان دەست پێدەکات. جگە لە دەنگی سووکی ئاو و جریوە جریوەی خۆشی باڵندەکان دەنگێک نایە. ئاسمانی دوور و بڵند بە ڕەنگێکی سەوزی کاڵ دەدرەوشێ، هیچ هەورێک، هیچ باڵدارێک دیار نییە.

عەگیدێکی بەهێز و قەڵەو، باڵابەرز، سمێڵ بادراو، ڕانکەوچۆخەی ڕێسراوی ڕەنگین لە بەر، لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا دیارە. ئەوەندەی چەند خولەکێک لە دەور و بەری خۆی دەڕوانێ و پێدەکەنێ. ئەو بێدەنگی و ئارامییە، ئەو جوانییە، ئەو ڕازاوەییە، ئەو قەشەنگییە، ئەو خۆشییە کە خوێنی مرۆڤ دێنێتە جۆش، ئەو خاک و وڵاتە، ئەو سرووشتە دەست لێنەدراوە هەمووی هی ئەوە، هی ئەوانە. کەمێک خۆی کۆ دەکاتەوە، دۆخینەکەی گرێ دەدات و بە هەنگاوی قایم بەرەو خوار، بەرەو چەم دەڕوا. لە بەر چەم، لە سەر دوو بەرد هەڵدەتروشکێ و دەستی ڕاستی دەخاتە ئاوەکەوە، هەموو جەستەی دێتە لەرزین، دەستی دەتەزێ. ئاوەکە ئەوەندە فێنکە، ئەوەندە زوڵاڵە. لاو بە ئارامی بە هەر دوو دەست، دەم و چاو و پشت گەردنی دەشوات. هەڵدەستێتە سەر پێ، بە قۆڵی چۆخە و کراسەکەی ڕوخساری وشک دەکاتەوە و سمێڵی بادەدا. لەو کاتەدا دەنگی باڵندەیەک دێ، لاو سەری هەڵدێنی و بۆ ئاسمان دەڕوانێ، باڵندەیەکی بەڵەک، کەمێک دوور لە ئەم لە نێوان دارستان و چەمدا، دەفڕێ. باڵندە باڵ لێنادا، وەک ئەوەی بیهەوێ بە ئاراستەی ئارامی ئەم بەیانییە زێڕینەدا بفڕێ. باڵندە کەمێک بەرەو لای لاوەکە دەفڕێ. لاو دەنووک و چاوە بچووکەکانی باڵندە دەبینێ. بەڵێ باڵندەکە بازە. بازێکی بەڵەک کە خەمی نێچیرڤانەکان دەڕەوێنێتەوە. لاو پێدەکەنێ و دەگەڕێتەوە ڕوو لە ئەشکەوت تاکوو بچێتەوە بۆ ئەوێ.

بەڵام لەو کاتەدا دەنگی تەقەیەک دێت. لەو کاتەدا دەنگی تەقەیەک دەشت و دەر دەتەنێتەوە. لەو کاتەدا دەنگی تەقەیەکی جاربەجار، بە چەندین جار لە ناو دۆڵ، شاخ و چیاکاندا دەنگ دەداتەوە. لەگەڵ دەنگی تەقە، بێدەنگیی دەر و دەشت درزی تێدەکەوێت و لە ناکاو باڵدار و باڵندە دەفڕن و دوور دەکەونەوە. سووتانێکی وێرانکەر دەکەوێتە دەروونی لاو. سەرەتا لاو نازانێ ئەوە دەنگی چییە و لە کوێوە دێت. لاو، مات و پەشۆکاو لە دەور و بەری خۆی دەڕوانێ، لێ کەس نابینێ، جەستەی گەرم دادێ، قورس دەبێ، سووتانێک کە تا ئێستا نەیدیوە بە دڵیدا دەگەڕێ. شتێکی گەرم و تەڕێ لێ دەڕوا. دەستی دەبا بەرەو زگی، بەڵێ خوێنی لێ دەڕوا. هەوڵ دەدا. دەیهەوێ بە پەلە خۆی بگەیەنێتە ئەشکەوت، چەند هەنگاو هەڵدەگرێ، بەڵام جەستە قورسە، قورستر دەبێ. هەناسەی لە بەر دەبڕێ بە ئارامی لە سەر ئەژنۆی بەردەبێتەوە سەر زەوی. ئەوەندەی تۆزقاڵێک بە هەمان شێوە لە سەر ئەژنۆ دەمێنێتەوە، بە پەلە و قووڵ هەناسە هەڵدەکێشێ و دەیداتەوە. لە دار و درەخت دەڕوانێ، لە دەرگای ئەشکەوت دەڕوانێ. باز؟ باز دێتەوە یادی . چاوەکانی بۆ باز دەگەڕێن. دیسان هەوڵ دەدا، دەستی ڕاستی دادەنێتە سەر زەوی و بە هەموو توانای هەڵدەستێتە سەر پێ و بەرەو دەرگای ئەشکەوت دەبێتەوە. هەنگاوێک، دوو هەنگاو، سێ هەنگاو. هەر ئەوەندە. تەقەیەکی تر ئارامییەکە لەت دەکات. دوایی یەکێکی دی. و یەکی دی و لاو دەمەو ڕوو دەگلێتە زەوی. و ئیتر لە زەوی ڕا نابێ.

لەوکاتەدا چەند لاوی دی، بە ڕوانینێکی واق وڕماو، بە ڕوخساری کۆنی پڕکەسەر، تفەنگ بەدەست لە ئەشکەوت دەرئەپەڕن. سەیری دەور و بەریان دەکەن، قەت کەس دیار نیە، کەس نییە. کێ وەهای کرد؟ کێ، هاوڕێکەیان، براکەیان، لاوی وەک کێویانی، لە سەرەتای ئەم ڕۆژە ڕۆشنەدا گلاندە خاکی ڕەش؟ کێ؟ بۆچی؟

تفەنگەکانیان هەڵدەگرن، گوللەی دەخەنە بەر و لە دەور و بەر دەڕوانن. دووانیان بەرەو لای لاوی سەر خاک دەڕۆن. لێ پێش ئەوەی بگەنە لاوەکە، دیسان دەنگی تەقە هەڵدەستێ و لە چیاکان دەنگ دەداتەوە. ئەمجار بە پەلە، لە دوای یەک، پێکەوە، بێکەم و کورپی. ئەمجار دەنگی تەقەی فیشەکی موسەلسەل دەشت و دەر دەگرێ. عەگید یەکە بە یەکە دەکەون، بێ ئەوەی بتوانن دەست ببەن بۆ چەک و فیشەکێک بتەقێنن، لە کەناری ئەو ئاوەی دەبریقێتەوە و بە شەوق دانەوە ڕێ دەکات، ئێستا خوێن جارییە. لەو عەگیدانەی پەرش و بڵاو لە زەوی گلاون، خوێن جارییە، کەسانێکی دیش هەوڵ دەدن لە ئەشکەوت بێنە دەر. بەڵام هیچ دەرفەتیان نابێ. هەموو لە سەر یەک، وەک مریشکی بەکرێ لە ئەشکەوتدا گیرۆدە دەبن.

و ئەوان واتە بێگانە یەک بە یەک، ڕیز بە ڕێز، لە پشت دار، بەرد، بنار، تاشەبەرد، قوڵکە و سەنگەرەکانیانەوە دیارن. جلی سەربازیی سەوزی ڕۆشن و کاڵیان لە بەردایە، بە چەک، ڕەخت و فیشەکدان هێدی هێدی، ئەڵقەیەکی تەنگ بە دەوری ئەشکەوتدا درووست دەکەن. ئەوان بێ ئەژمار زۆرن. هەموو جێگەیەک هەر ئەوانن، بێگانەن. چەند ئەفسەر لە هەر دوو لای ئەشکەوت، هەندێک دوورتر لە ئەشکەوت، سەربازی بێ ژمارە بەڕێوە دەبەن. لە دەرگای ئەشکەوتەوە چەند فیشەک دەتەقن، هەر ئەوەندە، لەوە زیاتر، ئیتر هیچ دەنگێک نایە. بێگانە دەنگیان دەچنن، ناهێڵن ئەوان بێن بە خۆیاندا. لە هەموو لایەکەوە بێگانە دەرگای ئەشکەوت گوللەباران دەکەن. بێ وەستان، بێ ڕاوەستان، سەرەتا بە تفەنگ، دواتر بە ڕەشاش، دواتریش بە دوو تۆپی بچووک، جارجارە.

هەتاوەکوو نیوەڕۆ، تا ئەو کاتەی هەتاو دێتە سەر سەری ئەشکەوت و لەوێ ڕادەوەستێ و شەوقی خۆی وەک گلۆپێک دەخاتە دڵی چەم، تەقە بەردەوامە. لە ناوەوە لە ئەشکەوت دەنگێک نیە. وەک ئەوەی کە

**هەرگیــز نەژیابێتــن. نــە دەنگێــک، نــە هەرایــەک. نــە شــوێن پێییــەک. بــە تەنیـا چەنـد کەرسـتەی دارینـی یاریـی منـداڵان و چەنـد مافورێـک لـە بـەر دەرگای ئەشـکەوتەکە کـە ئێسـتا دووکەڵـی لـێ بـەرز دەبێتـەوە، هەواڵـی بوونـی ئەوانـی پێیـە لـەو شـوێنەدا.**

**پـاش نیـوەڕۆ لەشـکەر هێـدی هێـدی لـە هـەر دوولا ، بـەرەو دەرگای ئەشـکەوت دەبنـەوە، دار و چرپـی* کۆ دەکەنـەوە و ئاگـری دەدەن. دەرگای ئەشـکەوت لـە نـاو ئاگـر و دووکـەڵ و دوومانـدا دەمینێتـەوە.**

**پـووش، پـەلاش، دار، چرپـی، دەوەن و ئاگـر. پـووش، پـەلاش، دار، چرپـی، دەوەن و ئاگـر. و دووکـەڵ و دوومـان و جارجـارەش تەقـەی تـۆپ و ڕەشـاش.**

**ئـەو ئاگـرە گـوڕە کـە لـە لوولـەی ڕەشاشـە و تۆپـەکان دێتـە دەر... دوو تـۆپ کـە هەریـەک لـە لایەکـی دەرگای ئەشـکەوت، ئاگـر و مـەرگ و مـەرگ دەبارێنـن... .**

**بـەرەو ئێـوارە، کاتێـک هەتـاو بـە ڕەنگێکـی سـوور، خـۆی دەگەیەنێتـە ئەوبـەری خەرەندەکـە، لەشـکەر ڕادەوەسـتن. لەشـکەر مانـدوون. لـە نـاکاو دونیـا دیسـان ئـارام دەبێتـەوە. بـەڵام دەر و دەشـتی زوڵاڵ و بێدەنـگ، ئیـدی بووەتـە مەیدانی شـەڕ. بەهەشـتی شـاراوە بۆتـە دۆزەخ. دار دەسـووتن. لـە دەور و بـەری ئەشـکەوت دووکـەڵ هەڵدەسـتێ. لاشـەی پـەز و دەوار و بارگینـان پـەرش و بـڵاو لـە دەر و دەشـت گـەوزاون. دونیـا گەرمـە، زۆر گـەرم. تەقـەی تفەنـگ، ڕەشاشـە و تـۆپ دونیـای کردۆتـە کوانـووی ئاگـر. ئیـدی نـە دەنگـی باڵنـدە و ئاژەڵان دێ، نـە بۆنـی گـوڵ و گـوڵ خونچـە. بـە تەنیـا بۆنـی بـاروت، خوێـن، ئارەقـە، دووکـەڵ و دوومـان دێ. تەنیـا بۆنـی مـەرگ دێ.**

**ئەفسـەر و سـەرباز، ئەنگوسـت لە سەر پەلەپیتکەی دەمانچە و تفەنگەکان،**

---

* بە مانای دار و لقی وشکەوەبوو دێت کە زیاتر پەرژینی لێ درووست کراوە.

هێدی هێدی دێن بەرەو دەرگای ئەشکەوت، لێ کەس ناچێتە ژوورەوە، ئەوان لە بەر دەرگا ڕادەوەستن و گوێ هەڵدەخەن بۆ ئەشکەوتەکە.

دەنگێک نایە، لەو ئەشکەوتەی دووکەڵی لێ هەڵدەستێ هیچ دەنگێک نایە. ئیدی هەموو شت تەواو بووە؛ ئیتر نە شاردنەوە، نە چاوەڕوانی، نە هیوا، نە گەڕانەوە، نە حەسرەت، نە کەسەر و پەژارە، نە گومان، نە ترس و نە حاڵەتی دیکەی ئینسانی بێچارە. تەواو، هەموو شت تەواو بووە.

بەڵام پاش چەند خولەکێک شتێک کە زیاتر لە ئەفسانەکاندا پێک دێت، دێتە ڕوودان؛ لە ناو دووکەڵی دەرگای ئەشکەوت، ڕەشاییەک دیارە. توولەیەکی بچووک بە نووزە نووزێک کە بە ئاستەم دێتە بەر گوێ، لە ناو دووکەڵ دێتە دەر. بە شوێن توولەدا ڕەشاییەک دێ؛ منداڵێکی بچووک کە بە زەحمەت هەنگاو هەڵدەگرێ. ئەم منداڵە، ئەوەندەی دوو ساڵ، دوو ساڵ و نیوێک دەبێ، بێدەنگ، ترس لە سەر ڕوخسار و چاو لە ئەشکەوت دێتە دەرەوە. منداڵ کوڕە. کراسێکی چەرمی لە بەرە، قژی کورتکراوەتەوە، بۆنێکی تیژی ئارەقە، دووکەڵ و میزی لێدێ. ڕوخساری بچووک، چاوەکانی بچکۆلە وەک دەنکە نیسکێک. کە چاوی بە ئەفسەر و سەربازەکان دەکەوێ دەستی هەڵدێنێ و دەخوازێ شتێک بڵێ، بەڵام دەنگی لێ نایە، ئەوکات ئەفسەرێک فیشەک دەخاتە بەر دەمانچەکەی و دێت لە سەر منداڵەکە دەوەستێ «لەوانە دەبێ هیچ کەسێک، هیچ شوێن و ئاسەوارێک، هیچ دەنگێک، هیچ ڕیشەیەک، هیچ ڕێچکەیەک نەمێنێ» ئەفسەر بە زمانی خۆی ئەمە دەڵێ. ئەفسەرەکە وا بیر دەکاتەوە. منداڵەکە ئاگای لە ئەفسەر و بیرۆکەکانی نیە، دەست دەخاتە سەر پشتی توولە بەڵەکەکە و لەگەڵی گەمە دەکات. لێ ئەفسەرێکی دی، یەکی سمێڵ قیت ناهێڵێ منداڵ بێتە کوشتن.

ئەفسەری سمێڵ قیت منداڵ هەڵدەگرێ، لە باوەشی دەگرێ و

بە دەستی ڕاستی، دەم بە پێکەنین، بە هێواشی دەست بە سەری منداڵەکەدا دێنێ. منداڵەکەش بەو چاوانەی کە هیچ شتێک نادرکێنێ، بۆ ئەفسەر دەڕوانێ.

بەڵێ ئەو منداڵە، بازە.

بەڵێ بەسەرهاتی باز ئاوەها دەست پێدەکات.

## ٣

# له دایك بوون

بەسەرهاتی باز کە خۆی مسۆگەر هەرگیز پێی نەدەزانی ئاوەها دەست پێدەکات. بە مەرگ و خوێن، بەسام و ترس، سارد و سەرما.

ئەی بەسەرهاتی کۆتر؟

بەسەرهاتی کۆتریش با بڵێین ئەوەندەی بیست ساڵ پاش بەسەرهاتی باز، دیسان لە وڵاتی چیاکان، لە ڕۆژێکی گەرمی کۆتایی بەهاردا دەست پێدەکات. لە شارێکی گەورە و تەڤلیهەڤی* وڵاتی چیاکان. لە وێستگە گەورەکەی ترێن.

ئێمە ئێستا لە پێش ترێنێکی ڕەشی درێژی سەربازی ڕاوەستاوین، ئێمە دیسان لە ڕێگەداین، ئێمە سواری ترێن دەبین. دیسان دەڕۆین بەرەو شوێنی نادیار، نائاشنا، بەرەو شوێنی غەریبی. وێستگەی کۆن و دەور و بەری پڕە لە ئینسان. پیر و بەساڵاچوو، منداڵ، ژن، پیاو تێکەڵی یەک بوون. لە بەر دەرگای سەوزی ڤاگۆنەکانی قەتار بە ڕیز بوون و چاوەڕوانن ناویان بخوێننەوە تاوەکوو سواری ترێن ببن و بڕۆن. لە پێش هەر دەرگایەکی ترێنەکە چوار ئەفسەر و چەند سەربازێکی چەکدار ڕاوەستاون. لە پێش دەرگا گەورەکەی وێستگە سەربازی چەکدار

* تێکەڵ و لە ناو یەکدا.

وەستاون. لە ژوورەوەی سالۆنی وێستگەکە و لە پێش گیشەکان سەرباز ڕاوەستاون. لە دەور و بەری وێستگە، سەربازی چەکدار ڕاوەستاون. دەوری وێستگەکە بە تانک و جیپی سەربازی تەنراوە. لە بڵندگۆی وێستگەکە دەنگی سرودی سەربازی دێت و پەردە بە پەردە بەرزتر دەبێتەوە. ڕۆژ، ڕۆژێکی ئاسایی نییە. ڕۆژ، ڕۆژی سەربازانە؛ ڕۆژی حەشرە؛ ڕۆژی بارکردن و کۆچکردنە. ڕۆژ ڕۆژی دوور خستنەوەیە، دوور خستنەوە بەرەو تاراوگە، بەرەو دیاری غەریب.

بەڵێ، ڕۆژ ڕۆژی سەرباز و ژەنەڕاڵەکانە. دوو مانگ پێش ئێستا لە وڵاتی مەزن، شەوێک دوای خەوتنی سەگی کۆڵانان و پێش بەخەبەر هاتنی کەڵەبابی ماڵان، ژەنەڕاڵەکان لە ژێر ڕێبەرایەتیی سەرۆکی گشتیی ئەرتەش (کە ئێمە پێی دەڵێین ژەنەڕاڵ سەردار) لە دژی پاشا و دەسەڵاتەکەی سەریان هەڵدا و دەسەڵاتیان گرتە دەست؛ ژەنەڕاڵ و سەربازەکانی، پاشا و دەست وپێوەندەکانیان لە نوێندا کوشت. سەرۆک وەزیر و هەموو وەزیرەکانیشیان گرت و لە زیندانیان توند کردن. و دەنگی ڕادیۆی میللیان تاوەکوو شەپۆلی کۆتایی کردەوە و دەسەڵاتی خۆیان بە سروودی سەربازی گەیاندە سەرتاسەری وڵاتی مەزن و جیهان. پەردەی دەستپێکی سەرهەڵدانەکەیان ئاوەها بە خوێن کرایەوە. دواتریش بە خوێن درێژە درا؛ بزووتنەوەی کرێکاری، ڕۆشنبیر، خوێندکار و زەحمەتکێشان قەدەغە کران. (ئەوەشی چاپ و بڵاو کرایەوە لە ژێر چاوەدێریی کاربەدەستانی ژەنەڕاڵەکاندا ئەنجام دەدرا). لە هەموو وڵات حوکمی ئاوارتە و نائاسایی ژەنەڕاڵەکان جێ بە جێ دەکرا و بەڕێوە برا.

ئەمڕۆ هەموو کەسێک، تەواوی گەل پێویستە بە گوێرەی ئەو حوکمانە هەڵبستێ و دانیشێ، بێ و بچێ، بخوات و بخواتەوە، بخەوێت و لە خەو هەستێ، بیر بکاتەوە و قسە بکات.

لە پارچە بچووکترەکانی وڵاتی مەزن، لە دوو مانگ پێش ئێستاوە، لە سەرەوە فڕۆکەی سەربازیی لە ئاسمان، لە ناو دڵی هەورەکاندا دەخولێنەوە، لە خوارەوەش بە هەزاران، بە دە هەزاران، بە سەد هەزاران تانک، تۆپ، سەرباز، جیپ و سەیارەی سەربازی بەردەوام لە سەر ڕێگەکان، لە ناو شارەکان، لە سەرکوێستان و زۆزانەکان، لە دەشت و دۆڵ، بە چەک و تەقەمەنیی قورسەوە، بە دەم سروودی سەربازییەوە، بە دەم نمایش کردنی قووەت و زۆر و هێز و توانایانەوە، دەگەڕێن.

لە وڵاتە بچووکەکان، ڕووناکبیرە پێشەنگەکان، کەسانی سیاسی و ناسیۆنالیست دەستگیر کران. بزووتنەوە، کۆمەڵ و پێوەندییە فەرهەنگی و سیاسییەکان یاساخ کران. دوو ناوداری وڵاتی چیاکان لە سێدارە دران. ئێستاش ژەنەڕاڵ سەردار و هاوڕێکانی، فەرمانێکی نوێیان داوە؛ سەرجەم خانەدان، ماڵ وخێزانی مەزن و هەڵکەوتووی وڵاتی چیا لە ماڵ و شوێنی خۆیان دەربکرێن. ئەوان بچنە شوێنی دی. دوور بخرێنەوە.

ئەمڕۆ ڕۆژی ڕۆیشتنە، ئەمڕۆ ڕۆژی فەرمانەکەیە.

ڕۆژێکی گەرمە، وێڕای ئەوە هێشتا هەتاو بە تەواوی بەرز نەبۆتەوە، هەر گەرمە، ئاسمان شین، دونیا ساماڵە. هەتاو وەک یاقووتێکی سوور دەدرەوشێتەوە، هەور وەک بەردێکی مەرجانی کەمێک سپی خۆی دەنوێنێ. ڕووناکی و زوڵاڵیی هەتاو بە پەژارە و حوزنی ئەم ڕۆژی فەرمانە ناکەوێت. بەڵام حوکمی دانیشتووانی وڵاتی چیاکان دراوە، دەبێ بڕۆن. مرۆڤەکانی چیای مەزن کە دەبێ ئێستا بڕۆن لە ناو خەونێکدان، وەک ئەوەی لە ناو خەونێکدا بن، وەک ئەوەی کابووسێک ببینن، ئەوان هەنووکە تێنەگەیشتوون چی دەبێ، هەنووکەش بڕوا ناکەن کە بە سەدان ماڵ و خێزان بە بار و بنەوە لە ماوەیەکی کورتدا لە ماڵ و حاڵی خۆیان، لە ڕەگ و ڕیشەیان دابڕێندرێن. ئەوان

هێشتا تێنەگەیشتوون کە بۆچی دەبێ بڕۆن، بۆچی؟ لە بەرچی؟ بەڵام ئەمڕۆ درێژترین ڕۆژی ژیانیانە، خەون نییە. ئەم ڕۆژە گەرمە، ئەم سەربازە چەکدارە مەغروورانە، ئەو قەتارە ڕەشەی کە وەک جانەوەرێکی هەزار پێ دیارە. هاتن و هەبوون و ڕاوەستانیان لێرە، لە وێستگە، ڕاستییە. ڕاستیی ئەوانە. ئەوان هیچ کابووسێک نابینن، لێ کابووس بۆتە ژیانیان. کابووس هەڵگەڕاوەتەوە و بووە بە ژیانیان، ئینسانی وڵاتی چیا و ژیانی ئەوان؛ تەنیا، هەژار، نەزان؛ ڕوخساری ئەسمەر، سمێڵی بادراو، بەژنی شۆخ و گەردنی زراف؛ ئاشقی شاخ، چیا، زۆزان و کوێستان، هەڵدێر و خەرەند، ئاشقی سرووشت. ئەوینداری تەنیا و تەنیایی؛ مرۆڤی سەرهەڵدەر، مرۆڤی جەنگ و جەنگاوەری، چارەنووسێک کە بەردەوام لە شەڕدایە و هەمیشە لە بەرخۆدانادا، بەردەوام حوکمی لێکراوە، هەمیشە لە ناو شەپۆلی مۆتەکەیەکدا دێت و دەچێ.

وەک ئێستا، ئەوان لە پێش دەرگای ڤاگۆنی ترێن بە ڕیز بوون و چاوەڕوانن. سەرکز، ماندوو، چاوهەڵناوساو. سەربازەکان، دوو ڕۆژ، تەنیا دوو ڕۆژ کاتیان دانێ کە بۆ ڕۆشتن خۆیان ئامادە بکەن، دوو ڕۆژ پێش ئێستا ئەفسەر و سەرباز هاتنە بەر ماڵ، شوێن و جێی کاری ئەوان و بڕیار و حوکمی ژەنەڕاڵیان پێ ڕاگەیاندن؛ ئێوە بۆ ماوەیەکی کورت بار دەکەن و دەڕۆن. دواتر کاتێک دونیا خۆش و ئارام بۆوە، دەتوانن بگەڕێنەوە ماڵەکانتان... حوکم ئاوەهایە...» بۆ ماوەیەی کورت... بەڵام تا کەی؟ بڕۆن ... جا بەرەو کوێ؟... بەچی؟ چۆن؟ کاتێک دونیا ئارام بۆوە... کەی؟ چۆن؟ بە چ شێوەیەک؟ کێیە بڕیار دەدات کە دونیا ئارام بۆتەوە یان نا؟ ئارامی؟ چۆن؟ بە پێوانەی کێ؟ و لە چل وەهەشت کاتژمێردا ئەوان ئامادەی ڕۆشتن ببن، چی لەگەڵ خۆیان ببەن؟ چی بکەن؟ هەڵبێن، خۆ کەنار بگرن؟ هەڵکشێن بەرەو چیاکان؟ وەک باو و باپیرانیان کردوویانە، ئەمانیش خۆیان بسپێرنە هەڵدێر و دۆڵ

و شیوان؟ دەی دوایی چی دەبێ؟ دوایی؟ چل و هەشت کاتژمێر... چل و هەشت کاتژمێری بێ سەر و بەر، هات و چۆ، ئاڵۆزکاو، فکر و گومان و پرس، چل و هەشت کاتژمێری کەوتن و بندەستی، بێچارەییەکی پاش چل و هەشت کاتژمێر، لە سپێدە و بەربانگی بەیاندا، ئەفسەر و سەربازی چەکدار ئەوانیان لە ماڵ و جێگەی خۆیان هەڵگرت و سواری سەیارەی سەربازییان کردن و هێنایانیانە وێستگەی ترێن. ئەوان چییان بکردایە؟ ... قەت، قەت هیچ شتێک... ئەوان بە چارەنووسی خۆیان ڕازی بوون، بێ ئەوەی شەوی دوایی سەردانێنە سەر سەنیر و خەو بکەوێتە چاویان، جل و بەرگ لە بەریان، سندووق و کەرستەکانیان ئامادە، لە بەرەبەیاندا، لەگەڵ خوێندنی کەڵەباب، چاوەڕوانی هاتنی سەربازەکان بوون. تەنیا سندوق و بوخچە بچووکەکانیان پێ بوو، لە چەند تاقمێک جل و بەرگ، زێڕ و ئاڵتوون، پوول و پارە، موورو و بەردی بەبەها زیاتر هیچیان لەگەڵ خۆیان هەڵنەگرت. نە بوخچەی جل و بەرگ، نە کەرستەی ناو ماڵ، نە کووپە و دیزەی ڕۆن و خۆراک، نە جێگە و بان، نە لێفە و سەرین، نە تیانە و مەشکەی شیر و ماست، نە توورەکە و کیسەی یادگارییەکان، نە ڕەف و قەفەسەی کتێب و دەفتەرەکان، نە کتێب و دەفتەری شاراوەی پشت دیوارەکان، نە ڕەسم و تابلۆی باو و باپیران، خۆشەویست و پایەبەرزان. و نە ئەسپی کحێڵی خۆشڕەو کە لە دەشتی سەوز و زەردی زۆزانە سپی و شینەکان بە غار و بازدان دەبوونە هەڵۆ. و نە سەگی گورگ خنکێن و تاژیی بەڵەکی باریک کە لە ناو شیو و دۆڵ و شاخ و چیاکاندا دەبوونە پڵنگ. و نە گەلە مەڕ و پەزی دەستەمۆ، کەڵەبابی سووری پۆپ درێژ، کەو و کۆتری بەڵەک... و نە هیچی تر. لە ژێر چاوەدێریی سەربازی بەرگ سەوزدا، ئەوان ماڵە نەرمەکانیان، شوێنی باو و باپیرانیان بەجێ هێشت و کەوتنە ڕێ.

ئەوان چاوەڕوانی بڕیارێکی لەم شێوە نەبوون، بەپێچەوانەوە بەهیوا بوون کە دونیا خۆشتر بێ، سەربازی سەر کۆڵان و شەقام و گوندەکان کەمێک کەمتر ببنەوە و بگەڕێنەوە ناو پادگانەکانیان. دوو مانگ بەسەر کوودەتادا تێپەڕیبوو. ژەنەڕاڵەکان ئەوەی خۆیان ویستبوویان، کردبوویان، خواستەکانی خۆیان پێک هێنابوو، هەموو شوێنێکیان بە زۆرداری کۆنتڕۆڵ کردبوو. هەموو وتنێکیان، بڕیار و فەرمانێکیان بە بێ بوونی دەنگێکی دژبەر و بەرخۆدانێکی ئاشکرا، جێبەجێ دەکرد. بەڵام ئەوان بۆچی بە فەرمان و توندوتیژی دەسەڵاتیان سەقامگیر و جێگیر دەکرد؟ مرۆڤەکانی وڵاتی چیا، وەک هەموو جارێک کە وەها ببوو، سادە و ساف بەڵام هەڵە، بیریان دەکردەوە.

وەک هەموو جارێک، ئەمجارەش ئەوان دیسان بەڕێ کەوتن، ئێستا لە ڕێگەدان. زارۆک جارێک دەگرین، جارێک دەچنە خەو، جاری واش هەیە دەرەلنگ و داوێنی دایکیان دەکێشن. پیر و بەساڵاچووان لە سەر کورسیی درێژی بەر دەرگای وێستگە و لە سەر بەردی ڕەش و سووری وێستگەکە دانیشتوون. پیران قەننە و جگەرە دەکێشن، بەساڵاچوو وەنەوز دەدەن، هەندێکیشیان لە سەر تەختەبەندی وێستگەکە پاڵیان داوەتەوەو خەونووچکە دەیانباتەوە و بیر لە ڕۆژانی ڕابردوو، لە فەرمانی ڕابردوو، لە شەڕ و پێکدادانی ڕابردوو و لە قات و قڕی و کۆمەڵکوژیی ڕابردوو دەکەنەوە. هەندێکیش هەن کە هەرگیز بیر لە هیچ ناکەنەوە، نایانەوێ بیر لە هیچ بکەنەوە، یان ئێمە وا دەڵێین، هەن کە بیر لە ژیانی درێژ و بۆشاییەکەی، بێمانابییەکەی، بێسوودییەکەی دەکەنەوە. هەرچی پیاوی ڕوگرژ و تێک سمراو، ژنی ڕوو داپۆشراو، لاو و گەنجی ڕوو ئەسمەریش هەن، لە پێشەوەی بەر دەرگای ڤاگۆنەکاندا لە ڕیزدان، بە مێشک و جەستەی ماندوو، بە چاو و ڕۆحی هیلاکەوە.

بەڵام چاو، چاوی ئەوان، بەتایبەتی چاوەکانیان؛ خەم، پەژارە،

گومـان و دوودڵـی، تـرس و سـام. بەتایبەتـی تـرس. ترسـی ئاڵـۆزی ئەمـڕۆ، ترسـی لـە کـردە، لێقەومـان، ڕووداو و بەسـەرهاتی دوێنـێ، ترسـی ئـاگادار نەبـوون لـە داهاتـوو، ئـەو تـەم و مـژەی لـە پێشـیانە، ڕێگەیانـی بڕیـوە، بە تەنیا یـەک شـت ئـەو مرۆڤانـەی ئێسـتا لـە ڕێگـەدان دەکاتـە هاوبەشـی یـەک؛ تـرس و چارەنوسـێکی یەکگرتـووی لـە تـرس پێکهاتـوو، بێجگـە لـەم شـت و بەشـە، ئیـدی ئـەوان یەکتـری ناناسـن. هـەرکام لـەم مـاڵ و خێزانانـە لـە شـوێنێکەوە هێنـراون. هەندێکیـان ئاغـا و بەگـی گونـدن و لـە گوندەکانـەوە هاتـوون. هەندێکیـان عەشـیرە و سـەرۆک عەشـیرەن و لە شارە بچووکەکانـی وڵاتـی جیـاوە هاتـوون. هەندێـک شـێخ و ڕێبـەری ئاییـنن و لـە شـوێن و جێگـەی دووری دڵـی جیاکانـەوە هاتـوون. هەندێکیـش خوێنـدکار، پزیشـک، پارێـزەر، ئەندازیـار، دەرمانسـاز،... کـە زیاتریـان ماڵیـان لـەم شـارە گەورەیـە کـە ئێسـتا بـە سـواریی ترێـن بەجێـی دەهێڵـن.

بەڵـێ، یەکـەم ترێـن ئێسـتا دەڕوا. کـێ دەزانـێ چەنـد ترێنـی دی دەڕۆن؟! بڕیـاری بـاڵا بەرفرەیـە. بـە سـەدان مـاڵ و بنەماڵـە دەکەونـە بـەر ئـەم فەرمانـە. ترێـن دەبـێ بـە ڕۆژان، بـە حەفتـان، لەوانەشـە بـە مانـگان بـڕۆن و بێـن، سـوار بکـەن و دابەزێنـن.

ئێسـتا کاتێـک تیشـکی هەتـاو ئیـدی خـۆی دەگەیەنێتـە سـەر بەردەفەرشـی سـووری سـەربانی وێسـتگە، لـە نـاکاو دەنگـی بـەرز و تیـژی سـروودی بڵندگـۆکان ڕادەوەسـتێ. ئەوەنـدەی چەنـد خولەکێـک هەمـوو دونیـا بێدەنـگ دەبـێ، تەنیـا چەنـد منـداڵ دەگریـن، چەنـد پیـر و بەسـاڵاچوو دەکۆخـن، چەنـد ژن ژیرانـە دەڕۆن و سـەربازێک بـە دەنگـی بـەرز چەند کەسـێکی تـازە هاتـوو دەخاتـە نـاو ڕیزەکانـەوە. هەموویـان بـە ڕوخسـارێکەوە کـە پرسـیار، شـک و گومانـی پێـوە دیـارە، چاوەڕوانـن. دوای کەمێـک چاوەڕوانـی بێدەنـگ لـە دەرگا گەورەکـەی وێسـتگەوە ژەنەڕاڵێـک و بـە شـوێنیدا شـەش ئەفسـەر دەردەکـەون. سـامناک، خۆفنـاک، جیـددی.

ئەفسەر و سەربازی ناو وێستگەکە خۆ کۆ دەکەنەوە، باڵایان ڕاست دەکەنەوە و ئامادەی سڵاوی سەربازی ڕادەوەستن. ژەنەڕاڵ و ئەفسەر قورس قورس، چاویان لە سەر ئەو حەشیمەتەی لە بەر دەرگاکان ڕاوەستاون، دێن و لە ناوەندی ڕێگە ئاسنینەکە ڕادەوەستن. ئەوەندەی چەند چرکەیەک، ژەنەڕاڵ بە ڕوانینێکی وشک، لووت بەرز و سەربڵند، لە دەور و بەر لە هەر دوو لای درێژی ترێن دەڕوانێ. فایلەکەی دەستی دەکاتەوە و سەیری دەکات. ئەفسەرەکان کەمێکی دی لێی نزیک دەبنەوە و پێکەوە سەیری لاپەڕەکانی ناو دۆسیەکە دەکەن. دواییش سێ ئەفسەر چەند لاپەڕەیەک بە دەستەوە بەرەو لای دواوەی ترێنەکە دەڕۆن. سییانەکەی دیکەش بەرەو لای پێشەوە بە هەڵهاتن. ژەنەڕاڵیش چەند سەرباز بە دەورییەوە بە ئارامی بەرەو دوا دەبێتەوە و لە بەر دەرگای گەورەی وێستگە ڕادەوەستێ.

ئێستا کۆچ دەست پێدەکات. ئەفسەر لە بەر دەرگای ڤاگۆنەکان بە دەنگی بەرز ناوەکان دەخوێننەوە. ناو، ناوی ئەوان، ناوی کۆچبەرەکان، پاشناو، ناوی باو و باپیر، باوەگەورە و باپیران. ناوی بنەماڵە و عەشیرە، ناوی شوێن و جێگە، ناوی کەونارای سەدان ساڵە... ناوی ئەوان؛ چارەنووسی ئەوان، حوکمی ئەوان؛ هەر کەسێک ناوی دەخوێنرێتەوە هاوار دەکات و بە زمانی ئەفسەرەکان دەڵێ «لێرەیە» و بەرەو پێشەوە دەڕوات. لەگەڵ ژن، منداڵ، سندووق و بوخچە بچکۆلەکانیان و ئەگەر پیر و بەساڵاچووشی هەبێ، ئەویش. ئەوان دێن بەرەو دەرگاکە و لە بەر دەم ئەفسەرەکان ڕادەوەستن. ئەفسەر جارێکی دی ناو و پاشناویان، جێگە و شوێنیان دەپرسێ، دەیانژمێرێ، بۆ کاغەزەکانی دەستی دەڕوانێ، هەندێک شت دەنووسێ و بە پێشەنگیی سەربازێک سواریان دەکات. یەک دوو کاتژمێر بەم حەیس و بەیسە، بانگ کردن، قیرە، هاتن و سواربوونە تێدەپەڕێ و دواتریش هۆڵی وێستگە، ڕێی ئاسنی ترێن،

دەور و بەری وێستگە، لە ناکاو چۆڵ دەبێت. ئەو حەشیمەتە، ئەو حەچ و لوورەی چەند کاتژمێر پێش، بەجارێک ون دەبن. ئەو شێنییە* خرۆشاوە ئیدی دیار نین. بە تەنیا یەک-دوو سەگە بەڕەڵا زۆر تەوەزەل لە ناو وێستگەکە دێن و دەچن. و ئەو ژەنەڕاڵە مەغروورە بە نواڕینێکی سەرفرازانە بۆ ترێن دەڕوانێ، ئەوەندەی دە ئەفسەر بە دەورییەوەن، دەستی داوەتە پشتی و هێشتا لە بەر دەرگای وێستگەکەیە. کار بەڕێوەچووە؛ کۆچبەری وڵاتی چیا چوونەتە ناو ترێن و ترێن پشتی لە وڵاتی چیاکانی باکوور، و ڕووی لە شوێنی نادیاری باشوور کردووە. دەنگی سروودی سەربازی دیسان دەست پێدەکات. بەڵام دوای چەند خولەک، دەنگێکی دی کە لە سەر هەموو دەنگەکانەوە خۆی بەهەموو شار و تەواوی جیهان دەگەیەنێ، بەرز دەبێتەوە؛ دەنگی بەرز و تیژ و درێژی ترێن.

ترێن دەکەوێتە ڕێ. هێدی هێدی وەک شاماری ناو چیرۆکەکان کە حەوت قاتی لە ژێر زەویدایە، دەجمێ و خۆی بە سەر ئاسنی ڕاخراوی ڕێگەدا درێژ دەکاتەوە. وێستگەی کەونارا کە بە بەردی ڕەشی مەزن و داتاشراو ساز کراوە، بەجێ دەمێنێ. کەفپۆشی سووری سەربانی وێستگەکە کە بە تیشکی هەتاو شەوق دەداتەوە، بە جێ دەمێنێ. دیمەنی ئاڵای سێ ڕەنگی وڵاتی مەزن کە بە با دەشەکێتەوە لە بەر چاو ون دەبێ. خانووی کۆن، پەڕاگەندە و ناچاری شاری گەورە کە بە گرانیتی ڕەش بە دوو- سێ قات ساز کراون، یەک لە دوای یەک دێن و ون دەبن. حەشیمەتی شار، خزم و کەس، ناسیاو و نەناسی کۆچبەران کە بە جل و بەرگی هەرێمیی خۆیانەوە لە شەقام و کۆڵانان دەگەڕێن یا لە بەر دەرگای ماڵی خۆیان ڕاوەستاون، یان لە باخچە و پارکی شارەکە دانیشتوون، ڕیز بە ڕیز دەردەکەون و ون دەبن. چەند

---

* حەشیمەت.

خوێندنـگا و قوتابخانـە کـە زارۆکـی کۆچبـەران بـە زمانـی ئەفسـەرەکان پـەروەردە دەکـەن، لـە هـەر دوو لای ترێنەکـە دەبینرێـن، و بەجـێ دەمێنـن. و پێـش ئـەوەی ترێـن بـە تـەواوی لـە شـار دەربچـێ، پادگانـی سـەربازیی ئـەو ئەفسـەر و سـەربازانەی کـە ئێسـتا دەرکـراوان دەبـەن، دەردەکـەوێ. ترێـن دەڕوا، تانـک و تـۆپ، سـەیارە و لۆریـی سـەربازی بـە چـەک و تەقەمەنـی، گرووپـی سـەرباز و ئەفسـەران، سـەربازی زێرەڤـان و چەکـدار، شـوێن و مەیدانـی ژیمناسـتیک و ڕاهێنانـی سـەربازی، شـوێنی پـەروەردە و نیشـان لێدانـی سـەربازی، یـەک بـە یـەک لـە دوای خـۆی بەجـێ دەهێڵـێ و دەڕوا. لـە شـار دەچێتـە دەرەوە، ڕوو لـە باشـووری وڵات دەکات و دەکەوێتـە دەشـتێکی سـەوزی بـێ کۆتایـی.

ئـەم ترێنـەی ئێسـتا ئێمـەی تێدایـن لـە یـازدە ڤاگۆنـی درێـژ پێـک هاتـووە. ڤاگۆنێکـی یەکجـار درێـژ هـی ئەفسـەرەکانە. یەکێکیشـیان چێشـتخانەیە. ئەوانـی دیکـەش دەمێنـن بـۆ کۆچبـەرەکان و ئەفسـەر و سـەربازی پاسـەوان. لـە هـەر ڤاگۆنێکـدا ئەوەنـدەی چـل کـەس هەیـە، موسـافیر جێگایـان گرتـووە، هـەر کـەس لـەو بەشـەی بـۆی تەرخـان دراوە، دانیشـتووە، ئێمـە لـە سـێهەم ڤاگۆنـی ترینەکەدایـن،- کـە بـۆ بەسـەرهاتی کۆتـر و هەروەهـا بازیـش گرنگـە.

بـاز؟

بەڵـێ، بـۆ بەسـەرهاتی بازیـش، چونکـە بازیـش لـەم ترێنەدایـە، لـە هەمـان ڤاگۆنـدا. لـێ نـە وەک یـەک لـە کۆچبـەرەکان، [بەڵکـوو] وەک چاوەدێری ئـەوان، وەک پاسـەوانیان. بـاز ئەفسـەری پاسـەوانی ڤاگۆنەکەیـە. بـە سـەر ئـەو ڕۆژەی کـە ئاگـر و دووکـەڵ لـە دەرگای ئەشـکەوت بڵنـد دەبوو، نزیکـەی بیسـت سـاڵ تێپەڕیـوە. ئێسـتا دەبـێ بڵێیـن تەمەنـی بـاز نزیکـی بیسـت و دوو- دوو سـاڵ و نیـو دەبـێ، تەمەنێـک بـە سـەر ڕۆژی سـووتان و مردنـدا تێپەڕیـوە. سـاڵ ڕۆیشـتوە، کات ڕابـراوە، ئیـدی نـە

دەنگی تۆپ و ڕەشاشەی ئەو ڕۆژە دەبیستریٚ و نە دووکەڵ و دوومانی فیشەک و سووتان دیارە. لە ئێمە زیاتر کەس بەو ڕۆژە نازانیٚ. ئەو ڕۆژە کەوتە بەر شەپۆلی تەواوکەری زەمەن و لە بیر کرا. بەڵام باز ماوە، وەک سێبەری ئەو ڕۆژە سەختە، وەک شوێن پێی مەرگ، سووتان، ون بوون، ڕق و ترس و سام.

ئەمڕۆ باز ئەفسەرە، ستوانێکی نوێی دڵگەرم و چالاکە، ستوانێکی لاو و بەهێز، مەغروور، بەخۆ باوەڕ، خاوەن بیر و دووربین، ژیر و ڕێک و پێک. چۆن وای لێهات؟ چۆن باز لەو سوپایەی باو و باپیریان قڕ کرد، بوو بە ئەفسەر؟ چیرۆکی ئەمە کە ئێمە جار و بار باسی دەکەین، درێژە، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ کڵاوێکی سەوزی سەربازیی بە سەریەوەیە و لە جل و بەرگی ناسکی سەربازیدا، لە بەر دەرگای ڤاگۆنی سێهەمی ترێن ڕاوەستاوە، چاوەدێریی ئەو کۆچبەرانە دەکات کە دراونەتە دەستی و سەربەرزانە بیر لە ئەرک و بەرپرسارێتیی مەزن و پیرۆزی خۆی دەکاتەوە؛ ئیدی چاوی هەر لە پێشە، ڕووی ئەو، بیر و قامەتی ئەو، هەروەک ئەو ترێنەی کە ئێستا دەڕوا، بەرەو پێشە. ئیدی ڕۆژانی تەنیایی، سارد و دڵتەنگی، بەسەرچوون، ئەو ئیدی لە پاش خۆی ناڕوانیٚ. خەونەکانی هاتوونە جیٚ، بووەتە ئەفسەر، جل و بەرگی سەربازیی لە بەر کردووە، چەک و فیشەکدانی بەستووە، و دەستبەکاری ئیشی پڕبایەخ و پیرۆز بووە. ژیانی ئەو ئێستا دەست پێدەکات، ئەو نها کەوتۆتە ناو ئافراندن و خولقاندنی ژیان. ڕاز و نهێنیی ژیان، ئەو ئێستا ژیان درووست دەکات، ژیانێکی ژیانان دەئافرێنیٚ. ئەو ئەفسەر و فەرماندەی تازە پێگەیشتوو، ئیدی ئێستا دەبێتە فەرمانداری ژیان... ئەم ترێنە، ئەم مرۆڤانە، ئەم سەفەرە، ئەم ڕۆژە گەرمە گرنگانەی وڵاتی مەزن... ئەمانە هەموو یەکەم هەنگاوەکانی خەونی ئەون کە ئەمڕۆ دەبنە ڕاستی. ڕاستیی ژیانی ئەو، و ئەویش لە ڕۆژانی داهاتوودا،

دەبێتە ڕاستیی ژیانی وڵاتە فراوانەکەی. ئەم کۆچە یەکەم ئەرکیەتی، دەستپێک و سەرەتایە. دەستپێکی فەرمانداریی ئەو، دەسەڵاتدارییەکەی. لە ئێستاوە، ئەم؛ دەسەڵاتە، حاکمە، فەرماندارە. دەستی لە سەر پەلەپیتکەی دەمانچەکەی، بە چاوی سووک لە کۆچبەرەکان، نا لە کۆچبەر نا، لە زیندانییەکانی دەڕوانێت. بەڵێ ئەو دەسەڵاتە.

باز؛ ئیدی منداڵی مردنەکەی بیستساڵ لەمەو بەر نییە، ئەو ئەمڕۆ ئەفسەرێکی بەهێز و بەدەسەڵاتە؛ بەژن و باڵای بەرز، ئاوڕ و نیگایەکی بەهێز و تیژ؛ ڕوخسارێکی ئەسمەر کە وەک ڕوخساری گیراوەکان دەچێ، ڕوخسارێکی خاوێن، ڕیش و سمێڵ تاشراو، دەم و لێوی درێژ و زراف، لووتێکی درێژ و باریک؛ ناوچەوانێکی کراوە، و چاو، چاوی بچووک وەک دوو دەنکە نۆک، هەروەک چاوی [باڵندەی] باز. چاو؛ ترس، سام، بڕوا، جیددی بوون، دیسیپلین، سارد و ڕەنگین. چاو؛ ڕەنگی ساردی تەنیایی، ڕەنگی مردن. چاو؛ تەنیایی دڵ و ڕۆح.

دڵ و ڕۆحی تەنیای باز... بەڵام ئیدی تەنیا نییە. ئەندامی ئەرتەشێکی مەزنە. ئەفسەر و فەرمانداری هێزێکی دەسەڵاتی سەرجەم هەرێمەکەیە. ئێستا ماڵی منداڵە هەتیوەکان، قوتابخانە، ناوەندی حکومی، خوێندنگای سەربازیی ئەرتەش و ئاکادیمیای سەربازی، دێنەوە یادی. ماڵ و مەسکەنی باز ئەو شوێنانە بوون. نە ماڵێکی گەرمی هەبوو نە باوک و دایکێکی دڵگەرم. نە خوشک و برایەک، نە مامە و برازایەک، نە خاڵۆ و خوشکەزایەک. هەرگیز کەسێک یان شتێکی نەبوو، تەنیا بوو. ڕۆحێکی تەنیا و سەرکز. ڕۆحێکی هەتیو. بەڵێ هەتیو. بەو جۆرەی دەیزانی و بەو جۆرەی یەک بە یەک پێی وترابوو؛ دایک و باوکی کاتێک کە ئەم هێشتا زۆر منداڵ بوو لە ڕووداوێکی هات و چوودا گیانیان لە دەست دابوو. کەسی نەمابوو. کەس نەبوو ئەرکی بەخێوکردنی ئەم لە ئەستۆ بگرێت. هەر بۆیەش کاربەدەستان

و دەزگاكانی دەوڵەت ئەویان ڕەوانەی ماڵی هەتیوان كردبوو. تەنیا جارجارە ئەفسەرێكی سمێڵ قیت كە خزمێكی دووری بوو، دەهات و سەردانی دەكرد. بیست ساڵ ژیانی بەم شێوە لە ناو گەمارۆی قووڵ و وێرانی تەنیاییدا بەسەر بردبوو.

بەڵام ئەمڕۆ ئیدی هەموو شت گۆڕاوە، ئیدی نە تەنیایە، نە هەتیویش. ژیانێكی درێژ وەك ئەو دەشتە بەرینەی ئێستا پێیدا دەڕۆن، لە پێشیەتی. ئەرك و بەرپرسیاریی مەزن و قورس وەك ئەو چیایانەی بەجێماون، چاوەڕوانی ئەون. خۆشی، باشی، جوانی، دەرفەت و هەبوونی ژیان، وڵات، میللەت، دەوڵەت و سوپا چاوەڕوانی ئەون. بەختەوەری، سەرفەرازی، خواردن و خواردنەوە، گەشت، پۆشاك، كەیف و خۆشی، كچ و ژن، ئەشق و خۆشەویستی، وەك ئەو شوێنانەی لە پەنجەرەی ترێنەوە دیارن، دەست لە باز هەڵدەتەكێنن و بانگی دەكەن. و كچ و ژن، بە تایبەتیش ئەو كچ و ژنانەی ئەو لە شەوانی تەنیایی و ساردی هۆڵی خەوتنی قوتابخانە و خوێندنگاكاندا، لە ژێر لێفەی ناسكدا دەستی ڕاستی لە ناو لنگی، بەردەوام خەیاڵی دەكردن. ئاخ ئەو كچ و ژنانە، تامی ژیان، ڕەنگ و بۆنی بوون، نەخشی جیهانن... ئەو كچ و ژنانە... ئەو زوڵف و پەلكە ئاورێشمینانە، چاوی بەكل، لێوی گۆشتن، گەردنی بەرز، سینگ و بەرۆكی كراوە، مەمكە جوانەكانیان، بەر و بەرزگی نەرم و گەرمیان، ڕەشایی قڵەشی شاراوە و پڕنهێنی بەر زگ، ڕان و پێ وەك پشتی ماسیی نەرم، جەستەی جوان و قەشەنگ... ئەوانە هەموو چاوەڕوانی بازن. باز بە گوێی ئەواندا بە ئارامی، ئەو گوتن و قسە هەرە نهێنییانەی بە ساڵان دووبارەی كردبۆوە و هەمووی لە بەر كردبوو، دەچرپێنێ. لە بن گوێیانەوە، بە قسەی مەحرەم بە هەناسەی گەرمی خۆی دەكەوێتە ناو جەستە، دڵ و ڕۆحیان. باز دەبێ ئەوان بخوا، بیانخواتەوە، بە هەموو جەستەی خۆیەوە، بە هەموو هەبوونی

خۆیەوە بکەوێتە ناو ئەوان و لە ناویاندا بمێنێتەوە. بە خولەکان، نا نەک بە خولەکان، بە کاتژمێران، نا نەک بە کاتژمێران، بە ڕۆژان، بە مانگان، بە سالآن، بە درێژایی تەمەنێک، ئەو لە ناویاندا بمێنێتەوە، لەوێ هێلانەیەک ساز بکات و بمێنێتەوە. ئیدی باز کێ بخوازێ، دەست بۆ کام ژن ڕاکێشێ، ئەوا بە کەیف و خۆشی دێت و لە بەردەم بازدا دەخەوێ. ئیدی باز بەتوانایە، داهاتێکی باش، ئەستێرەکانی لە سەر شان، هێز و توانای سوپا و دەوڵەت لە پشتی ئەوە. هێدی هێدی، یەک بە یەک، دانە بە دانە هەموو ئەو خەیاڵ و داخوازییانە بەجێ دێنێ. نە پەلە، نە هەڵهاتن، ئارام ئارام. ژیانی ڕاستەقینە تازە دەست پێدەکات. ئەو ڕۆژانەی کە چاوەڕوانی دەکرد و دەیزانی کە دەگەن، ئەمڕۆ تازە دێن. ڕۆژباش ڕۆژی نوێ، ژیانی نوێ!

جۆش و خرۆشەکەی ئەمڕۆ! بۆ خۆشی و سەربڵندی باز پایانێک نییە. جۆش و خرۆشی ئەمڕۆی بێسنوورە. لە ڕۆژێکی ئاوا مێژووییدا ئەو دەستی داوەتە ئەرکەکەی. شتی ئاوا بە نەسیبی کێ دەبێ؟ سەرباز و سوپا، ئەمڕۆ لە سایەی جەسارەتی ژەنەڕاڵ سەردار، دەسەڵاتدارە.

کار و باری دەوڵەت بە دەستی سوپا دەگەڕێ، قسەی سوپا بڕیار و فەرمانە. ئەگەر سوپا، پاشا و دارودەستەکەی نەدەڕووخاند، خودا دەیزانی چی بە سەر وڵات و دەوڵەتدا دەهات! لەوانە بوو دەوڵەت بڕووخایە، وڵات پارچە ببوایە، شەڕێکی ناوخۆیی دەستی پێبکردایە. بەڵام پێشی بە هەموو ئەو گریمانە نەباشانە گرت. لە سایەی سوپاوە، ئەمڕۆ، دیسان، باشی و خۆشی و ڕێک و پێکی هاتۆتە ئاراوە، بەڵام ئەرک قورسە، بەرپرسیارێتی مەزنە. نابێ هیچ هەڵەیەک ببێ. دوودڵی، شک، گومان، ناڕەحەتی، ڕووبادان، قەڵس بوون، سستی، سەرگێژ بوون، نابێ ببێ. ئاڵۆزی و تەڤلیهەڤی نابێ ببێ. دەبێ بەرنامەی سوپا بەڕێوە ببرێ. هەرچی ڕوودەدا با بدا، دەبێ ئەوە بەجێ بگەیەنرێ.

و لە بەر بەختی باش، باز لە ڕۆژێکی ئاوەهادا دەست بە خزمەت دەکات.

ئەو ڕۆژەی کە ئەو دیپلۆمی سەربازییەکەی وەرگرت و ئەستێرەکانی سەر شانی پێوە کران، ئێستا لە بەر دەرگای ڤاگۆنی سێهەمی ترێنی کۆچ، دێنەوە یادی؛ ئەو شەوە خەو نەچووە چاوی. ڕۆژێکی دواتر دەبووە ئەفسەر! ئەو لەو ژیانە زیندانە ڕزگاری دەبوو، دەرگای ژیان و جیهانی لە پێش خۆیدا دەکردەوە! ئەو دەبووە خاوەن ئەرک... سەر لە بەیان، پێش ئەوەی مژی سپێدە بکەوێتە سەر دونیا، لە ناو نوێنەکەی هەستا، لە هەڤالانی خەوتووی ناو هۆڵی خەوی نواڕی، بێ ئەوەی دەنگێکی لێوە بێت، بە هەنگاوی سووک بەرەو حەمام چوو. وێڕای ئەوەی مانگی گوڵانیش تەواو دەبوو، حەمامی گەورە سارد بوو. ئەو کلۆپی حەمامی داگیرساند و چەندێک لە بەر دەست شۆرەکە ڕاوەستاو لە ئاوێنەکەی بەرامبەری ڕوانی. بەڵێ، ئەو بوو، ئەو کەسە کەیف خۆش، لاو، قژ کورت و پێکەوتە کە لە ناو جلی خەوی سەربازیدا لێی دەڕوانی، ئەو بۆ خۆی بوو. «ڕۆژباش»، باز بە کەسی ناو ئاوێنەکەی وت، «ڕۆژ باش ستوان... ڕۆژباش ئەفسەری نوێ... سەرداری نوێ» و پێکەنی، «ڕۆژباش دونیا، ڕۆژباش ژیانی دەرەوە، بە هیوای من بە، من دێم، بۆ قووت دانی تۆ، داگیر کردنی ئێوە...» دوایی، چووە ناو ئاودەستەکە کە بۆنی تیژی میزی لێدەهات. ڕاوەستا، پیژامە و دەرپێکەی تا سەر ئەژنۆی داکێشا، لە پێش خۆی لەو شتەی لە ناو پێیدا دەجوولایەوە، و وەک «سەربڵندیی من» بەناوی کردبوو، ڕوانی. پێکەنی و بە نگوستە گەورەی لێیدا و «ڕۆژباش بۆ تۆش سەربڵندیی من» ی پێ گوت.

بە دەستی ڕاستی یاری پێکرد، هێدی هێدی. بە یاری پێکردن شتی ناو لنگ قەبەتر دەبوو. سەری هەڵێنا و دوای کەمێک ڕەپ بوو.

**باز دیسان لێی ڕوانی، بە حەیرەت، بە مەغرووری. «ڕۆژی تۆش ئەمڕۆ دەست پێدەکات» باز وتی، «ئێمە دەبێ ئەم ڕۆژە پیرۆز بکەین... » دواتریش چاوی نووقاند، بیری لە پەرییە ڕووتەکانی ناو خەون و خەیاڵی بەساڵانی خۆی کردەوە و دەستی ڕاستی بە دەوری پیاوەتییەکەی، سەربڵندییەکەیدا برد و هێنای. سەرەتا ئارام، دواتریش بە پەلە، تاوەکوو چەند دڵۆپێک ئاوک* وەک فیشەکی دەمانچە بەرەو قووڵایی ئاودەستەکە پەڕی. چاوی نووقاند، بیر و هۆشی لە لای بەهەشتە شاراوەکەی، هەژییا، کەوتە هەژانێکی گەرم و قووڵ. دواتر کاتێک جەستەی کەمێک ئارام بۆوە، چاوەکانی هەڵێنا، دڵۆپێک ئاوک نەگەیشتبووە جێگای خۆی، نووسابوو بە دەرەلنگی پیژامەکەیەوە. ئەو بە ئەنگوست دڵۆپەکەی لە پیژامە کردەوە، لە نزیکەوە لێی ڕوانی، ڕاز و نهێنی ئەو دڵۆپە بێ ڕەنگە چی بوو کە ژیانێک، چەندین ژیان، گەلێک ژیانی بەدی دەهێنا. بۆنی بە ئاوە ڕوونەکەی سەر ئەنگوستییەوە کرد. نا، هیچ بۆنێکی لێ نەدەهات، دوایی ئەنگوستی برد بۆ دەمی و تامی دڵۆپەکەی کرد. نا، تامێکیشی نەبوو. بەڵام هەرچییەکیش بووایە، ئەو ئەم ئاوە، ئەم ئاوە سەیرەی دەڕژاند، وەک تۆوی زەوی، لە قووڵایی تاریک و گەرمدا دەیچاند و ژیانی لێ درووست دەکرد. «ڕۆژی ژیانی تۆ پیرۆز بێت ئەی حوکمدار، ئەی فەرمانڕەوای ژیان» ئەو وتی . ئەو ئەنگوستەی تۆواوی پێوە بوو لستییەوە و لە سەر بەردی ئاودەستەکە دانیشت و ئەوەندەی دەمێکی درێژ خۆی بەتاڵ کردەوە. ئارام، هێدی و بە ئاسوودەیی. نە هیچ بۆنێک دەگەیشتە بەر لووتی، نە بەردی ساردی زینکەکە ئازاری دەدا. بەپێچەوانەوە ئەو بە کەیفخۆشی سروودێکی سەربازیی دەفیکاند و بە فیکە کارەکەی دیشی تەواو کرد. خۆی شوشت و گەڕایەوە هۆڵی خەوتن. کاتێک**

* تۆواو.

گەڕایەوە چووە بەر دۆڵابی جلەکانی کە لە تەنیشت جێگەکەی بوو. بە ئارامی دەرگاکەی کردەوە؛ جل و بەرگ لەوێدا بوو. تاقمێک جلی نوێی ئەفسەری لە دۆڵابەکەدا هەڵواسرابوو. خودایە! لە بەر جۆش و خرۆش و هەیەجان چەندین جار وتی «خودایە».، دەنگی لێدانی دڵی دەهاتە بەر گوێی. ئەو ئیدی ئێستا ئەو جلانەی لە بەر خۆ دەکرد. ئەو جل و بەرگەی کە بەردەوام لە خەیاڵیدا بوون، ئێستا، لە بەر دەمی، چاوەڕوانی لە بەر کردن بوون. ئەو جلانە لە پێش چاوی ئەم وەک جلی قەیسەر بوون، وەک زرێ و پارێزەری هەبوون و پاراستن بوون. وەک ئەوەی کاتێک ئەو جلانەی لە بەر کرد هەموو جۆرە دڵخوازی، خەون و خەیاڵەکانی دەهاتنە دی. ئەو پێش هەمووان جل و بەرگی نوێ و ناسکی سەوزی لە بەر کرد. کاتێک هاوڕێیانی بەخەبەر هاتن، ئەو لە ناو جلە نوێیەکانیدا بوو. لە باخچەی بێهاوتای ئاکادیمیای سەربازی دەستی بە پیاسەش کردبوو. دوای سوێند، سروود، بەرناشتا، ڕاهێنان و ژیمناستیکی بەیانی، ئەوان هەموویان ڕیز بە ڕیز — کە لە چوار کەس پێک دەهات- چوونە مەیدانی مەزن بۆ ڕێوڕەسمی سەربازی. هەموو کەس لێرە بوو، ژەنەڕاڵێک لە سەرۆکایەتیی کودەتا کە تازە دەستبەکار بوو، فەرماندەری ئاکادیمیا، ژەنەڕاڵ و ئەفسەری بلیمەت کە مامۆستای ئاکادیمیان، دوو وەزیر، بە دەیان کاربەدەستی مەدەنیی دەوڵەت، سەرۆکی شارەوانیی ئەو دوورگە و گرافەی ئاکادیمیاکەی لێیە و گەلێک کەسایەتیی دی. دەوری مەیدان بەو تۆپانەی دەدرەوشێتەوە، تەنراوە. تۆپ بە ئاڵای سێ ڕەنگ خەملیون. لە هەموو بەرزاییەکانی ئاکادیمیاش ئاڵا بە زەحمەت دەشەکایەوە و سروودی نەتەوەیی دەوڵەت و وڵات بە موسیقای ئۆرکێسترای سەربازی دەخوێندرا. ئەوان لێرە لەم ڕۆژە گەرمەی سەرەتای هاویندا ئاڵایان ماچ دەکرد، بە ناوی دەوڵەت، میللەت و سوپا سوێندیان دەخوارد و یەکەمین نیشان و دەرەجەی

سوپایان لە دەستی فەرماندارییی ئاکادیمیای سەربازی وەردەگرت.

باوک و خزمی هەرکەسێک هاتبوون بۆ ڕێوڕەسمەکە، جگە لە کەس و کاری باز. جگە لە هی باز. کێ بهاتایە؟ کێ جلی جەژن و بۆنەکانی لە بەر بکردایە و بهاتایە؟ باز کێی هەبوو کە بێت؟ بەڵام کێشە نەبوو. ئەو ڕۆژە باز دەبووە ئەندامی خێزانێکی پڕ مەزن، مەزنترین لە هەموو جیهاندا. ئەو دەبووە ئەندامی سوپا. ئەو ئەندامێتی و عایدبوونە بەشی هەموو ژیانی [بازی] دەکردا... ئەی ئەو کاتەی ژەنەڕاڵی فەرماندار هاتە پێش ئەو و لێی ڕوانی؟ مەگەر هەرگیز ئەو کاتەی لە یاد دەچێت؟ خۆزگە کەسێک وێنەیەکی لەو کاتە هەڵدەگرت. ئەو کاتە ڕووپەلێکی نوێ لە ژیانیدا دەکرایەوە، ژیانی ئەو ڕێگەیەکی نوێی دەگرتە بەر. بەژنی ڕاست، سەری ڕاست، نیگای لە پێش، بە ڕاوەستانێکی زۆر جێگیر، بە ڕێز و ڕێزدارییەکی زۆر مەزنەوە و بە جۆش و خرۆشێکی بێسنوور، ئەو شەوقی ئاسنی دەرەجەکەی کە لە دەستی فەرماندار‌دا بوو، دەبینی. دەرەجە هی ئەو بوون! بەڵێ کاتی هاتبوو، فەرماندار دەرەجەکانی لە سەر هەردوو شانی دادەنا. دوایی؟ دوایی ئەو کاتە کورتە، شتێکی زیاتر نایەتە بیری باز. لە بەر جۆش و حەیرانی، ئیدی چاوی هیچی نەدەدیت، ئیدی سەرنجی لە سەر هیچ شتێک نەبوو. دەرەجەی پێوە بوو و ببووە ئەفسەر...

ترێنی کۆن و پیسی سەربازی، قورس قورس بەو دەنگە تایبەتەیەوە دەڕوا. دەشت دەمێکەیە بەجێ ماوە. چەند دەشتی دی، زەوی و مەزرای دی، دار و درەختی دی، هەرێمی چیایی و زنجیرە چیای دی، گوند و ئاوایی دی، شار و شارۆچکەی دی، بەجێ مان. کات ڕۆیشتووە، کاتژمێر ڕۆیشتووە، کات و ژمەکانی ڕۆژ ڕۆیشتوون، موسافیر کاتیان گەیاندۆتە ئێوارە. ترێن گەیشتۆتە سەر سنووری وڵاتی چیاکان کە بە چەمێکی خوڕ دەگوێزرێتەوە سەر وڵاتێکی دیکەی جیران و دراوسێی وڵاتی مەزن.

ئەوان ئێستا وڵاتی چیاکان بەجێ دەهێڵن و لە ناو خاکی وڵاتی مەزندا بەرەو خوار، بەرەو باشوور، بەرەو وڵاتی دەشت و بیابان دەڕۆن. وڵاتی سارد لە دوا و وڵاتی گەرم لە پێش. ڕۆژ ئاوا دەبێ. دونیا، دەرو دەشت، لە ناو ڕەنگێکی مەیلەو سووردا، بە ئارامی هاوتەریبی ترێن، دەجوولێ و دەڕوا. مێگەلێکی مامز و کارمامزان کەمێک دوورتر لە ترێن لە پێش دارستانێک دەلەوەڕن، کە ترێنەکە دەبینن بە پەلە هەڵدێن و لە ناو دارستانەکەدا ون دەبن. لە سەرەوە چەند پۆل باڵندە لە لای باشووری ترێنەوە بەرەو باکوور، ئەو شوێنەی کۆچبەرانی لێوە دێن، دەفڕن و دەڕۆن. لە دوور لە بەر پێی زنارێک، ئەسپی گەردەن ڕەش، سپی و بەڵەک بەرەو خوار دادەگەڕێن و دوای چەند خولەکێک، کەمێک دوورتر لە ئەسپەکان، لە لای چەپی ترێنەوە گوندێک دەردەکەوێ. گوندێکی بێچارە، کاول، خانووەکانی بە بەردی گەوڕ ساز کراون. لە ڕۆچنەی هەندێک ماڵەوە دووکەڵ هەڵدەستێ. لەم گوندە کەس نایەتە دەرەوە بۆ بەردەرگا بۆ ئەوەی سەیری ئەو ترێنە بکات کە بە بەر گونددا ڕادەبرێ. ئاگایان لە کۆچی ئینسانی وڵاتی چیا نییە. کۆچی ئینسانی وڵاتی چیا سەرنجیان ڕاناکێشێ. ئەوان لە گوندی خۆیانن، کۆچبەریش لە ڤاگۆنەکانی خۆیاندا.

سەربازی پاسەوانی ڤاگۆنی سێهەم، لە هەر چوار لای ڤاگۆنەکە چرایان داگیرساندووە. ڕووناکیی چراکان لەگەڵ ڕووناکیی قەڵس و تووڕەی زەردەپەڕ کە لە دەرەوە ڕا لە پشت شاخ و دارستانەکانەوە ون دەبێ، شەوقێک دەڕژێنێتە ناو ڤاگۆن. باز لە بەر دەرگا لە سەر دوو کورسی دانیشتووە و پاڵیداوەتەوە. کورسییەکانی ڤاگۆنەکە تەختەکرد و ڕەقە. بەڵام باز چارەیەکی بۆ خۆی دیوەتەوە؛ سەربازەکان دوو دۆشەکیان خستۆتە سەر کورسییەکانی باز. خەڵکی ناو ڤاگۆن، بێزارن؛ جێگەکەیان تەنگە، ڕەق و ناڕەحەتە؛ برسین، تینوون، ماندوون. و

هەنووکەش نازانن بەرەو کوێ دەچن. لە ئێستاوە بۆن، بۆنی جگەرە، بۆنی ڕشانەوە، بۆنی ئارەقەیان و بۆنی میز و گووی منداڵە ساواکانیان ڤاگۆنەکەی پڕ کردووە. هەڵمێکی قورس و بۆگەن ڤاگۆنی گرتۆتەوە و هەناسەیان لە بەر دەبڕێ. پەنجەرە گەورەکانی ڤاگۆن توند لەحیم بووە و داخراوە. هەر دوو دەرگای ڤاگۆن کە پاسەوانی لە بەردایە، بەستراون. تەنیا دەرگای پێشەوە کە باز لە بەری دانیشتووە، جارجارە، گەر زۆر پیویست بێت، دەکرێتەوە. هەموو جێیەک داخراوە؛ دەوری زیندانییەکان گیراوە. خۆ جووڵاندن، خەوتن، پاڵدانەوە، هەستان، ڕۆیشتن، ڕێگە پێدراو نییە. ئەوان بۆیان هەیە تەنیا جارێک بچنە ناو ئاودەستخانەی ترێنەکە، بێگومان لە ژێر چاوەدێریی سەربازاندا. لاقی پیرەژنێک ئاوساوە، یەکێک کە بریندارە و ئازاری زۆرە لە ناوەڕاستی ڤاگۆن ڕاکشاوە، هەرچەند سەرباز هەوڵ دەدەن، لە زەوی هەڵناستێ. منداڵ دەگرین، دایکان بە زمانی خۆیان دەیانلاوێننەوە. پیر و بەساڵاچوو بە زمانی خۆیان چپەیان دێ. یەکی لاو وەک ئەوەی هیچی بە خەیاڵدا نەیەت، وەک بڵێی ئەو دوور ناخرێتەوە و لە ناو ئەو ڤاگۆنەشدا نییە، بە ئارامی بە زمانی خۆی ستران دەڵێ. ئەم کۆچە نادیارە تاوەکوو کەی بەردەوامە؟ وڵات، ئەو وڵاتە مەزنەی کە بەشی هەموو کەس دەکات، بۆچی ئاوایە؟ بۆچی بەردەوام ئاڵۆزاوە، وەک بڵێی بوومەلەرزە لێی دابێت، دێت و دەچێت؟ ئەم لا و لا دەکات و دەلەرێتەوە؟ بۆچی ئەم وڵاتە ناتوانێ وەکوو ئەو چیا، شاخ، گرد، خەرەند، شیو، درەخت، دارستان، گۆم، چەم، دەشت، زەوی و زار، بیابان و کەپر و ساباتانە ئارام بێت، سەقامگیر بێت، نەکەوێتە بەر شەپۆلی با و بۆرانی جڤاکی و سیاسی؟ هۆکار چییە؟ هۆکار کێیە؟ ئەو سەربازانە؟ ئەم ئەفسەرە کە لە تەنیشت دەرگاکە لووتبەرزانە دانیشتووە؟ ژەنەڕاڵ؟ سوپا؟ پاشای کوژراو؟ ئەوانە بۆ خۆیان؟ کێ؟ کێ؟... یان کەس نا. لەوانەیە ئەو

هەمـوو کارەسـاتە تەنیـا چارەنـووس بـێ، چارەنووسـی ئـەوان.

شـەو دادێ، هەتـاو دەڕوا، ئەسـتێرە دەردەکـەون، لێرە و لـەوێ ئاسـمان دەنەخشـێنن. ئـەوان پشـتیان، بڕبـڕەی پشـتیان دێشـێ. لـە یەکـدی، لـە زارۆکـە نوستووەکان، لـە ئەسـتێرەی دوور، گەلێـک دوورو گەشـاوە دەڕوانـن. مەگـەر ئـەو ئەسـتێرانە ئەسـتێرەکانی ئـەوان نیـن؟ ئەسـتێرەکانی کـەژ و کوێسـتان، دۆڵ و چیـا و هەڵدێرەکانـی خۆیـان نیـن؟ ئێسـتا چاویـان بڕیوەتـە ئەسـتێران و لـە کوێسـتان، شـیو و دۆل، چیـا و خەرەنـدان دوور دەکەونـەوە. بارتەقـای دووریـی ئەسـتێرەکان، ئەمـان ئێسـتا دوورن و ئـەو ترێنـەی بـە هـووژە هـووژ دەڕوا هێشـتا دوورتریـان دەخاتـەوە. ئـەوان کەنگـێ دەگەڕێنـەوە نـاو بۆنـی ئاشـنای کوێسـتان، دۆڵ، چیـا و هەڵدێران؟ نازانـن. ئەفسـەر و سـەرباز نایڵێـن. کـەس، هیـچ کـەس نازانـێ. لـێ ئـەوان دەڕۆن، لـە سـەر ڕێـی ئاسنینی نادیـار، بـێ پێزانینـی ڕۆژ، کات و زەمەنـی گەڕانـەوە، ئـەوان دەڕۆن. ئەستێرە، ئەستێرە بەزیاد نەبووەکان دڵیـان دەگووشـێ. مـاڵ و شـوێنیان دێنێتـەوە یادیـان. ئاگـری سـووری کوانووەکانیـان، ئـاوی لافاوەکانیـان، بەفـری سـپیی چیاکانیـان، هـەوای خاوێنـی گونـد و کوێسـتانەکانیان، دووکەڵـی چایخانـە و مەیخانەکانیـان و هـەوای شـەهوەتی شـەوانی پـڕ ئەسـتێرەیان دێنێتـەوە یادیـان. تەنیـا هـەر ئەوەنـدە نـا، ئەسـتێرەی بێدەنـگ، ئـارام، تـاک و تـەرا، چارەنووسـیان دێنێتـەوە یادیـان.

خـواردن دێ، ئەگـەر بکرێ پێـی بڵێـی خـواردن. جگـە لـە چەنـد شـتی سـووک کـە پێیـان بـوو، هیچیـان نەخـواردووە. ئێسـتا سـەرباز، خواردنیـان دەدەنـێ؛ سـەروو پارووییـەک نانـی وشـک، دە دەنـک زەیتـوون و چایەکـی ساردەوە بـوو لـە نـاو پیاڵەیەکـی گڵینـدا. و سـەرباز هۆشداریيان دەدەنـێ؛ دەبـێ بـە تەدبیـر بـن، تـا بەرناشـتا ئیـدی خۆراکێـک نییـە. ئـەوان چ بڵێـن؟ هیـچ، هیـچ شـتێک. لەگـەڵ هاتنـی نـان و زەیتـوون، قسـە و باسیان، چپـە

چەپ، دەم بەیەکدا دان، کۆخە و قرخەقرخیان دەبڕدرێ. نان، نانە، چ گەرم چ سارد، چ نەرم چ وشک.

باز، لاقی ڕاستی کە تەزیوە، دەجوڵێنێ، بە شەرمەوە لەو مرۆڤانە دەڕوانێ، لە جووڵەیان، نان خواردنیان، ڕوو و ڕوخساریان. باشە ئەم مرۆڤە بێچارە و هەژارانە کە هێشتا نازانن نان بخۆن، بە چ بوێری و جەسارەتێک دەخوازن لە بەرانبەر دەوڵەت سەر هەڵبدەن؟ بە چ زانست، هێز و توانایەکەوە، قسەی دەوڵەت بەجێ ناهێنن و داوای شتی دی دەکەن؟ مەگەر ئەوانە نازانن کە دەوڵەت، سوپا دەتوانێ ئەوان، هەموویان، ماڵ و موڵکیان، شوێن و وڵاتیان، بەخێرایی بروسکەیەک، بە یەکجاری هەڵبوەشێنێتەوە و لەگەڵ زەوی بیکاتە یەک؟ مەگەر لە ئەزموونەکانیان دەرسیان وەرنەگرتووە؟ چەندین جاران سەریان پان نەکراوەتەوە و سەرکوت نەکراون؟ مەگەر ئاگایان لەو ئەزموونانە نییە؟ ئەم هەژار و نەزانانە کێن کە دەم دەبەن بۆ یەکێتیی وڵات، میللەت و دەوڵەت؟ باز دەبێ ئەوان بناسێ، زۆر باش بیانناسێ، ئەو، ئەم مرۆڤانەی کە لە ڕێ لایان داوە، هەڵخڕاون و بوونەتە دارەدەستی دوژمنانی دەرەوە، قەت نەدیوە. لە هەموو ژیانی خۆیدا نە جارێک هاتۆتە وڵاتی ئەوان، نە کەسیشیان دەناسێ. لێ لە سەر ئەوان، ئالۆزی، تەشقەڵە و پێکدادانەکانیان گەلێک شتی خوێندۆتەوە. لە ئاکادیمیا باس و قسە، بەردەوام لە سەر ئەوان و کەسانی وەک ئەوان بوو. ئەوەش بەشێکی ئەو وانانە بوو لە سەر یەکێتیی وڵات و دەوڵەت، دوژمن و دوژمنایەتی، شەڕ و پاراستن بوو. مەگەر ئەو مرۆڤانە هەر ئاواش یەکێک لە هۆکارەکانی هاتنی ژەنەڕاڵ سەردار و سوپا نەبوون؟ مەگەر ئەوانەش لە ناو ئەو فرت و فێڵانەی لە بەرانبەر دەوڵەت دەگێڕدران، نەبوون کە ژەنەڕاڵەکان بەردەوام باسیان دەکرد؟ ئێستا ئەوان دەڕۆن. حەقی خۆیانە و موستەحەقی ئەوەن. دەرسیان پێویستە،

ئەدەب کردنیان پێویستە. ترس و شمشێر پێویستە، سیستەم پیویستە.

باز لە پەنجەرەوە بۆ دەرەوە دەڕوانێ؛ مانگ دەردەکەوێ، ئەو مانگەی لە شەوانی تەنیاییدا هەمیشە هەڤاڵ و هاودەمی بوو، ئێستا لەم سەفەرە درێژەشدا دەبێتە هاوڕێی. هەڤاڵێکی وەها دڵسۆز کە لە هەر دۆخێکدا، لە هەر هەستێکدا و لە هەر جێگە و شوێنێکدا هەمیشە لەگەڵیەتی. باز لە دۆستی ڕاستەقینەی کە ئێستا لە ناو ئەستێراندا دەدرەوشێتەوە، بە گەرمی دەڕوانێ. ئەو جوانییە، قەشەنگییە، ئەو دوورییە، بە هەستیاری و زویر بوونێک کە هی دوورییە! «هەروەک شیرێکی کەوانی تیژی لە کێلان دەرهاتووە»، بازشانە ماندووەکەی لە دەرەوە، بیر دەکاتەوە، «شیرێکی تیژ کە شەوق دەداتەوە، کە هەستی ڕێز و ڕێزداری، سام و ترس، سەردانەواندن و حورمەت پێک دێنێ، کە هێمای هێز و قووەت، حەق و دادە...» لە ناو هەموو ئەستێراندا، مانگ، ئارام، قورس، زوڵاڵ، کشاوە، لە هەموو ئەستێران مەزنتر، جوانتر و بەهێزتر دەدرەوشێتەوە. مانگ؛ ڕووناکیی شەوانی نەرم و گەرم؛ سەرداری ئەستێران، تاریکی و شەوان؛ ڕێبەری ڕێبواران، کۆچبەران، فەرماندە و فەرمانداره‌کان؛ پاسەوانی دار و دارستان، شاخ و چیا، دەشت و گوند، جڤات و شار، مرۆڤایەتی و مرۆڤەکان؛ شەوقی وڵاتی مەزنی بێکۆتایی کە هەمیشە لە سەر پێ دەمێنێتەوە و بەهێز دەبێ. مانگ؛ لەوێ، لە دوور ئەوەندە بێدەنگە کە سەدای بەهێزی دەنگەکان لە دڵ و هۆشی مرۆڤەکاندا پێک دێنێت.

لەشی باز خاو بۆتەوە، چاوەکانی دەبەسترێن.

لێ ترێن دەڕوا، جوغرافیای بەرفرە* و بێ سەروبەر، سروشتی بێکۆتایی، ناوچە وهەرێمەکانی وڵاتی مەزن دەگرێتە بەر و دەڕوا، قورس قورس دەڕوا. ئێوارە دەبێتە شەو، شەو دەبێتە بەیان، بەیان

---

* فراوان.

دەبێتە نیوەڕۆ، نیوەڕۆ دەگاتەوە ئێوارە. ترێن هەر بەو هووشە هووشە، بە گڤە گڤ، دەڕوا. هەوای ساردی وڵاتی چیا دەگۆڕدرێ بۆ هەوای فێنکی ناوچەکانی دیکەی وڵاتی مەزن. هەوای فێنک دەگۆڕدرێ بۆهەوای نەرم، هەوای نەرم دەگۆڕدرێ بۆ هەوای گەرم و هەوای گەرمیش دەگاتە گەرمای کوڵاندن، لێ ترێن دووکەڵ لە پاش خۆی بەردەدا، دەجمێ و دەڕوا. «هۆ ترێن، هۆ ماڵ کاول، هۆ ترێنۆ، ڕێگەکەت بەرەو کوێیە؟ لۆ ترێن، هۆ... ئێستا لە دووهەم ئێوارەی کۆچدا، کە هەتاو دیسان بە ڕەنگێکی مەیلەو سوور، ئارام، بێکەم و کوڕی ئاوا دەبێ». ئەو لاوەی کە بە زمانی کەونارای باو و باپیران بەردەوام سترانی دەگوت، بە شێوەی ئاوازی باو و باپیران سترانی ترێن دەڵێتەوە، «ئازار و ئێشی دڵی من، هۆ ترێن، مل کزی و هەژاریی من، هۆ ترێن، دە بڵێ، دەخیلی ئەو بەختەت بم، دە بڵێ...».

کۆچبەران بێزارن، نە توانایان ماوە و نە سەبر، نە خواستی پەیڤین و قسە کردن. لە لاوی سترانبێژ و چەند پیر و بەساڵاچوو کە دەناڵێنن و منداڵەکانیان زیاتر، ئیدی کەس دەنگی لێوە نایە. ڕوخساری ئەسمەریان کە بە تیشکی کۆتایی هەتاو کە لە پەنجەرە مەزنەکانەوە دەگەنە ژوور، دەبریقێتەوە، شەڵاڵی ئارەقەیە. دڵۆپی ئارەقە لە سەر تەوێڵ و ناوچەوان، چەناگە و گەردنیان دەبریقێتەوە. ڕوخساریان لاواز بووە، لەشیان سست و خاو بۆتەوە. جەستەیان بنج بووە و تەزیوە و زگ برسین. لێ ماڵ وێرانیی هەرە دژوار و گەورە ئەوەیە کە تینوون، تینوو، یەکجار تینوو. تا ئێستا بە درێژای ڕێگە هەرکامەیان تەنیا دوو پەرداخ ئاویان خواردۆتەوە. پەرداخێکی دیش تا تاوێکی تر دێت، بەڵام نەک پەرداخ و پیاڵە کە سەتڵ و دۆڵچەش دادی تینوویەتیان نادات و نایشکێنێ. لێو، دەم و قورگیان وشکە. ئیدی تفیشیان نەماوە کە تۆزقاڵێ قورگیانی پێ تەڕ بکەن. ئاو، تاسەیەک ئاو، دڵۆپێک

ئاو، قومێک ئاو... ئاو... دونیا دەسووتێ، زۆری ڤاگۆنەکە دەسوتێ و دەکولێ. جل و بەرگی گەرمیان داکەندووە، شتی زیادەیان دانە بە دانە لە خۆ کردۆتەوە، تەنیا کراسێکیان لە بەردا ماوە. بەڵام گەرمە، یەکجار گەرمە، ئیدی نە بڵندایی و شاخێک، نە باخ و بێستانێک، نە دار و درەختێک، نە ئاو و چەمێکیش لەو دەر و دەشتە دیار نییە. تەنیا زەوییەکی بۆزی کەس نەکێڵ کە شەپۆلان دەدا دیارە. ئاو، کوا ئاوی جۆگە و گۆل، چەم و لافاوەکانیان؟ کوا ئەو ئاوە فێنکەی کانی، رووبار و قامیشەکانیان؟ کوا دەنگەکانیان؟ ئاو، ئەوەندەی لاگوێلێک، مشتێک... لە ئاوی مەند، پنگاو... چی دەبێ با ببێ، کەمێک ئاو... ئەو مرۆڤە زیندووە چیاییانە، ئێستا خاو بوونەتەوە، چما لە سەرە مەرگدان. لەوانەیە بڵێی لە سەر خۆ چوون. لە دەنگی ناڵە ناڵ و لە دەنگی نائاسایی ستران بەولاوە، دەنگێک دەرنایە؛ ئەوان بوونەتە مردووی زیندوو.

باز بە سەر پێوە لە بەر دەرگا لاقی دەجووڵێنێ. ئەویش ژاکەتی ناسکی سەربازیی داکەندووە، قۆپچەکانی کراسە خاکییەکەی کە هەمیشە بەستراون، تا سەر سینگ کراوەتەوە. دڵۆپی ئارەقە لە ناو مووی رەشی سنگییەوە بەرەو خوار دەبنەوە. بن هەنگڵی، بەر زگی و ناو رانەکانیشی شەڵاڵی ئارەقە بووە. باز، بێزارە، لە گەرمای هەوای پیس و قورسی ڤاگۆن، لەو مرۆڤە بێسوود و بێ کەڵکانە، لە دەنگی ئەو لاوە جەردەیە، لە زمانە هیچ و پووچەکەیان بێزارە. بەڵام ناتوانێ بێزارییەکەی دەرببڕێ. نابێ، لەگەڵ بنەماکانی کارگێڕی و بەرپرسیارێتییەکەی نایەتەوە. لێ باز لەگەڵ ئەوان ناپەیڤێ، لەگەڵیان تێکەڵ نابێ، ناچێتە ناویان، بە تەنیا لە بەر دەرگا بە لێوردبوونەوە سەیریان دەکات. بەڵێ، باز خۆی دەگەیەنێتە قووڵایی دڵی ئەوان و تێدەگات لە قوڵایی تاریکی دڵیاندا چی هەیە.

یەکێکیان کە لە سووچی دواوەی ڤاگۆن دانیشتووە، هەڵدەستێ، دێت و بەرێزەوە هەر دوو دەست لە سەر یەک لە بەر دەم باز ڕادەوەستێ. باز ئارەقەی ناوچەوانی دەسڕێ، بێدەنگ لەو پیاوە درێژە، باریکە چاو گردە سمێڵ باریکە دەڕوانێ، لەو پیاوەی کە کەمێک سەری خۆی کز کردووە، دەنگێک دەرنایە، ئەو ڕادەوەستێ. باز بە تووڕەییەوە دەڵێ «چییە»؟ پیاوەکە کەمێک خۆی کۆ دەکاتەوە و بە شەرمنی بە زمانی باز دەڵێ «ئاو» ستوانی بەرێز... کەمێک ئاو... بۆ من نا، بۆ خێزانەکەم کە خەریکە منداڵی دەبێ... ئەو دووگیانە... ئەو زۆر قورسە، لە بەر ئەو منداڵە، لە ناوەوە دەکوڵێ... ئەمڕۆ، سبەی... هەر ئەوەندەی کەمێک ئاو...» قسەی نیوەچڵی پیاوەکە لە وریاییەوە، زاراوەی وەک زاراوەی ئەوانی دی خراپ و لێک ترازاوە. کراس و پانتۆڵی لە بەردایە. لە ڕاوەستانەکەیەوە دیارە کە ئەم پیاوە خوێندەوارە. باز بە دەنگێکی نەرمتر لێیدەپرسێ: «ئیشی تۆ چییە؟ بۆچی لە ناو ئەمانەدای؟»

«پارێزەر، پارێزەری... نازانم... وا دیارە هەڵەیەک ڕوویداوە» پیاوەکە شەڵاڵەی ئارەقە، بێ ئەوەی بجووڵێ، نیوەی قسەکانی دەخواتەوە و دەیڵێ و بە پاڕانەوە و تکاوە لە باز دەڕوانێ. باز بە چەند قسەی کورت سەربازەکەی تەنیشتی دەنێریتە چێشتخانە تا دەفرێک ئاو بێنێت و پیاوەکەش بەرەو دوا دەنێریتەوە سووچەکەی خۆی. ژیان لە ترێن و ڤاگۆنی سێیەم ئەوەندە زیز بەردەوام دەبێ دەڵێی هەنگاو بە هەنگاو بەرەو مەرگ دەڕوات، - تاوەکوو بگەینە دوایین هەنگاوی ئەم سەفەرە؛ پاش نیوەڕۆی ڕۆژی سێهەمە. سێ ڕۆژ و دوو شەو بە سەر کۆچدا تێدەپەڕێ. کەس لە کۆچبەران نەمردووە لێ کەسیش ساخ نەماوە. نیوە مردوو، بە هەموو حاڵەت، تایبەتمەندی و لایەنی کەسانی نیوە مردوو لە ترێن دادەبەزن. ئەوان گەیشتوونەتە کۆتایی سەفەر و

سەرەتای ژیانی نوێی تاراوگە، گەیشتوونەتە شوێنی نوێی ژیانیان لە وڵاتی غەریبی. دوای قیرە، فەرمان و قسەی ئەفسەران، یەکەم شت کە بەخێرهاتنیان دەکات، هەتاو و ڕووناکی و شەوقی ڕووناکییە. هەموو جێگەیەک خۆرە، دونیا لە ناو خۆرەتاودا بەردەبێتەوە، دەر و دەشت گرمۆڵەی ناو خۆرەتاوە. شەوقێکی تیژ و بەهێزی نەبینراو چاویان دەگرێت. دوای ماوەیەکی درێژ دەتوانن چاوەکانیان بکەنەوە و سەیری دەور و بەری خۆیان، وڵاتە نوێکەیان بکەن. بۆ دەور و پشتی خۆیان دەڕوانن، دەگەڕێنەوە و لە یەکدی دەڕوانن و دیسان سەیری دەر و دەشت دەکەن و گەرمایەکی توند بەر جەستەیان دەکەوێت. جەستەیان دەهەژێ، دڵ و مێشکیان دەگووشرێ، پیر و بەساڵاچووکانیان لە سەر ئەژنۆ دادەنەونە سەر زەوی. نا، نەک زەوی، سەر لم.

بەڵێ، لمە، لم و خیز، بە تەنیا لم و خیز. تا چاو بڕ دەکات و ئاسمان دیارە لمە، تەنیا لم، لمێکی زەرد کە قەتیان نەدیوە، لمێکی گەرمی سنووری کە تەنیا لە چیرۆکەکاندا بیستوویانە. بیابانێکی بێکۆتایی لە پێش چاویان شەپۆلانیەتی. نە خاک، شینایی، زەوی، باخ، باخچە، بێستان، نە دار، دەوەن، ڕەگ و ڕیشە، نە گوڵ، چەم، ڕووبار، لافاو، جۆگە، پەنگاو، کانی و بیر، نە دەریاش. نا هیچ شتێک، لە لم زیاتر هیچ شتێک نییە؛ هەموو ئەو شتانەی ئەمان لەگەڵی و تێیدا هاتنە دونیا و گەورە بوون، نین. ئەوانە هەموو لە وڵاتەکەیان بەجێ مان. سێبەری قەڵا کەوناراکان کە لە سەر لوتکەی چیا و کەناری ڕووبارەکان درووست کراون، داڵدە و شاراوەیی ئەشکەوت و موغارەکانیان لە قووڵایی شیو و خەرەندەکاندا، فێنکایی کوێستانە بڵندە سەرسەوزەکانیان کە بە ڕەشماڵان نەخشێنراون، حزووری زیارەتگای ئایینیی بەجێماو لە هەزاران ساڵ پێشەوە، گەورەیی پردە مێژووییەکانیان کە لە سەر ئاو و لافاو، ڕێگەی وڵاتی سەخڵەت دەگەیەنێتە یەکدی، لە دوور، زۆر دوور

بەجێ مان. ڕۆح و گیانیان، ژیانیان لە وڵاتەکەیان مایەوە. هاتنە وڵاتی بیابان و لم. ئێستا تێدەگەن؛ دوور خراونەتەوە بۆ وڵاتی چۆڵ و ونبوو- تاوەکوو دێ زیاتریش ون دەبن. ئەگینا ئەو وڵاتەی کە تەنیا لە لم پێک هاتووە، ئەو گەرمایەی نە تەنیا لەش و جەستە، کە ڕۆح و مێشکیش سیس دەکات، ئەو ڕوناکییەی کە نەک وەک ڕوناکیەکەی خۆیانە و بە تیشکی خۆی هەست و سۆزی مرۆڤەکان دەکوژێ، دێ ببێتە وڵاتی نوێی ئەوان، دەبێتە وڵاتی تەنیاییان، تێکڕووخان و ون بوونیان. ئەوان ئێستا تێدەگەن؛ ئەم وڵاتە بێدەنگە، بێ ئاوە، بێ سێبەرە، بێ درەختە، بێ ژیانە دەبێتە وڵاتی مەرگیان. لە کوێوە تا کوێ؟! لە باکوورەوە تا ئێرە، کۆتایی وڵاتی مەزن، کۆتایی دونیا و ژیان.

چارە؟ چارە نییە. ئەوان هەر بەو جۆرە هەندێکیان لە سەر لم، هەندێک بە پێوە، بە سەدان کەس لە وڵاتی بێکۆتایی لم دەڕوانن. شنەیەکی سووکی باشوور دەدا لە ڕوخساری ماتیان. لێ بایش، لە بای لای خۆیان ناچێت؛ گەرمە، هەناسەیان لە بەر دەبڕێ. گەرما، گەرمای هەتاو، ڕووناکی، لم و با ئەوان دەسووتێنێ، جەستەیان، دڵیان دەکوڵێنێ، ئارەقەیان دەکوڵێنێ و هێز و توانای دواییان ئەوەندەی ماوە، لێیان دەستێنێ. هەندێک ژن و پیرەژنیان، لە سەر لمی سووتاو، لە سەر چۆک دانیشتوون، ماتماو و لەش و گەردن ئارەقاوی، ڕوخسار تەرەکاو، لێو قڵەشاو، ماندوو، تینوو، برسی، دەگرین و بە زمانی خۆیان، بە دەنگێکی زیزی شینگێڕانە، دەنرکێنن، «بۆچی؟ هەی لۆ چارەنووسی بەقۆڕاچوو بۆچی؟ مەگەر مردن لەمە باشتر نەبوو؟ مەگەر بە زیندوویی بیانخستینایەتە گۆڕی ساردی وڵاتی کوێستانان، لەم گۆڕە گەرمە باشتر نەبوو؟»

نە مرۆڤ و ئافرێنراوێک، نە باڵدار و باڵندەیەک. لە سەرباز و ئەفسەر بەولاوە هیچ شتێک لە زەوی و ئاسماندا دیار نییە. ئەفسەر و

سەرباز، دیسان ئەوان بە ڕیز دەکەن و ڕیز بە ڕیز بە پێیان لە دوا وێستگەی وێرانی ترێن دووریان دەخەنەوە. لەو گەرمای دۆزەخەدا پاش ماوەیەک، دوای گردێکی لە لم پێک هاتوو، چەند دارێک کە کۆچبەر لە ژیانی خۆیاندا نەیاندیوە و خانووی تەنەکە، دەردەکەون. خانوویەک لە تەنەکە، دوو، پێنج، دە، بیست، پەنجا، سەد... و سەرباز ئەگەرچی نە ئەوەندەی لمیش بن، لە پێش پاش و دەور و بەری خانووە تەنەکە و تەختەییەکان دیارن. ئەو کەپرانە، ماڵە نوێیەکانی ئەمانە. ئەوان دەبێ لێرە، لە ناو لمی مردوو، وڵاتی مردوودا، بژین.

بەڵام لە سەرەتای ژیانی مردوودا، ژیانێکی نوێی زیندوو هەیە؛ دانەیەک لە قارەمانەکانی ڕومانەکەمان پاش ژماردن، سپاردن و جێگیر بوونی کۆچبەران، ڕۆژی دواتر، پاش سەرمای شەوی بیابان و پێش گەرمای ڕۆژ، بەرەبەیان، کاتێک باز و ئەفسەرەکانی دی لە بارەگای ئەفسەران دێنە دەر تاوەکوو ڕێبکەون و بگەڕێنەوە، باز لە بەر دەرگایەکی بچووکی بارەگایەک، ئەو پیاوە سمێڵ باریکە پارێزەرەکە دەبینێ. پارێزەر سڵاو لە باز دەکات. باز وەڵامی دەداتەوە، کەمێک لە دەستەی ئەفسەران جودا دەبێتەوە و بەرەو پارێزەر دێت. بێ ئەوەی هیچ نیگایەکی دیار بە ڕوخساریەوە دیار بێت، باز لە حاڵی پارێزەر و ژنەکەی دەپرسێ. پارێزەر بە دەم بزەوە دەڵێ: «خەو نەچووەتە چاوی ئێمە و خزمەکانمان... منداڵەکەمان لە دایک بوو»، «ناکرێ هیوا لە بەزەیی خودا ببڕدرێت، مرۆڤ نازانێ چی لە ڕێگەیەتی... کچێکمان بووە» باز چی بڵێ تەنیا لە بیلبیلەی چاوانیدا تروسکەیەکی خۆشحاڵی هەیە، سەری دەلەقێنێ. «فەرموو، وەرە ژوورەوە». پارێزەر بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامێک بێت وا دەڵێ و خۆی دەکێشێتە کەنار تا باز بێتە ژوورەوە. ناو خانووەکە لە چێشتخانە و ژوورێکی بچووک پێک دێت، ڕووناکە. ژنی پارێزەر لە سەر تەختێک لە سووچەکە، ڕاکشاوە و

شیر دەداتە منداڵە تازە لە دایک بووەکە. کە چاوی بە باز دەکەوێ، خۆی و لانکەکە ڕوودەکاتە لایەکی دی تاوەکوو باز سینگی نەبینێ. پارێزەر دەچێتە لای خێزانەکەی و منداڵەکەی بە ئارامی لێ وەردەگرێ و دەیهێنێ نیشانی بازی دەدات.

باز حەیران و مات لە منداڵی باوەشی باوک دەڕوانێ؛ منداڵێک، پەرییەکی جوان... چاوە بچکۆلەکانی هێشتا باش نەپشکوتوون، ڕوخساری بچووکی خڕی ڕووناک، لووتی وەک لووتی کەروێشکێک دەلەرزێ، دەستە بچووکەکانی دەجووڵێن، پەنجە و ئەنگوستی یاری دەکەن، بۆنێکی گەرم و ترشاوی تایبەتی کە باز هەرگیز نەیبیستووە، لێ دێ. باز ئەنگوستی گەورەی دەستی ڕاستی دەداتە دەستی، منداڵ بە دەستی چەپی کە لە مەچەکیدا نیشانەیەکی ڕەشی بچووکی پێوەیە، ئەپەنجەی باز توند دەگرێ.

بەڵێ ئەو منداڵە کۆترە.

بەڵێ بەسەرهاتی کۆتر ئاوا دەست پێدەکات.

٤

# شایی

بەسەرهاتی کۆتر کە خۆی دواتر لە دایک و باوکییەوە دانە بە دانە لێیان ئاگادار دەبێت، وەها دەست پێدەکات. بە وڵاتی غەریبی مەرگ. بە هەتاو و گەرما. بە لم و بیابان.

باز؛ منداڵی مەرگ.

کۆتر؛ منداڵی دوورخستنەوە و شاربەدەری.

ئێستا؟

ئێستاش ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ شاری گەورەی پایتەختی وڵاتی گەورە، شوێنی ژەنەڕاڵ سەردار. تا ئێستا ئێمە بەسەرهاتی بەکۆمەڵمان دەگێڕایەوە، ئێستا ڕوو لە کەسەکان دەکەین و دەگەڕێینەوە بۆ دڵی وڵات و دەچینە هۆڵی ئەفسەران و کەمێکی دی لە باز نزیک دەبینەوە. ئەمڕۆ ئێوارەیەکی ساماڵی پاییزێکە، و باز هاوسەرگیری دەکات. ئەمڕۆ بەسەر ڕۆژە سەرەتاییەکانی کودەتا، کۆچ و هات و چووی چڕ و پڕدا دە ساڵ تێپەڕیوە. باز کە لەو ڕۆژانەدا وەک ستوانێک دەستی بە ژیانی ئەفسەری کردبوو، ئێستا بووە بە سەرهەنگێکی ناودار. باز بڵند و پایەبەرز بووە، پلە و دەرەجەکانی زیادیان کردووە، داهاتی زیاتر بووە. لە هەمووشی گرینگتر، باز بەشێک لە خەون و خەیاڵەکانی هێناوەتە دی، ئەوەشی

ماوە دەیهێنێتە دی. لە ئامانج و مەبەستەکانی ژیانیدا، هەنگاو بە هەنگاو سەردەکەوێ. ئەم ئێوارە لە هۆڵی ئەفسەران لە پایتەختی وڵاتی مەزن، باز هەنگاوێکی نوێ هەڵدەگرێ و هاوسەرگیری دەکات. لەگەڵ کچێکی کەمێک خرپن، قژ زەرد، گەردن گەوهەر، چاوشین، جوان، و خەندەڕوو- کە ئێمە پێی دەڵێین خانمی باز. هەر ئەوەندە؛ خانمی قژ زەردی باز.

ئێوارە دەستی پێکردووە، کەسانی بانگهێشت کراو کە هەموو ئەفسەر و خێزانەکانیان دەگرێتەوە، هاتوون. هۆڵی گەرمی ئەفسەران، لە ناو ڕووناکیی کارەبادا دەدرەوشێتەوە. هەموو لایەکی هۆڵەکە بە وێنە و کاغەزی زێڕنەخش و ئەستێرەی زیوین خەملێندراوە. ئۆرکێسترای سەربازی کە بەردەوام سروودی سەربازی دەژەنێ، ئێستا لە تەنیشت شانۆی دانس و سەما موسیقایەکی ئارام دەژەنێ. لە هۆڵی مۆدێرن، چل مێزی گەورە و گرد بە گوێرەی سیستەمی شایی دانراوە. مێز بە گشتی پڕ بوون. میوانان بە جل و بەرگی سڤیلی خاوێن و نوێوە لە پشت مێزەکان دانیشتوون و شێو و نانی ئێوارە دەخۆن.

بووک و زاوا، واتا باز و خانمی قژ زەرد کە ئێستا، پاش کەمێکی دی، کاتێک کە مارە بڕدرا، دەبێتە خانمی باز، لە دەوری مێزێکی بچووکتر لە تەنیشت مەیدانی سەما کەمێک لەو لای ئۆرکێستراکەوە، بە تەنیا خۆیان دانیشتوون و نان دەخۆن.

هەموو شت تەواوە، هیچ کەم و کووڕییەک نییە. هۆڵی ڕووناک و گەرم، خواردن و خواردنەوەی هەرەباش، باشترین ئۆرکێسترای هەموو ئەرتەش، موسیقای نەرم و جوان، ڕاخستن و نەخشی جوان، کار و بارێکی باش و ڕێکخستنێکی ڕێک و پێک. میوانی بژاردەی هەموو وڵات، ئاهەنگ و بەزمی بێوێنە، گەرمایی و کەیفخۆشی، ڕابواردن و هاوڕێیەتی... ئەم ئێوارە هەموو شت تەواوە. تەنیا کەمییەک هەیە؛ ژەنەڕاڵ سەردار. ژەنەڕاڵ سەردار نەهاتووە، لێ هەواڵی ناردووە کە شەو

درەنگان دێت. ژەنەڕاڵ سەرداریش دێت! باز خۆشحاڵە. باز بەختەوەر، سەربڵند و سەرفرازە؛ بە جۆش و بە خرۆشە، باز لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانیدا دەکاتەوە. ئەو ژیانی خۆی لەگەڵ برازای ئەفسەرە سمێڵ قیتەکە، کە هەمیشە وەک باوکێک خاوەندارێتی لە باز کردووە، دەکاتە یەک. لەم ئێوارە بە دواوە، ئیدی ناو، بەژن و باڵا، تام و ڕەنگ، هەستان و دانیشتنێکی دیش لە ناو لاپەڕەی ژیانی بازدا دەبێ. ژیانی ئەو ئیدی دەبێتە ژیانی دوو کەس.

باز تاقمێک جلی ڕەشی لە بەردایە، کراسێکی سپی و بۆینباخێکی سووری خاڵ خاڵ. پێڵاوە نوێیە ڕەشەکانی دەدەروشێنەوە. ڕوخساری و ڕیشی تاشراوی شەوق دەداتەوە. بیلبیلەی چاوە بچکۆلەکانی دەبریقێنەوە. بووک لە جل و بەرگی سپیی بووکێنیدا لە پاڵ باز دانیشتووە، لە ژێر چاوەوە، بە بزە لە باز و دەور و بەر دەڕوانێ. تەمەنی زیاتر لە بیست و یەک و بیست و دوو نییە. بازیش گەشتۆتە سی. سەرەتای ژیانی ئەفسەری، ڕۆژانی غەددار، ساڵانی فێربوون بەسەر چوون. ئێستا باز، ئەفسەرێکی زانا، تێگەیشتوو، جێی باوەڕ و خاوەن بەرپرسارێتییە. ئێستا باز ئیدی شاگرد و بەردەست نیە، وەستایە، و ئێستا لە ڕۆژان و تەمەنی کامڵ بووندا هاوسەرگیری دەکات.

باز لە بەر خۆشحاڵی، جۆش و خرۆش و ماندوویەتیی چەند ڕۆژەی ئامادەکاریی ئاهەنگ و شاییەکە، ناتوانێ بە باشی نانەکەی بخوات، جارجارە پلە گۆشتێک دەخاتە دەمییەوە و هێدی هێدی دەیجوێ و قووتی دەدات. سەیری دەور و بەری خۆی دەکات و بیر دەکاتەوە، ئەو کەسانەی لێیان گێڕاونەتەوە*، ئەفسەر و کەسایەتیی ئەرتەش و دەوڵەتن. ژەنەڕاڵ، فەرماندار، ئەمیر، نەقیب و ئەفسەری هەڵبژاردەن کە هاتوون. لە ناو ئەواندا ئەمیر، فەرماندار و سەربازەکانی بازیش هەن، هاتنی

* لە شێوەزاری موکریانی بە مانای بانگهێشت کردن دێت.

ئـەوان شـتێک نیشـان دەدات؛ بـاز سـەرکەوتوو بـووە، بـاز سـەردەکەوێت.

لـە سـەرووی مەیدانـی سـەمادا، لـە ژوور سـەری ئۆرکێسـترا بـە پیتـی مەزن و زەرد لـە سـەر قوماشـێکی سـووری پـان و درێـژ نووسـراوە؛ «پیـرۆز بێـت». بەڵـێ، پیـرۆز بێـت... کـوڕە هەتیـو، کەسـی بێکـەس لێـت پیـرۆز بێت. باز بیـر دەکاتـەوە. ئـەو نوسـراوە هێمـای ئەوەیـە کـە بـاز ئەندامێکـی بـژاردەی خیزانێکـی مـەزن، واتـا ئەرتەشـە. و لـە سـەرووی جـاو*ی سـوور و زەردیش، وێنەیەکـی گـەورەی ژەنـەڕاڵ سـەردار کـە بـە دەسـتی هونەرمەندێک کێشـراوە، هەڵواسـراوە. ژەنـەڕاڵ سـەردار لەوێـوە بـە چـاوی چاوەدێـران، بـە نیـگای تیـژی، بـە سـمێڵی بۆقـی، لـە هـۆڵ و لـە بـاز دەڕوانـێ. ژەنـەڕاڵ سـەردار، وڵاتپارێـزی هـەرە مـەزن، ڕزگاریـدەری وڵات، ڕێبـەر و سـەرداری میللـەت؛ فەرمانـدەی گـەورە، سـەرمایەی وڵات، دەوڵـەت و میللـەت. ژەنـەڕاڵ سـەردار؛ باوکـی مینۆکیـی بـاز؛ ئەسـتێرە و مانگـی شـەوانی؛ هەتـاوی ڕۆژانی، ڕێبـەری ژیانـی. و ژەنـەڕاڵ سـەردار دێـت و شـەرف دەبەخشـێتە ئـەو و شـاییەکە...

بەڵـێ، لاپەڕەیەکـی نـوێ... بـاز هەمـوو شـتێکی کـرد، هەمـوو داخوازییەکانـی جێبەجـێ کـرد، هەمـوو خـەون و خەیاڵەکانـی یـەک بـە یـەک هێنایـە دی. ئێسـتا لاپەڕەیەکـی نـوێ هەڵدەدرێتـەوە. نـا، هەڵنادرێتـەوە، یەکـی نـوێ بـەو لاپەڕانـەی تـا ئێسـتا ژیـاوە، زیـاد دەبێـت. لاپـەڕەی چـی؟ لاپەڕەکانـی ژیانـی زۆرن؛ لاپەڕەی سـەربازی و ئەفسـەری، لاپەڕەی هاوڕێیەتی و دۆسـتایەتی، لاپـەڕەی گەمـە و خۆشـحاڵی، لاپـەڕەی خـواردن و خواردنەوە، لاپـەڕەی ژیانـی جڤاکـی و کۆمەڵایەتـی، لاپـەڕەی عەگیـدی و قارەمانێتـی... لـێ ئـەی [لاپـەڕەی] نـوێ؟ ئـەوی نـوێ لـە چـی زیـاد دەبێـت؛ کـچ و ژن، لـە لاپـەڕەی کچـان و ژنـان. لـە لاپـەڕەی هـەرە گرنـگ، هـەرە ڕەنگینـی ژیانـی.

لـە ڕۆژانـی تاریکـی، منداڵـی و لاویـدا، زیاتریـن خـەون و خەیاڵەکانـی لـە

---

* قوماش، قوماشی سپی.

مەڕ کچ و ژن بون. ژن، هەمیشە پێش هەموو شتیک؛ دایکێکی دڵگەرم، دڵپاک و دڵسۆز بوو کە ئامێزی خۆی بۆ بکردایەتەوە، بانگی کردبا، لە ئامێزی گرتبا و لە ناو سینەیدا بیحەواندایەتەوە. ئەو بە هەستی، هۆشی، مێشک و ژیانی، دایکێکی دەویست. دواییش، خوشکێک، باجییەک، هەواڵێک، یارێک وَ خۆشەویستێک. بەڵام ژن. بۆ ئەو، بۆ پیاوەتییەکەی کە وشیار دەبۆوە، بۆ ژیانی پیاوەتی، دونیای پیاوەتییەکەی، ژن پێویست بوو. ساڵانی ئاکادیمیای سەربازیی ساڵانی سووتان و ئازاری خەیاڵی کچ و ژنان بوو؛ ساڵانی غەدداری بە خەبەر هاتنەوەی جەستە، ساڵانی ویستی بێکۆتای کچ و ژن، بەڵێ ئەو ساڵانە، ساڵانی سەرفرازی، سەربڵندی و سەرکەوتنیش بوون. باز لەو ساڵانەدا بوو بە باز. ئەو ساڵانە، ڕێگەی ئەمڕۆ، ئەم ئێوارەیان بۆ کردەوە. لێ لە لایەکی دیش؛ شەوانی درێژی بێ ئەژماری ئەو ساڵانە یەکجار سەخت بوون. هەر شەوێکی بە تەنیا ژیانێکی دۆزەخ بوو. ئەو شەوانە، شەوانی ساردی تەنیایی. تەمەنێکی جوان، جەستەیەکی بەهێز و شەوانی تاریک و بەتاڵ.. ژیانی ئاکادیمیا، دەور و بەری باز و شەوانی، تەنیا هی پیاوان بوو. هاوڕێیەکانی، ئەو خوێندکارانەی لەگەڵ ئەم دەیانخوێند، سەرئەفسەرەکانی، مامۆستا و فەرماندارەکانی، چێشتخانە، خوێندنگا، حەمام، هۆڵی خەوتن، هەموو پیاو بوون. بەڵام ئەو ژنی دەویست، ژن، ژن...

لەگەڵ خەیاڵی ژن چاوەکانی دەچووە خەو، بە خەونی ژنان لە خەو رادەبوو؛ قژی درێژیان، ڕوخساری کراوەیان، نیگای نەرم و گەرمیان، لێوانی شیرینتر لە هەموو شیرینییەکی جیهان، گەردنیان، گەردنی بەرزیان، سینگ و مەمکیان، گۆیی قاوەیی مەمکەکانیان، جۆرەکانی سینگ و مەمک؛ گەورە، بچووک، داکەوتوو، داکشاو، خڕ، زگ و بەرزگیان، بەر زگ؛ دارستانێکی بچووک کە پێی وەک کەوان کشاوەیان دەنەخشاند، دەور و بەری قڵەشەکەیانی دەخەملاند، ڕەشایی بەر زگ،

ناوەندی خەون و خەیاڵەکانی باز، ئەو شوێنەی کە فانتازیاکانی بازی تێدا ون دەبوو، ئەو شوێنەی کە باز لە حەسرەتیدا دەمرد، ڕانی خڕ، لاقی وەک ستوون و بەدەنی نەرم و گەوهەرینی ژنان... ئەوانە هەموو لایەنی جوان و شۆخ و شەنگی ژیانی ئینسانی بوون. ئەوانە؛ ژن. ژن؛ هەبوونی باز، ژیانی باز، باز بیری لەوانە دەکردەوە، بەردەوام لە هەموو شوێنێک بە تایبەتی شەوان و نیوەشەوان، دەستی لە ناولنگی، ئەنگوستی لە سەر «سەربڵندییەکەی»، چاو نووقاو، بیری لە لنگی جۆراوجۆری ژنان دەکردەوە. لنگی لە یەک دەکردەوە، سەیری ناو لنگ و دواتریش دەچووە ناویانەوە، سەرەتا ئەوەندەی قامکێک، دواتریش ئەوەندەی بستێک، دوای ئەوەش هەموو جەستەی، هەموو بوونی. و ئەو کات ئەنگوست و دەستی تەڕ دەبوون، تۆواوی لیێڵ لە نێوان قامک و پەنجەکانی دا بەڕێ دەکەوت. جارێک، دوو جار، سێ جار، جاری واش بوو بە جاران. پێش خەوتن، پێش هەستان، لە حەمام، لە ئاودەست، لە هەر شوێنێک کە دەرفەتی هەبووایە، هەنگاو بە هەنگاوی ئاکادیمیا بە تۆواوی بێپایانی باز ئاو درابوو.

پاش تەواو کردنی ئاکادیمیا و قۆناغی خوێندن، ڕێگە بۆ باز ئاوەڵا بوو تاوەکوو بتوانێ خەون و خەیاڵ و فانتازیاکانی بخاتە بواری ژیانەوە. ئیدی کات، کاتی ئەزموون کردن، تام کردن و ژیان بوو. ئیدی دەیتوانی ئەسپی فانتازیاکانی لە ناو مەیدانی شەهوەتدا غار بدات. ئەو ئاوەهای کرد؛ کچی ناسی، ژنی ناسی، بە بەدەن و جەستەکان ئاشنا بوو، دارستانی تاریکی جۆراوجۆری ناسی. جۆرەکانی مەمک، کون و قلەشی ناسی؛ چاو و لێوی ناسی، دەنگ و ئاخ و ناڵەی تێکەڵی شەهوەتی ناسی. شەوانی سووتان و ئازاری دۆزەخ، بوون بە شەوانی بەهەشت. تەنیایی تەواو بوو. شەوان ئیدی سارد و تەنیا نەبوون. هەمیشە، هەموو جار، هەر کات باز بیویستایە، دەیتوانی لە ناو چوار، پێنج یان شەش

کچ و ژندا، یەکێک هەڵبژێرێ و بانگی بکات. لە هەر چوار لای پایتەخت، کە باز لەوێ لە قەرارگەی بڵندی ئەرتەش دەوامی دەکرد، دۆستی ژنی هەبوو. ئێستا کاتیک پارچە گۆشتێک دەخاتە ناو دەمی خۆی و جامی بادە دەباتە سەر لێوی، لە ژنی ڕۆژانی داهاتووی دەڕوانێ، بیر لە دۆست و هاوڕێیانی ڕۆژانی ڕابردووی دەکاتەوە.

کچێکی قژ زەردی خوێندکار هەبوو. باڵابەرز، تازەپێگەیشتوو، پێکەوتە و چاوشین. کاتێک کچە سەر لە ئێواران لە زانکۆ دەهاتە دەر، باز، لەوێ، لە بەر دەرگای مەزنی زانکۆ بە جل و بەرگی سەربازییەوە چاوەڕوانی ئەو دەبوو. کچە سواری ئۆتۆمبیلەکەی باز دەبوو و پێکەوە ئارام ئارام بەرەو ماڵی باز دەچوون. ماڵی باز لە کەناری ڕووباری مەزنی ناوشار لە گەڕەکێکی سەربازی بوو. ئاپارتمانەکانی شارۆچکەی سەربازی لە دوازدە نهۆمدا ساز کرابوو و ئاپارتمانەکەی بازیش لە نهۆمی یازدە بوو. لێرەوە هەموو شار؛ ڕووباری نازەنین کە لە بەر تریفەی مانگەشەو دەدرەوشایەوە، ئۆتۆمبیلی ناو شەقام و کۆڵانان، گڵۆپی بێ ئەژماری ناوشار، هەر هەمووی دیار بوون. باز حەفتەی دوو جار کچەی دەدیت. هەر جار کە کچەی دەدیت کراس و دەرپێی ئاوریشمینی جوانی بۆ دەکڕی. کاتێک دەگەیشتنەوە ماڵ، باز دەمانچە و جل و بەرگی سەربازی دادەکەند، جل و بەرگی کچەشی دادەکەند، ڕووتی دەکردەوە و بە دەستی خۆی کراس و دەرپێی نوێی پێ دەپۆشا و دواتر بە ڤۆدکای جین-تۆنیک شەویان دەست پێدەکرد. لەو شەوانەدا باز بێسنوور دڵخۆش بوو؛ ئەو جل و بەرگی لە بەر کچە دەردەهێنا، کراس و دەرپێی لە بەر دادەکەند و ڕووتی دەکردەوە و لێی دەڕوانی، بە دەققان، بە خولەکان، بە کاتژمێران. ئەم کارە بازی دەهێنایە جۆش، دڵخۆشی و شەهوەتێکی نەناسراوی دەدایە و بە سەرخۆشییەوە جەستەی کچە و ڕاز و نهێنییەکانی سەر لە نوێ کەشف دەکردەوە. جارجارەش بە مەودایەکی

درێژ. و باز بە تۆواوی خەستی خۆی، کچە و ڕاز و نهێنییەکانی و تەواوی جەستەی ناو دەدا.

ڕۆژێکیش باز لەم هۆڵەی کە ئێستا تێیداین ژنێکی مامناوەندی ڕەشتاڵەی ناسی. ژنە لەگەڵ چەندێکی دی لە سەر مێزێکی دوور دانیشتبوون، سەر لە ئێوارە بوو، باز لە دەوام گەڕابۆوە، لێرە بە تەنیا لە بەر پەنجەرە گەورەکەی نزیک باخچە دانیشتبوو، لە دارەکانی ناو باخچەی دەڕوانی و ڤۆدکایەکی ساردی لیمۆنی دەخواردەوە. وا دیار بوو کە ژنە پێشتر ئەمی دیبوو. چونکە کاتێک چاوی بە ژنە کەوت، چاوە پڕ لە کلەکانی ژنە لە باز بوو. بە نیگایەکی هەوەسبازانە، بە چاوی پڕ بزە و نیگای داواکارەوە. بازیش کە سەری ئەسپی خۆی شل کردبوو و بە شوێن نێچیرەوە بوو، ئەم دەرفەتەی لە دەست نەدا، ئەنجامی ئەم نیگا و چاو تێبڕینانە دیار بوو؛ ئەوان بوون بە دۆست. ژن لە کاری خۆیدا وەستا بوو، لە شەوانی زێڕنەخشی پایتەختی وڵاتی مەزندا، دەست، ئەنگوست و زمانی ژنە، هەموو جەستەی پێنەگەیشتووی بازی دەست بە دەست، بست بە بست پەروەردە کرد. پەنجەی ژنە بوونە مەرهەم، زمانی بوونە دەرمان و بەدەنی تۆزێ خڕی بووە کانی ناڵەی شەهوەت. باز کە هێشتا لە هونەری ئەشق و ئاشقیدا بەردەست و شاگرد بوو، بە گەمە و گاڵتە و یاریی ژنی زانا و خاوەن ئەزموون لە ماوەیەکی کورتدا بووە وەستا. بەڵێ، ژنە دەیزانی چ دەکا؛ ئەو، باز، هەموو گیانی باز، گیان و ڕۆحی بازی ڕادەکێشایە دەروونی خۆی و نەیدەهێشت دڵۆپێک تۆواوی باز بە فیڕۆ بچێت. باز کە بەردەوام خەریکی ئاودێری کردنی دەر و دەشت بوو، ئیدی ببوە ئەسیری ژنە؛ ژنە هەموو تۆواوەکەی قووت دەدا. سەرەتا حەفتەی جارێک یەکیان دەدیت، دواتر بوو بە دوو جار، دواتریش سێ و کاتێک هات کە ئیدی ژنە بە هەر شێوەیەک بوویێت هەموو شەو دەهاتە ماڵی باز. کاتێک دەنگی زەنگی ماڵەکە دوو

جاران تیژ لە سەر یەک لێدەدرا، ئەو کات باز دەیزانی کە ژنە لە بەر دەرگایە. «ئەز هاتووم ئەفسەرە قارەمانەکەم بخۆم»، ژنە وای دەگوت و بێ ئەوەی شتێکی زێدەتر بڵێ دەستی بە کاری خۆی دەکرد. پاش ماوەیەک ژنە هاوڕێیەکی خۆی کە کەمێک لە خۆی کورتتر و خڕتر بوو، لەگەڵ خۆ هێنا. ئێوارەیەک کاتێک باز دەرگای کردەوە دوو ژن لە بەر دەرگا بوون. «ئێمە هاتووین ئەفسەرە قارەمانەکەمان بخۆین»، ژنە وای وت و هەر دوو هاتنە ماڵەوە. ئەوان بوونە دوو ژن. دوو ژنی لێزان لە کار و باری خۆیان. باز هیچ لارییەکی لەمە نەبوو؛ ئەو خۆی و جەستەی خۆی تەسلیمی دەست و پەنجە و زمانی ژنە هونەرمەندەکان کرد. ئەو لە ئامێزی ژنەکاندا لە هۆش خۆی دەچوو و دەکەوتە ناو خەوی قووڵ. پاش ساڵ و نیوێک کاتێک باز بە بیانووی هەندێک کاری نهێنی چووە وڵاتی دەریایی وڵاتی مەزن، باز لە خەوی نەرم، گەرم و قووڵ وەخەبەر هات. لێ خەوێکی خراپ نەبوو بەڵکوو وەک ئەو ئێوارە، خەوێکی گەش بوو!

جارێکی دیکەش باز دیسان لەگەڵ کچێکی باڵابەرزی خوێندکار ئاشنا بوو، کچێکی ئەسمەری ڕێک و پێک، خەڵکی وڵاتی چیا، سەرەڕای ئەوەی خوێندکاریش بوو نەیدەزانی بە زمانی باز بپەیڤێ و بە لەهجە وشێوەزارێکی تێکەڵ و پێکەڵ قسەی دەکرد. بەڵام سترانەکان یەکجار خۆش بوون. ئەو لە ناو نوێنە شپرزەکەی بازدا بە ڕووتی دادەنیشت و گۆرانیی بۆ باز دەچڕی. بازیش جارێک جگەرە لە سەر لێو و جارێکیش قەدەحی ڤۆدکا بە دەست، دەمێک لە ئامێزی کچەدا و هەندێ جاریش ڕاکشاو لە سەر جێ، گوێی لێدەگرت. گۆرانیی سادە و شاد، ئەوی کەیفخۆش دەکرد. کچە هەژار بوو، بە بۆرسیەی دەوڵەت دەیخوێند، بۆیەش باز ناوە ناوە بڕێک پارەی دەدایە. لە ماوەیەکی کورتدا، کچە بە هەموو شێوەیەک، بە هەموو شتێکیەوە وابەستە و گرێدراوی باز بوو.

باز حەزی لە هەرچی بووایە، بیری لە چی بکردایەتەوە، چ شتێکی لە خەیاڵدا بووایە، لەگەڵ کچە دەیکرد. ئەوەی کە باز زۆری پێ خۆش بوو، وابەستە بوونی کچەکە بوو. باز جارێک کچەی سەر و بن دەکرد، جارێک لە سەر پشت، ڕووت دەیخەواند، دەست و پێی بە ئاسنی تەختی نووستنەکەوە گرێدەدا و هەموو شتێکی لەگەڵ دەکرد. پاش ماوەیەک کچە خۆیشی فێری ئەو گەمە و یارییانە بوو؛ ئیدی کچە خۆی دەچووە ژووری نووستن، خۆی ڕووت دەکردەوە، لە سەر تەختەکەی باز ڕادەکشا، دەستی درێژ دەکردەوە و چاوەڕوانی باز دەبوو.

ئەم ماجەراش ئەوەندەی ساڵێک بەردەوام بوو. تاوەکوو کچە لە بەر هەژاری دەستی لە خوێندن هەڵگرت و گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی.

کچ و ژن... هێشتا چەندین کچ و ژنی دی...

بەڵام لە ناو هەموو ئەوانەدا، هی هەرە دڵدار، پڕ نرخ و هێژا، ئەوەی ڕووسپی خانەکەی پایتەخت بوو. باز پێی دەگوت «مادەر». مادەر؛ قەڵەو، خڕ، باڵابەرز و سینگی مەزن، ڕان پان، نوکتەزان و گەرم، و نەرم و قووڵ. هەمیشە چاو و لێو و دەمی سووراو و ماتیک کراو. سەرەتای یەکەم ساڵی ئاکادیمیا، لە کۆتایی حەفتەیەکدا، کاتێک باز لەگەڵ هاوڕێکانی ئاکادیمیا دەهاتنە ناو شار، باز لە ڕووسپیخانە بە مادەر ئاشنا بوو. باز و هاوڕێکانی بە جل و بەرگی فەرمییەوە هاتبوونە ناو شار. باز نە خاوەنی جل و بەرگی مەدەنی بوو نە پارەیەکی زۆریش. لێ هاوڕێیەکی کە کوڕی ئەفسەرێکی بە ناوبانگ بوو، هەمیشە دەهات بە هانایەوە. پێکەوە دەچوونەوە بۆ ماڵی هاوڕێکەی. لەوێ جلی مەدەنییان لە بەر دەکرد و ئەمجار دەهاتنەوە ناو شار. جلی هاوڕێکە لە باز دەهات. ئەو جلی هەڤاڵەکەی بە ماوەی ڕۆژێک لە بەر دەکرد و دەچوو بۆ کەشفی نوێ لە ناو شار.

ئەوسا، ڕۆژێک لە ڕۆژانی پشوو، باز مادەری کەشف کرد. نا،

باز نا، مادەر بازی دۆزییەوە. باز و هاوڕێکەی چوبوونە ئەو جێگەی کە هەموو جارێک لە هاتنەوەیاندا بۆ ناو شار، دیداریان لێ دەکرد؛ ڕووسپیخانە. مادەر لە پێش دەرگایەک ڕاوەستابوو و لەو حەشیمەتەی دەڕوانی کە دەهاتن و دەچوون. کاتێک کە چاوی بە باز کەوت، یەکسەر بانگی لێکرد. باز لەگەڵی چووە ژوورە بچووکەکەی کە مژێکی قورسی بەسەرەوە بوو. سەرەتای پەیوەندیی درێژماوەیان بەم شێوە دەستی پێکرد. ڕۆژ بە ڕۆژ، حەفتە بە حەفتە باز وابەستە و گرێدراوی مادەر دەبوو. دوای ئەوە باز چیرۆکی ژیانی خۆی، ئەوەندەی کە دەیزانی، بە تێر و تەسەلی بۆ مادەر گێڕایەوە، ئیتر مادەر بۆ باز بوو بە ژن، بوو بە دۆست، بوو بە هاوڕێ، بوو بە هۆگر و بوو بە دایک. مادەر ئەمجار دەیگوت: «وەرە وەرە ڕۆڵە هەتیوە قارەمانەکەم»، و بازی دەکێشایە سەر خۆی، سەری دەخستە ناو مەمکەکانی و بەدەنی دەگوشا. جارجارە باز لە ژووری مادەر کە بە گڵۆپی سوور کەمێک ڕووناک دەبۆوە و هەمیشە بۆنی ئۆدکۆلۆنی هەرزان، ئارەقە و ئەشقی لێدەهات، لە ئامێزی مادەردا، (جاری واش بوو لە ناو لنگی دا) خەوی لێدەکەوت. ئەو سەرخەوانە بۆ باز زەمەنێکی کورتی بەهەشت بوو. هەروەک بێچوە چۆلەکەیەکی ئارام، کە هێشتا نەفڕیوە، سووک بکەوێتە فڕین، باز دەچووە خەوێکی فێنکی سووکەوە. بۆنی مێز، تۆواو، ئارەقە و خۆشەویستی وەک بۆنی موشک و عەبیر دەگەیشتە بەر لووتی باز. دوای ماوەیەک ئیدی مادەر پارەی لە باز وەرنەدەگرت، لە دواییشدا ئەو دەستی کرد بە دانی پارە بە باز. یار، دۆست، هاوڕێ، ژن و دایکێک کە باز لێی دەگەڕا، لە ڕووسپیخانەی پایتەختی وڵاتی مەزن پەیدای کرد. لە یەکەم ڕۆژەوە تا ئەم ئێوارەیە پەیوەندیی گەرم و پڕ بەدڵیان بەردەوامە و تا هەتایە هەروا دەبێ. مادەر؛ هاوڕێی هەتیوان، یاری کەسانی تەنیا، هاوبەشی ڕۆژگاری هەژاری و بێچارەیی. لە ڕۆژانی سەختیدا مادەر خاوەنداری لە

باز کرد. لە ڕۆژانی خۆشیشدا باز خاوەنداری لە مادەر دەکات.

هەرچەندە باز ئەم ئێوارەیە هاوسەر دەگرێت.

ژن؛ ژیان، خاوەنی ژیان، هۆکاری ژیان، هەبوونی ژیان، گەرەنتیی ژیان. کچ و ژنانی باز. هۆکار و هەبوونی ژیانی ئەو. هەرچەندە باز ئەم ئێوارە هاوسەرگیری دەکات، کچ و ژن هەمیشە هۆکاری هەبوون و ژیانی ئەو دەبن.

باز سەیری دەور و بەری دەکات و لەو خانمانەی کە ئەمشەو هاتوون دەڕوانێ. خانم لە پیاو زیاترن. خانمان لە پیاوان زیاتر سەرنج دەدەنە سەر کەیف و خۆشی و شایی و دیلان. خانمی قژزەرد کە ئێستا لە پاڵ باز دانیشتووە زۆر ڕێک و پێک چاوانی بە کل ڕشتووە و لێوەکانی سوور کردووە. پاش کەمێکی تر، ئەمشەو باز، ئەو لێوە گۆشتنانە دەخاتە دەمی و دەیمژێ. ئەو لێوانە، ئەو بەدەنە، ئەو کچە گەنجە ئیدی هی ئەوە. باز دوا تنۆکی جین —تۆنیک دەخواتەوە و کەمێک تووڕە دەڵێ: «خواردەنەکەشیان قەت تەواو نابێ».

خانمی قژ زەرد بە پێکەنینەوە دەڵێ: «زەماوەندە، شەوی کەیف و خۆشی و شاییە، بۆچی پەلەتە؟»

باز لەم قسە کەمێک بێزار دەبێت، بەڵام هیچ ناڵێ بە دەست بانگ لە یەکێک لە گارسۆنەکان دەکات کە لەو ناوەدا دێن و دەچن و داوای جین-تۆنیک دەکات. ئایا ئەو هەنگاوەی ئێستا هەڵیدەگرێ بەجێیە؟ ئەو کچەی ئێستا لە تەنیشتی دانیشتووە، دەتوانێ لێی تێبگات؟ ببێتە بنکە بۆی و بە قسەی بکات؟ مادەر پێی وتبوو: «کوڕە هەتیوەکەم باش بیر بکەوە، ژن هێنان داوە، ئەگەر جارێک لاقت تێی بکەوێ، ئیدی ڕزگاربوونت زۆر زەحمەت دەبێت، باش بیر بکەوە». ئایا ئەو باش بیری کردبۆوە؟ باز ناتوانێ بانگەشەی ئەوە بکات کە ئەو کچەی تەنیشتی بە باشی دەناسێ. بەڵێ، کچە برازای ئەفسەری سمێڵ قیتە. بەڵێ باوکی

کچەش ئەفسەرە و کچە بە پەروەردەی سەربازان بارهێنراوە. بەڵێ باز جاروبار ئەوی لە ماڵی ئەفسەری سمێڵ قیت، لەم هۆڵە، لە هەندێک جێگەی دی دیوە، بە کاتژمێران قسەی لەگەڵ کردووە، زۆر جار پێکەوە چوونەتە سینەما، بە قسەی گەرم و خۆش لێی نزیک دەبۆوە، دەستی دەگرت و دەیبرد بۆ پارک و باخچە و سەیرانگای پایتەخت، پیاسەی پێ ئەکرد، لە باوەشی دەگرت، رایدەمووسی، کچەش ڕووی لێ وەرنەدەگێڕا، بە پێچەوانەوە بە کەیفخۆشی لێی نزیک دەبۆوە و دەیخواست. بەڵام ئەوانە بەشی بەهاوسەر بوون دەکەن؟

زمانی شیرینی، قسەی بەڕێ و جێی، زانایی و تێگەیشتنی، ئەدەب و تەربیەتی، پۆشین و بەژن و باڵای، ڕووخۆشییەکەی، حەز کردنی لە خۆشی و گەمە، ئەوانە هەموو [لایەنە باشەکانی] بوون کە بە دڵی باز بوو. بەڵام لە لایەکی دیش، پەسن و خۆهەڵکێشان و لووتبەرزیی ئەو، مەغروری و لە خۆ ڕازی بوونی، ڕژدی و چنۆکییەکەی، خۆشەویستیی بۆ ماڵ و زێڕ و پارە و هەندێک لایەنی دیکەی لەم چەشنە کە بە دڵی باز نەبوو. هەمیشە چاوی بە شوێن ماڵ و موڵک و زێڕ و دیارییەوەیە. هەر جارێک کە لەگەڵ باز یەکیان دەدیت، بە حاڵ و حەرەکەتی خۆی بازی تێدەگەیاند کە دیارییەکی گران و بەنرخی دەوێ و هەر جارێک کە باز ویستبێتی باسی ئیش و کاری خۆی بۆ بکات، ئەو بابەتەکەی گۆڕیوە و هێناویەتە سەر ماڵ، موڵک، پارە، خانوو، ئۆتۆمبیل، گەشت و گەڕان و سەیران، خواردن، خواردنەوە، پۆشاک، جل و بەرگ، ئۆدکۆلۆن و عەتر. ئەو هەمیشە ویستوویەتی سەرنجی باز بۆ لای ئەو شتانە ڕابکێشێت. بۆیە باز هەنووکەش هەست بە دوودڵی دەکات. هێشتا دڵی ژانێک دەیگرێ، هەمیشە لە زەینیدا شک و گومانێک هەیە. ئایا؟ دیسان ئایا؟

بەڵام ئەفسەری سمێڵ قیت کە زۆر حەزی دەکرد ئەم هاوسەرگیرییە سەر بگرێت، قەناعەتی بە باز هینا و هێنایە سەر ئەوەی کە هاوسەرگیری

بکات. ئێوارەیەک با بڵێین شەش مانگ پێش ئەم ئێوارەی زەماوەندە، ئەو کاتەی باز بۆ سەردان چووبووە ماڵی ئەفسەری سمێڵ قیت، پاش خواردنی شێو، ئەفسەر بە تایبەتی لەگەڵ باز قسەی کرد و لە بارەی هاوسەرگیری لەگەڵی ئاخفی. دوا وتەکانی ئەفسەری سمێڵ قیت هەنووکەش بە باشی دێنەوە یادی باز: «کوڕەکەم ئیدی دەست لەو ژیانە پەرش و بڵاوەت، لە ژن و کچی بێبەند و بار هەڵبگرە، بەسە، مەگەر کێ بنی قووڵ و قووڵایی تاریکی ژنانی دیوە کە تۆش بیبینی؟ بێ بنە، کۆتایی نییە. بەسە، هاوسەرگیری بکە، ببە بە خاوەنی ماڵ، دامەزراوە، نەزم، منداڵ... و لە بیر مەکە کە لە ئەرتەشدا مەرجی یەکەمی سەرکەوتن؛ نەزم و دیسیپلینە، ژیان، ماڵ و خێزانە». بێگومان گەلێک هۆکاری دیش هەبوو، لێ ئەم وتە دواییانەی ئەفسەری سمێڵ قیت لە بڕیاری بازدا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو. باز دەیزانی کە ئەفسەری سمێڵ قیت کە خۆی وەجاخ کوێر بوو، ئیدی خانەنشین بووە و لەگەڵ ژنە بەڕێزەکەی ژیانێکی ئاسان و داخراویان ڕادەبرد، وەک کوڕی خۆی بازی خۆشدەویست و زۆری پێ خۆش بوو ببێتە هاوسەری برازاکەی. ئەفسەری سمێڵ قیت کە هەمیشە، لە منداڵییەوە تا ئێستا خاوەنداریی لە باز کردبوو، بەردەوام لێی پرسیبوو و هاریکاریی کردبوو، ڕێگەی بۆ ڕاست کردبۆوە و ڕێگەی ئەرتەش و سەربازی بۆ کردبۆوە، لای باز زۆر هێژا و خۆشەویست بوو. باز بە ڕێز و حورمەتەوە گوێی لە قسەکانی ڕادەگرت. لە بابەتی هاوسەرگیریشدا هەر بەم شێوەی کرد؛ بیری لە قسەکانی ئەفسەری سمێڵ قیت کردەوە و دواییش بڕیاری دا و ئاوەهاش گەیشتە ئەم ئێوارەیە.

ئەم ئێوارە خانمی قژ زەرد لە ناو جل و بەرگی بووکێنیدا؛ لە هەمیشە سەرنج ڕاکێشتر و جوانتر دیارە. ڕوخسار، تەن و بەدەنی بە ڕەنگی شیریی ئەم ئێوارە لە ژێر شەوقی گلۆپی کریستاڵدا شیریتر دیارە. بە

ئارامی لە قەدەحی شەرابی سپی دەخواتەوە و دانە دانە دەپەیڤێ. ئەو کەم قسە دەکات، لووتبەرزانە لە دەور و پشتی دەڕوانێ. هەمیشە لە نێوان ئەو و کەسانی دی، ڕووداوی دی و پێوانەی دیدا، مەودایەک هەیە. هەمیشە لە نێوان ئەو و دەور و بەریدا جیاوازی هەیە، وەک ئەوەی ئەو زۆر پاک و خاوێن و دەور و بەری یەکسەر پیسی بێت. کاتێک دەپەیڤێ، ئەودەم قسەکانی، وەک وتەی ئایەتێک قورسن. قسەی هەڵبژێردراو و قورسی زیاتر لە نیگا ئارام و سارد و ڕوانینە مەغرورەکانی کاریگەری لە سەر ئینسانەکان دەبێت. بەڵام باز، سەربازی نەترس، ئەفسەری لێهاتوو و مرۆڤی بەسەبر، دەزانێ دەبێ چی بکات؛ کاتێک کە جل و بەرگی لە بەر داکەند، ڕووتی کردەوە، لە ناو جێدا بە دەست و پەنجە و زمانی خۆی، جەستەی گەوهەرینی داگیر کرد و خۆی گەیاندە قووڵایی دڵ و بەدەن*ی، ئەو کاتە نە ئەم مەغروری، مەودا و جیاوازییە دەمێنێ، نە نیگای سارد و قسەی ڕێک و پێکی بێمانا و پڕوپووچی قورس. ئەو کچە نازەنین و لە خۆڕازییە هێشتا بە باشی بازی نەناسیوە، ئەو کچە زانا سادە ئیتر دەزانێ کە دونیا، ژیان چییە...

باز قەدەحە نوێکەی بەرەو قەدەحی ئەو دەبات و دەڵێ: «بەخۆشیی تۆ، ئێمە، هاوسەرگیریمان و ژیانمان...» خانمی قژزەرد بە کەیفخۆشییەوە دەڵێ: «بەخۆشی». بە ئەنقەست دەست و پای کەمێک زیاتر لە ئاستی نۆرماڵ ڕادەوەشێنێ تاوەکوو زێڕ و زینەتی دەست و پێ و گەردنی شەوق بدەنەوە و بە ئارامی هەموو شەرابەکەی دەخواتەوە.

نان خواردن تەواو بووە، جموجوڵی پاش نان خواردن کەوتۆتە ناو سالۆنەکە. دانیشتووانی سەر مێزەکان هەڵدەستن، دێن و دەچن. ئۆرکێسترا ئێستا موسیقایەکی شادتر لێدەدا. پیاو و ژنی جوان هەستاون.

---

* جەستە.

لە مەیدانی هەڵپەڕکێ بە ئارامی خۆیان دەجووڵێنن. گارسۆن لە نێوان مێزەکاندا بە پەلەتر خواردنەوەی جۆراوجۆر دەگەیەننە میوانان. لە ناو هات و چۆی میوانانـدا، گرووپێک بەرەو مێزی باز و خانمی قژزەرد دێن. ئەفسەری سمێڵ قیت، ژنەکەی، باوک و دایکی خانمی قژ زەرد و چەند کەسێکی دی. کە ئەفسەری سمێڵ قیت و کۆمەڵەکەی دەگەنە بەر مێزەکە، بە ڕوویەکی پڕ پێکەنین و گەشبین دەڵێ: «ئیدی کاتی هات، والی و سەرۆکی شارەوانی هاتوون ئیدی ئێوە لێک مارە دەکرێن...».
باز و خانمی قژ زەرد لە سەر جێگەیان ڕادەبن و بەر لەوەی باز بکەوێتە شانی خانم، ئەفسەری سمێڵ قیت بە پەلە خۆی دەکات بە نێوانیاندا و دەکەوێتە شانیان و بەرەو ئەو لای مەیدانی هەڵپەڕکێ دەڕۆن. لێرە لە پشت مێزێکی درێژ بە شایەتیی شایەتەکان مارە دەکرێن. شایەتی ژن هێنانی باز، ئەفسەری سمێڵ قیت، مامی خانمی قژزەرد، و شایەتی خانمیش قایمقامی سەربازیی پایتەختی وڵاتە. ئەوان هەموویان لێرە، یەکە بە یەکە، یەکدی لە ئامێز دەگرن و پیرۆزبایی دەکەن و لە تەنیشت مێزەکە دادەنیشنەوە. سەرۆکی شارەوانی کە ژەنەڕاڵێکی ناسراوە، دێت مارەیان بکات. باز بە ڕوخساریەوە بزەیەکی گەش، سەری لە قەدەحی جینێ تۆنیک خۆش، لە دەور و بەری خۆی دەڕوانێ. ئەم ڕۆژە، ئەم ئێوارەیە، ئەم ساتەوەختە، کە باز زۆر بیری لێ کردۆتەوە و هەرچی چۆنێک بێت بە سەر هەموو مرۆڤێکدا دێت، ئێستا هاتووە؛ زەماوەند و ژن هێنان. هەر شتێک کە باز ئارەزووی دەکرد، ئێستا لە لایەتی، هەر کەسێک کە دەیویست ببوایە هاتوون. ئەفسەری سمێڵ قیت کە باوکایەتیی دەرحەق کردووە، لێرەیە. باوکی خانمی قژ زەرد و دایکە بێدەنگەکەی کە دەبنە خەزوور و خەسووی باز، لێرەن. قایمقام و سەرۆک شارەوانی، ئەو دوو ژەنەڕاڵە ناودارە کە هەمیشە بۆ باز نموونەی بەهێزی، پیاوەتی و وڵاتپارێزی بوون، لێرەن. سەربازەکانی باز

کە هەمیشە پشتیان داوە بە پشتی بازەوە و هاوکارییان کردووە، لێرەن. هاوڕێ و دۆستانی باز، ئەندامانی دیکەی بنەماڵەی مەزن واتە ئەرتەش، لێرەن. گەورەیی و سەربڵندی، هێز و توانای دەوڵەت و ئەرتەش لێرەن. خۆشی، گاڵتە، بۆن و ژن لێرەن. و هاوڕێی ڕۆژانی داهاتووی، [ڕۆژانی] مان و نەمانی، ئێستا لە لایەتی.

«بەڵێ» باز وا دەڵێ، کاتێک سەرۆکی شارەوانی لێی دەپرسێ کە ئایا خانمی قژ زەرد وەک هاوسەری خۆی قەبووڵ دەکات. «بەڵێ، بەڵێ...».

«بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ...» و ئیمزا، چەپڵە، ماچ، ئامێز و پیرۆزبایی.

بەڵێ دوای مارەبڕینی باز و خانمی قژ زەرد بە دەنگ و چەپڵە، مووسیقا دیسان دەست پێدەکاتەوە. باز و خانمەکەی دەست بە یەکەمین دانسی زەماوەندەکەیان دەکەن. بە تەنیا لە ناوەند و ناوەڕاستی مەیداندا، بە ئاهەنگی چەپڵە. پێدەچێ کە ئەمە بەختیاری بێت. باز لە بەختەوەری و خواردنەوە سەرخۆش، بە دەوری خۆیدا نە زۆر بە لەرە لەر، بێ ئەوەی ئاگای لە ڕیتمی مووسیقا بێت، دەسووڕێتەوە و خول دەخوات. شەوقی گلۆپەکان لە ڕومەت و چاوی دەدەن، دەنگی زێڕ و زینەتی خانم کە وەک دەنگی بولبول و کەناری دێتە بەر گوێی، بە تەواوی سەرمەستی دەکات. دەنگی چەپڵە و هەلهەلە؛ پەیژەیەکی بەرز و بڵند بەرەو ئاسمان. پەیژەی قایم، جێگیر و بڵندی ژیان، دەوڵەت و ئەرتەش، باز پلیکانەکانی پەیژەکە یەک بە یەک دەبڕێ و بەرەو ژوور دەچێ. باز هەڵدەکشێ، لە ناو دەنگی بەرزی چەپڵەدا، هەڵدەکشێ بەرەو ژوور، قاتی هەرە ژوور و لەوێوە بە پێکەنین و بە غروورەوە لە جەماوەری چەپڵە لێدەر دەڕوانێ.

باز تینوو دەبێ، دەیهەوێ بێپشوو بخواتەوە، ئەوان دەڕۆن و لە شوێنی خۆیان دادەنیشن. ئەوکات پیرۆزبایی گەورە و بنەڕەتی دەست

پێدەکات. میوان یەک بە یەک، دەستە بە دەستە، ڕیز بە ڕیز دێن، باز و خانمەکەی ڕادەمووسن، لە ئامێزیان دەگرن، دیارییان دەدەنێ و دەگەڕێنەوە سەر مێزەکانیان. یەک، دوو، سێ، پێنج، دە، بیست، سی، چل، پەنجا، سەد، سەدوپەنجا، دووسەد... بە لانی کەمەوە دووسەد ڕامووسین، باوەش. بە لانی کەمەوە هەزاران پەیڤی پیرۆزبایی وەک یەک، هەرکام هەزاران جار هەستان و دانیشتن. بە سەدان ڕوخساری هەمە ڕەنگ، لەش و لاری جۆراوجۆر، دەنگی لێک نەچوو. لە نێواندا ئەوەندەی باز دەرفەتێک دێنێ چەند قەدەحی جینێ تۆنیک. باز سەرسام و سەرخۆشە. خانمی باز ماندوو، لێ کەیفخۆشە؛ دەست، پەنجە، پێ، سینگ و بەرۆک، گەردنی، ئێستا پڕن لە زێڕ. لە ئێستاوە ئەوەندەی تەمەنێک زێڕێ کۆکردۆتەوە. خانمی باز پێدەکەنێ، باڵی فڕینی نییە تا پێی بفڕێ.

ئێوارە دەگاتە شەو. شەو و ماندوویەتی شەو پەردەی دەخاتە سەر سالۆنی ئەفسەران. ئەوانەی سەما دەکەن، کەم بوونەتەوە، موزیک وشکە. چەند مێزێک چۆڵ بوون. میوان هێدی هێدی دەڕۆن. «ئەم شەوە تەواو بوایە» باز، سەرقورس، بیردەکاتەوە؛ «تەواو بوایە و هەرکەس چووبایەتەوە، منیش، ئێمەش ڕۆشتباین، من سەری خۆم خستبایەتە ناو ئەو سینگ و بەرۆک و گەردنە گەوهەرە. ..» لەو کاتەدا جموجۆڵێک دەکەوێتە ناو سالۆنەکە، شتێک ڕوویداوە. زیاتر لە بیست ئەفسەر بە یۆنیفۆرمی سەربازییەوە دێنە ناو سالۆنەکە و بە چوار دەوری سالۆنەکەدا بڵاو دەبنەوە. پارێزگار و سەرۆکی شارەوانی و کەسانی دی هەڵدەستن و بەرەو دەرگای گەورەی سالۆنەکە بەڕێدەکەون. باز بە ئەزموونی خۆی لە جموجۆڵی سەربازی دەزانێ؛ شتێکی گرنگ ڕوو دەدات. ئەفسەرێک لەوانەی هاتوونەتە ناو سالۆنەکە دێتە نزیکی باز و بە ئارامی هۆکاری پەلە پەلەکە بە گوێی بازدا دەچرپێنێ؛ ژەنەڕاڵ سەردار دێت. ژەنەڕاڵ

سـەردار هـات!

قسـەكانى دى نايەنـەوە يـادى بـاز، ئەويـش بەرەو دەرگاى سـالۆن هەڵديّت و دەچيّتە تەنيشـت پاريّزگار و سـەرۆكى شـارەوانى، ڕادەوەسـتێ. ئەى خانم؟ كـوا خانمەكـەى؟ سـەرۆكى شـارەوانى ئەفسـەريّك دەنيّريّتـە ژوورەوە تاوەكـوو خانمـى بـاز بيّنـن. پـاش چەنـد خولەكيّـك شـەش ئۆتۆمبيلـى ميّرسيّديّسـى ڕەشـى ويّكچـوو ديّـن، دەچنـە نـاو باخچەكـە و لـە بـەر دەرگاى سـالۆن ڕادەوەسـتن. ئەوەنـدەى بيسـت ئەفسـەر لـە ئۆتۆمبيلـەكان دادەبـەزن و دەور و بـەر دەگـرن. دواتـر دەرگاى ئۆتۆمبيلـى سـێهەمى كاروانـى ئۆتۆمبيـلان دەكريّتـەوە و ژەنـەڕاڵ سـەردار دادەبـەزێ. ژەنـەڕاڵ سـەردار؛ باوكـى وڵات، سـەرمايەى دەوڵـەت، سيسـتەمى ئەرتـەش؛ باڵايەكـى بـەرزى بەخـۆ، سـميّڵى بـۆرى گەنجـان بـە نيـگاى هەڵـۆى هيّـرش و پاراسـتن.

«ژەنـەڕاڵ سـەردار، ژەنـەڕاڵ سـەردار، هـەر بژيـت!...» چەپڵـە، قيـڕە، هـاوار، ڕيّـزدارى. «ژەنـەڕاڵ سـەردار، خـۆرى وڵاتـى ئيّمـە، ئەسـتيّرەى ئاسـمانى ئيّمـە، ژەنـەڕاڵ سـەردار...».

ژەنـەڕاڵ سـەردار، دەسـتەى ئەفسـەران بـە دەورييـەوە، ديّتـە لاى پاريّـزگار، سـەرۆكى شـارەوانى، بـاز، خانمـى بـاز، ئەفسـەرى سـميّڵ قيـت. سـێبەرى بزەيەكـى ناسـك بـە ڕوخسـاريەوە، پيرۆزبايـى لـە بـاز و خانمەكـەى دەكات و نيشـانيّكى بچـووك دەدات لـە سـەر سـينگيان. نيشـان، نيشـانيّكى زيوينـى ئـاڵاى سـێ ڕەنگـى وڵاتـى مەزنـە. دواييـش هەمـووان پيّكـەوە ديّنـە نـاو سـالۆن. كاتيّـك ژەنـەڕال سـەردار ديّتـە ژوورەوە، تيّكـڕاى جەمـاوەرى نـاو سـالۆن دەسـت لـە قسـەى خـۆش، جگەرەكيّشـان و خواردنـەوە هەڵدەگـرن، هەڵدەسـتنە سـەر پـێ و چەپڵـە ليّـدەدەن. ڕاويّژكارانـى ژەنـەڕاڵ سـەردار لـە بەشـى سـەرووى سـالۆنەكە، جيّگەيـەك لـە تەنيشـت بـاز و خانمەكـەى نيشـانى ژەنـەڕاڵ دەدەن، بـەڵام ئـەو دانانيشـێ. ئـەو كاتـى نيـە بـۆ دانيشـتن. ئـەو لـە پيّشـەوە و جەمـاوەر لـە پشـتى، لـە سـالۆنەكدا چەرخيّـك دەدەن.

لە لایەکەوە تا ئەولای دیکە. چەپڵە بەردەوامە. کەس ناتوانێ نزیکی ژەنەڕاڵ سەردار بێتەوە، ئەو لەگەڵ کەس تەوقە ناکات، بە سەر سڵاو دەکات لە جەماوەر و بە دەستیش سڵاو دەنێری بۆ کەسانی دوورتر. لە دوای ئەوەی کۆمەڵ دەگەڕێنەوە و جارێکی دی دەگەنەوە پێش دەرگای مەزن، ئەو کات ئۆرکێسترا دەست بە لێدانی مارشی (سروودی) نەتەوەیی وڵات دەکات. هەموو کەس بە پێوە، سینگ و سەر و ڕوو لە ژەنەڕاڵ، بە یەک دەنگ، لە سەر هەمان ڕیتم و بەهێز، سروود دەخوێنن. ساڵۆن بە دەنگی بەرزی جەماوەر دەهەژێ. ژەنەڕاڵ هەروەک هەیکەلەکەی مەیدانی دەرەوە کە لە خۆی ساز کراوە، بێجووڵە، لە سەر پێ، لە ناوەڕاستی جەماوەردا ڕاوەستاوە، نیگای هەندێک بەرەو ژوور گوێ لە سروود دەگرێ.

باز بە دەنگێکی بەرزی لە ئاستی قیرەدا سروود دەخوێنێ. بەڵێ، باز ئەندامی بنەماڵەیەکی ئاوەها جێگیر و بەهێزە. بەڵێ، ئەو بنەماڵەی کە وڵات دەپارێزێ، یەکێتیی وڵات بە پێوە ڕادەگرێ، پێشکەوتن و دەرفەت دەڕژێنێ بە سەر گەلی وڵاتدا. بەڵێ، ژەنەڕاڵ سەردار کە بە بوونی خۆی بۆتە گەرەنتیی بوونی وڵات و دەوڵەت. باز بە هەیەجانێکی گوڕ، بە جۆشێکی بێپایان هاوار دەکات: «وڵات گیان فیدای تۆین. ئالای ڕەنگین، ئێمە حەیرانی تۆین، خوێنمان بە قوربانت... سەرۆک، ئەی سەرۆک، بە گیان، بە دڵ، بە خوێن، ئێمە لەگەڵتین ئەی سەرۆک...».

پاشان سەرۆک ژەنەڕاڵ سەردار، دیسان بە پەلە دەگەڕێتەوە، سواری ئۆتۆمبیل دەبێت و لە چاو ون دەبێ.

ئیدی چی ماوە؟ هیچ. ژەنەڕاڵ سەرداریش هاتە شاییەکە، بە هەموو گەورەیی و هێزی خۆی سڵاوی لە شاییەکە کرد، شاییەکەی ڕەنگاند. ئیدی هەموو کەس دەتوانێ بە سەرفرازی، بە هەست و سۆزی زیارەتی ژەنەڕاڵەوە بگەڕێتەوە ماڵی خۆی. ئیدی شەو و شایی سەرکەوتوو، بڵاوە

دەکات. هاوڕێیانی باز حەز دەکەن بووک و زاوا ببەن لە بولواری کەناری ڕووباری شار بە ئۆتۆمبیل بیانگەڕێنن. بەڵام نە باز و نە خانمەکەشی ئەوەیان ناوێ. ماڵ. بە زووترین کات ماڵەوە. باز تەنیا ئەمەی دەوێ. ماڵی گەرم و هەیەجانی ئەم شەوە.

دووهەمین پەردەی ئەم شەوە لە ماڵەوە دەکرێتەوە.

دوو هاوڕێی باز، بووک و زاوا سواری ئۆتۆمبیلێکی سەربازیی ڕەش دەکەن و دەیانبەنەوە ماڵێ. ماڵێک کە نزیکی ئەستێرانە.

ماڵی گەرم... ماڵێک کە باز سەر لە نوێ بۆ ئەمشەو، بۆ ژیانی هاوسەری تەیاری کردووە. ماڵێکی گەورە کە لە چوار ژوور پێک هاتووە و بە ڕێک و پێکی ڕاخراوە. هیچ کەم و کوڕییەک نییە. هۆڵ، چێشتخانە، حەمام، ژووری میوان و نووستن و ڕایەخ و قاپ و کەوچک، هەمووی تەواوە. هەر دوو پەنجەرە گەورەکەی هۆڵی پێشوازیی گەورە دەڕوانێتە سەر ئەو ڕووبارەی ئێستا بە ڕووناکیی ئەستێرانی شەو دەدرەوشێتەوە. لە ناو هۆڵی گەورەدا، یەکەم شت کە سەرنج ڕادەکێشێ، تابلۆی وێنەیەکی گەورەی ژەنەڕاڵ سەردارە کە بە دیوارەوە هەڵواسراوە. لە دیوارەکەی دیش بەرامبەر بە وێنەکەی ژەنەڕاڵ، ئاڵایەکی سێ ڕەنگ و چەند وێنەی سەربازیی باز کە لە قاپێکی سادەدا دەور گیراوە، هەڵواسراوە. لە دیواری کەناری دەرگای چێشتخانە، کلۆکسیۆنێکی چەقۆ، خەنجەر و شمشێران لە ناو کالانی زیوین و زێڕنەخشدا هەڵواسراوە. پاش ئەوەی باز ژاکەت و بۆینباخەکەی دەردێنێ، ئەوەندەی چەند خولەکێک سەیری دەرەوە، سەیری ڕووباری ڕووناک دەکات. ڕوناکیی ئەستێران، شەوقی بە تروسکەی ڕوناکیی ڕووبار لە پەنجەرە دەدات و دەبریقێتەوە. باز هەموو گڵۆپەکانی دانەگیرساندووە، ژوورەکە کەمێک تاریکە. خانم دیار نیە. باز لە بەر مێزی بچووکی کەناری پەنجەرەیە و دەگەڕێتەوە و لە ناو شووشەکانی سەر مێزەکە لە شووشەی جین دەگەڕێ، دەیبینێتەوە،

ئەی تونیک؟ ناتوانێ شووشەی تۆنیک ببینێتەوە. باز ناتوانێ، ئێستا لە تۆنیک بگەڕێ. قەدەحێک پڕ دەکات لە ڤۆدکا و ئاوی لیمۆن و بەجارێک نیوەی دەخواتەوە.

خانمی باز، دەست و دەم وچاو شۆراو، هەوری و دەستکێشی سپی و جل و بەرگی بووکێنی داکەندراو، پەلکە درێژەکانی بەرداوەتەوە، دێتە هۆڵەکە. سینییەکی بچووکی بەدەستەوەیە. کەمێک دوورتر لە باز، سینی دادەنێتە سەر مێزی ناو هۆڵەکە و بە پێکەنینەوە لە سینی دەڕوانێ. ئەو زێڕ و زینەتانەی ئەمشەو بە دیاری پێی دراون خستوویەتە سەر سینییەکە. ئەنگوستیلە، گوارە، بازنە، ملوانکە، تاق بە تاق، جووت بە جووت لە ناو سینی دەدرەوشێنەوە.

باز لە بەر پەنجەرە بە پێوە دەڵێ: «وەرە بۆ لام»، «تۆ وەرە بۆ لام». خانم بێ ئەوەی بۆ باز بڕوانێ چاوی بڕیوەتە سەرمایەکەی ژیانی، و دەڵێ: «وەرە لەمانە، لە جوانییەکەیان بڕوانە» باز کە چاوەڕوانی وەڵامێکی وەها نەبوو هەندێک سەری سوور دەمێنێ. لێ بێدەنگ دەچێ بۆ لای خانم. هێشتا بۆنێکی یەکجار خۆشی لێدێ. لێوە سوورەکانی لە خۆشیدا دەبزوێن. چەن دڵۆپ ئاو لە نێوانی مەمکە گەورەکانیدا بەرەو خوار دەبنەوە. باز، خانم بەرەو خۆی دەکێشێ و دەستی چەپی دەخاتە سەر مەمکەکانی. خانم تۆزێک خۆی لادەدا. «نا، ئەمشەو نا، ئەز، ئێمە زۆر ماندووین».

چۆن ئەمشەو نا؟ مەگەر ئەمشەو شەوی پەردە و زاوایەتی نییە؟ چۆن شەوی زەفاف نا؟ باز کەمێک لێی دوور دەکەوێتەوە و بە سەرنجەوە لێی دەڕوانێ. دیسان هیچ ناڵێ. دەچێتە بەر پەنجەرە، قەدەحی ڤۆدکاکەی هەڵدەگرێ، تا دوا دڵۆپ دەیخواتەوە. «بەسە ئیدی، تۆ ئەمشەو زۆرت خواردەوە» خانم بە دەنگێکی کەمێک تووڕە بە باز دەڵێ. باز بێ ئەوەی وەڵامێک بداتەوە، دووبارە قەدەح پڕ لە ڤۆدکا دەکات و کەمێکی

لـێ دەخواتـەوە. ئەوەنـدەی چەنـد خولـەک ئـەوان ئاوەهـا، بـاز چـاوی لـە تروسـکەی قایمـی ئەسـتیرە و ئـاو، خانمەکەشـی چـاوی لـە درەوشـانەوە و تروسـکە تروسـکی زێـڕ و زینەتەکانـی، ڕادەوەسـتن. پاشـان خانمەکـەی وەک ئـەوەی لـە نـاکاو لـە خـەو ڕاچڵەکابـێ، دەڵـێ: «دەی بـا بخەویـن، یەکجـار ماندوویـن» و بـێ ئـەوەی چاوەڕێـی بـاز بێـت، بـەرەو ژووری نووسـتن دەبێتـەوە. لـە بـەر دەرگای ژوورەکـە ڕادەوەسـتێ وەک ئـەوەی شـتێکی لـە بیـر چووبێـت دەگەڕێتـەوە و سـەیری نـاو هۆڵەکـە دەکات. «پێشـتریش مـن گەلێـک جـار هاتوومەتـە ئـەم ماڵـە، لـێ ئـەوکات ماڵـی مـن نەبـوو». ئـەو نیـگای لـە سـەر دیـواران دەڵـێ» :لـێ ئێسـتا ماڵـی منیشـە، دەبێـت ماڵـی ئێمـە، ماڵـی مـن و تـۆ بێـت، نـەک کەمپـی سـەربازی، مـن ئـەو تابلـۆ، چەقـۆ و فیشـەک و شـتە سـەربازییانە لـە ماڵەکەمـدا ناخـوازم.»

بـاز، ماتمـاو، خوێنـی لـە جـۆش، لـەو ژنـە دەڕوانـێ کـە چەنـد کاتژمێرێـک لـەوە پێـش ببـووە هاوسـەری، کـە دەبێتـە هاوڕێـی ژیانـی، چـی دەبـێ؟ بـاز چـی بـکات، چـی بلـێ؟... ئـەو ژنـە چـی دەڵـێ؟ بـە چ زمانێـک دەپەیڤـێ؟ « گـەر گـوێ بدەیتـە قسـەکانم، تێدەگـەی چـی دەڵێـم» خانـم، پەیـڤ بـە پەیـڤ، دەڵـێ. «بەڵـێ، تـۆ تێدەگـەی، ئـەز بەنـی... ژەنـەڕاڵ سـەردار، سـەرۆکی ئێمـە، سـەرمایەی ئێمـە، هەمـوو شـتی ئێمەیـە، بـەڵام پێویسـت نـاکات هەمیشـەش لـە ماڵـی ئێمـە بێـت». ئـەز بەنـی؟ بۆچـی ئـەز بەنـی؟ خانمەکـەی هەمـوو ئەمانـە دەڵـێ، بـە شـوێن یەکـدا فەرمـان ڕیـز دەکات و هەمیـش دەڵـێ ئـەز بەنـی! بـاز دەهـەژێ، دەشـڵەژێ، قورگـی وشـک دەبێـت. پـاش ئـەو قسـانە، خانمـی بـاز دەچێتـە بـەر وێنەکـەی ژەنـەڕاڵ و لـە دیـواری دەکاتـەوە. ئیتـر بـاز خـۆی پـێ ڕاناگیـرێ، «کـەر، کچـی کـەران!...» لـە ژێـر کاریگەریـی زلەیەکـدا دەکەوێتـە سـەر زەوی. بـەڵام خـۆی کـۆ دەکاتـەوە، بـە نیگایـەک کـە بـاز هەرگیـز نەیدیـوە بـۆ بـاز دەڕوانـێ و بـەرەو بـاز هەڵمـەت دەبـات و بـە پەنجـە بـەر دەبێتـە ڕوخسـاری. «کـەر،

کوڕی کەر، کوڕی بێکەس و بێخانەدان». ڕوخساری باز دەگرژێنێتەوە، دڵی، بەدەنی، هەموو هەبوونی دەسووتێ. دەستی ڕاستی هەڵدێنێ و بە هەموو هێزی خۆی زلەیەکی توندتر لە خانم دەدات. خانم دەمەو ڕوو دەکەوێتە سەر زەوی، لێ لە زەوی ڕا دەبێ، دەست دەبا بۆ لووتی، خوێنی لێدێت. دەست دەکات بە قیژە و سەیری دەور و بەری دەکات. چەقۆ و خەنجەر... بەرەو چەقۆ و خەنجەران دەچێ و خۆی دەگەیەنێتە خەنجەرێکی خوار. بەڵام پێش ئەوەی بکەوێتە خۆی، باز خۆی پێ دەگەیەنێ و لە مەچەکییەوە ئەو دەستەی بە خەنجەرەوەیە، دەیگرێ. ئەوەندەی چەند خولەکان بە قیژە و قیڕە، بە خوێن و قسە یەکتر دێنن و دەبەن. پاشانیش دەکەونە زەوی و لە زەوی دەگلێن. مێز، کورسی، سەندەڵی، مێزی شووشەکان، شووشەی سەر مێز هەمووی تەفلی هەڤ دەبن، دەشکێن، بڵاو دەبنەوە. پاش پێکدادانێکی درێژ، هەر دوویان لە سەر قاڵیچەی سەر ئەرزەکە لێک دەبنەوە و دوور لە یەک، هەڵدەستنە سەر پێ. ئیدی دەنگیان لێوە نایە، تەنیا بە ڕق و قینەوە لە یەک دەڕوانن. خەنجەر دیار نییە، دەستی هەردووکیشیان خوێناوییە. لەم لاو لای مێزی ناو ساڵۆن، بە پێوە، چاو دەڕپەڕیو لە یەک دەڕوانن.

پاشان خانمی باز وەک تەلیسێکی بەتاڵ بەر دەبێتەوە.

٥

# دابڕان

کۆتر.

ئێستاش کۆتر. ئێستا لە کۆتر نزیک دەبینەوە.

ئێمە دیسان لە پایەختی ولاتی مەزنین. دیسان ئەستێرە لە ئاسمان بە سەر ئاوی خوڕی ڕووباری شارەوە شەوق دەداتەوە. لێ بە سەر شەوی هاوسەرگیریی خوێنێنی بازدا دە ساڵ تێپەڕیوە. زەمەن ڕابواردووە، کەس لە جێی خۆیدا نەماوە و کەس وەک خۆی نەماوە، لێ تاریکیی شەو و ڕووناکیی ئەستێران هەر وەک خۆیانن.

بەڵێ، تاریکیی شەو و ڕوناکیی ئەستێران. بەڵێ، تاریکی و ڕووناکیی ڕۆحی مرۆڤان.

دەروونی کۆتر، ئەمشەو پڕی ڕووناکیی ئەشق و خۆشەویستییە. بەڵام لە لایەکی دیش، دەروونی کۆتر، ئەمشەو پڕی تاریکیی زیزی دابڕان و ترسیشە. شەو، شەوی ماڵئاوایی و دابڕانە؛ شەوی گڕی جەستە و ڕۆحەکانە؛ شەوی سەخڵەتی کەسەر و خەمانە، گەرمایی شەهوەت و خۆشەویستییە.

ئێمە لە ژووری بچووک و شپرزەی کۆترین. ئێستا تەمەنی کۆتر لە دەور و بەری بیستە، یان ڕاستتر، کەمێک لە بیست زیاتر. لە سێ

ساڵ پێش ئێستاوە، کۆتر لە بینای خوێندنگای پایتەخت، لە ژوورێکی خوێندکاران کە ئێستا ئێمەش لەوێین، دەژی. کۆتر یەکێک لەو چوار هەزار خوێندکارەیە کە لەم شارۆچکە گەورەیەی خوێندکاراندا ژیان بە سەر دەبەن. گەڕەکی خوێندکاران لە گەڕەکی سەربازی کە بازی لێیە، سێ گەڕەک دوورترە. کۆتر و باز سێ گەڕەک لە یەک دوورن؛ بێ ئەوەی یەکدی بناسن، ئاگایان لە یەک بێت.

کۆتر لە ژوورەکەی تەنیا نییە. هاوڕێیەکی خوێندنی، دەزگیرانی ژیانی، کە ئێمە پێی دەڵێین ژیر، لەگەڵیەتی. کۆتر و ژیر خوێندکارن. ژیر لە پۆلی چوار و کۆتر لە پۆلی سێ دەخوێنن. بۆهۆ نییە کە کۆتر و ژیر زمانی فەڕەنسی دەخوێنن. زمان و ئەدەبی فەڕەنسی بۆ وڵاتی مەزن کە شەش ساڵ پێش ئێستا کەم تا زۆر کۆلۆنیای فەڕەنسا بوو، یەکجار گرنگە. سیستەم و دامودەزگای ئیداری، سیاسی و جڤاکیی وڵات، بەگشتی بە گوێرەی [سیستەمی] فەڕەنسا دامەزراوە. کاریگەریی زمان، کولتوور، ئەدەبیات، هزر و ڕێزمانی فەڕەنسی، زۆر ئاشکرا بەرچاو دەکەوێت. لەگەڵ ئەوەش کە وڵات ئازاد بووە و فەڕەنسییەکان لە مێژە لە وڵات کشاونەتەوە، لە قووڵایی ڕەگ و ڕیشەی بەڕێوەبردنی کاروباری جۆراوجۆری وڵاتدا، کاریگەریی فەڕەنسا دیارە. لە بەر پەیوەندیی لەگەڵ فەڕەنسا، پێوەندیی لەگەڵ زمان، فەرهەنگ و ئەدەبیاتی فەڕەنسی، هێمای پێشکەوتن، سەرکەوتن و زانایییە، ڕێگەی سەرکەوتنە. لە بەر ئەوەشە کە کۆتری کچی پارێزەرێکی بەناوبانگ و دەوڵەمەند، ژیری کوڕی سەرۆک عەشیرەیەکی مەزنی وڵاتی چیا، لە زانکۆی زمان و ئەدەبیاتی فەڕەنسی دەخوێنن.

ئێستا، لەم شەوە ساماڵەی پاییزدا، شاری مەزن، پەردەی تاریکی شەوی لە خۆ پێچاوە و نوستووە. گڵۆپی سەر شەقام و کۆڵانی شار کە وەک شەوق و برووسکەی ئاگر دەدرەوشێنەوە، پاسەوانی شەوانی

شارن. ڕووبار کە ئێستا زۆر ئارام دەڕوا، لە ژێر ڕووناکیی گڵۆپی بولواری کەناریدا، دەبریسکێتەوە. ئەستێرە لە سەر ئاوی چەم شەوق دەدەنەوە. بولوار، شەقام و کۆڵانان، گەر سەگی بەرەڵای کووچە لە بەر چاو نەگرین، چۆڵن. دەنگ هاتۆتە برین. ژیان، جموجۆڵ، بزووتن لە شار دوور کەوتوونەتەوە. خۆر، هەتاو، گەرما هێشتا دوورە، کازیوەی بەیان، سپێدە، ڕۆژێکی نوێ هێشتا دوورە. شەوە، تەنیا شەوی ڕۆشنە و لەم شەوە ڕۆشنەدا، دڵی کەسێک، دڵی کۆتر زیزە، زویرە، پڕخەم و کەسەرە.

کۆتر چەندە ناسک خەیاڵە.

لە ژووری بچووکدا کە بە دوو مۆم ڕووناک بۆتەوە، لە سەر تەختەی تەسکی نووستن، کۆتر و ژیر ڕووتن. ئەوان پێکەوە لە ناو یەکدان. ژیر ڕاکشاوە، کۆتر بە سەر ژیرەوەیە. کۆتر بسک و پەلکەی درێژی بەرداوەتەوە، هەر دوو لنگی بە سەر بەدەنی ژیردا بڵاو کردۆتەوە، خۆی بەرەو ناوچەوان و چاوانی ژیر درێژ کردۆتەوە و لە ڕوخساری ژیر دەڕوانێ، وەک ئەوەی حەز بکات هەموو دڵ و ڕۆحی ژیر، یەک بە یەک ببینێ و بیناسێ. چاوانی کۆتر وەک دوو ئەستێرەی ئەستوور دەدرەوشێنەوە بەڵام نە پێکەنین، نە دڵخۆشی بە چاویەوە دیار نین. بە تەنیا ئەو بە نیگای گەلێک قووڵ لە بیلبیلەوە، لە قووڵایی چاوانی ژیر دەڕوانێ و دەخوازێ تا دەتوانێ دیسان بیخاتە ناو قووڵایی تەڕی خۆیەوە. کۆتر هەر دوو دەستی خۆی لە سەر ژیرەوە بردووە و خستوویەتە ناو [پەنجەی] ژیر، توند گرتوویەتی و دەیگووشێ. «ژیر»، کۆتر بە دەنگیکی زۆر نزم، بە ناڵەوە، دەڵێ: «ژیر، تۆغرت خێر بێ...».

ژیر لە ناو قووڵایی کۆتردا، بێدەنگ لە کۆتر دەڕوانێ. نە بەرسڤێک دەداتەوە نە نیگایەکی دیاریش نیشان دەدا کە ببێتە وەڵام. ئەو تەنیا بە هێز و جۆشی خۆشەویستی، بە کەڵکەڵەی گەرمای قووڵایی تەنگی

کۆتر، بە چاوی کراوە لە یارەکەی دەڕوانێ؛ بە تکا، بە مینەت، لێی دەڕوانێ. دەنگێکی لێوە نایە، ئەگەر بیشیەوێ ناتوانێ دەنگی لێوە بێت. قورگی وشک، لە سەر هۆش چوو، بەدەنی، دڵی، ڕۆحی، هەموو بوونی کەوتۆتە بەر شەپۆلی قورس، قووڵ و قایم. دەمارەکانی لاویەتیشی هەستاوە، سەری لە گێژەوە دێت، ژیر لە ناو سەرگێژە و شەپۆلاندا وەک لانکەیەک دێت و دەچێ، دێت و دەچێ.

«ژیر» کۆتر دیسان بە دەم گریانەوە دەڵێ: «ژیر بە خەبەر بێ، لەگەڵ تۆمە، گوێم لێبگرە... ئۆغر بێ، من دەڵێم... وەک دایەگەورەم دەیگوت؛ ئۆغری خێرت بێ، با خوات لەگەڵ بێ... گوێم لێبگرە ژیر... هەروەک لە چیرۆکی هەرە کۆنی مرۆڤایەتیدا وتراوە؛ با لاقەکانت، تۆ بە زیندوویی و سەلامەت بگەیەننە ماڵێ... بڕۆ ژیر؛ بڕۆ... و ئێستاش من بە دڵ و گیان، بە ڕۆح و جەستە، بە خۆشەویستی و ئەوین، ئۆغرت دەخوازم... بڕۆ...».

ژیر بەرسڤ ناداتەوە. لە باتیی وەڵام، هەوڵ دەدات بێ ئەوەی لە ناو کۆتر بێتە دەر، دەستەکانی لە قامک و پەنجەی کۆتر ڕزگار بکات، هێزێکی کەم لە خۆ دەدات و بە ئارامی هەڵدەگەڕێتەوە سەر کۆتر. ژیر جێی خۆی ڕاست دەکاتەوە، لنگی کۆتر دەکاتەوە وەک ئەوەی بیهەوێ خۆی بگەیەنێتە بنی قووڵایی کۆتر بەهێزەوە، لە سەر کۆتر ڕادەکشێ. بێجووڵە، بێ بزووتن، هەر ئاوەها چاو نووقاو، چەند خولەکێک لە ناو ئەو گەرماییەدا دەمێنێ. دەستەکانی کۆتر بە ئارامی و ڕێک و پێک لە سەر پشتی، لە سەر سمتی دەگەڕێن. دڵی کۆتر بڵێسە دەدات، زگ و بەر زگی، لە بەر جۆشی خۆشەویستی دەبزوێ. جەستەی کۆتر کە وەک هەورێشم نەرم، تەنک و سافە، بە ئارامی دەبزوێ. لە ناو قووڵایی کۆتردا، ژیر هەست بە دەنگ و سەدای سووک و قووڵی حەز و خۆشەویستی دەکات. پێشتریش هەستی بە دەنگ و سەدا کردبوو، بەڵام

نە ئەوەندە بەهێز و قووڵ، نە ئەوەندە ڕوون و ڕۆشن. ڕۆشن؟ بەڵێ، ڕۆشن وەک ئەوەی ئێستا لە دەروونی ژیردا برووسکەیەک لێبدات، هێند بەهێز، تێکڕای جەستەی بە ڕۆشناییەکی ئێجگار بەهێز بەند بە بەند داگیر دەکات. ئایا لە سەرخۆ چوون و بوورانەوە وەهایە؟ مردن ئەوەیە؟ یان نا، ئەوە لە دایک بوونە؟ لووتکەی جۆشی ئەوین ئەوەیە؟ بنی قووڵایی خۆشەویستی ئەوەیە؟ پاش لێدانی ئەو برووسکە دەروونییە، لە دوای ئەو شەپۆلە یەکجار بەهێزانە، ئەو دەتوانێ بە ئاسانی، بە ڕاحەتی بمرێ. «ئیدی خەمی مەرگم نیە کۆتر»، ژیر لە بن گوێی کۆتردا بە هێمنی ئەمە دەڵێ و دەست بە مژینی گوێچکەی دەکات.

کۆتر چاونووقاو، هەندێک لە خۆ بێئاگا، وەک ئەوەی لە خەودا بێت دەڵێ: «بمرە، لە ناو باوەشی مندا، لە ناو مندا بمرە». کۆتر بە دەستەکانی کە پشتی ژیر دەخورێنێ، توند سمتی ژیر، کەمێکی تر بەرەو زگ و ژێر زگی ئارەقاویی خۆی دەکێشێ. ئەگەر ئێستا مومکین بوویا، هەموو جەستەی ژیری دەخستە ناو خۆی، ئەو بەدەنی ژیر و بەدەنی خۆی دەکردە یەک. بەڵام نابێ، ئەو هەرچییش بکات، نابێ. پێشتریش چەندین جار ئەو و دەزگیرانەکەی لە سەر ئەم تەختە تەسکە دڵ و بەدەنی خۆیان دابووە بەر ئاگری حەز و شەهوەت. بەڵام ئەمشەو سەیرە، ئەمشەو شەوێکی نائاساییە، شەوێکی بێ وێنەیە. هەرگیز هەستی ئاوا قووڵ، داگیری نەکردبوون. هەرگیز ئەو بەم شێوە بە ویستێکی بێکۆتایی نەیخواستبوو کە ژیر تێیدا بووایە. ئەمشەو ویستێکی نوێی بێهاوتا بەسەریدا دێت. لە قووڵایی جەستە، مێشک و ڕۆحیدا شتێکی وێنا نەکراو ڕوو دەدات. فێنکایی ڕووباری مانگی نیسان، سەرما و شەختەی چلە، گەرمایی تیرێژی ڕووشپەڕ، هێز و توانای هەرەسی وڵاتی چیاکان، ناوەوەی ئەو ئاڵۆز دەکەن. ئەو زوبرییە، ئەو زوڵاڵییە، ئەو گەرمایە! وەک لافاوی خوڕ لە دەروونیدا دەخولێتەوە، وەک ئەوەی گیایەک کە

تازە سەری لە خاک دەرهێنابێ، تیایدا دەڕوێ. وەک ئەوەی برووسکەیەک لە دەروونیدا لێبدات، کۆتر دەسووتێ، ڕەگی، بەدەنی، ڕوخساری، دڵ و گیانی دەسووتێ. دونیا ئیدی ناسووڕێتەوە، کات ئیدی ناڕوا. دونیا، کات، ڕۆژگار، دەر و دەشت، ئەو شارە گەورە، ئەو ژوورە بچووکە، ئەو جەستە زراف و جوانە، هەرشت، هەرکەس دەسووتێ. هەموو شت لە ناو ڕووناکیی سووتاندا، بە بڵێسەی ئاگر ون دەبێ. کۆتر ون دەبێ.

بەڵام لافاویش هەڵدەستێ. جەستەی کۆتر سەرچاوە و ئاوەڕێی هەموو کانی، ڕووبار و لافاوی جیهانە. هەموو ئاوی جیهان، ئێستا لە جەستەی کۆتر هەڵدەقوڵێ. کۆتر تێناگات. بەڵێ، ئەوە ئەوینە، حەزە، خۆشەویستییە. یان نا، ئەو ئەوینەی مێژوو دەهۆنێتەوە، چارەنووس پێیدەگەیەنێ، مرۆڤان بەرەو مەرگ دەنێرێ ئەوەیە! بەڵێ، کۆتر تێدەگات، ئەوینی مان و نەمان ئەوەیە. کۆتر هەم تێدەگات، هەم تێناگات. لە ناو تێکەڵییەکی ڕەنگینی شەهوەتدا، کۆتر دێت و دەچێ. شەپۆلی ڕووناکییەکی بێکۆتا، ئێستا لە دەروونی کۆتریشدا هەڵدەستێ. شەپۆل، یەک بە یەک، هەنگاو بە هەنگاو بەدەنی کۆتر داگیر دەکات. جەستەی بە ئارامی دەجووڵێتەوە. «بمرە»، کۆتر لە ناکاو بە دەنگی بەرز دەڵێ؛ «ئێستا بمرە» و وەک ئەوەی بوومەلەرزە لە جەستەی دابێ، وەک ئەوەی برووسکەیەک لە دڵی دابێت، هەموو بەدەنی هەڵدەستێ و دادەکەوێ، جارێک، دووجار... جار بە جار... بێکۆتایی. کۆتر هەر دوو دەستی دەبا بۆ ڕوخساری ژیر کە لە سەرەوە لە کۆتر دەڕوانێ و ڕوخساری جوان و ئارەقە کردووی دەماڵێ. کۆتر لە ژێرەوە بە پارێز لە چاوی کراوەی ژیر دەڕوانێ.

ئەو لەرزینە، ئەو شەپۆلە، ئەو پەلە کردنە، ئەو دانەوە، ئەو گرتنەوە دەبێ بێکۆتایی بێت، تەواو نەبێت. جاربەجار، جارێکی دی... جارێکی تر...

بەڵام ژیر بە ئارامی لە سەر کۆترەوە دێتە تەنیشتی. سنگی کۆتر توند توند هەڵدەستێ و دادەکەوێتەوە. دەستی ڕاستی لە سەر مەمکی تەڕی کۆتر، لە پاڵ کۆتردا ڕاکشاو، دەڵێ «من دەمرم».

«بەڵام لێرە لە کن من بمرە» کۆتر وا دەڵێ و لە ناو نوێنی شپرزە هەڵدەستێ، بە سەر ژیردا هەنگاو هەڵدەگرێ. دەستی ڕاستی لە ناوەڕاستی لنگیدا، بەرەو حەمامی زۆر بچووک دەڕوا.

پاش کەمێک، کاتێک کۆتر دەسرەیەکی زۆر گەورە بە دەستەوە بۆ قسە کردن دێتە بەر تەختی نووستن، ئیدی ژیر خەوی لێکەوتووە. چاوی بەستراو، ڕوخساری وەک ڕوخساری منداڵێکی بچووک، ئارام، خاوێن و ڕۆشن. ژیر دەخەوێ. ئەوەندەی چەند خولەک بە پێوە بە هاریکاریی ڕووناکیی قەڵسی مانگ و ئەستێران لە ژیر دەڕوانێ. ئەویندار نووستوو... دڵی ئەنگاوتەی کۆتر توند لێدەدات.

ژیر؛ ئەو چاوە جوانانەی وەک دوو دەنکە ترێی ڕەش کە دڵی کۆتر دەتوێنێتەوە، ئەو جەستە بەهێز، زراڤ و ڕێک و پێکە کە ئیدی فێر بووە لەگەڵ جەستەی زراڤی کۆتر ببێتە یەک، ئەو دەستە، ئەو قۆڵ و بازووە بەهێز و جوانە کە بە توندی جەستەی کۆتر لە ئامێز دەگرێ، ناوقەدی زراڤی داڵدە دەدا، ئەو لێوە ناسک و ژیانبەخشە کە جەستەی کۆتر بەئاگا دێنێ و لە دەروونیدا برووسکە لێدەدا، ئەو مرۆڤە لاوە کە دڵی کۆتر دەبات، کۆتر دەگەیەنێتە لووتکەی حەز، جۆش، شەهوەت و کەیفخۆشی.

ژیر؛ کوڕی عەشیران، بەڵام لە زمانی زگماکیی خۆی دوور، بۆیەش لە بەرانبەر زمان، فەرهەنگ و ڕێزمانی وڵاتی خۆی شەرمەزار، کانگای تووڕەیی و ئازار، نموونەی غیرەت و شەرەف؛ وەک ناوەکەی زۆر ژیر، تێگەیشتوو ودووربین، بەڵام چالاک، سەرهەڵدەر، دڵگەرم، ئێستا ئەو ئینسانە دەڕوا، لە کۆتر دادەبڕێ، کۆتر لە شوێن خۆی لەم شارە مەزنە

بە تەنیا بەجێدێڵێ و دەڕوا. ئەو ڕۆژانەی کە لە بەر باران تەڕ دەبوون، ئەو ڕۆژگارانەی بە بەفر سپی دەبوونەوە، ئەو کاتانەی بە تینی هەتاو دەسووتان، ئەو شەوانەی بە سڵاوی مانگ و ئەستێران ڕووناک دەبوونەوە و ئەو ژیانەی بە ناڵەی خۆشەویستی ڕەنگینی دەکرد، ئێستا بە جێ دەمێنێ.

ژیر.

کۆتر لەگەڵ ئەم گەنجە کە ئیستا بە ئارامی پرخەی دێ، لە سەرەتای خوێندن لە زانکۆ، ڕۆژێک کە زۆر دڵتەنگ بوو و زۆر خۆی تەنیا دەدیت، بە هەڵکەوت لە چێشتخانەی زانکۆ ئاشنا بوو. ئەوان لە کەناری هەمان مێز دانیشتبوون. ژیر دوو هاوڕێی خۆیشی لەگەڵ بوو. بە قسە کردن و لەهجەی ژیر، کۆتر تێگەیشت کە ژیریش وەک خۆی خەڵکی وڵاتی چیایە. لەگەڵ ئەوەش کە ژیر بە زمانی فەرمیی وڵاتی مەزن قسەی دەکرد، ئاسەواری زمانی وڵاتی چیا بە زاراوەیدا دیار بوو. سەرەتا بە چاوی ڕەشی گەرم یەکدییان ناسی، دواتریش قسە و زمانی خۆش و شیرینی ژیر ڕێگەی ئاشنا بوونی کردەوە. سەیر بوو... بۆ هەموو شتێک، لە سەر هەموو شتێک وەک یەک بیریان دەکردەوە، وەک یەک هەستیان دەکرد، وەک یەک حەزیان لە شتەکان دەکرد، وەک یەک پێدەکەنین، وەک یەک هەڵوەدای شتەکان بوون. ئەو وێکچوونە سەرنجڕاکێش و پڕ هەیەجانە ڕێگای بە یەکبوونی جەستەکانیشی کردەوە. شەوێک، دیسان لەم ژوورە، دیسان لە بەر ڕووناکیی قەڵسی مۆمەکاندا، بە ئیلهام و جۆش، لێ بەترس ودڵەڕاوکێ، دڵی- وەک پەپوولەیەک کە کەوتبێتە ناو گەردەلوول- ئەنگاوتە، کۆتر خۆی و کچێنیی خۆی پێشکەشی دەست، جەستە و ڕۆحی ئەو کرد. جارێکی دیش خۆی ڕادەست کرد، جارێکی دی... هەموو شتێک لە ناو وێکچوونێکی شیریندا کە کۆتر پێی سەرمەست دەبوو، بەردەوام بوو، تاوەکوو ڕۆژێک ژیر بە نیگایەکی وەها

تیـژ کـە کۆتـر نەیدیبـوو، تەقییـەوە و وەک هـەوری ڕەش گرمـەی هـات. ئێستا باش نایەتـەوە یـادی کۆتـر کـە بۆچـی ژیـر ئەوەنـدە ناڕەحـەت و بێـزار بـوو. بـەڵام کۆتـر لایەنـی نوێـی ژیـری ناسـی کـە لـە تاریکیـی دڵ و مێشـکیدا خۆی حەشـار دابـوو. بەڵـێ ژیـر لایەنـی تاریکـی هەبـوو... کۆتـر تێگەیـی کـە لایەنـی وێکنەچووشـیان هەیـە. زانـی کـە یەکسـانی هەمیشـە و لـە هـەر هـەل و مەرجێکـدا مەیسـەر نابێـت. بـەڵام قەینـاکا، مەگـەر ژیانـش لـە نـاو لانکەی یەکسـانی و نایەکسـانیدا نایـە و ناچـێ؟ مەگـەر سیسـتەمی دونیـاش بـە گوێـرەی ئـەم نەریتـە هەڵناسـووڕێ؟ گرنـگ حـەزە، ئەوینـە. کۆتـر بـڕوای بەمـە هەبـوو؛ ئەشـق و خۆشەویسـتی دەتوانـێ قوفڵـی زۆر ژەنگگرتـووش بکاتـەوە... .

لـە زانکـۆ، ژیـر سـاڵێک پێـش کۆتـر بـوو. لـە وانەکانیـدا یارمەتیـی دەدا، ئێـواران لـەم ژوورە تەنـگ و بچووکـەدا، پـاش نیـوەڕوان لـە کەنـاری بولـواری هـەر دوو لای ڕووبارەکـە، شـەوانە لـە ژێـر ڕوناکیـی گڵۆپـی شـاردا، لـە نـاو تـەم و مـژی ڕۆژانـی شـێداری پاییـزدا، لـە ژێـر تینـی گەرمـی ڕۆژانـی هاوینـدا، بـەردەوام شـیعری فەڕەنسـی بـۆ دەخوێنـد. دوای فراوێـن و شـێوی سـادەی خوێنـدکاران، دوای کاتـی درێـژی خۆشەویسـتیی کاتژمێرانـی درەنگـی شـەوان کـە ئیـدی ئەسـتێرانیش ماڵئاواییـان دەکـرد و دەڕۆیشـتن، ئـەوان لـە سـەر شـۆڕشـی فەڕەنسـا، شارسـتانییەتی، مێـژووی فەڕەنسـا و نووسـەرانی نـاوداری فەڕەنسـا دەئاخاوتـن. ئـەوان دەپەیڤیـن، هەمیشـە دەپەیڤیـن. بـە دەم ئـەو قسـانەوە لـە خـەو ڕادەچـوون. بـەو قسـە ئەدەبییانـە جـۆش و کوڵـی ڕۆحیـان بـەرز دەبـۆوە و بەدەنیـان دەهاتـە جـۆش. ئـەوان؛ دوو ڕۆحـی جـوان، گـەش و لێگـەڕ، بەڵـێ، لێگـەڕ. ڕۆحـی زۆر گەرمیـان لـە ڕێگـەی ڕاسـت، لـە ئایدیـای گـەورە و بڵنـد، لـە پێـوان، هـزر و ڕوانگەیـەک کـە ژیـان و جیهانیـان وەک یـەک لێدەکـرد، دەگـەڕا. لـە سـەر ڕێگـەی لێگەڕیـن و گەڕانـدا قۆناغێـک لـە قۆناغـە هـەرە گرنگـەکان، بێگومـان وڵاتـی بـاو و باپیـران،

ولاتی چیاکان بوو. ئەوان دوور لە ولاتی چیا، لە پایتەختی ولاتی مەزن دەیانخوێند. ئێرەش ولاتی ئەوان بوو. لێ ولاتی ئەوان، ئەو شوێنەی کە کەسایەتییەک، ناسنامەیەکی داوەتە ئەوان، لە دوور، لە باکووری ولات، لە ناو شاخەکاندا بوو. ئەوان، کچ وکوڕی ئەو شاخانە و ئەو ولاتە دوور و تەنیا بوون. ڕەوشی ولاتەکەیان، هیچ حاڵێکی نەبوو نە دوێنێ حاڵێکی هەبوو نە ئەمڕۆ. ولات، ولات پەروەری، ولاتپارێزی و قسەی لەم چەشنە لە ناو گفتوگۆی لێکەڕینی ڕاستییەکاندا، بۆ ئەوان، قسەی هەم بڵند، هەم جوانیش بوو. پێدەچێ بۆیەش ئەوان، جارێک کۆتر، جارێک ژیر، شیعرێکی ڤیکتۆر هۆگۆ کە لە سەر ولاتپارێزی بوو، بە سێ زمان، زمانی باو و باپیران، زمانی ولاتی مەزن و زمانی فەڕەنسی، هەمیشە لە کاتی خەم و پەژارە، شادی و خۆشیدا، دەیانگوتەوە. «پلە و گەورەیی بە تۆ دەکەوێ/ ولاتی شیرین و تاهەتایی/ پلە و شەرەف بەوانە دەکەوێ/ کە بوون بە قوربانی تۆ.../ ئێستا کۆتر نیگای پڕ پەژارەی بڕیوەتە ژیر، دیسان هەندێک دێڕی شیعری درێژ، وەک مەقام دەچڕێنێ.

پلە، شەرەف، گەورەیی، بوون بە قوربانی... کۆتر پاش ئەم دێڕە شیعرانە هەنووکەش بەپێوە، بیر دەکاتەوە، پلە و پایە و گەورەیی و سەروەریی ولاتی ئەوان... و ئەوانە... و لێکەڕینی ئەوان... ئەوان لە چی دەگەڕێن؟ ئەوەی ئەوان لێی دەگەڕێن لە کوێیە؟ ئەوان کەی دەتوانن خۆیانی پێ بگەیەنن؟ بۆچی سەرنجی ڕۆحی بەمێژیان هەمیشە لە مێژوو و زەمەنی ڕابردوو، لە کات و زەمەنی داهاتووە؟ لە ناو چیرۆک، بەسەرهات، گێڕانەوە و ئەزموونی مێژووییدا لە چی دەگەڕێن؟ ئەوان لە ناو لاپەڕەکانی کتێبی هەرزاندا کە بە چاپێکی زۆر سادە بلاو کراوەتەوە چی دەبینن؟ بۆچی کۆچ، کۆمەڵکوژی، ڕۆشتن، دابڕان، پەژارە، ژان، مردن، خواست، هیوا، هەیەجان و تێکۆشان ئەوەندە سەرنجیان ڕادەکێشێ؟

بۆچی نیگای ساردی ژنانی بێچارە، ئارەقەی ناوچەوانی پیاوانی بندەست، گریانی منداڵانی هەژار، سترانی دەنگانی پیر، چرپە چرپی نهێنیی جەماوەری داماو، هاوار و بەرخۆدانی مرۆڤانی هەژار ئەوەندە، ئەوەندە بەهێز سەرنجی ئەوان ڕادەکێشێ؟ بیر و هزری نوێی شەڕ، تێکۆشان، خۆڕاگری، سەرهەڵدان و شۆڕشە کە لێرە و لەوێ، نیوە و نیوەچڵ بەڵام شەپۆل شەپۆل دەڕژێ بەسەریاندا؟ بۆچی ئەوان کە لە خێزانی تێر و دەوڵەمەندن، ئەوەندە بۆ ئەو بیر و هزرانە کراوەن؟ بۆچی دڵ و ڕۆحیان بەجۆشی ئەو هزرانە لە سەر خۆ دەچێ؟ بۆچی بیریان هەمیشە لە لای وڵاتی دوور، شوێنی نادیار، ڕۆشتن و کۆچی پڕ مەترسییە؟

ئەوەی ڕۆحی ئەوان لێیدەگەڕێ، لە کوێیە؟ لە دوور؟ لە نزیک؟ لە کۆتایی سەفەران؟ پێدەچێ لە هیچ کوێ، پێدەچێ ئەوان بە تەنیا بە شوێن خەون و خەیاڵێکەوە بن.

ژیر کە ئێستا پاش کەمێکی دی دەکەوێتە سەر ڕێی لێکەڕین و دەڕوا، چی دەبینێ؟ تووشی چی دەبێ؟ بەڵام ژیر دەڕوا، دەچێت بۆ وڵاتی باو و باپیران، دەڕوا بەرەو ئامێزی چیا تاهەتاییەکان، دەکەوێتە ناو داڵدە و حەشارگەی مێژوویی خەرەند و هەڵدێرەکانی وڵاتی چیا. کۆتر دەزانێ ئەو چیش بکات، ژیر بریاری خۆی داوە. وڵات، بە تەنیا بیر لە وڵات و چوونەوە بۆ وڵات دەکاتەوە. وڵات کە ژیر جار بە جار بێوچان، بە جۆش و خرۆشێکی گوڕ، دەیگوت؛ وڵاتی جوان، بینایی چاوان، جوانییەکی لە بەر چاو، چیای بڵند، شیوی قووڵ، ئاوی زوڵاڵ، لافاوی خوڕ، دار و درەختی شین، چەم و درەختی گەوهەر، ڕەنگی سەوز و سوور، سەرپۆشی سپیی بەفر، گیا و دەوەنی شینی شیفا؛ هووژە هووژی کانی و ئاوی خوڕ، دەنگی سووکی گەڵای داری بی و سپیندار؛ هەرەس، با و گژەبای بێکۆتایی؛ سپێدەی ئارام، مەغریبی سوور، شەوی ساماڵ، ئەستێرەی درەوشاوی سوور، ئەشکەوت و موغارەی فێنک، دەر و

دەشتی زەرد، هەموو شت، هەر شتێک کە بانگ لە دڵی کەسانی لێگەڕ دەکات، لەوێیە. ژیر دەیگوت لە وڵاتی باو و باپیرانە.

ژیر؛ ئەویندارى دڵبەر، دڵدارى ئەشقى کۆتر، ئەشقى وڵات... .

لە ناو هزر و هەستی تێکەڵدا، کۆتر لە ژیر دوور دەکەوێتەوە و دێتە بەر پەنجەرەی بچووک و لە ڕووبار دەڕوانێ. مۆم تەواو بووە، شەمدان خاڵییە، کۆتر ڕووت، بێهیوا، ماوەیەک بۆ دەرەوە دەڕوانێ. ئەستێرە کەم بوون، لە دوورەوە لە سەر بانی خانووی ناوشار، سوورایییەکی کاڵ و تەنک دیارە. ئاوی ڕووبار شەوق دەداتەوە. گەڵای داران لە کەناری ڕووبار بە شنەی بایەک دەجووڵێن. دەنگی سووکی شنەیەک بە ئارامی دەگاتە گوێی کۆتر. ئایا دونیا هەر ئاوا پڕ خەم و پەژارەیە یان پەژارە و ترسی سەر دڵی ئەوە کە دونیا وەها پڕ پەژارە دەکات؟ کۆتر نازانێ، گرنگیش نیە کە بزانێ، بەڵام زویرە، هەستەکانی ئەوەندە ناسک بوون کە بە دەنگێک، بە جووڵەیەک دەتوانێ بە هاوارەوە بگری.

ژیر دەڕوا، ژیر دەڕوا بۆ سەر شاخەکان، دەڕوا بۆ شەڕ و تێکۆشان. لە وڵاتی چیاکان، لە قووڵایی شیو ودۆڵ و هەڵدێران، لە بنار، دوند و لووتکەی چیا، سەرهەڵدانێکی نوێ لە دژی دەسەڵاتداریی دەوڵەتی وڵاتی مەزن و دەسەڵاتداریی ژەنەڕاڵ سەردار دەستی پێکردووە. وەک دوێنێ، وەک پێرێ. وڵاتی چیاکان و سەرهەڵدان؛ چارەنووسێک کە بێوچان هەر بەردەوامە. دیسان شەڕێکی خوێناوی، سووتانێکی ماڵوێرانی دەستی پێکردووە و گەنج و لاو، یەک بە یەک، دەستە بە دەستە، وەک ئەوەی بچنە شایی، دەچن و خۆیانی پێ دەگەیەنن. ئێستاش ژیر دەڕوا. ئێستا، بەڵێ ئێستا، کاتێک دوای کەمێکی دی سپێدەی دا، ئیدی دەنگی گۆرانی، زمانی شیعر، خۆشی و یاریی جەستەکان تەواو دەبێ. ئیدی ئەوان هەرگیز، دەست لە ناو دەست لە کەناری بولوار ناگەڕێن، پیاسە ناکەن و باسی فەلسەفە، نووسەر، کتێب، بابەت و وتارەکان ناکەن. ئیدی کۆتر

ناتوانێ گوێ بداتە دەنگی سترانی فۆلکلۆری کە ژیر بە زمانی باو و باپیران دەیوتەوە. ئەو خواستی هاوسەرگیری، ژیانی هاوبەش، بەختیاریی ژیانی خێزانی و ڕۆژانی داهاتوو... ئەوانە هەموو بەجێ دەمێنن و دەبنە نووسراوەی سەر لم.

ژیر دەڕوا.

لە ژووری بچووکدا کە پڕ لە سەدای ڕۆژانی ڕابردووی ژیر و کۆترە، کۆتر بێ ویستی خۆی دەست بە گریان دەکات. ئەوەندەی چەند خولەک ئەو هەر ئاوا سەری داخستووە، چاوی لە دەرەوە، بێجووڵە دەگری. فرمێسک یەک بە یەک بەرەو خوار دەبنەوە. ئایا ئەوان دەتوانن دیسان یەکتر ببینن؟ چۆن؟ کەی؟ ئەوە چ چارەنووسێکە؟ چارەنووسی ڕەشی ولاتێک چۆن دەتوانێ ئاوەها چارەنووسی ئینسانەکانیش بهۆنێتەوە؟ چارەنووسی گیراو چۆن دەتوانێ چارەی کەسانی دیش بگرێ، بیکاتە یەخسیر؟ ڕۆژگاری ڕووناکی پاییز، ئێستا ئاوەها بە دابڕان، ئاوەها تاریک کۆتایی بێ؟ بە خەم و پەژارەیەک کە دەبێتە گریان و هەناسە لە بەر کۆتر دەبڕێ، کۆتر بەرەو مێزی سووچی ژوورەکە دەچێ، لە چاوەیەک دوو مۆمی نوێی درێژی سوور دەردێنێ و دەیهێنی لە سەر شەمدانەکە دایدەنێ و دایدەگیرسێنێ. مۆم دەسووتن، سەرەتا وەک دوو پزیسک و دواتریش وەک دوو گلۆڵەی باریکی ئاگر. ژوورەکە کەمێکی دی ڕووناک دەبێ و سێبەری مۆمەکان لە سەر دیواری سپی و کەمێک وێران و سادەی ژوورەکەدا دەجووڵێ. ئەوەندەی چەند خولەک کۆتر بە پێوە، بە چاوی تەڕەوە لە مۆمەکان دەڕوانێ. ڕووناکی و گەرمای بێزاری مۆمەکان، شەکانەوەی ئاگر، سێبەرەکەی و یەکیەتیی ئەوانە هەمووی، وەک ئەوەی دەنگ و سەدا، هزر و خەیاڵ بێت، سەرنجی ڕادەکێشێت.

دوای ئەوەش کۆتر دیسان دەگەڕێتەوە بەر پەنجەرە. شانەیەکی درێژی ڕەش لە بەر پەنجەرەیە. کۆتر بە ئارامی وەک ئەوەی لە خەودا

بێت، شانەکە هەڵدەگرێ و قژی ڕەشی درێژی خۆی پێ شانە دەکات. بێدەنگ، بەپارێز، ڕێک و پێک. قژی درێژی بە بەژن و بالای بەرزی دەکەوێ. دڵتەنگ، چاو پڕ گریان، قژی شانە دەکات. شانە، تاڵی نەرمی قژی درێژ، هێدی هێدی لە یەک جودا دەکاتەوە.

ئەو دەڕوا، کۆتر وەک ئەوەی شیعرێک بخوێنێ، لە ناکاو وا دەڵێ، ئەو دەڕوا بۆ وڵاتی بێبەخت، شوێنی مردن و ون بوون. ئەو وڵاتەی کەس خێری لێ نەدیوە، هەمیشە لە ناو مژ و دووکەڵدایە، هەمیشە وەک چیایەک کە خەریک بێ بتەقێتەوە، تووڕە و توندە، هەمیشە پێکدادان، هەمیشە شەڕ و خوێنی تێدایە. ئەو وڵاتە کە هەمیشە بە گڤە گڤی با و ڕەشەبا، هووژەی باران و تەرزە دەناڵێنێ. مەگەر ژیر، ئەو کوڕەی ئێستا وەک فریشتەیەک نوستووە، نازانێ کە ڕۆشتن بۆ ئەو وڵاتە، گەڕانەوەیەکی نییە؟ ژیر، ژیری بیرمەند و تێگەیشتوو، بۆچی تۆ نازانی کۆتایی ڕێگەی چوون بۆ ئەو وڵاتە، گۆڕە، گۆڕستانە؟ گۆڕستانی کاولی بێکەسانە؟ ژیر، ئەوینداری دڵبەر، بۆچی ئازاری ئەم دڵە ئەدەی؟ تۆ نازانی ئەم ئەشقە، ئەم خۆشەویستییە بێکۆتاییە، ئەم ناڵینە تاهەتاییە، ئەو قسە ئاشقانەی تۆ، ئەو گەرما و هەیەجانی ئەشقە، لەگەڵ ڕۆشتنی تۆ کۆتایی دێت؟ تۆ نازانی پێکەنینی وەک گوڵ پشکوتووت، چاوی درەوشاوەی وەک دەنکە یاقووتت، بەدەنی وەک خواوەندە ئەفسانەییە کۆنەکانی مرۆڤایەتی ڕێک و پێکت، لەگەڵ ڕۆیشتنت دەبنە بیرەوەری؟ مەگەر تۆ ئەوانە نازانی؟

کۆتر دیسان بەڵام بە دەنگەوە دەگری.

«کۆتر...»

سەرەتا کۆتر دەنگ نابیستێ، دوایی دێتەوە سەر خۆ و سەری هەڵدەگەڕێنێتەوە. ژیر بە پێوە لە سەر تەختی نووستن، ڕووت، بە چاوی خەواڵوو، لە کۆتر دەڕوانێ. «کۆتر... بۆچی دەگریت؟ چی

دەڵێی؟ وەرە بۆ لام...» «نا» کۆتر چاوی سوور و ماسیو، نیگەران دەڵێ، «نا، تۆ بێ... وەرە، با پێت بڵێم کە چی دەڵێم...». ژیر دەچێتە لای کۆتر، دەست دەخاتە گەردنی و لە ئامێزی دەگرێ، بە بزەیەکەوە دەڵێ؛ «هەڤاڵ و هۆگری ژیانم». کاتێک مەمکی قوتی کۆتر لە سینگ و مووی سینگی ژیر دەکەوێ، دیسان تەزوویەکی بەهێز بە سەر کۆتردا دێ. بەڵام خۆی ڕادەگرێ، هەندێک خۆی کۆ دەکاتەوە و دەڵێ: «مەڕۆ، تۆ دەبێ نەڕۆی»، بە دەنگێکی کەمێک بەرز و خەمین.

«کۆتر»، ژیر بە نەرمی وەک ئەوەی تکای لێ بکات دەڵێ.

«نا، نا، دەبێ نەڕۆی... دوای پێنج شەش مانگ ئیدی خوێندنت تەواو دەبێ، ئەو ساڵانەی خوێندنمان کە شەو و ڕۆژمان کردە یەک تا سەرکەوتوو بین، ئەو شتانەی ئێمە فێر بووین، یانی ئەوانە هەمووی بە فیڕۆ دەڕوا؟ نا، نابێ تۆ بڕۆی...».

«کۆتر...»

«ئێمە باسی کورپەڵە و منداڵ، ماڵ و خیزانمان دەکرد، کوڕ و کچی ئێمە بە سترانی زمانی ئێمە، بە سترانی ئێمە گەورە بووبان. تۆ هەموو ئەوانەت لە بیر کردووە؟ تۆ نازانی؟ تۆ نازانی کە ڕۆیشتن، مردنە؟ ڕۆیشتن! واتا تەرک کردن، دابڕان، خەم، ژان و مردن... مەگەر تۆ ئەوە نازانی؟»

«کۆتر...!» ژیر ئەمجار لە ناکاو هاوار دەکات و دەڵێ: «کۆتر سست بوونت لێ نایە، شەرمە، عەیبە، خۆڕاگر بە... کۆتر... مەگەر مردن لەم ژیانە باشتر نییە؟ بڵێ، باشتر نییە؟ مەگەر ئێمە چەندین جار لە سەر چوون قسەمان نەکردووە، ئێمە قسەکانمان نەکردۆتە یەک؟ بڵێ! ئێمە و وڵاتەکەمان ئازادیمان هەیە؟ نا. سەربەستیمان هەیە؟ نا. ئێمە دەتوانین بە ئاسوودەیی و بە مسۆگەری بڵێین کە ژیانی ئێمە، داهاتووی ژیانی ئێمە و ئەو منداڵانەی بیریان لێدەکەینەوە، ڕووناکە؟ نا.

ئەم دەوڵەتە، ئەو ژەنەڕاڵە، ئەو ژەنەڕاڵەی خۆی بە سەرداری هەموو کەس دەزانێ و بە درۆ بانگی ئازادی و یەکیەتی هەڵدەدات، ژیانێکی یەکسان، دادپەروەرانە و هاوشێوەی بە ئێمە داوە؟ نا، نا، نا. ئەو کات؟ بڵێ کۆتر ئەو کات؟...».

تووڕەییەکی بەهێز، ژێر داگیر دەکات. ئەو تووڕەیی و تۆقینە تاریکەی کە کۆتر چەندین جاران لە بیلبیلەی چاوی ژێردا دیبووی، ئێستا دیسان دیارە. کین و نەفرەت، ئێستا دیسان هاتووە و لە سەر چاوی نیشتۆتەوە. چاوە گەورەکانی دەرپەڕیوە. دەمارەکانی گەردنی هەستاو، بە قیڕە و هاوار دەپەیڤێ. «مەقیرێنە» کۆتر بە ئارامی بە ژێر کە ئێستا کەمێک لێی دوور کەوتۆتەوە و لە ناو چاوەکانی دەڕوانێ، دەڵێ.

«نا، کۆتر، نا، بڵێ! ئەوانە ئێمە ناکوژن، پێرێ نەیانکوشتین، دوێنێ نەیانکوشتین، ئەمڕۆ نامانکوژن؟ ئێمە بەردەوام نامرین؟ هەر ڕۆژێک کە ئێمە دەژین لە مردن پیستر نییە؟ وڵاتی ئێمە لە ژێر پێدا نییە؟ زمانی باو و باپیرانمان، فەرهەنگمان، هەبوونمان لە ژێر مەترسیی زۆردارانـدا نییە؟ ئەوانە ون نابن؟ مەگەر ئێمە، من و تۆ، ئێستا بە زمانی ئەوان ناپەیڤین؟ بۆچی، بڵێ بۆچی؟ ئەوان، ئێمەیان لە ڕەگ و ڕیشەمان دوور نەخستۆتەوە؟ پێوانەکانی ئەوان وەک چەلەنگی گەردنمان هەمیشە لەم ملماندا نییە؟ ئەوان باشترین شوێنەکانی وڵاتی ئێمەیان داگیر نەکردووە؟ کۆشک و قەڵا، شوێن و شاریان بۆ خۆیان تێیاندا ساز نەکردووە؟ ئێمەیش لە وڵاتی خۆمان دیل، وەک غەریب و غەوارەی ئەم وڵاتە، لە دەرەوە، بە ترس، بە سام، لەوان ناڕوانین؟ دە بلێ نا! ئیدی تۆ باسی کام مردن دەکەی؟ وای دابنێ من خوێندنم تەواو کرد، چی دەبێ؟ چی دەگۆڕێ؟ هیچ شتێک، کۆتر هیچ شتێک...».

«باشە بڕۆ، چی دەکەی بیکە، لێ مەقیرێنە» کۆتر چەند دڵۆپ لە چاوی بەردەبێتەوە و دەڵێ، «بڕۆ...» ناڕەحەت دەبێ. لەم ژوورە

بچووکەدا بەرەو کوێ بڕوا، خۆی بخاتە کوێ؟ شانەکە لە دەستی بەر دەبێتەوە، ڕووی لە ژێر وەردەگێڕێ و دەڕواتە سەر تەختی نووستنەکە دادەنیشێ. کۆتر دەگری. ماوەیەکی درێژ ئەوان هەروا لە یەک دوور، ژێر لە بەر پەنجەرە، کۆتر لە سەر تەختی نووستن، لە ناو شەپۆلانی دونیا دەروونییە جیاجیاکانیاندا دەمێننەوە. دوایی ژێر هێدی هێدی، هەنگاو هەنگاو، دێت و بە سەریەوە ڕادەوەستێ، دەست دەخاتە قژی و دواییش لە تەنیشتی دادەنیشێ.

ژێر بە نەرمی، دانە دانە، دەڵێ: «هەوری ڕەش سەر وڵاتی ئێمەی گرتووە» «وڵاتی باو و باپیرانمان، ئەمڕۆ تاریکە، پەردەی تاریکی بە سەردا کشاوە، ئاسۆ، ئاسمان تاریکە، ئاو، کانی، چەم، بیر، سەرچاوە دیلن، چیای گەوهەری دیلن، ماڵ، شوێن، گوند، شار بوونەتە شوێنی کوندەبوو. وڵات تەنیایە، ئێمە تەنیاین، ئینسانە بێ پشتیوانەکانمان، بێ بەشەکانمان کە خۆشی، گەمە، حەزو خۆشەویستییان لە بیر کردووە، تەنیان... ئەو ئینسانە هەزارانە کە لە هەموو خۆشی، ماڵ و دڵخۆشییەکی ژیان و جیهان بێبەش ماون، دەستیان داشۆردووە، ئەمڕۆ سەر کزن و بە هیوای ئێمەن کۆتر، بە هیوای ئێمە...».

کۆتر سەری داخستووە و لە ژێر ناڕوانێ.

«کۆتر، تۆ وامەکە، من لەخۆوە نیگەرانم، دڵتەنگم، تکات لێ دەکەم تۆ وامەکە، وێرانترم مەکە» ژێر، ڕووی کۆتر دەکاتە لای خۆی و بە پەنجەی فرمێسکی چاوەکانی دەسڕێ. ژێر پێدەکەنێ، بەڵام کۆتر نیگای لە سەر ئەو لادەبا. ژێر بە هەر دوو دەست ڕوو و ڕوخساری هەندێک بەرەو ژوور دەکات تاوەکوو لە ژێر بڕوانێ. «دەخیلی بەختت بم، وا مەکە!»

«داهاتوو تاریکە ژێر مەگەر هەستی پێ ناکەی؟»

«بەڵام ڕووناکی لە دوای ئەم سەرهەڵدانەوەیە، کۆتر، زنجیر لەوێ،

لە بڵندایی و بەرزایی چیاکان دەپسێ... بەڵام تۆ خۆڕاگر بە، من تەنیا ئەوەم دەوێ».

ژێر ڕووی کۆتر دەکاتە خۆی و ڕوخساری، گۆناکانی ڕادەمووسێ و دواییش لێوی خۆی دەخاتە سەر لێوی کۆتر و چەند خولەکێک لێوەکانی دەمژێ. کۆتر خاو دەبێتەوە. ئەو ڕاموسینانە کە سەرەتای برووسکی دەروونی کۆترن، دیسان گەرمای بروسک پێش لێدانی، لە دەروونیدا ساز دەکەن. کۆتر دیسان، هێدی هێدی، لە سەر خۆ نامێنێ. دەکەوێتە ناو دەریای شەهوەت، دیسان برووسکەی ڕوناکییەکی بێپایان لە دەروونیدا هەڵدەبێ.

کۆتر بە هەر دوو دەستی کەمێک پاڵ لە ژێرەوە دەنێ و ئەو لە سەر پشت لە سەر تەختەکە دەخەوێنێ. لە ژێر کەمێک دوور، لە بەر لنگی ئەو، لە سەر ئەژنۆ دانیشتوو، لە سەر تەخت، کۆتر ئەوەندەی چەند خولەک، بست بە بست بە نیگای سەیری لە ژێر و بەدەنی ڕووتی دەڕوانێ. ژێر دەڕوا، بێ ئەوەی لە کۆتر زیاتر کەس بزانێ، بە درێیەوە، بە هەڵاتن، بە پەلە، ئەو دەڕوا. نە قسەکانی ئەو و نە هی ئەمیش کەڵکیان نییە. قسە بێهوودەیە، پێویست ناکات. کۆتر دەست پێدەکات، لە پەنای پێی ژێرەوە هەتا سەرەوە هەتا چاوی، بەند بە بەند ژێر ڕادەمووسێ، بێ ئەوەی زمان و لێوی لە بەدەنی جوانی ژێر بگوێزێتەوە. هێدی هێدی، دانە بە دانە. هەر دەڕوا بەدەنی ژێر بە لێوی گەرم و گۆشتنی کۆتر تەڕ دەبێ. دواییش کۆتر، ئەمجار قژی درێژی شانە کراوی لە سەرەوە بۆ خوار بە سەر جەستەی ژێردا دەکێشێ. تاڵی زوڵفی ڕەش و نەرم، وەک پەڕەی گوڵی نەوشکوفتە بە سەر جەستەی ژێردا دەگەڕێ. هەر تایەکی بوومەلەرزەیەک دەخاتە دەروونی ژێرەوە. وەک ئەوەی کارەبا گرتبێتی، ژێر دەهەژێ.

ژێر دەناڵێنێ.

کۆتـر بێدەنگـە؛ چـاوی تـەڕ، نیگـەران و دڵتەنـگ، جـۆش و خرۆشـی خۆشەویسـتی، دەنـگ و سـەدایەک کـە لـە دەروونیـدا ئـۆلان دەدەنـەوە، دیسـان سەرمەسـتی دەکـەن. خواسـتی بەدەنـی جوانـی ئـەو کـە لـە ژێـر ڕووناکیـی مۆمەکانـدا ڕێـک و پێـک دەجمـێ، دیسـان کۆتـر دەکەنـە تینـووی حـەز و عەشـق و دەیکەنـە یـاری مەیـل و خۆشەویسـتی. کۆتـر لـە خەودایـە؟ بـە خەبـەرە؟ کات ڕاوەسـتاوە؟ کات بـە خێرایـی برووسـک دەڕوا؟ شـەپۆلی خۆشـی و ئەشـقە؟ ئارامیـی خـەم و پەژارەیـە؟ ئایـا ئـەوە مردنـە؟ ئایـا ئـەوە بـە پێچەوانـەی مەرگـە؟ ڤەژیـن و ژیانەوەیـە؟ کۆتـر نازانـێ. کۆتـر نایـەوێ بزانـێ. کۆتـر بـە ئارامـی لنگـی دەکاتـەوە و هێدی هێدی لـە سـەر ژێـر دادەنیشـێ. بـە گەرمـای گۆشـتی ژێـر، تیـری ڕووناکـی لـە دەروونیـدا دادەگیرسـێ، لـە خـوارەوە هەتـا سـەر، تـا قـوڕگ، تـا مێشـک، بەنـد بـە بەند، ئەنگوسـت بـە ئەنگوسـت. قـژی کۆتـر لـە سـەر ڕووی ژێـرە، پەنجـەی هـەر دوو دەسـتی لـە نـاو پەنجـەی ژێـردا، کۆتـر بـە ئارامـی خـۆی دەجوولێنـێ. هـەر جارێـک کـە خـۆی دەجوولێنـێ هێـزی تیـرەکان زیاتـر، گەرمـای ڕووناکـی دەروون پڕتـر دەبـێ.

کۆتـر ناوچـاوان و ڕوخسـاری گەرمـی بـەرەو ژێـر دەبـا، لـە ڕووی ئـەو، لـە چاوانـی دەڕوانـێ. وەک بڵێـی ئیـدی جارێکـی دی ژێـر نابینـێ، وەهـا بەهێـز لـە قووڵایـی چـاوی دەڕوانـێ. وەک ئـەوەی کۆتـر حـەز دەکات هەمـوو ئـەو ڕووناکییـە گەرمـەی لـە دەروونیـدا شـەپۆل دەدات، بیگوێزێتـەوە قووڵایـی دڵ و دەروونـی ژێـر، ئاوەهـا گـەرم و نـەرم، خـۆی دەجوولێنـێ.

ژێـر دەناڵێنـێ، «پێویسـت بـە تۆڵەیـە، کۆتـر پێویسـتە تۆڵـەی مردووەکانمـان بسـێنین» و لـە

چاوی کۆتر دەڕوانێ.

« وییشششـش ، تـۆواو پێویسـتە» کۆتـر لایەکـی بـەدەن و جەسـتەی بـە شـەوقی مۆمـەکان ڕوونـاک بووەتـەوە، قسـەکەی دەبـڕێ و دەڵـێ «دوای

ئەمە، تۆیش بمرە، بڕۆ بۆ مردن...»

«تۆواو نا، تۆڵە» ژیر دیسان بە تکا، لە ناو ڕووناکیی ئەو تیرەی لە دەروونیدایە وا دەڵێ.

کۆتر بە دەنگێک کە بە ناڵەوە دەگاتە ئاستی هاوار دەڵێ: «تۆو، ژیر، تۆو، تەنیا تۆو...» «بمرە ژیر، ئێستا بمرە...تۆو، من بە ئەشقی خۆمان تۆو دەچێنم ژیر،» کۆتر ئێستا بە هاوار وەک ئەوەی سترانێک یانیش داستانێک بخوێنێ، دەڵێ؛ «بە ناوی تۆ، من دەیچێنم. بەو گەرمای دەروونی خۆم، من تۆو شین دەکەم، ئەو چەکەرە دەدات، گەورە دەبێ... تۆو پێویستە هۆ ژیر، تۆو» کۆتر هاوار دەکات و تاوەکوو دەنگی دەگاتە ئەو دیوی پەنجەرەی ژوورە بچووکەکە ئیدی سپێدەی بەیانی داوە و ڕووناک بۆتەوە؛

«تۆو پێویستە».

# ٦

# شەو

باز؛ مندالّی مەرگ، مندالّێک کە لە مژ و دووکەڵی مەرگ هاتە دەر، کە لەوە پێک هات. مندالّێک کە لە زگی مەرگەوە سەر لە نوێ، هاتە دونیا. باز ئەفسەری مردن و کوشتن کە حەز لە تەم و غوباری شەوانی تاریکی و مەرگ دەکات. باز؛ پەیام هێنی مەرگ.

ئێستا دیسان باز، ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ لای باز.

ئێمە لە وڵاتی مەزنین، بەڵام نەک لە پایەختی وڵات، دوور لە پایەخت، زۆر دوور، لە هەرێمی وڵاتی چیا. وەرز و کات هەر هەمانە؛ ئەوەندەی چەند ڕۆژێک بە سەر ئەو شەوە ڕووناکە پاییزییەی کۆتر و ژیردا تێپەڕیوە. کات، دیسان کاتی زیز و زویر، کاتی شەپۆلانی هەست و سۆزە، بەڵام شوێن جودایە، کۆتر و ژیر لە پایەختی وڵاتی مەزن، دڵ، ڕۆح و بەدەنی خۆیان بە هەست و سۆزی تێکەڵ دەدایە بەر برووسکەی ڕووناکی ئەشق. هەرچی بازیشە ئێستا لە هەرێمی دی، لە وڵاتی چیا، لە شوێنێکی زۆر سەخڵەت، بە هەست و سۆزی تێکەڵ، لە سەر سنوورە.

بەڵێ ئێمە لای بازین، لە ناو جیپی سەربازی، کە ئەوی تێدایە. ئێمە لە بەر دەمی دەرگای گەورەی پادگانێکی سەربازیی شارێکی بچووکی وڵاتی چیا لە سەر سنوور دەچینە ناو باخچە گەورەکەی پادگان. لە

ناو جیپدا، باز، شۆفیر و دوو ئەفسەری دی هەن. باز بە جلی مەدەنیی نویّ و خاوێنەوە لە تەنیشت شوفیرەکە دانیشتووە. هەر دوو ئەفسەر کە جلی سەربازییان لە بەردایە، لە دواوە دانیشتوون. دەنگێک نایە، کەس ناپەیڤێ. جیپ بە ئارامی لە ناو تەپ و تۆزی حەوشەی گەورەی پادگاندا دەڕوا و لە بەر بینایەک کە لە قەڵایەکی چیمەنتۆ دەچێ، ڕادەوەستێ. شۆفیر کە سەربازە و جلی خاکیی سەربازیی لە بەرە بە هەڵهاتن دێت و دەرگاکەی باز دەکاتەوە. باز بە ئارامی دادەبەزێ. کەمێک سەیری دەور و بەری خۆی دەکات و بە دەست تەپ وتۆزی سەر جلەکانی دەتەکێنێ. پادگان لە ئارامیی سەر لە ئێوارەدایە. جگە لە پاسەوانەکان، سەربازەکانی دی بێ چەک و ڕەخت، دەستە دەستە لە بەر دیوارەکانی پادگان دانیشتوون. دەستەیەکی بچووکی سەرباز، بە دەسماڵ و بەروانکەوە بەرەو جێگایەک دەڕۆن. دەستەیەکیش کەمێک دوورتر لە مەیدان، لە گۆشەیەکی پادگانەکە، خەریکی باڵەن.

دونیا ساماڵە، بای فێنکی ڕۆژهەڵات بە ئارامی شنەی دێت، خۆر هێدی هێدی بەرەو ئاوابوونە. خۆر بە ڕەنگێکی سووری ئەسمەر، لە دوورەوە لە قوڵایی ئاسمانەوە، ڕووناکییەکی قەڵس دەبارێنێ. باز لە پاڵ جیپەکە ڕادەوەستێ و جارێک سەیری دەور و پشتی دەکات، جارێکیش بۆ سەرەوە، بۆ ئاسمان و بۆ ڕەنگی تایبەتیی ئێوارە دەڕوانێت. ڕۆژێکی تر دادەگەڕێ، شەوێکی نوێ دەست پێدەکات. لاپەڕەیەکی دی دیتە سەر لاپەڕەکانی کات، ئەڵقەیەکی دی لە ئەڵقە بێ ئەژمارەکانی تەمەنی باز زیاد دەبێت. ساڵ چەندە؟ تەمەن گەشتۆتە کوێ؟ ئەم پاییزە، چەندەمین پاییزی ژیانی سەربازییە؟ چەند پاییز، چەند زستان، بەهار و هاوین هاتن و چوون؟ ئەگەر هەڵە نەبێ دەبێ ئەم پاییزە بیست بیست و یەکەمین پاییزی ژیانی سەربازی بیت؟ یان بیست و دووهەمین؟ بیست و سێهەم؟ باز کەمێک دەست و پێی دەجووڵێنێ؛ چەند جاران

گەردنـی خـوار و ژوور دەكات و هـەر دوو دەسـتی دەباتـەوە بـۆ پشـتی و توند پشتی خـۆی دەتەقێنـێ. دواییـش دەسـت دەبـا بـۆ سـمێڵی و كایـەی پـێ دەكات.

هەرچی بێ؛ چەندەمین پاییزیش بێ، خـۆ ژیانـی ئەرتـەش بەردەوامـە، ئـەرك و بەرپرسیاریێتیی پیـرۆز هـەر هـەن. وەك ئەمـڕۆ.

بـاز بـاڵا بـەرز، ئەسمەر، ڕێـك و پێـك و ئیتـر مامناوەنـد، بە ڕوخسارێكی ئـارام و هێمـن و تەنانـەت ماندووشـەوە. بەژنـی ڕاسـت، نیـگای وشـك، قـژی ڕەش و كـورت. ڕیـش و سـمێڵ ڕەش و درێـژ. سـمێڵ كەمێـك درێـژ، ڕیـش كـورت، لێـو قەڵـەو و گۆشـتی، لـووت كـوڵ.

بـاز؛ تەوێڵـی كـراوە و بـەرز، لـە سـەر تەوێـڵ شـوێنی دەور و زەمانـە و ڕۆژ و ڕۆژگار، چەنـد قـرچ و لـۆچ كـە هەمـوو تەوێڵـی لـە لایەكـەوە تـا ئـەو لای دی دەبـڕن، چاو ورد، بـەژن و بـاڵا بـەرز، شـان و تەوێـڵ پـان، چاوی وردی ڕەش- وەك خەڵـووز، یانیش بـا بڵێیـن وەك دوو بـەردی یاقووتـی ڕەش كـە بریقـەی دێ. بـرۆی ڕەش و پـان، مـژۆڵ درێـژ. بـرۆ و مژۆڵێـك كـە وەك كـەوان لای سـەرووی ڕەوخسـاریان گرتـووە. ڕوخسـاری ئەسـمەری كەمێـك درێـژ، چەنـە و ڕوومـەت پـان.

بـاڵا درێـژ، ڕوخسـار درێـژ، دەسـت و پـێ درێـژ، بـرۆ و برژانـگ درێـژ. تەمـەن... تەمـەن درێـژ؟

ڕوخسـار بـە بـا و باهـۆز، بـە بەفـر و بـاران، بـە خـۆر و گەرمـا ئەسمەر و كەمێكیـش سـیس هەڵگـەڕاوە. بـەڵام شـتی هـەرە گرنـگ ڕوانینیەتـی، نیگایەتـی. لەگـەڵ ئارامیـی سـەر ڕوخسـاری، نیگاكانـی، نیـگای لێكەڕانـە، نیـگای چاوەدێران، نیـگای بێزاران، نیـگای ڕاوچییـان. نیـگای بـازی شـوێن نێچیـرە. نیـگای بـاز؛ قـووڵ، ورد، وشـك و قایـم، بـەڵام لـە پشت ئـەو پـەردە ڕەشـەدا، نادیـاری، دوودڵـی، هـزر و شـك و گومـان هەیـە.

باڵا بەرز بەڵام هەندێك خوار و لۆق.

باز کەمێک سەری هەڵدێنێ و سەیری ئاسمان دەکات. لە لای باکوورەوە پەڵە هەورێک بە ئارامی دەڕوا. لە لای ڕۆژهەڵاتیشەوە پەڵەی بچووک دیارە. ڕەنگێکی سووری گەوهەری ئاسمانی داگرتووە. پاش کەمێک ئێوارە دادێت، لەگەڵ داهاتنی ئێوارە، ژیانی ڕاستەقینەی باز دەست پێدەکات.

ئێوارە چۆن دادێ؟ شەو؟ کراوە، گیراو، فێنک، سارد، بە باران، بە با؟ ئێوارە و شەو لە ئامێزی خۆیاندا چی دەشارنەوە؟ باز، وەستای شەو و تاریکیی شەوان، دەبێ بزانێ. تاریکیی شەو هەرچیش لە ئامێزدا بشارێتەوە ئەو شتە شاراوە هی بازە، هی خاوەنی شەو و تاریکیی شەوانە. باز ئەوە دەزانێ، لەوە دڵنیایە.

«من کەمێک دەنووم» باز بەو هەر دوو ئەفسەرەی لەگەڵی دابەزین و لە کەناریدا بە شێوەی سەرباز، وشک ڕاوەستاون دەڵێ، بێ ئەوەی لێیان بڕوانێ دەڵێ؛»سەعاتێکی دی خەبەرم بکەنەوە.. ئەو کات دەبێ دەستەش لێرە ئامادە بن و ئاگادار بن کە هەوا لە شەودا چۆن دەبێ...».

باز بە نەرمە هەنگاو لە دەرگا گەورەی بینا بتونییەکەوە دەچێتە ژوورێ. پاسەوانی بەر دەرگا، ئەوانەی لە ناو ساڵۆنەکەدا دێن و دەچن، ئەو ئەفسەر و سەربازانەی لە ڕێسێپسیۆنی بیناکەدان، هەر هەموویان، کاتێک باز دەبینن لە جێی خۆیان ڕادەوەستن و زۆر توند سڵاوی لێ دەکەن. و هەروەها بە ڕێز و حورمەتەوە، کەمێکیش بە ترس و سامەوە بەپێوە دەوەستن تاوەکوو باز بە پێشیاندا ڕادەبوورێ. سەرنجی باز لای ئەوان نییە، ئەم ئارام ئارام هۆشی لە جێگەیەکی دی بە ناو کریدۆرێکی درێژ، زۆر درێژدا دەڕوات. لە کۆتایی کریدۆرەکەدا دەرگایەکی ئاسن دیارە. باز دەڕوا و دەرگا دەکاتەوە. دوای دەرگاکەش ساڵۆنێکی گەورەی لێیە کە زۆر جوان ڕازاوەتەوە. هەموو لایەکی ساڵۆنەکە داخراوە، نە

پەنجەرەیەک نە دەلاقە و جێیەکی کراوە. لە سەر دیواری ڕووبەڕووی دەرگاکە وێنەیەکی یەکجار گەورەی ژەنەڕاڵ سەردارهەڵواسراوە. لە سەر دیوارێکی دیش ئاڵای ڕەنگینی وڵات و لە ژێرەوەش دێڕێک بە پیتی زۆر گەورە نووسراوە: هەموو شتێک بۆ سەرۆک و وڵات. لە گۆشەیەکی زۆر دوور لە دەرگاکە، لە سەر قەنەفەیەکی چەرمی ڕەش سێ ئەفسەر دانیشتوون. کە باز دێتە ژوورێ، هەموو بە جارێک ڕا دەبنە سەر پێ و ڕاست دەوەستن. باز بە سەر سڵاویان لێ دەکات و بەڕێگەی خۆیدا دەڕوا بەرەو لای دەرگایەکی دی کە لەو بەری ساڵۆنەکەیە. کە دەگاتە بەر دەرگا، وەک ئەوەی لە ناکاو شتێکی بیر کەوتبێتەوە لە ئەفسەرەکان دەپرسێ: «ئێوە دەزانن ئەمشەو هەوا چۆن دەبێ؟» ئەفسەر لە یەک دەڕوانن. نا. ئەوان نازانن.

«پاش سەعاتێک یەکێکتان بێت خەبەرم بکاتەوە با جگە لەو کەس ئیسراحەتم تێک نەدات،» باز ئەمە دەڵێ و بە کلیلێک دەرگا دەکاتەوە و دەچێتە ژوور. ژوور، ژوورێکی تەنگ، داخراو، تاریک و بێ هەوایە. باز دەست دەنێ بە سویچێکدا و گڵۆپەکە دادەگیرسێنێ. لە ناو ژوورەکەدا هیچ تێکبەرێک (جوداکەرەوە)، دیوار یان شتێک کە جێگایەک بەش یان لەت بکات بوونی نییە. تەنیا تەختێکی نووستن، لە سەر تەختەکە، وێنەیەکی ڕەنگینی ژەنەڕاڵ سەردار بە دیوارەوە، لە کەناری تەختەکە مێزێکی بچووک، لە سووچێکدا دۆڵابێکی درێژ و لە پاڵیشێدا کورسییەکی دارین. لە سەر مێزەکەش تۆنگێکی ئاو، پەرداخێک، سەعاتێکی بچووک، پاکەتێک جگەرە، تەپڵەکێک و وێنەیەک لە ناو چوارچێوەیەکی بچووکدا. باز دەمانچەکەی، بارێتایەک کە شەوق دەداتەوە، لە کەمەری دەکاتەوە، لە سەر مێزە بچووکەکە دایدەنێ، ژاکەت و پانتۆڵەکەی، کراس و کراواتەکەی لە بەر دادەکەنێ، دەرگای دۆڵابەکە دەکاتەوە و بە ڕێکی لە ناو چەکمەجەیەکی دۆڵابەکەدا دایدەنێت و دێتە ناو جێگەی نووستنەکە.

باز ماندووە، بە جیپێکی تەنگ لە ڕێگەیەکی تەنگی پڕ مەترسی و زیخەڵانیدا، ئەوەندەی چوارسەد کیلۆمەتر دوور، هاتووە. بە ناو تەپ و تۆزدا، بێ ئەوەی لە جێگایەک ڕابوەستن و شەکەتی دەرکەن و شتێک بخۆن یان بخۆنەوە. لە بیریەتی چەندە تینوو بوو. کەمێک خۆی کۆ دەکاتەوە و لە تۆنگەکە تۆزێک ئاو دەکاتە ناو پەرداخەکە یەک قوم دەیخواتەوە. بەڵام تینوێتیی ناشکێ، پەرداخێکی دی دەخواتەوە و دەچێتە ژێر مەلافەکە. تاقەتی نییە بیر لە هیچ بکاتەوە، سەیری وێنەی منداڵەکانی بکات، لە چەند دەقاندا چاوی دەچێتە خەو و دەست بە پرخە پرخ دەکات.

تاوەکوو یەکێک لە دەرگا دەدا و ئەو بێ دەنگییە قووڵە تێک دەدات.

باز کە خەوی یەکجار سووکە، لەگەڵ دەنگی دەرگا، یەکسەر خەبەری دەبێتەوە. «باشە، دێم» دەڵێت و لە جێگاکە دێتە دەرەوە. سەری گێژ و چاویشی خەواڵووە. ژوورەکە ڕووناکە. لە بیری چوبوو گڵۆپەکە بکوژێنێتەوە. بەدەنی سستە، ئێشێکی باریک جەستەی سستتر دەکات. لای چەپی جەستەی کەمێک تەزیوە. دەست و پێی ڕادەوەشێنێ، چەند جار لاقی تا بەر سەری بەرەو ژوور دێنێ، پشت و گەردنی دەتەقێنێ و لە کەنار تەختی نووستن دادەنیشێ و پەرداخێکی تر ئاو دەخواتەوە.

ئێوارە دەست پێدەکات، ژیانی باز دەست پێدەکات. ئیش و کاری تاریکەشەوی دەست پێدەکەن. باز؛ پیاوی شەو، شەوگەڕ. باز شەوکارە.

باز بە ئارامی دەڵێ «شەو، ئەز دێم»، دوایین تنۆکی ئاوی ناو پەرداخەکە دەخواتەوە و هەڵدەستێتە سەر پێ. کاتێک هەڵدەستێ نیگای دەڕوا بۆ وێنەی سەر مێزەکە. لە وێنەکەدا هەر دوو کوڕەکەی پێکەوەن، خۆی لە ناوەڕاست و هەر دوو کوڕەکەی لەم لاو لای، سەیری کامێراکە دەکەن و پێدەکەنن. کوڕە گەورەکەی لای ڕاستەوە و بچووکەکەی لە لای چەپ، باز پێدەکەنێ و تەزوویەکی خۆش بەسەریدا دێت. پێویستە

جارێک بەم زووانە سەردانی ماڵەوە بکات لە پایتەختی وڵات و منداڵەکانی ببینێت. باز، بیری کوڕەکانی دەکات. «ئەز دێم بۆ لای ئێوەش» باز، دیسان بە ئارامی دەڵێ و هەڵدەگەڕێتەوە بۆ لای دۆڵابەکە. باز چەکمەجەیەکی تایبەتی دۆڵابەکە بە کلید دەکاتەوە و جل و بەرگەکەی ناوی دەردێنێ، دەیهێنێ لە سەر تەختی نووستنەکە دایدەنێ.

بەڵێ، شەوە، تاریکە شەوە، جل و بەرگی شەو پێویستە.

جل و بەرگی تایبەتی شەوانەی باز؛ واتا هی خەڵکی بیچارە و هەژاری وڵاتی چیا، هی شوان و گاوانان، هی ئەو سەرهەڵدەرانەی ئێستا لە بەرانبەر دەوڵەت، لە بەرانبەر ئەرتەش و ژەنەڕاڵ سەردار، لە بەرانبەر باز سەریانهەڵداوە. یانی جل و بەرگی ئەو کەسانەی کە دەبێ قڕ بکرێن. پانتۆڵێکی کۆن لای سەرووی هەراو*، تا ئەو کەسەی لە بەری دەکات بتوانێ بە ئاسانی تێیدا بجمێ، بەڵام دەرەلنگی تەنگ و تەسک، تاوەکو مار و دووپشک، جڕ و جانەوەر نەتوانن لە دەرەلنگەوە بچنە ژوورێ، تاکوو لە کاتی پەلە و هەڵاتندا، دەرەلنگی پانتۆڵ لە دار و بەرد گیر نەبێت. کراسێکی قۆڵ درێژ و کەوایەکی هەراو و ناسک کە لە گەرما و هەتاودا فێنک، لە باران و بەفردا گەرمن و دەست و پەنجە، شان و مل تیایاندا بە ئاسانی دەجوولێ و دەکاتە تفەنگ و دەمانچە، دار و بەرد. جووتێک گۆرەویی بەنی ڕەنگین و نەخشێندراو کە تا سەر ئەژنۆ دێت و لە ڕۆیشتن، پەلە و هەڵهاتنی ناو شاخ و کێو و دۆڵ و شیودا، لاق و ئەژنۆ دەپارێزن. و جووتێک پێڵاوی سووک کە ڕووەکەی لە چەرمی قایمە و بنەکەشی قایشێکی ڕەشی قایم و وشک کە بە دەست دووراوە. پێڵاوێک کە لە بەفر، باران، قوڕ، بەرد، شاخ، گەرما و سەرمادا بە ئاسانی بەرگە دەگرێ، قورس نییە و لە پێ کردنی زۆر ئاسانە.

جل و بەرگی شەوانەی باز؛ جلی ڕۆژگاری دژوار، زەمەنی تاریکی و

---

* بە مانای فراوان و گەورە دێت.

شوێنی سەخڵەت و زەحمەت. جل و بەرگی کەسانێک کە هەمیشە لە ڕێدان، هەمیشە پەلەی هەڵهاتنیانە.

باز کراس و دەرپێکەی بەری دادەکەنێ و بە ڕووتی لەسەر سووچێکی تەختەدا دادەنیشێت و جگەرەیەک پێدەکات و مژێکی قووڵی لێدەدات. دیسان شەوێکی نوێ دەست پێدەکات. دیسان کات، کاتی «ڕاو» هاتووە. سەری، جەستە و لەشی قورسە. کات وەها دەڕوات، ساڵ وەها ڕادەبوورێ. ئاوەها لە ژوورێکی بچووک، تاریک، بۆگەن و بێ هەوادا. ئاوەها بە دزییەوە، شاراوە. ئاوەها لە تاریکیی شەواندا. ئەمشەو گرنگە. ئەوان ئەمشەو پێویستە سەرکەون. باز چەند مژی قووڵی دی لە جگەرە دەدا و هەڵدەستێتە سەر پێ تا خۆی کۆ بکاتەوە و جل و بەرگی سەر تەختەکە لە بەر بکات. بەڵام پێش ئەوە پانتۆڵی هەراوی خەڵکی هەرێمەکە لە بەر بکات، لە جەستەی خۆی دەڕوانێ. مووی سەر سنگی ئیدی هەرچی چۆنێک بێت سپی بووە. لە دەوری بەرزگیشی مووی سپی لە ناو ڕەشدا دیارە و سەربڵندییەکەی کە هەمیشە پێی سەربڵندە، ئێستا ئەوەندەی دەنکە زەیتوونێکی ماوە. ئەوە لە کەیەوە سەربڵندییەکەی لە ناو تەڕی و تاریکی و قووڵایی ژنەکەی نەلەقاندووە و وەک شێر نەیگوڕاندووە؟ مەگەر ئێستا کاتی ئەوەیە کەمێک بیر لە سەربڵندییەکەی بکاتەوە؟ ئێستا نە کاتی ئەوەیە و نە بیریشی لای ئەوەیە. «تۆش وەک من پێویستت بە پشوو هەیە» وا دەڵێ و پانتۆڵەکە لە پێ دەکات. دواییش، جگەرە لە سەر لێو، کراسێکی ناسکی خان خان کە ئەویش هەر وەک پانتۆڵ لە گوندی ئەو هەرێمە ڕێسراوە، لە بەر دەکات. بە سەر ئەوەشدا کراسی قۆڵ درێژی نەخشێندراو، شاڵی ڕێسراو و چۆخەی ڕەنگینی نەخشێندراو. باز دۆخێنی شاڵەکە گرێدەدا و بە سەر دۆخێن و کەمەری چۆخەکەدا پشتێنێکی درێژی ڕەش دەبەستێ. و هەروەها دەمانچەکەش. داوی لەبەر کردنی جل و بەرگ، خۆی دەکێشێتەوە،

سەیری بارێتاکەی دەکات، خەشابەکەی دەردێنێ و فیشەکەکانی دەردەکا و دیسان یەک بە یەک تێیدەخاتەوە، کۆنترۆڵی دەکات لە نیشانگاکەیەوە لێی دەڕوانێ، لە دواوە دەیکات بە بەر پشتێنەکەیدا.

ئێستا ئیدی هەموو شتێک تەواوە. باز ئامادەیە بۆ شەو. دیسان دەڵێ: «شەو، ئەز دێم» و لە دەرگا دێتە دەرەوە و بێ ئەوەی سەیری دەور و پشتی بکات، بە سالۆن و کوریدۆری درێژدا ڕادەبوورێ، دێتە سالۆنی پێش دەرگای دەرەوە کە پێشوازییەکەی لێیە و لەوێش دێتە دەرەوە. ئەوانەی لە ڕێدا تووشی دەبن، هەموویان خۆیان دەکشێننە کەنار و ڕێگەی بۆ بەردەدەن و بەژن ڕاست سڵاوی لێدەکەن. کاتێک دێتە دەرەوە، ئەفسەرێک بە دەنگێکی بەرز دەڵێ «ئامادە بن». ئەو کات باز سووکە بزەیەک دەیگرێ. بەڵێ، لەم سەرەتای شەوەدا دەستە لە بەر دەرگا چاوەڕێی ئەو دەکەن.

باز دەڵێ «ئێوارەتان باش» و بە هەنگاوی قورس بەرەو دەستە دەبێتەوە. دوازدە کەس و دوو فەرماندە کە هەموویان وەک باز جل و بەرگیان لە بەر کردووە، لێرە، چاوەڕوانی بازن. هەر دوو فەرماندەکە دێنە لای باز، دوو هەنگاو دوورتر، لە پشتیەوە ڕادەوەستن. باز بە دەنگێکی وشک و بەرز دیسان دەپرسێ: «ئێوە ئامادەن؟» هەر دوو فەرماندەی دەستە پێکەوە بە یەک دەنگ دەڵێن: «بەڵێ». باز مەغروور، بەخۆ باوەڕ، قایم و بە هەنگاوی قورس، لە پێش دەستەوە دەڕوا، یەک بە یەک بە سەرنجەوە لێیان دەڕوانێ. هەموو بە چەک و ڕەخت و فیشەکن. چەکی درێژی ئۆتۆماتیک بە دەستەوە، نارنجۆک و بۆمبای کەمەریان، هەر هەمووی چەکی مردن و سووتاندنن. دەمانچە، کلاشینکۆف، ڕەشاشە و دوو چەکی قورسیان پێیە. لە پشت تا گەردەن ڕیز بە ڕیز، ڕەخت و فیشەکیان بەستووە. دەمانچە، چەقۆ و خەنجەریان لە بەر پشتوێندا، دووربین لە سەر سنگیان، بەڵێ، ئەوانیش ئامادەن، دەستەیش ئامادەیە.

بەڵێ، دەتوانن دەست بە ڕاو بکەن... .

بەڵام باز لە بەردەم دواییین کەسی ڕیزەکە ڕادەوەستێ و چەند خولەکێک بە توندی لێی دەڕوانێ. لاوێکی تازە پێگەیشتوو کە لە بەرانبەر بازدا ڕاوەستاوە، لە باز نا، کە ڕاست لە پێش خۆی دەڕوانێ. باز بە دەنگێکی تووڕە لێی دەپرسێ: «ئێمە دەچین بۆ کوێ؟» لاو بە ئارامی دەڵێ: «دەچین بۆ ڕاو». باز دەڵێ: «ئەی ئەو کات؟» «ئەی ئەو کات ئەحمەق... بڵێ ئەو کات؟» لاو کە باش تێناگا مەبەستی باز چییە هیچ ناڵێ، «کوا ریش و سمێڵت؟ ئەو جلە خاوێنانە چییە لە بەرتدا؟» «ئەحمەق مەگەر ئێمە دەچین بۆ سەیران، دەچین بۆ شایی و هەڵپەڕکێی باوکت کە ئاوا خۆت ڕازاندۆتەوە و جلی جوانت لە بەر کردووە؟!» باز دەگەڕێتەوە بەرەو لای دوو فەرماندەکەی پشتە سەری «ئەو کەرە لە ڕیزەکە دەرخەن، بە پەلە، یەکی دی، بخەنە جێگاکەی با بڕۆین» و بەرەو خوار بەرەو لای جیپ و لۆرییە سەربازییەکە دەڕوات.

«دەی خێرا کەن سوار بن، دەڕۆین...»

و ئەوان دەکەونە ڕێ، لە ناو جیپێک و کامیۆنێکی سەربازیدا.

باز و هەر دوو ئەفسەرەکە کە ئێستا وەک باز جلی وڵاتی چیایان لە بەر کردووە، لە ناو جیپدا و دەستەش بە شوێن ئەوانەوە لە ناو کامیۆندا لە دەرگای گەورەی پادگان دێنە دەر و بە ڕێدەکەون. پادگان لە کەناری شارێکی بچووکی مێژوویی وڵاتی چیادایە. دوای هاتنە دەرەوە لە پادگان لە قەراخی شار، هاوتەریبی شار، دەچنە سەر ڕێگەی قیرتاو. دونیا تاریکە. گڵۆپی شاری بچووک داگیرساون. لە شارەوە دەنگ دێ، دەنگی منداڵ، سەگ، حەیوان، ئۆتۆمبیل و مۆتۆڕ تێکەڵی یەک دەبن و دەنگێکی تێکەڵ دەگاتە دەر و دەشت. ئەم شارە مێژووییەی کەناری ڕووبارەکە، دەکەوێتە سەر سنوورەوە و پاڵی داوە بە شاخەکانەوە، بۆ ئەرتەش، بۆ باز و بۆ جموجۆڵی باز یەکجار گرنگە. شارێکی بچووکە

بەڵام لە هەموو ناوچەدا دەناسرێ، ناوەندێکی ئابووری و بازرگانییە، چەقی هات و چۆیە. پەیوەندییەکانی شار لەگەڵ وڵات و دەوڵەتانی دیش بەهێزە. تاک و کۆ هەمیشە دێن و دەڕۆن. ئەرتەش کە دەوڵەت، میللەت و وڵات دەپارێزێ و بەڕێوەی دەبات، لەم شارە بچووکەوە، هەموو ناوچەکە کۆنتڕۆڵ دەکات. بازیش لە پادگانی شارەوە، هەموو جموجۆڵەکانی ئەنجام دەدات، بەڵام، لەگەڵ ئەوەش کەس ئاگای لە باز نییە. باز ئاگای لە هەموو شتێک، هەموو جۆرە پەیوەندی، جموجۆڵ و جمەی شار هەیە، لێ نە شار و نە دانیشتووانی شار، نە کەسی دیش ئاگای لە بوون، جموجۆل و کاروباری باز نییە.

باز جگەرەیەک بە لێویەوە لە تەنیشت شۆفیرەکە دانیشتووە، دەستێکی لە بەر پەنجەرەی جیپەکە، سەیری خانووەکانی دەرەوەی شار و گلۆپەکانی شار دەکات، «پێویستە کۆنترۆڵی سەر شار زیاتر بێت، پیاوەکانمان دەبێ زیاتر بکەونە قووڵایی شارەوە، بکەونە ناو خەڵکی شارەوە» باز بیر دەکاتەوە. پاشان، لە ناکاو لە ئەفسەرەکانی پشتەوە دەپرسێ: «برا، هەوا ئەمشەو چۆن دەبێ؟»

ئەفسەرێک بە کورتی دەڵێ: «دونیا هەندێک سارد دەبێت، هەندێک هەور دەبێ و پێدەچێ دوای نیوەشەو باران ببارێ».

ڕێگە لە بناری چیاکان، هاوتەریبی ئەوان، درێژ دەبێتەوە. ئەو ڕێگە وەک زۆربەی ڕێگەکانی وڵاتی چیا پڕ مەترسی نییە. ڕێگە ڕاست، پان و قیرتاوە. باز و تاقمەکەی، لە نێوان چیا و چەمی درێژی شاردا، لە دەنگی تێکەڵی شار دوور دەکەونەوە و بە ڕێگەیەکی درێژدا دەڕۆن بەرەو مەبەستی دیاریکراو کە لە ئامێزی تاریکی شەودایە. خۆر، هەتاو، ڕۆژ ڕۆشتووە. تاریکی وەک مۆتەکە، وەک دێوی تاریکی مۆتەکە، داهاتووە. بە ئاسمانەوە لە سەرەتای تاریکیی ئێوارەدا، هەندێک هەور، پەرش و بڵاو دیارن. لە لای ڕووبارەکە مژێکی تەنک وەک گلۆڵەیەکی هەورێشمی

دەر و دەشتی تەنیوەتەوە. لای شاخەکان، لە بناری داوێنی چیا، دار و بەرد وەک سێبەر، وەک شەتڵە ڕێحانی کەناری چەم کە لە ژێر تینی هەتاودان، دیارن. گاشە بەرد، تەپۆڵکە، گرد، شاخ، دار و بەردی چیا، کە باز زۆر باش ئاشنایەتی و لێی شارەزایە، ئێستا دیسان بە تاریکی و بێدەنگیی شەو گەمارۆ دەدرێن. شەوێکی ئارام و بێدەنگی پاییز، دیسان دەر و دەشت دەتەنێتەوە. دیسان باز، ئەفسەر و دەستەی چەکدار، بێدەنگ لە ناو پەردەی تاریکی شەودا دەڕۆن.

لە شەوی نوێ، بۆنی پاییز، بۆنی گژوگیای وشکەڵ، بۆنی پووش و پەلاش دێت. باز قسە ناکات، ئەفسەر ناپەیڤن، لە دەنگی مەکینەی جیپەکە زیاتر هیچ دەنگێک نایە. هەرکەس، هەرشت لە ناو بێدەنگیدایە. باز و تاقمەکەی کە زۆر باش ئاگاداری کارەکەیانن، بە بێدەنگی چالاکییەکەیان بەڕێوە دەبەن. ئەوان فێربوون، جارجارە پێیان گوتراوە، جارجارە وشیار کراونەتەوە، کاری ئەوان قسە کردن نییە، بەڵکوو کاریان جێبەجێ کردنە، تەنیا جێبەجێ کردن. ئەوەندەی سەعاتێک ئەوان بە ناو بۆنی تایبەتی پاییز و تاریکیی شەودا، بە جیپ و کامیۆن ڕێ دەکەن. پاشان لە بەر ڕێگەیەکی زۆر تەنگەبەر و خیزەڵانی داوێنی چیا، ڕادەوەستن. وەک هەموو جارێک، شۆفێر لە جیپ دادەبەزێ و دەرگای لای باز دەکاتەوە تاوەکوو باز دابەزێ. دواتریش ئەفسەر و تاقم دادەبەزن و دێنە ڕوو بە ڕووی باز و بە ڕیز دەبن. باز لێیان دەڕوانێ و دەڵێ: «لە دەور و بەر بڵاوە بکەن، ئێمە ڕێدەکەوین» و دەکەوێتە سەر ڕێگەی تەنگ کە لە جادە قیرتاوەکە جودا دەبێتەوە. جیپ و کامیۆن دەگەڕێنەوە و بەرەو شار دەچنەوە. باز و تاقمیش دەست بە ڕێکردنی خۆیان دەکەن. ئێستاش ئەوان بە پێ دەڕۆن بەرەو چیا. دەبێ بە پێ بچنە سەر چیا.

دووان لە پێش، دووان لە پاش، ئەوانی دیش بڵاوەی دەور و بەری

ڕێگـە دەکـەن، بـاز و تاقـم بـە نـاو خیـز و بـەرددا ڕێگـە دەبـڕن. دونیـا تاریکـە، پـەردەی تاریکـی شـەو بـە سـەر دونیـادا کێشـراوە. ئـەم ڕۆژ و شـەوانە! ئـەم ڕووناکیـی ڕۆژان و تاریکیـی شـەوانە! ئـەم گەمـەی ڕووناکـی و تاریکییـە کـە قـەت تـەواو نابێ!هەمـوو دونیـا، هەمـوو شـت، ئێسـتا بـە ڕەنگـی شـەو خەملّیـوە. شـەو، ئێسـتا بۆتـە دەریایەکـی بـێ سـەر و بـەر، بۆتـە دەریایەکـی بێکۆتایـی کـە دونیـا لـە ئامێزیـدا وەک گەمیەکـی بچـووک دێـت و دەچێـت.

تاریکیـی شـەو، ئەوەنـدە بەهێـز، ئەوەنـدە قایـم، ئەوەنـدە قـووڵ و ئەوەنـدە بـێ دەنـگ.

و بـاز، کـوڕی تاریکـی، کـوڕی تاریکیـی ئێـوارە و شـەوان. بـاز ئێسـتا لـە ناوەنـدی تاقمـدا، لـە نـاو زەوییەکـی خۆرەتـاو و لـە کەنـاری شیوەڕێیەکی تەنگی گوندان، بە هەنـگاوی سـووک و تەمریـن کـراو، بـەرەو چیـا هەڵدەکشـێ. ئامانـج چیایـە، بەرزایـی و لووتکەکانـی، دۆڵ و خەرەنـد و قووڵاییـە تاریکەکانـی. بـاز دەمانچەکـەی دەرهێنـاوە بـە دەسـتییەوە، پەنجـەی لـە سـەر پەلەپیتکـە، لـە پشـتەوە، لـە بەرزایـی چیاکان کـە لـە نـاو تاریکیـدا وەک جانـەوەری ئەفسـانەیی دیـارە، دەڕوانـێ و ڕێـدەکات. ئەندامانی دەسـتەکەش، بـە دەوری ئـەوەوە کلاشـینکۆفی ئامـادە لـە دەسـتیاندا، بـە پەلـە، بـە هەنـگاوی گـەورە ڕێگـە دەبـڕن. ڕێگـە پێچەڵاوپێچـە، تەپۆڵکـە و هـەوراز لـە سـەر ڕێیانـە. بـەڵام بـاز و دەسـتە پیاوی شـەو، وەسـتای کاروباری شـەو، ڕێگـەی خۆیـان دەدۆزنـەوە و دەڕۆن؛ وەک ئاژەڵـی ئـەو شـاخانە بـە هـەورازە سـەختەکاندا سـەردەکەون. بـە سـەر ئـاو و کانییەکانـدا، لێهاتووانە و ڕێـک و پێـک هەنـگاو هەڵدەگـرن، لـە کەنـاری جێگـە سـەخڵەتەکاندا، بـێ هیچ سـەختی و زەحمەتییـەک هەڵدەگـەڕێن. جـادەی قیرتـاو لـە دواوە بەجێمـا، شـاخ و هەڵدێـر بەجـێ دەهێڵـن. خۆرەتـاو و نسـار بەجـێ دەهێڵـن، دار و درەخـت بەجـێ دەهێڵـن. ئـەوان هەڵدەکشـن، تاوەکـوو خۆیـان بگەیەننـە

بەرزاییەکان.

بەرزایی چیاکان؛ تەنیا شوێنی باڵندەی دڕندە، تەنیا جێی هەڵهاتوو، شوێنی ونبووەکان، بە تەنیا شوێنی ڕاو و ڕاوچییان. دونیایەکی فێنک، نا، فێنک نا، سارد. دونیایەکی سارد، تەنیا، پڕسام، پڕترس. دونیایەکی تایبەتی کە زەمەنێکی درێژە دونیای باز دەهۆنێتەوە. باز هەناسە سوار، عارەقە دەرداو، لە کەناری بنارێک ڕادەوەستێ، هەموو قۆپچەکانی کەوا و کراسەکەی دەکاتەوە و دەڵێ «با وچانێک بدەین». دەستە کەمێک دوور لە یەکتر، بڵاو ڕادەوەستن. پیاوانی پێش و دوای دەستە، خۆیان دەدەنە بەر شاخ و بەردان. ئەوانی دیش بۆ ئەوەی بێنە لای یەکدی لە جێگاکانی خۆیان دادەنیشن. باز جگەرەیەک دادەگیرسێنێ، لێزانانە لە ناو لەپی دەستیدا دەیشارێتەوە و نیگای لە سەر پەنجەکانی چەند مژی قووڵی لێدەدات. هەوا زۆر ساردە، لێ ئێستا کاتێک لەو بەری چیاوە بەرەو خوار دادەگەڕێن، سەرماش نامێنێ. بە بێ سەختی و زەحمەت ئەوان گەشتوونەتە ئەو شوێنانە. ئێستا لە سەر چیان. بەڵێ، کۆنتڕۆڵی ئەو شوێنانە، سەر چیا و کوێستان و ڕۆژانی بێ ئەژمار و بەرفرەی ئەو چیانە لە دەستی ئەواندایە. ئەرتەش و دەوڵەت کۆنتڕۆڵی بە سەر ئێرەشدا هەیە. هاتن و گەشتنە ئێرە لە ماوەیەکی کورتدا، سەلمێنەری دەسەڵات و کۆنتڕۆڵی ئەرتەشە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەرتەش کۆنتڕۆڵی ئەو شوێنانە بەهێزتر بکات. هەمیشە، بست بە بستی وڵات بێگومان دەبێ لە ژێر کۆنتڕۆڵی ئەرتەشدا بێت.

پاش ئەوەی باز جگەرەکەی دەکێشێ، هەڵدەستێتە سەر پێ و دەڵێ «با بڕۆین» و دیسان ڕێدەکەون. ئەمجار لەو دیوی تری چیا، بەرەو خوار، دەستە وەک پێشتر لە هەر چوار لای باز بڵاو، دەست بە ڕێکردن دەکەن. ڕێگەیەک نییە، شوێن پێیەک نییە، هێمایەکی نیشاندەری ڕێگەی هات و چۆ نییە. لەگەڵ ئەوەش بە ڕێکردن و چالاکییاندا دیارە

کە ئەوان ئەو شوێنانە دەناسن. ڕوو لە شیو و دەراوێک* بەرەو خوار دەبنەوە- تاوەکوو خۆیان بگەیەننە هەندێک ئەشکەوت لە بناری چیا، لە بەر دەمی دەراوەکە. ئەشکەوت لە دوورەوە دیار نین. ئەگەر کەسێک شارەزای ئەو شوێنانە نەبێت، بە تایبەتیش بە شەو، مومکین نییە بتوانێ ئەو ئەشکەوتانە بدۆزێتەوە. کەسێک لە ئەندامانی دەستەکە سێ جار بە چرادەستی، ڕۆشنایییەکی بێزار دەدا لە دەر و دەشت. پاشان لە ئەشکەوت ڕوناکییەک سێ جار هەڵدەبێت و دەکوژێتەوە، دەستە ڕاستەوخۆ دەچنە بەر ئەشکەوت. حەفت کەس لێرە لە بەر دەرگای ئەشکەوت، لە سەر بەرد دادەنیشن. ئێستا مانگ هەڵهاتووە و دونیا تۆزێک ڕووناک بۆتەوە. باز دیسان پاکەتی جگەرە لە گیرفانی دەردێنێ جگەرەیەک دەگیرێنێ. ئێستا دێتەوە یادی کە برسیشیەتی. لە بەیانییەوە هیچی نەخواردووە! دەڵێ: «من برسیمە، ئێمە برسیمانە، خواردن هەرچییەکتان هەیە، بیهێنن».

چوار لەو کەسانەی چاوەڕوانی باز و تاقمەکەی بوون، خەڵکی گوندن، گوندیی ئەو دەور و بەرانە، گوندییانی وڵاتی چیا کە هەل و مەرجی چیا باش دەناسن، ئەوانی دیش ئەفسەری ئەرتەش، هاوکاری بازن. جل و بەرگی هەموویان هەر لە جل و بەرگی باز و دەستەکەی دەچێت. نیگای باز لە سەر گوندییەکان، وەک ئەوەی فەرمانێک بدات، توند دەڵێ: «ڕێبەر و فەرماندەی شەو کێیە؟» دووان لە گوندییەکان هەندێک ڕوو لە باز دەکەن و دەڵێن: «ئێمەین فەرماندە».

«فەرماندە نا، ناوی من فەرماندە نییە، باز، لە بیرتان نەچێت باز... وەرنە لای من دانیشن» باز بە دەست ئاماژە بۆ جێیەک لە لای خۆی دەکات و دەڵێ: «جێ ڕاو لە کوێیە؟»

«کەمێک دوورە لێرە، لە گوندێکی کاول، بەڕێز باز»، گوندییەک بە

* ئاوەڕۆ.

زمانـی بـاز، یـان ڕاسـتتر بڵێیـن بـە زمانێـک کـە لـە زمانـی بـاز و زمانـی وڵاتـی چیا پێکهاتـووە، بـەڵام بـە لەهجەیەکـی زۆر خـراپ و بـە قسـەیەکی وا کـە بـاز زۆربـەی جاران تێینـاگا ئەمـە دڵـێ.

«نـا بەڕێـز بـاز نـا، تەنیـا بـاز... هەندێـک لێـرە دوورتـر، لـە گوندێکـی کاول» بـاز قسـەکانی کابـرا بـە شـێوەی کابـرا دووبـارە دەکاتـەوە».

«هەندێـک لێـرە دوور... بـەڵام چەنـدە دوور؟»

«ئەوەندەی دوو قۆناغە ڕێ»

«ئەوەنـدەی دوو قۆنـاغ...» بـاز دیسـان قسـەکانی دووبـارە دەکاتـەوە، «دوو قۆنـاغ چەنـدە؟»

«ئیسـتاش گونـدی کەمێـک دۆش دامـاو دەڵـێ: «دوو قۆنـاغ... دوو قۆنـاغ... دوو قۆنـاغ، بـا بڵێیـن بـە ئەنـدازەی کێشـانی دە دانـە جگـەرە، گـەر کاتـی پێچانەوەکـەی نەهێنینـە ئەژمـار...»

«بـە ئەنـدازەی کێشـانی دە جگـەرە...» بـاز بـە بزەیەکـەوە دووبـارەی دەکاتـەوە «دەی باشـە گـەر کاتـی کێشـانی جگەرەکانـی بهێنینـە سـەر کاتژمێـر، دەکاتـە چەنـد؟»

ئـەو پیـاوەی کـە وەڵامـی داوەتـەوە لـەوی تەنیشـتی دەڕوانـێ و دەپرسـێ «دەکاتـە چەنـد؟» بـەڵام وەڵامێکـی دەسـت ناکـەوێ و بێدەنـگ دەبـێ. یـەک لـە هاوکارەکانـی بـاز ئـاگای لـەم قسـانەیە، ڕوو لـە بـاز دەکات: «دوێنـێ شـەو ئێمـە چوویـن و دەور و بـەری گوندەکەمـان کۆنتـڕۆڵ کـرد، هەمـوو شـتێک بـێ کـەم و کورتـی بـە تـەواوی ئامـادەی ڕاوە، گونـد لێرەوە چـل و پێنـج خولـەک دوورە».

«بـا گوندییـەکان بچـن بـۆ لای پاسـەوانەکان، [ئێمـەش] دەسـتە و هاوڕێیانـی لێـرە کـۆ ببینـەوە و جارێکـی دی [نەخشـەی] هێرشـەکە تاوتـوێ بکەیـن».

گوندییـەکان هەڵدەسـتن و دەچنـە لای دوو پاسـەوانی بـەر دەرگای

ئەشکەوتەکە. ئەندامانی دەستە و هاوکارانی بازیش، یەک بە یەک دێن و لە دەوری باز کۆ دەبنەوە. لەو کاتەدا ئەو کەسەی بۆ هێنانی خواردن چوبووە ناو ئەشکەوتەکە، سینییەک بە دەستەوە، دایدەنێتە بەردەمی باز و دەڵێ: «شتێکی وەها نەبوو، نان، پەنیر، گۆشتی کوڵاو و کەمێکیش سەوزە». باز کە وەک گورگێک برسییەتی، نانێکی ساجی گوندی هەڵدەگرێ، پلێک گۆشت و پارچەیەک پیاز و بیبارێکی سەوز دەخاتە ناو نان و دەڵێ: «دەی دەست پێبکە...»

ئەو هاوکارەی کە وەڵامی بازی دایەوە، دەست بە شیکردنەوەی هێرش دەکات؛ رێگە، شێوەی رۆیشتن، پاسەوان، شوێنی فەرماندەکان، سیستەمی دەستە، ئەو چەک و تەقەمەنییانەی کە دەبێ لەگەڵ خۆیان ببەن، چۆنیەتیی بەکارهێنانیان، گوند، دەور و بەری گوند، ئەو چەند خەڵکەی لە گونددا دەمێننەوە، دانە بە دانەی ماڵەکانی گوند، ئەو ماڵەی نێچیری تێدایە، گەمارۆدانی گوند، چەپەر، چاوەڕوانی، جموجۆلی چاوەدێری، رۆیشتن و دواییش هێرش، هێرشی کۆتایی و مردن، هەموو شتێک یەک بە یەک ، دەڵێ.»زەبری مردن، دەبێ بۆ مردن بێ» هاوکارەکەی باز بەم وتە، شیکارییە درێژەکەی تەواو دەکات.

باز: «ئایا کەسێک پێی خۆشە شتێک لەم قسانە زیاد بکات، یانیش پرسیارێک بکات؟» و بە دەستی راستی دەمی دەسڕێ.

کەس هیچ ناڵێ. «کەواتە هەر کەس ئاگاداری کاری خۆیەتی».

باز هەڵدەستێتە سەر پێ و دەڵێ: «کەواتە دەتوانین برۆین... چەک و رەختی من بێنن... و کەمێکیش ئاوی خواردنەوە».

پێویست ناکات تۆ بێی، هاوکارێکی باز پێی دەڵێ؛ «تۆ دەتوانی لێرە چاوەڕوانی ئێمە بیت، کارەکە ئەنجام دەدەین و دەگەڕێینەوە».

باز پێدەکەنێ، خۆی دەکێشێتەوە و دەڵێ: «دەزانم پێویست ناکات، بەڵام خۆم دەمهەوێ» وەک ئەوەی لە ناکاو شتێکی بیر کەوتبێتەوە،

دادەنیشێ، پێڵاوەکانی دەردێنێ و چەند جار دایدەتەکێنێ و دەیکاتەوە پێی. جگەرەیەکی دی پێدەکا، دەڵێ «بۆ دواجار سەیری چەکەکانتان بکەن».

لەو کاتەدا چەکی ئەویش دێنن؛ کلاشینکۆفێکی درێژی ڕەش، چواردەخۆرێکی لوولە درێژ کە لە ژێر شەوقی مانگدا دەدرەوشێتەوە، سێ تاقم ڕەختی چەرمی کە پڕی فیشەکن، کاردێکی درێژی دوو دەم، دوو نارنجۆک و قومقومەیەکی ئاو. باز دانە دانە ئەوانە بە خۆیەوە دەبەستێ و دواییش سەیرێکی قۆنداق، دەرزی و خەشاب و نیشانگای کلاشینکۆفەکە دەکات، فیشەک دەخاتە بەر لوولەکەی و ڕاست و چەپ دەیکاتە شانی.

دەستەش لەگەڵ فەرماندە و هاوکارانی باز کە لە ئەشکەوت چاوەڕوانی ئەو بوون، ئێستا ئامادەن، بەڕیز بوون و چاوەڕێی فەرمانی باز دەکەن. باز دێتە بەرانبەریان، دانە بە دانە سەیریان دەکات، سەیری ڕاوەستان، چەک، جل و بەرگیان دەکات و دەگەڕێتەوە بەو ئەفسەرەی لە پادگانەوە لەگەڵی هاتبوو دەڵێ: «سوێندەکە بخوێنە...».

ئەفسەر کە ئێستا لە گوندییان دەچێ، ڕاپۆرت دەدا، سوێند دەخوا، دەستەش سوێند دووبارە دەکەنەوە؛ هەموو شتێک بۆ وەتەن، بۆ ئاڵا، میللەت و دەوڵەت... سەرۆک، بە دڵ، بە گیان، بە خوێن، ئێمە لەگەڵتاین ئەی سەرۆک، ئەی ژەنەڕاڵ سەردار...

باز دەڵێ: «دەی بە گوێرەی سیستەمی ڕۆیشتن بڵاوە بکەن با بکەوینە ڕێ».

ئەوان دەکەونە ڕێ؛ بەرەو نێچیر، یانی بەرەو ئەوانە، واتا بەرەو ئەو کەسانەی لە بەرانبەر دەوڵەت سەریانهەڵداوە، کە بە شوێن پارچە کردن و دابەش کردنی دەوڵەت و وڵاتەوەن. ئەوانە؛ لاو و کەسی ئەم وڵاتی چیایەن کە هەمیشە لە دەوڵەت و ئەرتەش بێزارن. کە هەمیشە

بەرامبەر بە دەوڵەت بێ باوەڕ و لێی بە شک و گومانن. ئەوانە؛ ئەو سەرهەڵدەرانەن کە لە هەر دەرفەت و فورسەتێکدا، وەک ئێستا، بێ ئەوەی ئاگاداری هێزی خۆیان و توانای دەوڵەت بن، سەرهەڵدەدەن. ئەوانە؛ نەزان و جاهیلی بێ قیمەتن کە لە مێژووی خۆیان، بەسەرهاتیان، مەرگ و کوشتنی ڕابردووی باو و باپیرانیان دەرسیان وەرنەگرتووە. ئەوانە؛ ئەو سەرهەڵدەرانەن کە پێویستە لە هەر هەل و مەرجێکدا، ڕۆژ و ڕۆژگارێکدا، جێ و شوێنێکدا سەریان پان بکرێتەوە... لە چەند ساڵێک پێش ئێستاوەیە ئەوانە، خەڵکی ئەم شاخانە، دیسان سەریان هەڵداوە و خۆیان سپاردۆتە چیا، بەو هیوای کە گەمە بە شەرەف و نامووس و بەهاکانی دەوڵەت و ئەرتەش بکەن، بەهای ئاڵا و یەکیەتیی وڵات تێکبدەن و هەندێک کێشە و سەرئێشە بۆ دەوڵەت و ئەرتەش ساز بکەن. بەڵام ئەوان ئاگایان لە هێز و توانای دەوڵەت و ئەرتەش نییە، هیچ نازانن، نازانن کە چالاکی و سەرهەڵدانیان بۆ دەوڵەت و ئەرتەش، وەک ویزە ویزی مێشێکە. هەر ئەوەندەی دەنگی ویزەی مێشێک کە بە دەستێک بە هەناسەیەک لە ناو دەچێت.

بەڵام، لەگەڵ ئەوەش، لەم چەند ساڵەدا هەزاران ئینسان کوژراون، سەدان سەرباز و ئەفسەر شەهید بوون. سەدان شوێن و جێ کاول بوون، دەیان مۆڵگە و پادگانی ئەرتەش سووتاون و لە هەموو لای وڵاتی چیا، شەڕێکی پرش و بڵاو و بێ سیستەم بەڵام خوێناوی، لێرە و لەوێ، بەگوێرەی شێوەی سەرهەڵدان، ئەنجام درا. ستراتیژی سەرهەڵدان دیارە؛ ئەوان حەز دەکەن ئەم شەڕە بکێشنە ناو زەمانێکی یەکجار درێژ و هەموو خەڵکی وڵاتی چیا ڕابکێشنە ناو مەیدانی شەڕ. باز و ئەرتەش دەزانن؛ مەترسیی هەرە گەورە ئەوەیە. دەوڵەت و ئەرتەش پێویستە ڕێگە نەدەنە ئەو شتە. نە دەوڵەت و نە ئەرتەشیش ئەوەندە کات و دەرفەتیان نییە. بە زووترین کات پێویستە سەرکوت بکرێن. دەبێ ئەم

ئاگرە بکوژێتەوە. هەر بۆیەشە کە باز وەک یەکێک لە سەربازە هەرە ناودار و بەرچاوەکانی ئەرتەش، بە ئەرک و بەرپرسیارێتیی یەکجار گرنگی نهێنی هاتۆتە ئەم ناوچە. بەرپرسیارێتیی ئەو، سەرۆکایەتی کردنی هێزی شاراوەی دەوڵەتە، واتا ئەرکی کوژاندنەوەی ئاگر، تێکدانی سەرهەڵدان، ڕووخاندنی هەست، ویست و جۆشی ڕاپەڕینە. ئەرکی باز؛ ڕاوە، ڕاوی ئینسان، لە بەربانگی ئێواران و شەوانەدا کەوتنە شوێن پێ و ئاسەواری سەرهەڵدەران. ئەرکی باز؛ کوشتن...

«ئەم سەرهەڵدانەش دەکوژێتەوە» باز بیر دەکاتەوە و لە ناوەندی چەکدارەکانیدا دەڕوا؛ وەک پێشوو، ئەمەش سەرکوت دەکرێت، گومان لەمەدا نییە... سیستەمی ئارامی و دادپەروەرانەی ڕاست و جێگیری وڵات دیسان، سەر لە نوێ سەقامگیر دەبێت. ئەم پیاوکوژی، بەرەڵایی، دزی، سووتان و بێ یاساییەی کە لەم هەرێمە ساز بووە، بە هاوکاریی هێزی دەوڵەت و ئەرتەش لە ناو دەچێت. ئەم جموجۆڵ، چالاکی و هێرشە شەیتانییانەی کە لە بەرانبەری میللەت، دەوڵەت و ئەرتەش، وەک مارێک خۆی دەخشێنێ، بێ گومان تێک دەبرێ. هەرچۆنێک دەبێ با ببێ، تیایدا کوشتن و مردن، ئێش و ئازاریش هەر دەبێ، سەری مار دەبێ پان بکرێتەوە. ئەرک ئەوەیە. ئەوە ئەرکی هەرە گرنگی مان و نەمانە.»

باز دەڕوا، ڕوو لە پێش، چەکی مەرگ بە دەستەوە، ئامرازی مەرگ لە سەر سینگ، لە بەر پشتوێن، بە هەنگاوی خێرا، بەهێز، مەغروور و لە خۆبایی دەڕوا. بە توانای شەوقی سووکی مانگ و ئەستێرە، بە هێزی پێشەنگی گوندییەکان، بە بەڕێوەبەریی چەک و تەقەمەنیی چەکدارەکانی مەرگ و کوشتن و بە بیر و باوەڕی ئەمری دەوڵەت و ئەرتەش، باز دەڕوا. باز حاکمە، دەسەڵاتە، حوکمداری هەموو شتێکە، تەنانەت حوکمداری جانەوەری دڕندە، دووپشک و ماری ناو شاخ و باڵندەی ئاسمانیشە. ئەو حوکمداری مان و نەمان، لە دایک بوون و مردنە. هەر شتێکی

لێ دەپرسرێ، پێویستە لێی بپرسرێ، باز حوکمدار و فەرماندەیە؛ باز سەرداری خۆشی و گاڵتە، ژان و ئازار، هێز و توانا؛ باز، عەگید و قارەمان و هونەرمەندە، قارەمانی شەوان، هونەرمەندی سووتان. باز، دڵێکی پڕ کینە وەک چیا کە سووتان و گڕی لێ بەرز دەبێتەوە.

ئێستا، لە ناکاو و بە خێرایی ڕۆشتنی دەستە قورس دەبێ، یەک لە گوندییە پێشەنگەکان لە پێشەوە، بە ئارامی دێ، بە ناویاندا دەگەڕێ، بە دەست، یەک بە یەک شتێکیان پێ دەڵێ. بەڵێ، ئەوان نزیکی گوندی کاول کەوتوونەتەوە. دەستە خێراییەکەیان کەم دەکەنەوە و پاش چەند خولەکێک، لە دوورەوە چەند شەوقی قەڵس دیارن. هەر دوو هاوکارەکەی باز، چالاکانە لە هەر دوو لای دەستە لە نێوان ئەندامەکانی دەستەدا دێن و دەچن و بە ئارامی، ڕۆشتنیان ڕێکدەخەن. ئەوان هەنگاو بە هەنگاو لە گوندەکە کە پەردەی تاریکی شەو کشاوە بەسەریدا، نزیک دەبنەوە. بێدەنگییەکی یەکجار سەیر، لێ ترسناک لە دەر و دەشت دایە؛ شەو، تاریکیی شەو، بێدەنگی، ترس و سام. بەڵام تەنیا ئەو دوو سێ شەوق و ڕۆشناییە بێزارە کە بە ئاستەم دیارن، هێمای هەبوونی گوند و دانیشتووانی گوندن. لێ ئەو بێدەنگییە، ئەو ئارامییە؟ ئەوانە هێمای چین؟ لە ناو ئەو بێدەنگییە سەیر و تاریکییە قووڵەدا، تەنیا دەنگی مێش و ڕۆشتنی ئەندامانی دەستە دەبیسترێ. تەنیا دەنگی پێڵاوە سووکە لۆکاڵییەکان...

گوند دیارە. ئەو چەند خانووە کاولەی گوند دیارن. ئەو چەند شەوقە بێزارەی کە لە تاریکیی شەودا وەک درەوشانەوە، دەجووڵێن، ئێستا هەندێک باشتر دیارن. کەمێک دوورتر لە گوند، لە چاڵێکدا، دەستە ڕادەوەستێ. هەرکەس دەزانێ دەبێ چی بکات، پێشەنگ، ئەندامانی دەستە، ئەفسەر و هاوکارانی باز، خێرا بڵاو دەبنەوە و هەریەک بەلایەکدا دەڕۆن. باز و هاوکارێکی، ئەفسەرێک کە لەگەڵی هاتبوو، ئەندامێکی

دەستە و گوندییەک، هەموو پێکەوە، لە تەنیشتی چاڵەکە، لە شوێنێک کە لە چەپەرێکی ئارام دەچێت، بەجێ دەبن. ئەو شوێنە چاڵە، بەڵام پێشەکەی ئاوەڵایە. ئەوان لەوێوە دەتوانن هەموو گوند و دەور و بەری ببینن.

بەڵێ، ئەوان تا بەر گوند هاتوون. ئێستاش چاوەڕێ دەکەن، بۆ زەبری کۆتایی مەرگ. لە دەرفەتێک دەگەڕێن. باز کە زۆر هەست بە ماندوویەتی دەکات، کلاشینکۆفەکەی لە پاڵ خۆیدا دادەنێت، پاڵ بە بەردێکی ڕەقی چەپەرەکەوە دەدات و لە سەر خاک، لە سەر گیایەک کە ئیدی وشک بووە، دادەنیشێ. پاش کەمێک حەسانەوە، جگەرەیەک لە ناو لەپی دەستەکانیدا زۆر بە دیقەتەوە، پێدەکا و لە ناو دەستیدا بە شاراوەیی دەیکێشێ. شەوێکی ساماڵە. دەر و دەشت بێدەنگ و ئارامە، مانگ و ئەستێرە لە دوورەوە ڕووناکییەکی سووک دەڕژێنن بە سەر شەوەکەدا. هەندێک هەور بە ئارامی لە باکوورەوە بەرەو باشوور دەڕۆن. وەک ئەوەی ئەو گوندە، خانووەکان، باز، دەستەکەی، لەم دونیادا نین، لێ لە ناو دڵی چیرۆک و داستانەکاندان. کێ ئاگای لەم هەرێمە پڕ سام و لە بیرکراوانە هەیە؟ بۆچی ئێرە ئەوەندە لە دونیا دوورە؟ باز کەمێک دەلەرزێ، پێدەچێ لە بەر هەستی تەنیایی و دوور بوون لە دونیا، دەست و پێی کەمێک بلەرزن. خۆی کۆ دەکاتەوە، هێز دەداتەوە بەر خۆی و سەری بەرز دەکاتەوە. بە دیقەت و بە وردی لە گوند و خانووەکانی دەڕوانێ. خانوو بەهەموویەوە پێنج شەشێکن. خانوو لە مەیدانی گوند هەمووی لە دەوری یەکن. هەندێک دوورتر لە خانووەکان، تارمایی کۆمەڵێک داری درێژ دیارە. گەڵای دارەکان کە ئیدی دەوەرن، بە شنەی بایەک دەجمن و لە لای دارەکانیشەوە بناری تاریکی چیا بەرزەکانی هەرێمەکە دیارن. هەروەک گوندییەکان وتبوویان، ماڵەکان کاول و وێرانەن. سەربان و هەندێک دیواری دوو سێیەکیان داڕماون.

لە دوو- سێیەکیانەوە کە نزیکی یەکن ڕووناکییەکی کەمی چراکان لە پەنجەرەکانیانەوە دیارە. خانوو بە ڕیزە بەردی مەزن ساز کراون. هەر بۆیەش هێرش لە دوورەوە کەڵکی نابێت، لێ خانووەکان زۆر بڵند نین، نزم ساز کراون و پەنجەرەکانیشیان گەورەیە. پەنجەرەکانی زۆر نزمن. نزم بوونی خانوو و پەنجەرەکان، کاری ئەمان ئاسانتر دەکاتەوە. بەڵام کات و دەرفەتی پێویستە، دەبێ کاتێکی باش بۆ هێرش کردن بە دەست بێنن.

«ئاخۆ ئەو ڕووناکییە کەمە لە دوورەوە دیارە، ئەوانە، لەوێن»، باز بە ئارامی بە هاوکارێکی دەڵێ: «ڕووناکی، ڕووناکیی جەردەکان، ڕووناکیی بێزاری ئەوان... ئەو ڕووناکییە دەبێ بکوژێتەوە...» ئەو جەردانە، ئەمشەو دەبێ دەرسێکی وەها وەربگرن کە هیچ کەس هەرگیز لە مێژووی ئەواندا لە بیری نەکات. دەرسێکی وەها کە ئەوان ئیدی هەرگیز لە بیری نەکەن کە وڵات تەنیا یەک هێز و یەک دەسەڵاتە؛ دەوڵەت و ئەرتەش. تەنیا دەوڵەت و ئەرتەش دەتوانێ قسە بکات، بڵێ و فەرمان بدات. بە تەنیا کار و کردەوەی دەوڵەت و ئەرتەش وەک قسەی خودا، جێگیر، مسۆگەر و ئەبەدییە. ئەو جەردانە دەبێ بزانن. بەم دەرسە، فێر ببن کە لە بەرانبەر قسە و کرداری دەوڵەت و ئەرتەش، تەنیا یەک ڕێگە هەیە؛ فەرمانبەری. هیچی دی نا، تەنیا فەرمانبەری و پەسەند کردن. تەنیا پەسەند کردن و بەجێهێنان... ئەوان و وڵاتەکەیان ئەمشەو دەرسێکی ئاوەهایان پێویستە؛ لە بەرانبەر قسە و کردەوەی دەوڵەت و ئەرتەشدا چارەیەکیان نییە. هەرکەس، هەر شتێک بێچارەیە، بێچارە. کەسێک کە ئەمە پەسەند نەکات، دەبێ بزانێ کە بەسەرهاتەکەی هەروەک ئەمانە دەبێ... دەرس دەبێ وەها بێ... لێ دەرفەت...

هێشتا باز نیگای لە سەر خانووەکانی گوند، لەم بیرانەدایە کە

دەرگای ئـەو خانـووەی شـەوقی چراکـەی لێـوە دیـارە، دەکرێتـەوە و دوو کـەس دێنـە دەرەوە. باز لـە نـاکاو خـۆی دەدزێتـەوە و لـە سـەر جێگاکـەی دادەنیشـێ. دەنگـی ئەوانـەی هاتنـە دەرەوە، دەگاتـە گوێـی ئەمـان. ئـەوان بـە زمانـی خۆیـان، بـە زمانـی ئـەو هەرێمانـە، پێکـەوە قسـە دەکـەن. باز بـە دەست، بێ ئـەوەی دەم بکاتـەوە، لـە گوندییەکـی پـاڵ خـۆی دەپرسـێ کـە ئەوانـە قسـەی چـی دەکـەن، گونـدی چەنـد خولەکێک بـە وردی گـوێ ڕادێـرێ بـۆ قسـەکانیان، بـەڵام نـا، وا دیـارە گونـدی تێنـاگا باسـی چـی دەکـەن. ئـەوان بـە هەنـگاوی ئـارام و قـورس بـەرەو لای خانـووە وێرانـەکان دەڕۆن. تفەنگێکـی درێژیـان بەدەستەوەیە. پێدەچـێ تفەنگـی ئەوانیـش کلاشـینکۆف بێـت. «کەواتـە ئەوانیـش چەکدارن»بـاز بیـر دەکاتـەوە، ئـەو کات کار زەحمەتتـرە، یەکجـار سـەختە. بـەڵام چـارە نییـە. هەرچەنـدە لـە بەرانبـەر قسـەی دەوڵـەت و ئەرتـەش چـارە نییـە، ئـەوەی ئەمشـەویش چـارەی نییـە؛ ڕاوچـی دەبـێ کاری ڕاو تـا دوایـی ئەنجـام بـدەن.

ئـەو دوو کەسـە چەکدارە، ماوەیەکـی درێـژ لـە نێـوان خانـووە وێرانـەکان و دەور و بـەری خانووەکانـدا، دەگـەڕێن، بـەرەو ڕۆژئـاوا و ڕۆژهـەڵات، باکـوور و باشـوور، دێـن و دەچـن. ئـەوان، ئەوەنـدەی پـازدە بیسـت مەترێـک دوورتـر لە چەپەرەکـەی بازیـش بـە پێـش ئەوانیشـدا دەڕۆن. پاشـان دیسـان دەگەڕێنەوە بـۆ ئـەو ماڵـەی لێـی هاتبوونـە دەر. یەکیـان دەچێتـە ژوور، ئـەوی دی لـە بـەر دەرگا ڕادەوەستێ. تفەنـگ بەدەست، لـە بـەر دەرگا لـە نێـوان خانووەکانـدا دێـت و دەچێـت.

«ئەمجـار کار زۆر دژوارتـر بـووە» بـاز بیـر دەکاتـەوە. خۆزگـە هـەر ئـەو کاتـەی گەیشـتین هێرشـمان دەکـرد. بـەڵام وەهـاش نەدەبـوو. بـاز و تاقمەکـەی ئێسـتا چ بکـەن؟ دەرس پێویسـتە، زەبـر پێویسـتە... سـەرەڕای هەمـوو شـتێک دەبـێ وەهـا بکـەن، نـە هیچـی دی. ئـەوان چـاوەڕوان دەبـن و چاوەدێـرن.

چاوەڕوانی؛ لە ژێر پەردەی ڕەشی شەودا چاوەڕوانی مەرگ، لە ناو جل و بەرگی شەودا، بە ویستێکی بێپایان دڵگەرم، چاوەڕوانیی هەڵوەشاندن و داڕووخان. لە ناو شەوەزەنگی پاییزی وڵاتێکی لە بیرکراودا چاوەڕوانی دەرفەتی خوێن ڕشتن و کوشتن. چاوەڕوانی؛ بێچارەیی و بەلەنگازیی تێکەڵ و جادوو کە تەنیا لە مەرگ و کوشتن پێک دێت و بەردەوام لەم هەرێمانە بەرپایە... چاوەڕوانی، بە دزییەوە، چاوەڕوانی نهێنی، واتا بەهیوای هێمای تێکدان و تێکچوون بوون.

شەو دەڕوا. لێ لەگەڵ شەو، لەگەڵ تاریکیی شەو، لەگەڵ ئەو پەڵە هەورانەی دەجووڵێن، ئەستێرە هەن، مانگ هەیە، ڕووناکییان هەیە. شەو دەبێ تاریک بێ، ئەستێرە دەبێ ون بن، مانگ دەبێ ئاوا بێ. ئەوانە بۆ هێرش کردن پێویستن. باز سەر هەڵدێنێ و سەیری ئاسمان دەکات. ئەستێرە، کۆمەڵی ئەستێرەکان لێرە وەک نەخشی قاڵیچە و مافوورێکی دەستکرد هەڵواسراوە. کاروانکوژە دەدرەوشێتەوە. لەیلی و مەجنوون گەلێک دوور لە یەک دەڕوانن. گەلاوێژ، سەرۆکی ئەستێران، ڕێبەری شوان، گاوان، ڕاوچی، ڕێ لێونبوو، جەردە و پیاوکوژان، بە شەوقێکی زێڕین، دەدرەوشێتەوە. کۆمەڵی هەتیوان لە لای ڕۆژهەڵاتەوە خۆیان دەجمێنن. دیوانی ئەسحابان کە بە گوێرەی ژماردنی باز، دوازدە ئەستێرەن، هێدی هێدی لە ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دەڕۆن.

و مانگ و تریفەکەی، دەلالییەکەی، ڕازاوەیی و نەخشی درەوشاوەی. مانگ وەک مانگە، وەک مانگی منداڵییەکانی باز لە ماڵی منداڵانی هەتیو، لە ڕۆژە تەنیاییەکانیشدا مانگ، هەر ئاوەها دەهات و لە سەر سەریان هەڵدەوەستا. باز و منداڵانی دی کە هاوچارەنووس بوون، لە باخچە گەورەکەی ماڵەکەدا بە کاتژمێران لە مانگ و ڕۆیشتنی دەیانڕوانی. جووڵانەوەی مانگ، شێوە و ڕۆشناییەکەی، شەنگ و شۆخییەکەی، جۆراوجۆر بوون. بەڵام لە ناو هەموو ئەوانەدا باز زیاتر حەزی لە مانگەشەو بوو.

مانگێـک کـە وەک سـینییەکی زێڕیـن دەدرەوشـێتەوە و ڕووناکییەکـەی لـە دەر و دەشـتدا دەتەنێتـەوە. ئـەو کاتـەی هێـزی مانـگ تـەواو بـوو، ئـەو دەمـە مانـگ جێگیـر و قایـم بـوو، ئـەو ساتەی مانـگ دەسـەڵاتی تـەواوی جیهانـی هەبـوو. لـە شـەوانی مانگەشـەودا بـاز سـترانێکی وەهـای دەگـوت کـە لـە دادەکانـی ماڵـی هەتیوانـەوە فێـری ببـوو؛ مانگەشـەو مانگەشـەو، خاوەنـی شـەوق و ڕەونەقـی ڕووناکـی، لێـی بڕوانـە، مانگەشـەو، باڵنـدە و پەلـەوەر، کەروێشـک و سـمۆرە لـە دارسـتان، لـە گۆڤەنـدن. بـە ڕووناکیـی تـۆی دەلال، لـێ مانگەشـەو... لـە ئاکادیمیـای سـەربازیش تاقـە هاوڕێـی شـەوانی بـێ ئەژمـار و بێکۆتایـی بـاز، مانـگ بـوو. لـە شـەوانی تەنیایـی و زۆربـەی جارانیـش سارددا بـە تایبـەت ئـەو کاتانـەی باز پاسـەوانی شـەو بـوو، نیـگا هـەر لـە سـەر مانـگ و بزووتنـی مانـگ بـوو. جگـەرە قەدەغـە بـوو، خەوتـن قەدەغـە بـوو، قسـە کـردن، سـتران، هـات و چـۆ، خـواردن و خواردنـەوە، خوێنـدن و نووسـین و ماسـتۆر باسـیۆن* قەدەغـە بـوو. بـەڵام سـەیر کردنـی مانـگ و ئەسـتیران ئـازاد بـوو. و ئـەو شـەوانەی مانـگ بـوو، بـاز پاسـەوان بـوو، بـاز بـۆ مانگـی دەڕوانـی، بـە خولـەکان، بـە کاتژمێـران بیری دەکـردەوە، لـە ژیـان و حاڵـی خـۆی، لـە داهاتـووی، واتـا لـەم ڕۆژانـەی ئێسـتا تێیـدا دەژی، بیـری دەکـردەوە. مانـگ هاوڕێـی بـوو. هاوڕێکـەی، ئێسـتاش بڵندایـی چیـا سەرکەشـەکان، پشـتی شـاخەکان، دارسـتانی بێدەنـگ، سرووشـتی ڕەنگیـن، پاییـز و ڕووبـاری زوڵاڵ دەتەنێتـەوە، وەک تۆپێـک هەورێشـمی نـەرم، ناسـک و زەریـف دەیانتەنێتـەوە.

بـەڵام ئەمشـەو ئـەم گۆڤەنـدەی مانـگ لـە جێـی خۆیـدا نییـە، پێویسـتە ئەمشـەو مانـگ بـڕوات، ون بـێ. بـاز، پیـاوی تاریکـی، ئەمشـەو مانگـی نـاوێ، ئـەو تاریکـی، تاریکەشـەوی دەوێ.

بـەڵام مانـگ نـاڕوات. لـەو لاشـەوە یـەک لـە جـەردەکان کـە لـە نێـوان

---

* دەستپەڕ.

خانووەکاندا دێت و دەچێت، پاسەوانە. پاسەوان ئێستا گۆرانی دەڵێتەوە. سترانێک کە بە مەقامێکی ئارام و ئاوازێکی قووڵ بە دەنگێکی زیز و زویر دێتە گوتن. باز و ئەوانی دی ناتوانن گۆرانییەکە تێبگەن، لێ ئاوازی درێژی ستران، بە ئارامی دەگاتە ئەوان.. باز، ئەو ئاوازە، ئەو شێوەی وتنە، ئەو مەقام و ئاهەنگە دەناسێ. ئەو جار و بار لێرە و لەوێ، ئەو ئاوازە و ئەو مەقامەی بیستووە. کاتێک باز هێشتا ئەفسەرێکی نوێ بوو و تازە دەستی بە ئیشی ئەرتەش کردبوو، ئەو کاتە یەکەم جار گوێبیستی ئەو مەقام و ئاوازە بوو. کاتێک دیسان لەم هەرێمانە کۆچێکی مەزن بەرپا بوو و بە هەزاران کەسی ئەم هەرێمانە بە ترێن دوور خرانەوە بۆ وڵاتی باشوور و بیابان. ئەو کات باز فەرماندەی ڤاگۆنێکی ترێنەکە بوو، لە رێگەدا، لە ناو ترێندا ئەو ئاوازەی بیستبوو. لاوێک لە کۆچبەرەکان لە ڤاگۆنەکەدا هەمیشە بەم ئاوازە سترانی دەوت. ئەو سترانە چییە کە لە ئامێزی ئەم شەوە بێدەنگەدا دێتە وتن؟ ئەم وڵاتە لە بیرکراوە، ئەم چیا سەرکەشانە، ئەم سرووشتە هۆڤە، ئەم شەوە پڕ سام و بێدەنگە و ئەو سترانە... ئاوازێکی قووڵ، دەنگێکی درێژ، بەرز و زیز و ئەو بەندانەی هەمیشە دووبارە دەبنەوە... تایبەتمەندیی ئەم شێوە بەندانە چین؟ بۆچی ئەم ئینسانە چیاییانە هەمیشە وا ستران دەچڕن؟ ئەوانە ئاوازی ئەفسانە لە بیرکراوەکانن یان هی چیرۆکەکانن؟ ئەوانە، دەنگی دەرد و خەمن، هی ڕق و کینن؟ یانیش ئەوانە مەقامی خۆشی و شادیی ئەو مرۆڤانەن کە کەس لێی تیناگا؟ باز فەرماندار و حاکمی ئەو هەرێم و مرۆڤانە، پێویستە ئەم شتانە دانە بە دانە فێر بێت.

بەڵام نەک ئەمشەو. ئێستا کاتی چاوەدێرییە. کاتی بەدەست هێنانی دەرفەتێکە. کات دەڕوا، شەو دادەگەڕێ، هەور دێن و دەڕۆن، ئەستێرە کەم دەبنەوە، ڕووناکیی مانگ کەم دەبێتەوە، لێ ئەوان چاوەدێری

دەکەن. هاوکارانی باز دێن و دەچن. لەگەڵ یەک ڕاوێژ دەکەن، دیسان دەچن و دێن، لێ چاوەدێری دەکەن ئەو دەرفەتەی ئەمان بەهیوایەن، نایە. دونیا سارد دەبێ، شەونم دەکەوێتە زەوی، سەرمای شەونم لە پێڵاو و گۆرەوییە بەن و خورییەکانیانەوە بەرەو ژوور، بەرەو دڵ و گیانیان دەڕوات. پێ و ئەژنۆیان دەتەزێ، چاوەکانیان کە لە سەر خانووەکانە، دەبیەستێ. لێ ئەوان بە هیواوە، چاوەدێری دەکەن. لەگەڵ ئەوەش کە باز بە هۆی ڕاوەستانەوە، سڕ بووە، هێشتا بەهیوایە. هیوا، سەرەڕای هەموو شتێک، هیوا، باز هەموو هێزی خۆی کۆ دەکاتەوە تاوەکوو هیوا لە دەست نەدا. باز هەر دوو دەستی دەخاتە باخەڵی خۆی، لاقی دەجووڵێنێ، جارجارە گەردن و پشتی دەتەقێنێ و چاوەدێرە. بە هیوا. بۆنی ئارەقە، تەپ و تۆز، چڵک، قوڕ، گیا و میزی لێدی. باز هەست بە چڵکنیی خۆی وەک بەرازێکی ناو قوڕ دەکات. برسی، تینوو، تووڕە، یەکجار ماندوو، چاوەدێریی دەکات.

چی پێویستە؟ هاوکار دێن و لێی دەپرسن، پێشەنگ دێن و باسی مەترسی دەکەن. ئەفسەرەکانی دی، بێزاریی ئەندامانی دەستەی پێ ڕادەگەیەنن. و ئەستێرە دانە بە دانە ون دەبن، مانگ ون دەبێ، دونیا لای ڕۆژهەڵاتەوە، لە پشت شاخەکانەوە، ڕۆشن دەبێتەوە.

ئیدی هیچ نییە کە باز بتوانێ بیکات، ئەو بڕیاری خۆی دەدا؛ خۆتان کۆ بکەنەوە، دەگەڕێینەوە. کاتێک یەکەمین تیرێژەکانی ڕۆژێکی نوێ لە پشت چیاکانەوە سەر دەردێنێ، باز و دەستەیش بە ئارامی لە چەپەرەکانی گوند پاشەکشە دەکەن، بێ ئەوەی باز لەگەڵ ئەوانی دی بپەیڤێ و شتێکیان پێ بڵێ، هەموو پێکەوە، بڵاو، دیسان پێشەنگ لە پێشەوە و ئەندامانی دەستەش لە پشتەوە، لە دەور و بەر بڵاو دەبنەوە و ڕێگە دەبڕن و بەرەو ئەشکەوت دەگەڕێنەوە. تا بەر دەرگای ئەشکەوت کەس دەنگی لێوە نایە، کاتێک دەگەنە بەر ئەشکەوت باز بە هاوکارێکی

دەڵـێ کـە ئـەو تاقمـە لەگـەڵ گوندییـەکان کۆ بکاتـەوە. تاقـم لە بـەر دەرگای ئەشـکەوت لـە دوو ڕیـزدا ڕادەوەسـتن. بـاز چەنـد خولەکێـک لێیـان دەڕوانـێ و دەڵـێ «ئەمجـار نەبـوو، ڕۆژێکـی نـوێ دەسـت پێـدەکات. بـەڵام ئـەم ڕۆژە نوێیـە شـەوێکی نوێشـی بەدواوەیـە. ئێمـە ئەمشـەو دیسـان دەچیـن. ئێسـتا بحەسـێنەوە، ئێـوارە کاتێـک تاریـک داهـات، دیسـان بـە هەمـوو شـتێکتانەوە لێـرە ئامـادە بـن».

پاشـان بـاز لەگـەڵ ئەفسـەرەکان دەچێتـە ئەشـکەوتی پێـش پێشـەوە، چـەک و ڕەخـت و فیشـەکدانی لـە خـۆی دەکاتـەوە و لـە سـەر دۆشـەکەی ڕاخـراو پـاڵ دەداتـەوە. بـاز مانـدووە. ئەوەنـدە مانـدوو کـە ناتوانـێ قسـە بـکات. ئـەو ئەفسـەرانەی لـە دەوری دادەنیشـن، لـە مـەڕ گونـد، خانـووکان، دەور و بـەری ماڵـەکان و جـەردەکان، هەندێـک شـتی پـێ دەڵێـن. لـێ تەنیـا گـوێ ڕادێـرێ. پـاش کەمێـک نانـی بەیانـی کـە بریتییـە لـە چایـی گـەرم و نـان و پەنیـر دێتـە بـەر دەسـتیان. بـاز دوو پیاڵـە چـای گـەرم دەخواتـەوە و پارووپـەک نـان و پەنیریـش دەخـوات، و پاشـان بـەر لـەوەی بـە تـەواوی چـاو ببەسـتێ و بخەوێـت، وەک ئـەوەی لـە خـەودا بێـت بـە نەرمـی بـە ئەفسـەرەکان دەڵـێ: «هـەوا، هـەور، ئەسـتێرە، مانـگ... بـاش بزانـن کـە هـەوای ئەمشـەو چـۆن دەبـێ».

بەڵـێ، بـەم شـێوە شـەوێک ڕادەبـرێ و ڕۆژێکـی نـوێ دەسـت پێـدەکات. لـە کاتـی دەسـتپێکی ڕۆژێکـی نوێـدا، بـاز دیسـان، لـە تاریکیـدا، تاریکیـی ئەشـکەوت و خـەودا، دەچێتـە خـەو. ڕۆژی نـوێ دیسـان ئێـوارە و شـەوێکی هەیـە. پـاش ڕوناکیـی ڕۆژ، دیسـان تاریکیـی ئێـوارە و شـەو دەسـت پێدەکات. بـاز، کـوڕی تاریکـی، فەرمانـدەی شـەو، دیسـان خـۆی کۆ دەکاتـەوە، چـەک و فیشـەکدانی لـە خـۆ دەبەسـتێ، ملـی ڕێگـە دەگـرێ و دەکەوێتـە شـوێن نێچیـر.

وەهـا دەبـێ. کاتێـک بـاز لـە خـەوی قـووڵ خەبـەری دەبێتـەوە، دونیـا

دیسان تاریکە. هەموو جەستەی تەزیوە، گشت گیانی دێشێ، قوڕگی وشکی دەسووتێتەوە. ئەو هەر بە جل و بەرگ و پێڵاوەکانییەوە نوستووە. هەڵدەستێ، دەست، پێ، شان، گەردن و لاقی چەند دەقەیەک دەجووڵێنێ و دێتە بەر دەرگای ئەشکەوت.

چەند کەسێک لە ئەندامانی دەستە، کەمێک دوورتر، لە بەر دەرگای ئەشکەوتێکی دی دانیشتوون. کاتێک چاویان بە باز دەکەوێ، هەموو پێکەوە هەڵدەستنە سەر پێ، ڕاست ڕادەوەستن. باز بە دەستان پێیان دەڵێ دانیشنەوە و دەگەڕێتەوە دەچێ بۆ پشت ئەشکەوتەکان، میز دەکات و ئەوەندەی میز دەکات یەکسەر لە ئاسمانیش دەڕوانێ. دونیا گیراوە. هەورێکی قورس ئاسمانی گرتۆتەوە. کەیفی کەمێک ساز دەبێ، دەڵێ «ئاوەها، وەها گیراو بە» و دەگەڕێتەوە بۆ لای گرووپەکە. پاش ئەوەی کە باز دیسانەوە پێیان دەڵێ دانیشنەوە، خۆشی لە سەر بەردێک دادەنیشێت و لە هاوکارێکی دەپرسێت تۆ بڵێی هەوا چۆن بێت.

هاوکار دەڵێ: «هەوا هەورە و گیراوە، هەروا هەوری و گیراو دەبێ و پێدەچێ بارانیش ببارێ».

باز دەڵێ: «کەواتە تۆ دەستە ئامادە بکە با دوای نیو کاتژمێر بە ڕەخت و چەکەوە ئامادە بن» و داوای خواردن لە گوندییەکان دەکات.

دەستە بە جارێک ئامادە دەبن . باز خواردن دەخوا، پاشماوەی گۆشتە کولاوەکەش پلە پلە دەجوێ و دەیخوا، جل و بەرگەکەی دەتەکێنێ، دۆخینەکەی توند دەکاتەوە، دەمانچە، چەک و فیشەکدان لە پشتی دەبەستێ، جگەرەیەک دەکێشێ و دێتە بەر دەستە. بە وردی لێیان دەڕوانێ و دەڵێ «هیچ گۆڕانێک لە پلانەکەماندا نییە» «هەر وەک دوێنێ شەو، بەرەو گوند دەچینەوە، بە گوێرەی زانیارییەکانمان، ئەوانە ئەمشەو و چەندین شەوی دیش هەر لە گوند دەبن، بەڵام ئەمشەو دەبێ کێشەکە چارەسەر بکەین... بەڵێ کەواتە ڕاپۆرت بدە» باز بە هاوکاری

تەنیشتی خۆی دەڵێ و چەند هەنگاو دەچێتە دواوە. دەستە بە یەک دەنگ دیسان سوێند دەخۆا؛ سەرۆک، بە دڵ، بە گیان، بە خوێن، ئێمە لەگەڵتاین ئەی سەرۆک، ئەی ژەنەڕاڵ سەردار...

و ئەوان دەکەونە ڕێ. وەک شەوی ڕابردوو، هەر بەو سیستەمە، بەرەو هەمان ئامانج. بەڵام لە کاتی ڕۆشتندا شتێک جیاوازتر لە شەوی پێشوو ڕوو دەدات؛ باران دەست پێدەکات. سەرەتا دڵۆپ دڵۆپ و نم نم، دواتریش بەخوڕ، و لەگەڵ باران مژێکی تەنک دێت بە سەر زەویدا. ئێستا خۆشیی باز بێکۆتاییە. دونیا تەڕ دەبێ، زۆر تەڕتر دەبێ. قوڕ و چڵپاو درووست دەبێ، جل و بەرگ تەڕ دەبن، بەڵام کێشە نییە، بەپێچەوانەوە زۆریش باشە. باز کەیفخۆشە، دەڵێ «زووکەن، خێرا بن» «ئەمشەو خوداش لەگەڵ ئێمەیە...».

کاتێک ئەوان، ئەو ڕوناکییە بچووکەی بە قەد ترووسکەیەکی بچووکە، دەبینن، کەمێک ڕادەوەستن. بەڵێ ئەو گوندەی ئەمشەویش ژیانی تێدایە، واتا جەردە لەوێن، ئێستا لە پێشیاندایە. باز بانگی هاوکارانی دەکات و دەکەوێتە ڕاوێژ لەگەڵیان کە چ بکەن. ئەمشەو لە ژێر ئەم بارانەدا، ئیدی وەک دوێنێ شەو پێویست ناکات چاوەڕوان بن. ئەگەر پاسەوانیش هەبن، ئەمان بەرەو ماڵەکان دەچن. لەم بارانەدا جەردە ناتوانن زوو بێن بە خۆیاندا و لە ماڵ بێنە دەرەوە. بەڵێ بڕیار وەهایە. باز دەڵێ؛ «دەی پیاوانی پێشەوەی لای پێشەنگەکان دیاری بکەن، ڕیز بە ڕیز بڵاو ببنەوە، ئێمە ڕاستەوخۆ دەچینە سەرماڵەکان» و دیسان دەست بە ڕۆیشتن دەکەن. خۆیان دەگەیەننە ئەو چاڵەی لێیبوون. بەڵام لێرە ڕاناوەستن، بە شوێن پیاوانی پێش و پێشەنگەکاندا بەرەو ماڵەکان دەچن. کەس دیار نییە. لە دەنگی باران زیاتر، دەنگێک نایە. لە سیبیان لە خانووەکانەوە ڕوناکییەکی بێزار دیارە. ئەوان کەمێکی دیش لە ماڵەکان نزیک دەبنەوە. چەند هەنگاوی دی، کەس دیار نیە. چەندی تر، دیسان

کەس نییە. بێدەنگ چەند هەنگاوی دی و ئێستاش لە بەر پەنجەرەی خانووەکانن. باز کەیفخۆشە. ئەو بڕوای نەدەکرد کە ئاوا بە ئاسانی بتوانن بگەنە ئەو جێگە. لە بەر پەنجەرەکان، بێدەنگ ڕادەوەستن. پاشان هەر ڕیزێک لە دەستە، بێدەنگ، بە هەنگاوی سووک، دەچێتە بەر پەنجەرەی خانوویەک. سێ خانوو، سێ ڕیز. لە ناوەوە دەنگ دێ. «بڕوایان بە باران زۆرە» باز پێدەکەنێ «باران وەرە ببارە کەس نایە... ئەحمەقانە... فەرمووو».

باز لە کەسانی دەوری خۆی، لە ڕیزەکانی دی، لە پیاوانی پێش کە خۆیان داوەتە بەر دیواری خانووە وێرانەکان دەڕوانێ. بە وردی چەند جاران نیگایان تێدەبڕێ و پاشان دەستی ڕاستی هەڵدێنێ و کەمێک هەروا ڕادەوەستێ. دەستە، ڕیز، ئەندامانی دەستە، هەموو پێکەوە، کلاشینکۆف، تفەنگی درێژ، ڕەشاشە و نارنجۆک بەدەستەوە چاوەڕوانی بازن، هەموو چاوەڕوانن کە باز دەستی هەڵێنراوی دانێ.

باران بە خوڕ دەبارێ. لای ڕۆژهەڵات لە سەر چیاکانەوە بایەکی توند لەگەڵ خۆی باران دێنێ و دەیرژێنێ بە سەر گونددا. چیا، شاخ، دار و بەرد، چاڵ، دۆڵ، گوند، خانووەکان، باز و ئەندامانی دەستە لە ژێر بارانی بێوچاندا تەڕ دەبن. ریزەکان، ئەندامانی دەستە لە سووچی خانووەکان، لە بەر پەنجەرەکان لە بەر باراندا چاوەڕوانی فەرمانی بازن.

و باز ئارام دەستی دێنێتە خوار. دەنگی تەقینەوەیەک دەر و دەشت دەگرێ. و تەقەیەکی دی و دەنگی تەقینەوەیەکی دی. جار بە جار بێ پشوو لە پەنجەرەکانەوە بەرەو ناوەوە. دەنگی گوللەباران، دەکەوێتە سەرووی دەنگی بارانەوە. لە ناو خانووەکانەوە دەنگی قیژە و هاوار دێ. لێ دەنگی کلاشینکۆف، ڕەشاشە و نارنجۆکان، دەکەوێتە سەرووی هەموو دەنگەکانەوە. لە تاریکیی شەودا لەگەڵ بارانی زولاڵ، ئاگر دەبارێ. برووسکە، گڕ و پزیسک دادەگیرسێن و دەکوژێنەوە.

چەن دیواری خانووەکە تێکدەچن، چەند کەسێک هەوڵ دەدەن کە لە دەرگای خانووەکان بێنە دەر بەڵام هەر کە سەریان دێننە دەرەوە لە قوڕ دەگلێن. گوللە باران بەردەوامە، فیشەکی نوێ دێتە بەر کار، فیشەکدان دەگۆڕدرێن، لوولەی تفەنگ سوور دەبنەوە و تفەنگ دەگۆڕدرێ و فیشەکی تێکەڵی چەکی مەرگ لە تاریکیی شەودا بەردەوام پزیسک و گڕ دەپشێنن. بە داگیرسانی برووسکە و گڕ دەر و دەشت ڕووناک دەبێتەوە. دڵۆپەی باران لە ناو ئەم ڕووناکیی مەرگەدا، وەک دوڕ و یاقووت دێتە بەرچاو.

بۆنی ئاگر و بارووت، بۆنی دار و بەرد و با و باران تێکدەدا.

تا کەی گوللە باران بەردەوام دەبێت؟ کەس نازانێ، بازیش نازانێ. گوللەباران، گوللە بارانکارانیان یەخسیر کردووە، لێ پاش ماوەیەکی درێژ، یەکجار درێژ، باز دێتەوە سەر خۆ و سەیری دەور و پشتی دەکات. دەستە لە سەر خۆ نین، بەردەوام لە پەنجەرە، دەرگا و ڕۆچنەوە گوللە دەبارێننە ژوورەوە. باز بە دەنگێکی بەرز بانگ دەکات «ڕاوەستن» بەڵام کەس دەنگەکەی نابیستێ. دیسان دەقیرێنێ «ڕاوەستن»، ئەمجارەشیان کەس نایبینێ. ئەمجار توند شانی هاوکارەکەی تەنیشتی کە هێشتا گوللە دەبارێنێ، دەگرێ و ڕایدەوەشێنێ، پێی دەڵێ «بەسە، بەسە، بەوانەش بڵێ بەسە».

پاش کەمێک گوللەباران ڕادەوەستێ. دونیا دیسان لە تاریکیی شەودا، ئارام دەبێ، دیسان تەنیا دەنگی باران دەمێنێتەوە. هیچ دەنگێکی دی نامێنێ. هیچ جموجۆڵێک، هیچ جووڵەیەک نییە. قامکی باز و ئەوانی دی هێشتا لە سەر پەلەپیتکەی تفەنگەکان چەند خولەکێک بەم شێوە بێدەنگ ڕادەوەستن. پاشان باز دەڵێ: «بچنە ژوورەوە». ئەندامانی ڕیزەکان بەجارێک دەچنە ژوورەوە بۆ ناو هەر سێ خانووەکە. بە دوای ئەواندا بازیش دەچێتە ژوور. ئەو ماڵەی باز چووە ناوی، دوو ژووری

هەیە. لە ژوورەکانەوە بۆنی ئاگر و خوێن و باروووت دێت. لە چەن لاوە ئاگرێکی بچووک هێشتا دەگڕێ و تۆزێک ژوورەکە ڕووناک دەکاتەوە. لێ باز گڵۆپە دەستییەکەی دادەگیرسێنێ و سەیری دەور و بەری خۆی دەکات. بۆنی خوێن و باروووت لووتی پڕ دەکات. دوو ژوورەکە پڕی خوێنە. لە ژووری مەزندا چوار کەس کەوتوون. یەکیان هێشتا گیانی تێدایە و دەناڵێنێ. لە ژوورەکەی دی دا سێ کەس هەن کە دووانیان گیانیان تێدا ماوە. باز دانە دانە بە گڵۆپەوە سەیریان دەکات. جگە لە دووان، ئەوانی دی هەموویان کوڕ و پیاون. سییان لەو حەوتە ژنن. ئەو ژنەی لە ژوورە بچووکەکەدا لە سەر پشت کەوتووە و هیشتا دەناڵێنێ، هەوڵ دەدا کە بتوانێ سەری بجووڵێنێ. پێیەکی پەڕیوە و لە گەردن و کەمەریەوە خوێن دەڕوا. بانی خانووەکە دڵۆپە دەکات و دڵۆپەکانی بێ میچ دانە دانە دێن و دەکەونە سەر ڕوخسار و دەم و چاوی. پێدەچێ لە بەر ئەمە بێت کە حەز دەکات ڕوخساری لە بەر دڵۆپەکان لا بات. ئەو ناتوانێ چاوەکانی بکاتەوە، بەڵام حەز دەکات سەری خۆی بجووڵێنێ. باز بە ئارامی سەری [کچە] دەجووڵێنێ و ڕوخساری هەندێک لە دڵۆپەکان دوور دەخاتەوە. پاشان بە ئارامی لەو دەرگای کە لێی هاتۆتە ژوور، دەچێتە دەرەوە. هاوکارەکانیش بە شوێنیدا. هاوکار لێی دەپرسن: «چی بکەین لە بریندارەکان؟»

باز وەڵام ناداتەوە، سەری هەڵدێنێ و ڕوو دەکاتە باران و بە هەر دوو دەستان، ڕوخساری بە دڵۆپەی باران دەشوا. چەند جاران ئەمە دووبارە دەکاتەوە و پاشان دەڵێ: «بیانکوژن، هەموویان بکوژن...».

# ٧

# بێگانە

لـە شـاری گـەورەی وڵاتـی مـەزن کچێکـی جوانـی خەڵکـی وڵاتـی چیـاکان؛ کۆتـر.

چەنـد مانـگ دوای کۆمەڵکوژیـی ئـەو پـەڕی جیهـان. لـە پایتەختـی وڵاتـی مـەزن. لـە لای کۆتـر. ئێوارە و شـەوێکی زسـتانی شـار. و ئێـوارە و شـەوێکی ژیانـی ڕاوی و بێـژەری ئـەم ڕۆمانـە.

بەڵێ، ئێوارە و شـەوێکی ژیانی من.

تـا ئێسـتا ئێمـە جارێـک لای بـاز و جارێـک لای کۆتـر بوویـن. جارێـک باسـی تاکەکەسـێکمان کـردووە، جارێـک باسـی کۆمەڵێـک. جارێـک ڕۆژ و ڕۆژگاری لـە بیرکراومـان بـە زمانـی داسـتان و چیـرۆک گێڕایـەوە، جارێـک دەنـگ و ئـاوازی بـا بڵێیـن ژیانـی ئەمڕۆمـان، بـە زمانـی ئەمڕۆ گێڕایـەوە. ئێمـە هەندێـک دەنـگ و نەفەسـمان لـەوێ لـە قووڵایـی زەمەنـی ڕابـردوو، هەندێـک هـاوار و ناڵـەی خـەم و ئـازار، یانیـش ئەشـق و خۆشەویسـتیمان لێـرە، لـە بەسـەرهاتی ڕۆژی ئەمڕۆمـان هێنایـە بـەر یـەک – تاوەکـوو یەکیەتییەکـی ئاهەنگدار بـۆ ڕۆمانەکـە سـاز بکەیـن.

ئێسـتاش ئێـوارە و شـەوێکی زسـتانی پایتەختـی وڵاتـی مـەزن، لـە ژیانـی کۆتـر و ژیانـی مـن، ڕاویـی ڕۆمـان تاوەکـوو یەکیەتیـی هاوئاهەنگی

ڕۆمانەکە پێک بێت.

دیسان وەک بەشەکانی پێشوو بە گێڕانەوەی زمەنی نویّ.

ئێمە، کۆمەڵێک نووسەر لە چوار وڵاتی ئەورووپای ڕۆژئاواوە هاتووین و لە پایتەختی وڵاتی مەزنین. ئێمە هەشت کەسین، سیّ ژن، پێنج پیاو. دوو شاعیر، شەش نووسەر. ڕەوشی هاوڕێیانی نووسەر، شاعیر، هونەرمەند، ڕۆژنامەڤان و ڕوناکبیری ئێمە لەم وڵاتە باش نییە. هەندێکیان گیراون و شەو و ڕۆژ و مانگ و ساڵان لە بەندیخانەی تەنگ، تاریک و شێدار بەسەر دەبەن. هەندێکیان لە بەر دەرگای دادگان- دەرگای دادگایەک کە بە ڕووی بەندیخانەدا دەکرێتەوە. هەندێکیشیان پێنووسەکانیان شکاندووە، زمانی خۆیان گریّ داوە و بیّدەنگ، دڵ پڕپەژارە دانیشتوون. هەندێکێش بە دوا تواناییان وەک دۆن کیشۆت، خۆ ڕادەگرن، بە پێی دەرفەتەکان دەنووسن، زۆرجاریش بە شێوەی تانە لێدان دەنووسن و هەندیّ جاریش هاوار دەکەن.

ئێمە هاتوویەنەتە پایتەختی وڵاتی مەزن بۆ ئەوەی ئەو هاوڕێیانەی لە پشت دەرگای زیندانەوەن، ببینین. لای هەڤاڵانی زمان داخستوومان بین، دەنگی ئەوانەی خۆڕاگری دەکەن، ببیستین و پشتگیریی خۆمان پیشان دەین. بەڵیّ بۆ پشتگیری، بەڵام بیّ ئەوەی باش بزانین چ کاریگەرییەکی دەبێت. ئەو ئێوارە و شەوەی ئێستا وەک بەسەرهاتێکی سادە دەیگێڕمەوە، دوا ڕۆژمان بوو لە وڵاتی مەزن. سەر لە ئێوارەی ڕۆژی پێنجەم. کاری ئێمە یان با بڵێین ئەو بەرنامەی دیاریمان کردبوو، بەرەو کۆتا بوو. سبەی کاتێک سپێدەی دا، ئێمە ئەم شارە مەزنە کە هەمیشە پڕە لە دەنگی تێکەڵ، و ئەم وڵاتە مەزنە کە بەردەوام لە ناو ئاڵۆزی و دژواریدایە، بەجیّ دەهێڵین. پێنج ڕۆژە لەم شارەین. پێنج ڕۆژی تێکەڵ و پێکەڵ، دژوار و زەحمەت. پێنج ڕۆژە بەردەوام ئینسانی جودا جودا دەبینین کە بە زمانی فەڕەنسی، بە زمانی وڵاتی مەزن

و بە زمانەکانی دیکەی ئەورووپی دەپەیڤن، گوێ ڕادەگرن و بەردەوام لەم کۆبوونەوەوە بۆ ئەو کۆبوونەوە هەڵدێن. لەم پێنج ڕۆژەدا زیاتر لە سێ سەد کەسمان بینیوە. سێ سەد کەسی یەکجار جودا لە یەکتر؛ هەندێکیان کاربەدەست و کارگێڕی ئیش و کاری دەوڵەت، هەندێک نووسەر، ڕۆژنامەڤان، ئاکادیمیسیەن و ڕووناکبیری ئۆپۆزیسیۆن و دژبەر، هەندێکیش ئالیگر و لایەنگری زیندانییان، سەرهەڵدەر و تێکۆشەر.

ئێمە ماندووین. من ماندووم. بە هەزاران، دە هەزاران، سەد هەزاران قسە و پەیڤی جودا و دژی یەک، دڵ، مێشک و ڕۆحی ئێمە/ منیان داگیر کردووە. لە هەموو جێگەیەک وێنە، پۆرترە و پەیکەری سەرۆکی وڵاتی مەزن، ژەنەڕاڵ سەردار. لە هەموو جێگەیەک، قسەکانی ئەو لە سەر وڵات، میللەت، دەوڵەت، وڵاتپارێزی، شەرەف و نامووس. لە هەموو شوێنێک ئاڵای ڕەنگینی وڵاتی مەزن. من ماندووم.

ڕووداوەکانی ڕۆژی کۆتایی تەواوی توانام دەگرێ؛ نووسەر و ڕووناکبیرێکی ناوداری وڵاتی مەزن لە دادگا، لە پێش چاوی ئێمە، لە بەر قسەکانی، بە سێ ساڵ سزا دەدرێت. نا، سزا نادرێت، سزای بە سەردا دەسەپێت. دانیشتنی کۆتایی دادگاکەیەتی، بەیانی نیو کاتژمێر پێش دەست پێکردنی دانیشتنەکە، ئێمە دەچین بۆ دادگا. ئێمە لە دەرگا، کۆریدۆر و ساڵۆنی دادگادا کە زیاتر لە هەزارتۆ ولابیرێنتێک* دەچێت، ڕادەبووریـن و دەگەینە ئەو ساڵۆنە بچووکەی نووسەرە ناودارەکەی تێدا دادگایی دەکرێت. ئێمە لە پێش دەرگا لە سەر کورسی دادەنیشین و چاوەڕوانی کرانەوەی دەرگا دەکەین. دەرگا ناکرێتەوە، نیو سەعاتی دیکە دەڕوا، دەرگا ناکرێتەوە. بەڵام دواتر نزیک بە کاتژمێر و نیوێک پاش کاتی دەستپێکردنی دانیشتنی دادگا، دەرگا دەکرێتەوە و ئێمە دەچینە ناو ساڵۆنی دادگا. نووسەری ناودار

* بە مانای ڕێگایەکی پێچاوپێچە.

کە تەمەنی نزیکی شەستە، بە باڵایەکی بەرز و جەستەیەکی زۆر لاوازەوە، لێرە لە بەردەمی دەستەی دادوەران، بە پێوە ڕاوەستاوە و سەرباز هەر دوو لایان گرتووە. پشتی لە ئێمەیە و نامانبینێ. ئێمە لە سەر ئەو کورسییانەی لە دواوە ڕیز کراون، بێدەنگ دادەنیشین. ساڵۆن بچووکە، جگە لە دوو دەرگا، ئەوەی ئێمەی لێوە هاتینە ژوورەوە و ئەوەی نزیکی دەستەی دادوەران، هیچ دەرگا و پەنجەرەیەک بەرەو شوێنێک کراوە نیە. بۆنێکی قورسی بۆیاخ لە ساڵۆن دێت. لە بەرانبەر ئێمە و نووسەری ناوداردا، پێنج کەسی دادوەر، هەندێک لە ژووری ساڵۆنەکەوە دانیشتوون. لە سەر دیواری پشتی کۆڕی ژووری، لە ژوور سەریانەوە وێنەیەکی مەزنی ژەنەڕاڵ سەردار بە جل و بەرگی فەرمیی سەربازییەوە هەڵواسراوە و لە ژێر پۆرترە، لە ناو چوارچێوەیەکدا، چەند وتەی ژنەڕاڵ بە دوو زمان، بە زمانی فەرمیی وڵاتی مەزن و فەڕەنسی نووسراوە؛ هەموو شتێک لە پێناو یەکیەتیی وڵات، میللەت و دەوڵەت.

وڵات، میللەت و دەوڵەت سێ وشەن کە لەم پێنج ڕۆژەدا بە هەزاران جارمان بیستووە. لە بەر دەمی دادوەرێک کە لە ناوەڕاستی دەستە و کۆڕی ژووریدا دانیشتووە، چەن دۆسیە هەیە. دادوەر بە ئارامی، چاویلکە لە چاو، پێنووس بە دەستەوە، لە لاپەڕەکان دەڕوانێ. هیچ پەلەی نییە. پێنووسەکەی دەستی ڕاستی بە مێزەکەیدا دەکێشێ و بە ئارامی لە دۆسیە دەڕوانێ. وەک ئەوەی کات ڕاوەستابێ و نەڕوات. بێدەنگییەکی قووڵ زاڵە. کەس ناپەیڤێ، کەس ناجووڵێ و لە دەور و بەری خۆی ناڕوانێ. جگە لە دەنگی پێنووسی دادوەر دەنگێک نایە. پاش چەند خولەک سەری لە سەر کاغەزەکان هەڵدێنێ و لە نووسەر و ئێمە و ساڵۆنی بەتاڵ دەڕوانێ و بە دەنگێکی زۆر ناسک کە مرۆڤ لە دادوەرێکی وەهای چاوەڕوان ناکات، بە زمانی فەرمیی وڵاتی مەزن

کە من و دوو هاوڕێی نووسەری دیکەم لێی تێدەگەین دەڵێ: «بەڵێ، گەیشتینە کۆتایی دۆزەکە، هەر کەس قسەی خۆی کرد، ئێستا سەرەی قسەی ئێمەیە. بەڵام پێش ئەوەی ئێمە قسەی کۆتایی بکەین، ئایا قسەیەکی دیکەت هەیە؟»

دادوەر بزەیەک لە سەر ڕوو، لە نووسەر دەڕوانێ و لێی دەپرسێ.

نووسەر بە زمانێکی ئارام و ڕێزدارانە، بە دەنگێکی قووڵ دەڵێ: «هەرچی پێویست بوو وتم، پێش قسەی کۆتایی ئێوە منیش قسەی کۆتاییم هەیە: پێویستە هیچ کەس لە بەر قسە و بیر و ڕای خۆی نەخرێتە زیندان، سزا نەدرێ و سزا نەبینێ...».

نووسەر پاش قسەکانی بە ڕێزەوە لە سەر کورسییەکەی دادەنیشێتەوە.

دیسان بێدەنگییەک سالۆنی بۆنقورس دەگرێتەوە. ئێمە بێدەنگ لە یەک دەڕوانین، بە ڕاقەوە لە دەوری خۆمان و لە دادوەران دەڕوانین. دادوەری ناوەڕاست دیسان دۆسیەکانی دەکێشێتە بەر دەستی ، یەکیان دەکاتەوە و لێی دەڕوانێ، چەند خولەکێک. ئەمجار ئەنگوستەکانی دەستی ڕاستی بە سمێڵەوە، لە لاپەڕەکانی دۆسیە ورد دەبێتەوە. کات دیسان ڕادەوەستێ، دەتوانرێ چرکە، خولەک بێتە ئەژماردن. ئەو دادوەرەی سەیری دۆسیەکە دەکات، ئێستا بیر لە چی دەکاتەوە، چ هەستێکی هەیە؟ ئەو دادوەرانەی دی کە بە نیگایەکی بێ واتا، جارێک لە ئێمە و جارێک لە نووسەر دەڕوانن، ئێستا چ هەستێکیان هەیە؟ سەرباز؟ ئەی نووسەر؟ ئێمە؟ هەستی زیندانییەک کە لە هەموو مافەکانی قسە کردن و نووسین بێبەش کراوە، ناچاری ژیانێکی تاریک، تەنیا و تەنگ بووە، چیە؟ هەستی دەسەڵاتێک کە ئێستا سزای زیندان بە سەر کەسێکدا دەسەپێنێ چییە؟ هەستی کەسانی وەک ئێمە کە ئێستا دڵیان بۆ نووسەری گیراو لێدەدا، بەڵام خۆیان

دەستبەسەر نین و تەنیا بینەرن، چییە؟

پاش ماوەیەکی درێژ، دادوەر خۆی بۆ لای ڕاست ڕادەکێشێ و لەگەڵ دوو دادوەرەکەی لای ڕاست بە دەنگێکی زۆر نزم کە ئێمە نایبیستین، دەپەیڤێ، پاشانیش لەگەڵ دادوەری لای چەپ، دوای چپە چپێک، دادوەر دەڵێ؛ «بڕیار» و بە وتنی بڕیار، ئێمە و نووسەر هەموو تێکڕا هەڵدەستینە سەر پێ. دادوەر بە وشەی تایبەتی و کەونارای حقووقی، بە ڕستەی درێژ کە مرۆڤ تێیان ناگات بڕیار دەخوێنێتەوە. ئەو باسی وتارێکی نووسەر، هەندێک یاسا، پاڕاگرافی یاسا، دادپەروەریی سیستەم، ڕێکخستن، وڵات، میللەت و دەوڵەت دەکات. من باش تێناگەم کە چی دەڵێ، بەڵام لە کۆتایی قسەکانیدا، دوو پەیڤی زوڵاڵ هەیە کە باش فام دەکرێ؛ سێ ساڵ.

بڕیار؛ سێ ساڵ سزا بۆ بیر و ڕای جودا، سێ ساڵ ژیانی بەند کراوی و زیندان. نە ژیانێکی ئاسایی کۆمەڵایەتی، نە ژن و منداڵ، نە دۆست و هاوڕێ، نە نووسین و خوێندن، نە قسە و پەیڤین. نە گەشت و گەڕان، نە هاتن و چوون، نە خواردن و خواردنەوەیەک کە مرۆڤ خۆی هەڵیبژێریت. نە هەتاو و نە ڕۆژ، نە مانگ و نە شەو، نە باران و نە بەفر، نە گەرما و نە تیرێژ. نا، تەنیا زیندان. تاریکیی زیندان. سێ ساڵ، سەد و پەنجا و شەش هەفتە، هەزار و نەوەد و دوو ڕۆژ تەنیایی زیندان. بڕیار واتا فەرمان، واتا سزا، یانی بێ تەحەمولی.

بڕیار؛ چەند وشەی سارد، بێڕۆح و بێ هەستی دادوەرێک کە نووسەرێک سزا دەدات، چەند وشەی فەرمی کە بە گوێرەی تێڕوانینی ڕەسمی، نووسەرێک سزا دەدەن.

دوای بڕیار، دادگا کۆتایی دێت. بەڵام کاتێک سەرباز دەخوازن نووسەر ببەن، ئەو بەرەو لای ئێمە هەڵدەگەڕێتەوە و بە سەر، خەندەڕوو، سڵاوێک لە ئێمە دەکات. ئێمە وەڵامی سڵاوەکەی دەدەینەوە — بێ

ئـەوەی خەنـدە لـە ڕوومـان بێـت، یـان شـتێک بڵێیـن، یانیـش هێمایـەک بدەیـن. ئێمـە نازانیـن کـە چـی بکەیـن، ماتمـاو، شـڵەژاو، تەنیـا سـڵاوێکی لێدەکەیـن. بێچـارە، دۆش دامـاو، تەنیـا سـڵاوێکی نـەرم.

ئێسـتا لـە ژووری بچووکـی هۆتێلێکـی گـەورەی پایتەختـی وڵاتـی مـەزن، لـە سـەر تەختـی نووسـتن، شـپرزە، ڕاکشـاو، بیـر لـەو خەنـدە نەرمـەی نووسـەری زیندانـی دەکەمـەوە. دیسـان بێچـارە. بێـزار. دۆش دامـاو. ئـەو خەنـدە... ئایـا هێمـای هێـز و توانایـە؟ بڕوایـە؟ شـەرەفە؟ ئارامیـی ئەخلاقییـە؟ خۆشـحاڵیی بینینـی ئێمەیـە؟ هێمـای دۆسـتی و پشـتگیریی نێـوان نووسـەرانە؟ یانیـش خەندەیەکـی ناسـک و بێـزارە کـە لـە بێچارەیـی سـەرچاوەی گرتـووە؟ لـە تووڕەیـی و دەرد و خەمـەوە هەڵدەقوڵـێ؟ هێمـای هەسـت و سـۆزی ئاڵـۆزە؟ خۆزگـە دەرفـەت دەبـوو کـە مـرۆڤ لەگـەڵ نووسـەر لـە سـەر ئـەو پێکەنیـن و خەنـدە قسـەی دەکـرد. خۆزگـە. بـەڵام نووسـەر ئێسـتا دوورە، لـە پشـت دەرگای بەندیخانەیـە، لـە زیندانـە، منیـش لێـرەم، لـە ژووری کەمێـک فێنکـی ئـەم هۆتێلـە. سبەی لـە سـپێدەدا ئـەم وڵاتـە بەجـێ دەهێڵـم و دەگەڕێمـەوە، دەڕۆم. نووسـەر دەمێنێتـەوە.

دیـوارە سـپییەکانی ژوورەکـە دەدرەوشـێتەوە. وەک بڵێـی دیـوار و ڕەنگـی دیـوار شـەپۆل دەدات و خـۆی دەجووڵێنـێ. وەک بڵێـی دیواریـش دەپەیڤـن و ئـەو باسـانەی لـەم پێنـج ڕۆژەدا بیسـتوویانە دووبـارەی دەکەنـەوە: هـاوکاری، پشـتگیری، ئـازادی، سەربەسـتی، مـاف، حـەق، حقـووق، دادپـەروەری، شـەڕ، پێکـدادان، سـەرهەڵدەر، جـەردە، وڵات، میللـەت، دەوڵـەت، یاسـا، سیسـتەم، مرۆڤایەتـی... و ئەدەبیـات، هێـز و توانـای ئەدەبیـات و ئافرانـدن، نووسـەر و بەرپرسـیارێتیی نووسـەر، ڕۆمـان، توانـای ڕۆمـان. لـە وڵاتێکـی وەهـا ئاڵـۆز و یـەک دەنگـدا سـەختییەکانی خولقاندنـی بەرهەمێکـی ئەدەبـی... لـەم سـەر لـە ئێـوارە دڵگیـرەدا وەک دیـوار بـە سـەر منـدا دێـن و بـەم قسـانەی کـە لـە خـۆوە دەوری منیـان

تەنیوەتەوە، هەناسەم لە بەر دەبڕن. خۆم دەسپێرمە تاریکی و چاوم دەبەستم. بەڵام کەڵکی نییە، بێسوودە، قسەکان لە دەور و پشتم ئۆلان دەدەن، ئەو ناسکە خەندە، وەک حەڵقەکانی شریتی فیلمێک، دیمەن بە دیمەن، لە خەیاڵمدا دەڕوا و دێ، دەڕوا و دێ.

من تەنیا ماندوو و دۆش داماو نیم، بە تەنیا هەناسە لێبڕان و هەستی بێپایانی بێچارەیی دڵی منیان داگیر نەکردووە، بەڵکوو ترسیش هەیە. من دەشترسم. من تەنیا لەم ژوورەدا. ژووری هاوڕێکانم لە تەنیشت ژوورەکەی منە. من بەیانی دەڕۆم. بەڵام دەترسم. وەک بڵێی کەوتوومەتە بەر شەپۆلی کابووس و مۆتەکەیەک. ترسێکی بێ پێناسە، ئەگەرچی ناشخوازم وەها بێ بەڵام دەقە بە دەقە لە دەروونمدا گەورە دەبێ.

چاوەکانم دەکەمەوە، هەندێک خۆ کۆ دەکەمەوە، لە بەر ترس دڵم بە خۆم دەسووتێ. لە شووشەی ویسکی سەر مێزی کەناری تەختی نووستن، قەدەحێک تێدەکەم و بە دووجار لە سەر یەک دەیخۆمەوە. وەک بڵێی پزیسکێکی ئاگر بە گەروومدا دەچێتە خوار، ئاوا قورگ و گەرووم دەسووتێنێ. دوای دڵۆپی ئاگر، کتێبی تەنیشت شووشە ویسکییەکە هەڵدەگرم. کتێبێک کە زۆر لە مێژە دەیخوێنمەوە، ڕۆمانێکە. بەڵام لاپەڕەکانی ئەم ڕۆمانە کە بە خۆشحاڵییەوە و لە سەر هاتنەوەی ئۆدیسە بە گێڕانەوەی هۆمێرۆس پێکهاتووە، هیچ یارمەتییەکم نادات. لاپەڕەکان ناتوانن من لەو دەنگانە، لەو خەندە ناسکە، لە بەسەرهاتی ئەو پێنج ڕۆژەم و لە ئەم ترسەی کە هەناسەی لە بەر بڕیوم، دوور بخەنەوە. نە حەسرەت و تووڕەیی ئۆدیسە، نە پەژارە و ئاخ هەڵکێشانی پەنەلۆپ، نە هەست و ویستی تەلەماکۆس و نە گێڕانەوەی بێپایانی هۆمێرۆس و نووسەری ڕۆمان، ناتوانن من لە داوی شک و پەژارە ڕزگار بکەن.

من لاپەڕە سارد و بێدەنگەکانی ڕۆمانەکە دەبەستم و هەڵدەستمە سەر پێ. کاتێک دەچمە بەر پەنجەرە و لەو ڕووبارەی هەندێک دوورە لە من، بەڵام بە پێشمدا دەڕوا، دەڕوانم، هەست بە شتێک دەکەم؛ من هەرچی بکەم ناتوانم خۆم لەم هەستانەی ئەم وڵاتە دوور بخەمەوە. هەر بۆیەش بە پێچەوانەی هەڵهاتن و دوور کەوتنەوە، پێویستە هەمیشە بە سەر ئەو قسانە، ئەو ڕووداوانە و ئەو ترسەدا بچم تاوەکوو بتوانم لێیان تێبگەم. و ئەو کات، کاتێک لێیان تێگەیشتم پێدەچێ ئەو ترسە بگۆڕدرێ بۆ هیوایەک، پێدەچی ئەم بێزارییە، ڕووناکییەک پێک بهێنێت... کێ دەزانێ!

بەڵام پێویستی بە هەوڵدانە. پێویستی بە سەبر و ئارامییە. جەسارەت و ئازایەتی، هەندێک ئازایەتی دەوێ تاوەکوو بتوانم خۆم بگەیەنمە قووڵایی ئەم پێوەندی، ڕووداو و قسانە. یان با بڵێم؛ هەندێک جەسارەت پێویستە، تاوەکوو ئەو هەموو پێوەندی، ڕووداو و وتانە بتوانن بە ئاسانی خۆیان بگەیەننە قووڵایی دڵ و مێشکی من.

هەتاو لە پشت پەڵە هەورێکی قورس، بەرەو ئاوابوونە. تیشکە بێزارەکانی بە هەزار زەحمەت سەر دەردێنن و خۆیان دەگەیەننە ڕووبار و ڕەنگێکی زیوین دەدەنە ڕووباری کەونارای شار. لە بولواری کەنار ڕووباردا ئۆتۆمبیل بە چرای داگیرساوەوە دێن و دەچن. دونیا تاریک دەبێ و دوایین ئێوارەی من لەم شارە دەست پێدەکات.

دەگەڕێمەوە پێش مێزە بچووکەکە و دیسان قەدەحەکەم پڕ لە ویسکی دەکەم و دێمەوە بەر پەنجەرە. وێنەکەم بە هاوکاریی گڵۆپی ناو ژوورەکە، بە سەر پەنجەرەوە دیارە. پاش چەند قومێک، لە وێنەی سەر پەنجەرە دەڕوانم و بە دەنگێکی بەرز و کەمێکیش تووڕە دەڵێم: «ترسەنۆک، سەیرێکی خۆت بکە، وەرە سەر خۆ... تۆ چیت لەم مرۆڤانە، لەو نووسەرە زیاتر؟ دەی بڵێ ترسەنۆک!» وێنەی ئەو

بەر پەنجەرە لە من دەڕوانێ، بەڵام سەیرە، ئەو بە بزەوە لە من دەڕوانێ. من دەڵێم؛ «کەواتە ئێمە پێک هاتین» دوا تنۆکی ناو قەدەحەکە دەخۆمەوە و بەرەو حەمام دەچم».

بەرنامەی ئەم ئێوارەیەمان لە دوو بەش پێک دێت؛ سەرەتا لە کۆنسولخانەی وڵاتێکی ئەورووپی کە میوانداریی ئێمە لە وڵاتی مەزن دەکات، شێو دەخۆین. دواتریش ئێمە و مۆسیقار و گۆرانیبێژێکی ناوداری وڵاتی مەزن کە من و دوو هاوڕێم دەیناسین، پێکەوە دەچینە ئەو بارەی کە ئەو گۆرانیی تێدا دەڵێت.

نزیکەی شەست کەس لە نووسەر، ڕۆژنامەڤان، پارلەمانتار، دیپلۆمات، سیاسەتمەدار و پارێزەر لە میوانیی کۆنسولخانەدا کۆ بوونەتەوە. سالۆنە گەورەکەی کۆنسوولخانە بۆ نان خواردن ئامادە کراوە. گڵۆپی جوان و ئاوێزەی کریستاڵ داگیرساون. لە سەر مێزەکان کە بە ڕێک و پێکی ڕیز کراون، سینیی زێڕ نەخش کە هێمای پاشای وڵاتیان بە سەرەوەیە، دەدرەوشێتەوە. مۆمی سپیی درێژ هەڵ کراون، گڵۆپی بچووکی سەر تابلۆی پاشا و گەورەکانی دیکەی وڵاتی میواندار، ڕەنگێکی تێکەڵ و جوان دەڕژێننە سەر تابلۆکان. گارسۆنەکان سینیی بچووکی خواردنەوەی جودا جودا بە دەستەوە، بە ناو میوانەکاندا دەگەڕێن و میوان بە جل و بەرگی خاوێن و ڕازاوەوە، قەدەحی خواردنەوەی جیا بە دەستەوە، بە پێوە و پێکەوە دەپەیڤن. شێو کە بە شێوەی ئەورووپا ساز کراوە، بەم جۆرە دەخورێ. پاش خواردن کاتێک میوان دیسان قەدەحی کۆنیاک، ویسکی، ڤۆدکا و جۆرەکانی دیکەی خواردنەوە، بە دەستەوە دەگرن، باڵوێزی باڵابەرزی خەندەڕوو بە وشەی بژاردەی گوتارێکی کورت، باسی سەردانی ئێمە بۆ وڵاتی مەزن دەکات، دوای سەفیر هاوڕێیەکی وەفدەکەی ئێمە، ڕێز و سپاسی ئێمە هەموومان، پێشکەشی سەفیر، میوانانی ئامادەبوو، ئەو کەسایەتی

و ڕێکخستنانەی هاوکاریی ئێمەیان کردووە، دەردەبڕێ و باس دێنێتە سەر ئەو نووسەرەی ئێستا لە کونجێکی تاریکی بەندیخانەدایە. ئەم هاوڕێمان قسەی خۆی بە دوایین وتەکانی نووسەر کۆتایی پێدێنێ؛ پێویستە هیچ کەس لە بەر قسەکانی سزا نەدرێ...

شەو درەنگان دوای ئەوەی زۆربەی میوانەکان دەڕۆن، ئێمە ماڵئاوایی لە سەفیر و کەسانی دیکەی ناو باڵوێزخانەکە دەکەین و وێڕای سترانبێژ کە ئەمشەو لەگەڵمان بوو، دێینە دەرەوە، بۆ شەوی سامالّی پایتەختی وڵاتی مەزن.

شار ساردە. هەورەکانی سەرەتای ئێوارە هەندێک بڵاو بوونەتەوە. هەندێک ئەستێرە دیارن. کۆڵان، شەقام و بولواری گەورەی پایتەخت، بە شەوقی گڵۆپەکان ڕووناکن. ئۆتۆمبیل و تاکسی بە دەنگی تیژ درز دەخەنە بێدەنگیی شەو و دەڕۆن. چەند کەسی ڕێبوار و پیادە بە پاڵتۆ و مانتۆوە لە کەناری کۆڵانەکان بە خێرایی دەڕۆن. ئەو بارەی سترانبێژ، سترانی تێدا دەڵێ، لە کونسولخانەکەوە دوور نییە. ستران بێژ حەز دەکات بە پێ و بە دەم پیاسەوە بڕۆین. لە شەوی غەریبی پایتەختی غەریبدا، ئێمە دەکەوینە ڕێگە. بە هەنگاوی خێرا. مەراق، ترس، ماندوویەتی و دڕدونگی بە سەر ڕوخسارەوە. ئێستا کات وەک کاتی دادگا نییە؛ کات ئێستا خێرا دەڕوا. خولەک، کاتژمێر دەڕۆن. ئێمە دەڕۆین.

کاتێک بە بەر دەرگای هۆتێلەکەدا ڕادەبووریـن چوار لە هاوڕێکانمان لە ئێمە دادەبڕێن و دەگەڕێینەوە بۆ هۆتێل، ئێمە، ئەوانەی ماوینەتەوە، گۆرانیبێژ لە پێشەوە و ئێمەش بە دەورییەوە، دەچین بۆ بار. بار دوو نهۆمە. نهۆمی خوارەوە وەک ڕێستورانتە، گەلێک کەس بە دەوری مێزە بچووکەکانەوە دانیشتوون و نان دەخۆن. قاتی سەرەوە بارە. بارێکی زۆر گەورە، پڕپڕە، بە سەدان کەس لە دەوری مێزە بچووکەکان

دانیشتوون یان لە پێش بار بە پێوە ڕاوەستاون. هەوای ناو بار یەکجار قورسە، دووکەڵی جگەرە و هالاوی هەناسەکان تێکەڵی یەکدی بوون. قاتی سەرەوە وەک قاتی خوارەوە ڕووناک نییە. ڕووناکییەکی بێزار لە گۆشەکانی بارەوە بە زەحمەت، بار ڕۆشن دەکەنەوە. کاتێک ئێمە دەچینە ژوورەوە و چاوی ئامادەبووان بە سترانبێژ دەکەوێ، دەست بە چەپڵە دەکەن. سترانبێژ هەر دوو دەستی هەڵدێنێ و سڵاو لە حەشیمەتەکە دەکات. من لە هاتنەکەم پەشێمان دەبمەوە، بەڵام ئیتر ناکرێ بگەڕێمەوە. ئێمە بەرەو ئەو مێزەی بۆمان تەرخان کراوە، دەچین. مێزێکی گەورە و خڕ لە گۆشەیەک چاوەڕوانی ئێمەیە. دوای ئەوەی دانیشتین، گارسۆن هەندێک شووشەی خواردنەوە و چەند پیاڵەیەک دێنن و سەر مێزەکە دەڕازێننەوە، کەسێک لە مەیدانی بارەکە ناوی سترانبێژ دەخوێنێتەوە. سترانبێژ هەڵدەستێ، بە ناو چەپڵە و دەنگەکاندا بەرەو مەیدانەکە دەڕوات. ئۆرکێستراکەی چوارکەسی بە ئامێری موزیکەوە لەوێن. دوای چەپڵە و دەنگەکان، سترانبێژ دەست بە گۆرانی دەکات. بە زمانی وڵاتی مەزن. بە دەنگێکی یەکجار گوڕ، بە ڕیتمێکی شاد و بە وشەی ئەدەبی.

سترانبێژ دەخوێنێ. چاوە گەورەکانی دەبەستێ، بەژنی کورت و خڕی دەهەژێنێ، ڕیش و سمێڵی پڕی دەجمن. ڕوخساری ئەسمەری خوار و ژوور دەکات. هەر دوو دەستی بە مایکرۆفۆنەکەوە وەک ئەوەی لە سەرخۆ چووبێ، سترانبێژ ستران دەڵێ. ئێمە گوێمان لێگرتووە. حەشیمەت گوێیان لێگرتووە. ئەو قیرە قیرەی پێش کەمێک، ئێستا نەماوە. بێدەنگییەکی قووڵ، ئارامییەکی بەهێز باڵی بە سەر سالۆنەکەدا کێشاوە. سترانبێژ کە پێشتر یاریی بە وشەی سووک و هەندێک جاریش ناماقووڵ دەکرد، ئێستا بووەتە مرۆڤێکی تر. مرۆڤێک کە هیچ پێوەندییەکی لەگەڵ ئەم سالۆنە، ئەو مرۆڤانە و ئەو دونیایەدا

نییە، هیچ قسەیەکی ژیانی ڕۆژانە لە زاری نایەتە دەر. مرۆڤێک کە کەوتۆتە ناو جیهانی قسەی هونەری و لەو دەنگانەی ڕاستەوخۆ دەگەنە دڵی، سازی دەکات. چاوی ماندوو و مێشکی ماتماوی منیش لەم گۆڕانکارییە سەیرە، سووڕ دەمێنێ. بە دەنگێکی یەکجار نزم بە هاوڕێکەم دەڵێم: «مووزیک، سەیری هێزی مووسیقا و هونەر بکە».

هەموو چاو و گوێیان لێیەتی. سترانبێژ گۆرانی دەڵێ.

تا کەی هەر دەڵێ، نازانم. بەڵام دوایی، پاش ماوەیەکی درێژ و گۆرانیی زۆر درێژ، سترانبێژ، ئاهەنگی وتنەکەی ئارام دەکاتەوە، هێدی هێدی گۆرانی تەواو دەکات و بە خەندەوە چاوەکانی دەکاتەوە. سترانبێژ دیسان دەگەڕێتەوە ئەو دونیای ئێمەی تێداین. شەپۆلی چەپڵە دەست پێدەکات. و ماوەیەک بە هێز، درێژەی هەیە. پاشان سترانبێژ چەپڵەکان دەبڕێ و دەڵێ: «ئەمشەو چەند هاوڕێی نووسەریش لەگەڵ ئێمەن» و یەک بە یەک ئێمە دەناسێنێ.

سترانبێژ دێت و لای ئێمە دادەنیشێ. من ئێستا زۆر باشتر ئەو دەناسم. زۆر باشتر هەست بە هونەرەکەی دەکەم. خەڵک دێنە بەر مێزەکەی ئێمە و پیرۆزبایی لە سترانبێژ دەکەن، لەگەڵی قسە دەکەن، پاش کەمێک کچێکی باڵابەرزی قژ درێژ دێ. سەرەتا پیرۆزبایی لە سترانبێژ دەکات، پاشان ڕوو دەکاتە من. لە بەر دەمم ڕادەوەستێ، دەستی ڕاستی درێژ دەکاتەوە و بە بزەیەکەوە دەڵێ «بۆنسیۆر»، پاشانیش بە زمانی وڵاتی مەزن بەردەوام دەبێ: «من ئێوە دەناسم، ڕۆمانەکەی ئێوەم خوێندۆتەوە».

بەڵێ، ڕۆمانەکەی من، «مێژووی ئەشقێکی پڕ پەژارە» کە ئەوینی کەسێکی لە بیرکراو بە ژێر بەرگی مێژوویەکی کۆندا دەگێڕێتەوە، ساڵێک پێش ئێستا وەرگێڕابۆوە و لە وڵاتی مەزن چاپ و بڵاو کرابۆوە. بەڵام من چاوەڕوان نەبووم کە ئەمشەو کەسێک بێت و باسی ئەو

ڕۆمانە بکات. من هەندێک مات لە کچەکە دەڕوانم و دەڵێم «سپاس، سپاس بۆ خوێندنەوەکەت». من نازانم دەبێ چی بڵێم و هیچ قسەیەک بە زارمدا نایە.

بە شوێنیدا دەڵێ؛ «زمانی ئێوە زۆر خۆشە، بەڵام چەند تێبینییەکم لە سەر ناوەرۆکەکەی هەیە» بەڵێ ئەو حەز دەکات قسە بکات. من دەڵێم: «فەرموو، وەرە دانیشە» و کورسییەکەی هاوڕێیەکەم کە چۆتە ئاودەستخانە، نیشان دەدەم. ئەو دادەنیشێ.

لەگەڵ دانیشتن دەڵێ «ئەوین، ئەوین، ئێوە باسی ئەوین دەکەن، ئەوینی کەسێک، کەسێک کە لە پشت تەم و مژی مێژووەوە ماوەتەوە، ئێوە باسی ئەوین دەکەن و خۆتان دەسپێرنە مێژوو...».

لە زاری من تەنیا وشەیەک دێتە دەر، دەڵێم بەڵێ و لە ژێر ڕووناکییەکی کەمدا، بە وردی سەیری دەکەم. کچەکە گەنجە. تەمەنی با بڵێین لە دەور و بەری بیستساڵە. چاوی گەورە و یەکجار جوانی لەگەڵ ئەو ڕووناکییە بێزارەش، دەدرەوشێتەوە. چاوەکانی، قژی درێژی و نیگای ئارامی سەر ڕوخساری، پەیتا پەیتا، سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێ. دیسان دەڵێ؛ «ئەوین، ئەوین، ئەمڕۆ، لەم وڵاتە بە هەموو توانای خۆی، بەهەموو شێوەکانی، دێتە ژیان کردن. پێویست ناکات کە مرۆڤ خۆی بسپێرێتە مێژوو و بگەڕێتەوە ناو لاپەڕە زەردهەڵگەڕاوەکانی مێژوو...».

من هەندێک پێدەکەنم و دەڵێم: «لەم پێنج ڕۆژەدا لێرە، گەلێک قسەی ئەوینمان بیست، ئێمە ئەوەندەمان گوێ لێبووە کە پێم وابێ تا ماوەیەکی درێژ ئیدی وشەی ئەوین لە زارم نایەتە دەر».

ئەو نیگای لە سەر قەدەحەکەی من لە سەر مێزەکە، دەڵێ: «ئێوە نە گوێتان لە قسەی ئەوین، بەڵکوو گوێتان لە درۆکان گرتووە، هەرچی وشە لەم پایتەختە هەیە، درۆیە. پێویستە ئێوە گوێ نەدەنە

ئەوانە. ئەوین لەوێ، لە شوێنێکی هەرە دووری ئەم وڵاتە، لە پشت ئەو چیا سەرکەشانە ئامادەیە، من باسی ئەو ئەوینە دەکەم، نەک درۆکانی ئێرە... و لەوێ نەک هەر ئەوین، مێژووش، ئەو مێژووەی ئێوە ئەوەندە حەزی پێدەکەن و ئەوەندەش باسی دەکەن، ئەمڕۆ لەوێ ئامادەیە، لەوێ...».

من تێدەگەم، دەڵێم «ئایا شتێک ناخۆیتەوە؟»

«نا، سپاس»

«کەواتە تۆ خەڵکی ئەوپەڕی وڵات، خەڵکی وڵاتی چیای؟»

«بەڵێ» لە من دەڕوانێ و دەڵێ «من خەڵکی ئەوێم... خەڵکی وڵاتی لە بیرکراو... ئێوە هاتوون بۆ ئێرە و ئێستا گوێ لە درۆی ئەم شارە دەگرن. سبەی، دوو سبەی ئێوە دەگەڕێنەوە و دەڕۆن و دیسان دەکەونە ناو لاپەڕە تۆز گرتووەکانی مێژوو و چیرۆکی ئەوین و مێژوو دەڵێنەوە... بێ ئەوەی ئەم وڵاتە لەبیرکراوەتان بیر بکەوێتەوە، بێ ئەوەی سەرنج بدەنە سەر ئەو ئەوین و مێژووەی ئەمڕۆ، بە خوێن، بە هەموو شێوەکانی توند و تیژی، ئامادەیە... ئەوینیش، مێژوویش، لەوێیە، لە ناو خوێندایە، بە خوێن ئاو دەدرێن... من حەزم کرد ئێوە ئاگاتان لەمانەش بێ...».

من هەوڵ دەدەم سەرنجی ماندوو و بڵاوم بدەمە سەر قسە پڕ و بەهێزەکانی. زۆر بە وردی لێی دەڕوانم. هەندێک لە نیگاکانم بێزار دەبێ. دەپرسم: «ناوت چییە؟» «لەم شارە چ دەکەی؟»

«ناوی من گرنگ نییە. ویستم هەستەکانی ئەو کاتەی کە ڕۆمانەکەتانم خوێندەوە، بۆتانی باس بکەم. ناوی من با بڵێین: خوێنەر، خوێنەریکی ئاماتۆری ئێوە».

بێزار دەبێ، سەیری دەور و پشتی خۆی دەکات، دەڵێ: «خوێندکارم، زمان و ئەدەبیاتی فەڕەنسی دەخوێنم»، هەڵدەستێ، دەخوازێ بڕوا.

پێدەچێ لە هاتن پەشیمان بووبێتەوە.

من دەڵێم: «پەلەت چییە؟» «ناکرێ ڕۆمان وەک ئاوێنە ببینی، وەک ڕاستیی زمانی کۆمەڵگا لە قەڵەمی بدەی... ڕۆمان، ئەدەبیات لە باشترین حالەتدا یۆتۆپیایە، خەونێکی دەرفەتی ڕاستییەکانە. وانییە؟

ئەم پرسەی دواییم بە ئەنقەست دەپرسم تاوەکوو دانیشێتەوە.

من سەرکەوتوو بووم، دیسان دانیشت. «یۆتۆپیا، خەون...» قسەکانی من دووبارە دەکاتەوە. «بەڵام یۆتۆپیا و خەون نابێتە هەست، دەنگ، ئاواز، تووڕەیی، ڕەنج، پەژارە، خۆشحاڵی، گریان، بەکورتی نابێتە ژیان؟»

«ئەمە چ ئەدەبیاتێکە کە بێ ژیانە، ژیانی تێدا نییە ، نازی؟ ئەدەبیات چییە؟ ئەگەر ئەدەبیات نەتوانێ ببێتە سترانی ژیان و ڕووناکی، کەواتە مانای ئەدەبیات چییە؟... ئەگەر ئەدەبیات نەتوانێ ڕۆح بکات بە بەر وشەکاندا، وشەکان نەکاتە خاوەنی ژیان و بە یارمەتیی وشەی ژیندار، باسی ژیان نەکات، کەواتە ئەدەبیات بۆ چییە؟ بە بڕوای من لە گەڵ ئەوەش ئەرکی ئەدەبیاتی ئەمەیە». هەندێک شتی دیکەش دەڵێ، بەڵام من باش تێناگەم. مووسیقایەکی بەرز دەست پێدەکات. گرووپێک لاو هاتوون و دەوری سترانبێژیان گرتووە و بە پێکەنینەوە لەگەڵی قسە دەکەن. قسەکانی کچەکەم باش پێناگات. سەرم هەندێک لەو نزیک دەکەمەوە، بۆنێکی خۆشی لێدێ، خۆی دەکێشێتە دواوە، بەڵام قسەکانی درێژە پێدەدا.

بەڵام هاوڕێکەم، ئەوەی خاوەن کورسییەکە، هاتەوە. کچە قسەکانی دەبڕێ و هەڵدەستێ. وا دیارە بە هاتنەوەی هاوڕێکەم خۆشحاڵە. دیسان دەستی ڕاستی دەدات بە دەستمەوە و بە فەرەنسی ماڵئاواییم لێدەکات «ئاو ڕیڤێور». هەڵدەستمە سەر پێ، دەڵێم من دەمویست گوێتان لێبگرم، بەڵام...» ئیدی چی بڵێم؟ کچە بزەیەک لە سەر ڕوو،

ئەمجار بە سەر ماڵئاوایی دەکات و دەگەڕێتەوە بە هەنگاوی ئارام، قژی درێژی لە سەر شان و مل پەخش، دەڕوا، بە کەناری بارەکەدا ڕادەبرێ، دەگاتە ئەو لای بارەکە و ون دەبێ.

قسەکانی ئەو کچە کە بە پەلە پەل ڕۆیشت، هێشتا لە هۆشمدایە، دەگەڕێمەوە لای هاوڕێیانی سەر مێزەکە. زگی قەڵەوی سترانبێژ هەڵدەخاتەوە و پێدەکەنێ. هاوڕێیانی دیکەش هەوڵ دەدەن دەنگیان بە یەکدی بگات. مووسیقا بە گرمە گرم بەردەوامە. وەک بڵێی من لێرە نەبم، کەس بە دەورمەوە نییە، یان با بڵێم لێرە من تەنیام. قەدەحە خاڵییەکەم لە شەرابی سپی پڕ دەکەم، لە شەپۆلە بچووکەکانی ناو قەدەحەکە دەڕوانم و بیر لە قسەکانی کچە دەکەمەوە. لەم پێنج ڕۆژەدا قسەی ئاوەهام نەبیستبوو. قسەکان خۆشحاڵم دەکەن. نا، خۆشحاڵ وشەیەکی بەجێ نییە، قسەکان وا دەکەن بیر بکەمەوە. هێزی وشەکان، جوانییەکەیان، توانای دەربڕینیان، گێڕانەوە، بە قەناعەت گەیاندن، پێوەندی و گفتوگۆ، واتا جیاوازەکانیان. بابەتی ئەوین... وشەی ئەوین کە خەڵکی ئەم شارە بە کاری دێنن و ئەو ئەوینەی کچەکە ئێستا باسی دەکرد. چاوانی پڕ کلی و [نیگای] قووڵی، یەکجار قووڵی، بێگومان ئەوین دەبینێ. بێگومان ئەوینێکی تایبەتیی هەیە، ئەوینێکی جیاواز. و قسەکانی لە سەر ئەدەبیات... ڕەخنە؟ هەستێکی تاریکی شکاندنە؟ پەندە؟ تەنیا چاوەدێرێکی ئەدەبییە؟ هەست و جۆشی کچێکی کاڵە؟ جۆشی گەنجییە؟ ویستێکی تایبەتییە؟ تکا و ڕجایە؟

نازانم چەندە کات تێپەڕیوە، بەڵام بە دەنگی سترانبێژ دیسان دەگەڕێمەوە ناو بار، دەوری مێزەکە. پەنجەم لە سەر چاوی ڕاست، چاوم لە بەر دووکەڵی جگەرە دەکزێنێتەوە. سترانبێژ دەپرسێ کە ئایا من برسیمە. دەڵێم: «نا». نا من ماندووم، من گێژم، ماتم، شڵەژاوم.

دەمهەوێ بگەڕێمەوە بۆ هۆتێل. یەک لە هاوڕێکانیشم دەخوازێ. ئێمە هەڵدەستین. ستران‌بێژ دەیهەوێ ئێمە ببات بۆ هۆتێل. بەڵام هۆتێل نزیکە. لێرە ئێمە ماڵئاوایی لێدەکەین، ڕێز و سپاسی خۆمان دەردەبڕین و خێرا لەم قیرە قیرەی دەنگەکان هەڵدێین. لە دەرەوە، لە بەر درگای بارەکە، بایەکی ساردی شەختەبەند، وەک خەنجەر، ڕوخساری من دەبڕێ. من دەلەرزم. قۆپچەکانی پالتۆکەم دادەخەم، هەر دوو دەست دەکەم بە گیرفانی پاڵتۆدا، سەر بەرەو خوار، هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشم. من و هاوڕێکەم بەرەو شەقامی مەزن دەکەوینە ڕێ. ئێمە قسە ناکەین. نە من و نە هاوڕێکەم حەز ناکەین قسە بکەین. ئەو شتانەی بیری لێ بکەینەوە یەکجار زۆرن. دونیا دیسان تاریکە، هەور ئاسمانی گرتۆتەوە، ئەستێرە بە دەرەوە نین. حەشیمەتێکی زۆر لەو کۆڵانەدایە کە ئێمەی لێین. ئێمە بەهەنگاوی ئارام بەرەو شەقام دەڕۆین. ئێمە لە سووچی کۆڵانەکەوە هەڵدەگەڕێین و ڕوو لە هۆتێل دەکەین. کاتێک بۆ بینینی خەڵکی ناو کۆڵان سەرهەڵدێنم چاوم بە سێ کەس دەکەوێ کە لە گۆشەی کۆڵانەکەوە هەڵدەگەڕێن. دوو ژن و پیاوێک.

ئایا یەک لەو کچانە هەمان کچی بار نییە؟ بەژن و قژی درێژی هەر لەو دەچێت. من بە پەلە دەڕۆم، هاوڕێکەشم لەگەڵم. بە پەلە ڕۆشتن بەش ناکات، بە هەڵاتن خۆم دەگەیەنمە گۆشە. پێم وابێ ئەوە. لە دوورەوە بە زمانی وڵاتی مەزن دەڵێم: «شەوتان باش»، ئەوان دەگەڕێنەوە، لە من لەم کەسە سەیر و سەمەرە، لەم کەسە غەریبە کە بۆ خۆشی نازانێ چ دەکات، دەڕوانن.

بەڵێ، ئەوە.

خۆم دەگەیەنمە ئەوان و دەستم بەرەو لای کچە ڕادەکێشم، «لە دوورەوە ئێوەم دیت» کچە بزەیەک لە سەر ڕوخسار، هاوڕێکانی بە من

و هاوڕێکەم کە تازە گەشتۆتە لامان، دەناسێنێت. من دەڵێم: «هەوا ساردە، من ڕەق هەڵاتم، ئێوە بەرەو کوێ دەچوون؟»

نا، ئەوان بە ڕێگەی ماڵەوە نین، بە شوێن جێگەیەکی ئارامتردا دەگەڕێن. من دەرفەت لە دەست نادەم. دیسان دەستم بردۆتە ناو گیرفانی پاڵتۆکە: «فەرموون، با بچین بۆ هۆتێلەکەی ئێمە، هۆڵی هۆتێلەکە ئارام و گەرمە... « ئەوان سپاسی خۆیان دەردەبڕن، حەز ناکەن بێن بۆ هۆتێل. من ئیسرار دەکەم: بە کچە دەڵێم: «حەزم دەکرد گوێ لە قسەکانت بگرم» هاوڕێکانی دیسان دەڵێن «نا»، بەڵام ئەو هیچ ناڵێ. «هۆتێل زۆر نزیکە و هۆڵەکەش تا بەیانی کراوەیە».

«ئێوە چ دەڵێن؟» کچە لە هاوڕێکانی دەپرسێ، «بچین؟» بەڵام بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێت، ڕوو لە من دەکات و دەڵێ: «فەرموو با بڕۆین» ئێمە بێدەنگ بەرەو هۆتێل دەڕۆین. پاش کەمێک کچە و هەر دوو هاوڕێکەی کەمێک دوا دەکەون و چپە چپ دەکەن. هاوڕێکەی من دێتە لام و بە ئارامی دەڵێ «من ماندووم، دەچم دەخەوم» کاتێک دەگەینە بەر دەرگا گەورە ئۆتۆماتیکەکەی هۆتێل، هاوڕێکانی کچەکە دەڵێن: «ئێمە نایەین، زۆر سپاس».

«بۆچی؟»من بە سەر سووڕمانەوە دەلێم.

کوڕە دەڵێ: «نا، سپاس. با کۆتر بێت، بەڵام ئێمە دەچینەوە بۆ ماڵ». کەواتە ناوی کۆترە! هاوڕێکانی دەڕۆن، بەڵام ئەو دەمێنێتەوە! هەر دوو هاوڕێ ماڵئاوایی لە ئێمە دەکەن، دەگەڕێنەوە و لە ناو شەوی سارددا ون دەبن. ئێمەش بەرەو دەرگای هۆتێل دەڕۆین. کاتێک دەچینە بەر ڕێسێپشن تاکوو بزانین کەس تێلی بۆ کردووین یان نا، هاوڕێکەم بە فەڕەنسی ماڵئاواییمان لێ دەکات. کلیدی ژوورەکەی لە ڕێسێپشن وەردەگرێ و لە ئێمە جودا دەبێتەوە. من و ئەو بەرەو هۆڵی گەورە و ڕازاوەی هۆتێلەکە دەچین. هۆڵ ئارامە. لە چەند کەسێک کە لە دەوری

چەند مێزی زۆر نزم لە سەر کورسیی چەرمی دانیشتوون، زیاتر، کەسی تێدا نییە. گارسۆنێک جێگەیەکمان نیشان دەدات، بەڵام ئێمە جێگەیەکی ئارامتر هەڵدەبژێرین لە کەناری مێز، مێزێک کەمێک دوورتر لەوانەی دانیشتوون، بەرامبەر بە یەک دادەنیشین. من ڕووم بەرەو لای شەقامەکەیە، هی ئەویش بەرەو دیوارەکە، من دەڵێم: «جێگەکەمان بگۆڕین».

ئەو هەندێک تووڕە دەڵێ: «نا پێویست ناکات، وەها باشە».

من: «ئارام بە، قسەکانت زۆر سەرنجی منیان ڕاکێشاوە. دەمهەوێ گوێت لێ بگرم، با قسە بکەین...».

ئەو بە بزەوە: ئارام بە، قسە کردن بۆ ئێوە ئاساییە، بەڵام بۆ ئێمە نا. لەم وڵاتە نرخی قسەکردن گرانە، وەک وڵاتی ئازاد و سەربەست هەرزان نییە. لەم جەهەندەمە، وشەیەک دەتوانێ ببێتە هۆی ژیانی مرۆڤ...»

«ئایا ناوت کۆترە؟»

«باوک و دایکم، خزم و کەسم، هاوڕێکانم وام پێ دەڵێن. کۆتر، کۆتری گوندی شاخەکان، کۆتری چیا و زۆزانان. بەڵام من لە کوێستان لە دایک نەبووم، بە پێچەوانەوە لە بیابانێکی یەکجار گەرم، گەلێک دوورتر لە وڵاتی چیاکان، چیا و کوێستانەکان، لە تاراوگە، لە گەرمایەکی بێ وێنەدا. پێدەچێ حەسرەتی دایک و باوکم بۆ چیا و کوێستانان بێت کە ئەم ناوەیان لێم ناوە. لە بەر ئەوەی ئەوان/ ئێمە سێ ساڵ لەو بیابانە ژیاین.»

«تۆ لە گوندییان ناچی؟ باوک و دایکیشت لێرە دەژین؟»

پێدەکەنێ، «تۆیش دەزانی کە گوندی چۆنن؟» دەستی چەپی دەخاتە سەر کورسییە چەرمەکە، لاقی لە سەر یەک دادەنێ، لە من دەڕوانێ و پێدەکەنێ. «نا، من گوندی نیم، بەڵام بەشێکی گرنگی

ژیانم لە گوندێکی چیا بە سەر بردووە. هاوینان دەچووین بۆ گوند. من و دایکم. باوکم کە هەمیشە سەرقاڵ بوو، ئێستاش هەر وایە، کاتی نەبوو لەگەڵ ئێمە بێت. تا باوک و دایکم لێرە ناژین. ئەوان لە شارێکی گەورەی وڵاتی چیان. باوکم پارێزەرێکی ناوداری وڵاتی چیایە. پارێزەرێکی ناودار کە بۆتە هاوبەشی درۆی ئەو شارە، ئەو جوامێرە...». ئەمانە دەڵێت و بە دەستی ڕاستی تابلۆیەکی ڕەنگین و گەورەی ژەنەڕاڵ سەردار کە بە دیوارەوە هەڵواسراوە، نیشان دەدات.

کاتێک گارسۆن دێتە بەر مێزەکە، ئەو قسەکانی دەبڕێ و سەیری مێزەکە دەکات کە لە کاشیی چێندراو ساز کراوە. گارسۆن لە ناو سینییەکدا قەدەحێک شەرابی سپی و فنجانێک قاوەی هێناوە، قەدەح لە پێش من و قاوەیش لە بەر دەمی ئەو دادەنێ. من چەند قومێک لە شەراب دەخۆمەوە و بە وردی ، [لە ئەو] دەڕوانم کە هێشتا نیگای لە سەر مێزەکەیە. ئەو کچەی لە بەرانبەرم دانیشتووە، یەکجار جوانە. چاوە ڕەشەکانی خاوەن قووڵاییەکی جوان و نیگایەکی ئارامن. چاو وەک دوو دەنکە ترێی ڕەش و خڕن. ڕوخساری کراوە، پێکەوتە و ئارامە. نیگاکانی نیگای کەسانی بە خۆ باوەڕ، لە خۆبایی، زانا و تێگەیشتووە. چەند تاڵ لە زوڵفی ڕەشی، تەوێڵی پانی وەک تابلۆیەک دەنەخشێنێ. تەوێڵی پان و ڕوخساری کراوە لە یەک دێن. قژی ڕەش، حەڵقەیی و درێژی، وەک شەپۆلانی دەریا دەدرەوشێتەوە. پێدەچێ قژی بە ڕەنگێکی وەنەوشەیی تۆخ، بۆیە و خەنە کردبێ. ئەو کلی لە چاوەکانی کردووە؛ برۆ و برژانگی تۆخی یەکجار جوانی وەک نەخش وایە. لە پشت قووڵایی چاوان، بە سەر بیلبیلەی چاوانیەوە، زیپکەیەک دیارە. بەڵێ زیپکەیەک. بەڵام لە هەمان کاتدا خەمێک، پەژارەیەک. لێوەکانی گۆشتی و پڕن. کێ ئەو لێوانە لە لێوی خۆیدا دەحەوێنێتەوە؟ گەردنی وەک ستوونێک بەرزە، ئەنگوست و پەنجەکانی دەستیشی.

کچە؛ باڵا درێژ، قژ درێژ، گەردن درێژ، ئەنگوست درێژ. شێوە و باڵای یەکجار ڕێک و پێکە. بەدەن و ئەندامی بە جوانییەکی مسۆگەر، بێپایان سەرنج ڕاکێشە. پێویست ناکات کە ئەو خۆی بۆیاخ بکات و بۆ خۆ ڕازاندنەوە شتێکی تایبەت ئەنجام بدات. وا دیارە خۆیشی ئەمە دەزانێ، کلە و بۆیاخی سەر دەم و چاو و لێوی زۆر نییە، بە پێوانەیەکی دیاریکراو، کەم و سادەیە. زگ، کەمەر و ڕانی وەک تیری کشاوە[ی ناو کەوان]، سەرنج ڕاکێشیی جوانییەکەی دەگەیەننە لووتکە.

ئێستا پاش ئەوەی پاڵتۆکەی دەردێنێ، لە ژێر ڕووناکیی ئاوێزە کریستاڵییەکانی هۆڵدا، ڕوخسار و ئەندامی جوانتر دیارە. مەمکە قیتەکانی، سینگی دەکاتە ناوەندی سەرنج و لێ ورد بوونەوە. ڕان، لاق و لنگی وەک ستوونێکی ئەنتیک، بە ڕازاوەیی، درێژ بۆتەوە.

کچە؛ جوانییەکی سرووشتی، بەڵام هەندێک کێوی، جوانییەک کە بە ناوی فێنکی وڵاتی چیا گەورە بووە. شیرینییەک کە لە با، گەردەلوول، بەفر و فێنکایی چیا و کوێستانی وڵاتێکی دووری دونیا پێک هاتووە. هێمنی و ئارامییەکی پڕ ڕاز، ژنێک کە بە ڕای من دەتوانێ ژیانی مرۆڤ بکاتە خەونی بەهەشت. یانیش بە پێچەوانەوە، ژیان بۆ مرۆڤ بکاتە دۆزەخ؟

پاش ئەوەی تۆزکاڵێک شەکر دەکاتە ناو قاوەکە، بە کەوچک تێکی وەردەدا وهەندێکی لێ دەخواتەوە، سەیری من دەکات و بە چاوی پڕ پرسیار، دەپرسێ، «ئێوە چۆن لەم شارە هەندێک ویژدانی خۆتان ئاسوودە کرد؟» ویژدان، ئاسوودەیی ویژدان...

ئەو زمانەی قسەی پێ دەکات، زمانی ناسکی خوێندکارانە. کچە زمانی فەرمیی وڵاتی مەزن باش دەزانێ، باش بە کاری دێنێ. بەڵام مرۆڤ لە شێوەی دەربڕینی هەندێک پەیڤی تێدەگا کە ئەو زمانە، زمانی یەکەمینی نییە. بێ شک زمانی ئەو لە زمانی وێرانی ئەم

ولاتە زۆر باشترە، بەڵام بە وتەی زماننناسان «ئەکسانا « پشی هەیە. مـن بـەو زمانـە لێکتـرازاوەی خـۆم وەڵامـی دەدەمـەوە، «بۆچـی تـۆ وا دەئاخفـی؟ وشـەکانت وەک تیـری ژاراوییـە... ئێمـە حەزمـان کـرد لـە لای هـاوڕێ بەدحاڵـەکان بیـن و پشـتیوانییان لـێ بکەیـن، مەگـەر ئەمـە کارێکـی خراپـە؟»

«هیـچ خـراپ نییـە، بـەڵام هیـچ سوودێکیشـی نییـە، سبەی دوو سبەی ئێـوە دەگەڕێنـەوە و ئێمـە دەمێنینـەوە.»

مـن قسـەکانی ئـەو دەبـڕم، «بەیانـی، نـا، نـەک بەیانـی، بەڵکـوو ئێسـتا دوای چەنـد کاتژمێرێـک ئێمـە دەگەڕێینـەوە.»

«بەڵـێ، ئێـوە دەگەڕێنـەوە... پێدەچـی کـە ئێـوە لـە ولاتەکەشـتان باسـی گـەڕان، باسـی دژواری و زەحمەتییەکانیـش بکـەن. بـەڵام پـاش ماوەیـەک ئێوە هەمـوو شتێک لـە بیـر دەکـەن و دەگەڕێنـەوە ژووری تەنـگ و تاریکـی نووسـینتان. ئێـوە دەگەڕێنـەوە نـاو چیرۆکـی تاریکـی دوور لـە ئێمـە، دوور لـە مرۆڤـان، دوور لـە مرۆڤایەتـی، بـەڵام، خوێـن وەک بـەرێ و پێشـتر لێـرە، لـەو لای دیکـەی ولات، بـەڕێ دەکـەوێ، تونـد و تیـژی، قیـڕە، گریـان، گازنـدە، هـاوار، کینـە و نەفـرەت بـەردەوام دەبـێ.»

کاتێـک قسـە دەکات بەدەنیشـی لەگـەڵ ڕیتمـی قسـەکانی دەجمـێ. ئـەو دەسـت و پەنجـەی بـە ئاهەنگـی قسـەکانی دەجووڵێنـێ، لـێ ئارامـی و جوانیـی ڕوخسـاری قـەت ناگـۆڕێ.

« ئێـوە وەک هەمیشـە، ڕۆمانـە هەناسـە سـارد و بـەد بینەکانتـان بنووسـن و بیخوڵقێنـن.»

«بـەڵام قسـەکانت یـەک ناگرنـەوە» مـن بـۆ ئـەوەی زیاتـر قسـە بـکات وا دەڵێـم: «تـۆ باسـی تونـد و تیـژی، قیـن، نەفـرەت و خوێنـی بەڕێکەوتـوو لـەم ولاتـە دەکەیـت و ئێمـەش بـە بەدبینـی تاوانبـار دەکەیـت...».

«نـا مـن ئێـوە تاوانبـار ناکـەم، تەنیـا ئـەو شـتەی کـە ئێـوە نایبینـن

و لە بیری دەکەن، دەیهێنمەوە یادتان. من باوەڕ ناکەم کە گوتەکانم دژوازیی تێدا بێت. ئەدەبیات، ڕۆمان، دەبێ ڕۆشن بێت، ڕووناکی بڕژێنێ. چونکە ژیان تاریکە. ڕووناکی و تاریکی... ئەوەتا ئەو شتەی کە لە هەموو مێژووی ئەدەبیات دا بۆتە بابەتی سەرەکی، بنەڕەتی... ڕووناکی و تاریکییە... ئەڵبەت ئێوە ئاگاداری داستانی گلگامێش هەن، وا نییە، ئێوە دەیزانن؟»

لە باتیی ئەوەی وەڵامی بدەمەوە، هەندێک لە قەدەحی شەرابە ساردەکەم دەخۆمەوە و بە مەراقەوە لێیدەڕوانم و بە هیوای ئەوم.

«گێڕانەوەی هەرە کۆنی مرۆڤایەتی، گلگامێشە، وانییە؟» بە شێوەیەکی یەکجار تایبەت وا دەڵێ؛ «وا نییە». ئەو قسە دەکات، لە من دەڕوانێ، چاوەڕوانی پەسەند کردنی منە و بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامێک بێت، قسەکانی بەردەوام دەکات، لە داستانی گلگامێش دا، ئایا گلگامێش لەگەڵ کێ شەڕیەتی، لە بەرانبەر کێ؟ ئێوە وەڵام مەدەنەوە، من دەڵێم. لە بەرانبەر تاریکی. ئەو بەشەی داستانەکە بێننەوە یادتان؛ گلگامێش دەچێتە ناو دارستان، دارستان تاریکە، کەمێکی دی دەڕوا، تاریکە، کەمێکی دی، دیسان تاریک. بەردەوام تاریکە. بەڵام ئەو دەڕوا، ڕێ دەکا، تاوەکوو خۆی بگەیەنێتە ڕووناکی، ئەو ڕێدەکا. ئەها، ئەدەبیات، کانی ئەدەبیات ئەوەیە، ئاوەها دەڵێ؛ شەڕی ڕووناکی و تاریکی. پرسێک کە لە ڕۆژگاری گلگامێشەوە تا بە ئەمرۆ نەگۆڕدراوە. بەڵام ئەمرۆ کێیە سەرنج بداتە ئەم گێڕانەوە کەونارایە کە سەرچاوەی بنەڕەتییە؟ نا، هیچ کەسێک سەرنج ناداتە ئەمە، بە پێچەوانەوە، هەر کەس بە چاوێکی سووک و بچووک لەم داستانە دەڕوانێ. لە ئەدەبیاتی بەدبینی ئێوە و تیۆریی بڵندی ئەدەبیاتاندا، شوێنێک بۆ ئەم داستانە نییە. لەو ئەدەبیاتە یەکجار جوانەدا کە ئێوە دەیخولقێنن، ناوی ئەم داستانە، فۆلکلۆرە. فۆلکلۆریش بە نیگای ئێوە، ئەدەبیاتێکی جوان

نییە. ئەو شێوە گێڕانەوانە، هی بەربەرەکانە. بە دیدی ئێوە بە جۆرێک ماوە بەسەرچوو و ئێکسپایەرە، وا نییە؟»

من تەنیا بە ئەدەبەوە، بۆ ئەوەی بێزاری بکەم، پێدەکەنم. دانیشتووانی هۆڵەکە ئیدی کەمتر بوونەتەوە. دەنگی مووسیقای کەمانچەیەک، ئارام و هێدی بەر گوێ دەکەوێت. گڵۆپی چەند لایەکی هۆڵی گەورە کوژاونەتەوە. لایەکی ڕوخساری کچە، ئێستا سێبەری تاریکییەکی کەمی پێوە دیارە. ئەو تاریکی و ڕووناکییەی باسی دەکات، ئێستا لە سەر ڕوخساریەتی. ئەو، ئێستا زۆر جوانتر دیارە. لێوەکانی دەجووڵێن. بە جمەی لێوی، بە گێڕانەوەی قسەکان، هاوڕێ لەگەڵ دەنگی کەمانچە، ئەو ئەوەندەی تر جوانتر دیارە. گارسۆنێکی باڵابەرز بە ئارامی دێتە کەناری مێزەکەی ئێمە و دەپرسێ کە ئێمە شتی دی دەخوازین، چونکە ئیدی بارەکە دادەخەن. کچە دیسان داوای قاوە دەکات. منیش، خەوم دێ، خەو چاوی گرتووم و ناهێڵێ باشتر گوێڕادێری کچە بم. لەوانەیە قاوە باش بێت.

«لەوێ، لەو شوێنەی دەنگ توانای نەماوە، بۆ ستران ماوە؛ چیا بێ تام و مژ، دەشت بێ زەوی و بێ شینایی ماوەتەوە؛ جەستە بێ توانا، دڵ بێ هیوا، مێشک بێهۆش ماوەتەوە؛ ژن، گیانلەبەر، سرووشت نەزۆک بوون؛ گلگامێش لەوێ، لەو وڵاتەی کە ناوی لە نەخشەدا نییە، هەنووکەش دەژی. ڕووناکی و تاریکی و شەڕەکەیان لەو وڵاتە هەر ماوە. وڵاتێک کە ئەمڕۆ لە ناو خوێندایە، لافاوی خوێن، کۆتەرە داری گەورە و قایمی گوێزی داوەتە بەر و دەیبا، وڵاتێک کە دەنگی با و باران، بەفر و شەختە بە سەر وێرانەکانیدا، وەک گۆرانی شینگێڕی، دەویزێنێ، وڵاتێک کە ڕوخسار و نیگای مرۆڤە ئەسمەرەکانی وەک کانیی وشکبوو، بێ هیوا ماوە، بێچارە بووە، وڵاتێک کە مێژووەکەی لە مردووان، شەهیدان و ئەو قارەمانانەی لە شیو و دۆڵدا بێ ناونیشان

و بێ گۆڕ بوون، پێکهاتووە. بەڵام ئێوە لە کوێ و بە چ توانایەک سەرنجی ئەو شوێنانە دەدەن!»

ئێستا لەگەڵ ئەم قسانەی کچە، من دیسان هەست بەو ترسەی کە سەر لە ئێوارە تەنگی پێهەڵچنیبووم، دەکەم. هەندێک بێزار دەبم، بەڵام دیسانیش نازانم بۆچی حەز دەکەم بپەیڤێ. لەم کاتەدا گارسۆن دێت بە هاوارمەوە. کچە قسەکانی دەبڕێ. گارسۆن وەک جاری پێش، بە ڕێزەوە فنجانەکان دادەنێ، قەدەح و فنجانی بەتاڵی سەر مێزەکە هەڵدەگرێ و دەڕوا.

بێ ئەوەی ئەو ترسەی لە دڵمدایە، نیشانی بدەم، بە بزەوە لە ناو چاوانی دەڕوانم و دەڵێم: «وڵات، وڵاتپارێزی، مێژوو، قارەمان، قارەمانێتی، شەڕ... من زۆر حەز لەم وشانە دەکەم، ئەگەر بە قەد تۆش نەبێ، بەڵام منیش بەسەرهاتی بێ بەختیی وڵاتی تۆ دەزانم. بەڵام ئەم قسانەی تۆ ئێستا، وەک شاعیرێک بە شوێن یەکدا ڕیزیان دەکەی، زۆر جاران دەبنە کەمین. پێدەچێ جار جارە ببێتە یارمەتیدەری دڵێکی شێواو، ڕۆحێکی بریندار. بەڵام زۆربەی جاریش ئەوانە کاتێکی یەکجار قورسن، زۆر جار تەڵە و داون، دەرگای دۆزەخن. دەرگای وڵاتی مردن، یان ڕووداون...».

ئەو هیچ ناڵێ، چەند خولەکێک بێدەنگ لە من دەڕوانێ، پاشان دێتەوە لای فنجانەکە و دوو کەوچک شەکری تێ دەکات و دەیشێوێنێ، چەند قومی لێ دەخواتەوە، فنجانەکە دادەنێتەوە سەر مێزەکە و وەک پێشووتر پاڵ دەداتەوە. لاقی دەخاتە سەر یەک و: «ئەگەر من بڕوام بە دڵسۆزیی ئێوە نەبووبا، نەدەهاتمە ئێرە و لەگەڵتان قسەم نەدەکرد» «دوای ئەمشەو پێم وانییە جارێکی دی یەکدی ببینینەوە. پێموایە ئەمە یەکەمجار و دوایین جارە. بەڵام پێویستە ئێوە یەک شت بزانن: ئەو دوورییەی ئێوەی تیدا دەژین، لە مرۆڤەکان، لە مرۆڤایەتی

و لـه ڕووداوەکان دوورتـان دەخاتـەوە، ئێـوە دەڵێـن ڕووداو... ڕووداو بـۆ ئێـوە ئەمـڕۆ تەنیـا وشـەیەکی خوازەیـە. بـاوەڕ دەکـەم ئێـوەش هـەر بـەم مانـا خوازەیـە بەکارتـان هێنـا، وا نییـە؟ بـەڵام بـا مـن پێتـان بڵێـم، ڕووداو ئەمـڕۆ ڕاسـتیی ئێمەیـە. ڕاسـتیی وڵاتـی دوورە. ئـەو وڵاتـە ئەمـڕۆ ڕووداوە. ڕووداوێـک کـە لـە مـەرگ پێـک هاتـووە، بـە مـەرگ دەژی و بانگـی مـەرگ دەکات و هـەر کەسـێک بـەرەو لای خـۆی ڕادەکێشـێ...».

نیـگای لـە سـەر مـن هەڵدەگـرێ، کەمێـک لـە دەور و بـەری دەڕوانـێ، بـە ڕوخسـارێکی پـڕ پـەژارەوە لـە هەمـوو لای هۆڵەکـە کـە ئێسـتا کەسـی لێنەمـاوە دەڕوانـێ و هەندێـک خـۆی هەڵدەگەڕێنێتـەوەو لـە پەنجـەرە زۆر گەورەکـەوە سـەیری شـەقام دەکات. شـەقام خاڵییـە، نـە کەسـێک، نـە تاکسییەک. هەڵدەگەڕێتـەوە سـەر مێزەکـە، نیـگای لـە سـەر فنجانەکەیـە، پەنجـە گـەورەی دەسـتی ڕاسـتی بـە لێـواری فنجانەکـەدا دەگەڕێنـێ و دەڵـێ «ڕووداو لێرەیـە» «ڕووداو بانـگ دەکات، هەمـوو کـەس دەڕوا... ژیریـش ڕۆیشـت، منیـش دەڕۆم...».

مـن ئیـدی هیـچ ناڵێـم چونکـە کچـە لەگـەڵ مـن قسـە نـاکات. ئـەو بیـر دەکاتـەوە، بـە دەنگێکـی زۆر نـزم کـە بـە زەحمـەت دەگاتـە مـن، ئـەو لـە نـاو بەسـەرهات، هەسـت و سـۆزەکانیدا دەگـەڕێ. کـەس لـە هۆڵەکـە نەمـاوە، دەنگـی مۆسـیقا داخـراوە. لـە دەرەوە، لـەو دیـوی پەنجەرەکـەوە، بەفـر دەسـتی پێکـردووە. کلـووی بەفـری سـپی کـە وەک ئەسـتێران دەدرەوشـێنەوە، هێـدی هێـدی بـەرەو خـوار دێـن. بـەڵام مـن باسـی بەفـری بـۆ ناکـەم، نامـەوێ ڕۆشـتنی دەنـگ، سـەدا و هەسـتەکانی تێـک بـدەم.

«ڕۆیشـت» کچـە نیـگای هێشـتا لـە سـەر فنجانەکـە دەڵـێ؛ «بـە هەڵاتـن ڕۆیشـت، شـەوێکی پاییـزی بـا و سـاماڵ، شـەوێکی ئـارام، شـەوێکی وەک خـەون. ئـەو شـەوەی ئێسـتا بۆتـە خەونێـک، لـە خەونێـک زیاتـر هیـچ نییـە. ئـەو شـەوەی بـە گلۆپـی [نـاو] بولـوار کەمێـک ڕوونـاک بـوو، بـە

ڕووناکیی دەروونی جەستەکان پڕ شەوق بوو. ئەو شەوەی ئەو لە پەنجەرەوە، بۆ دەرەوە، بۆ دونیا، بۆ دوور، بۆ دونیای هەرە دوور و گەردوونی دەڕوانی. ئەو شەوەی وڵاتی ڕووداو ئۆلانی دەدا. ئەو شەوە من قسەم کرد، گریام، لە بەری گەڕیام. بەڵام ئەو ڕۆیشت، نیگاکانی لە پێش چاومە، دەنگی هەنووکە لە گوێمدایە، وەک بڵێی ئەو لە خەونێک دەرچووبێت و کەوتبێتە ئامێزی خەونێکی دی، ون بوو و ڕۆیشت. لێم مەپرسە کە زێر کێ بوو... زێرێک کە ئەوینداربوو، دڵبەری ئەشق و دڵان بوو، زێرێ کە زێر بوو، ڕۆیشت... ئێمە، من و ئەو باسی شیو و دۆڵانمان دەکرد. پاشان بە بانگهێشتی ڕووداو، وشەی دۆڵ بوو بە تۆڵ (تۆڵە). شەوی دوایی، بەر لەوەی بڕوا، من بە گەرمای جەستەی وشەی تۆڵەم کرد بە تۆو. بەڵام زێر سەرکەوت؛ تۆڵە مایەوە، دۆڵ ڕۆیشت، تۆویش دوو هەفتە پێش ئێستا ڕۆیشت. زێر ڕۆیشت وەک تیریژی هەتاوی سەر لە ئێواران، شەپۆلی دەریا لە کەناران، بای ناو دارستانان، بەفری بەر هەتاو، زێر وەک ئەوانە ون بوو و ڕۆیشت. ئیدی دوورە. ئیدی دوورییەکی بێپایان کەوتۆتە نێوانمان. دابڕان، خەمی دابڕان، خوێن، چارەنووسی ئێمە، چارەنووسی من. من لە سەرێکی دونیا، ئەو لە سەرێکی دی. نە دەنگێک، نە هەواڵێک. بەڵام ڕۆح یەکێکە، ڕۆح یەکیان گرتووە. نە ڕۆیشتنی پاییز، نە حەسرەتی زستان، نە چاوەڕوانیی بەهار و نە دووریی هاوینیش. دڵ دەزانێ بۆچی لێدەدا. «هادەس*» بانگ دەکات، دیسان ئۆلان دەدا... منیش دەڕۆم...».

من چی تر ناتوانم خۆ ڕابگرم. «بڕوانن بەفر دەبارێ» بەم جۆرە قسەکەی دەبڕم «سپیەتیی بەفر بڕوانە.»

دێتەوە سەر خۆی، سەری هەڵدەسوورێنێ، چەند خولەکێک سەیری

* ناوێکی دیکەی پلۆتۆن، خواوەندی وڵاتی مردووانە.

دەرەوە دەکات «سپیەتی» بە بزەیەکەوە دەڵێ، کاتێک ئاوڕ لە من دەداتەوە «هەڵبەت سپیەتی... بێگومان لە هۆڵێکی گەرمی قاڵیچە ڕاخراودا خۆشە. بەڵام ئەو تێکۆشەرانەی بە تۆلانی هادەس دەستیان بە گۆڤەند کردووە، ئێستا چ دەکەن، لە کوێن، ئەوان لە وڵاتی ڕۆشتن و نەگەڕانەوەدا، حەشارگەیەکیان دۆزیوەتەوە؟» هەڵدەستێ و بەرەو پەنجەرە دەڕوات. ژاکەتێکی ڕەشی درێژ و شەرواڵێکی تەنگی جینی تاریکی لە پێدایە. دەستی لە گیرفانی شەرواڵدا، چەند خولەکێک لە پەنجەرەوە، سەیری دەرەوە، سەیری بەفر دەکات. من لە جێگاکەم ناجمم. بیرم لای قسەکانیەتی و لەو دەڕوانم. هەوا هەندێک، یان بە بۆنەی بەفرەکەوە یانیش بە هۆی سپێدەی بەیانەوە، ڕووناک بۆتەوە. ئەو دەگەڕێتەوە بەر مێزەکە، بەڵام دانانیشێ. وەک ئەوەی لە خەونێکدا بێ دەڵێ «من ئیدی دەڕۆم». «خۆت دەزانی» من بە ئارامی دەڵێم و هەڵدەستمە سەر پێ. منیش ئیدی نە تاقەتی قسە کردن و نە گوێ شل کردن و نە بیر کردنەوەشم هەیە. مێشکی لە خۆوە ماندووم، ئێستا بە تەواوی لە یەک ترازاوە. بەڵام من لەو، لەو ڕوخسارە جوان و بەهێزەی دەڕوانم؛ زەردەخەنەیەکی زراڤ، خەندەیەکی باڵکێش، نیگایەکی بەهێز، بەخۆباوەڕ، نیگایەکی باریک بین. شوێن پێی هیوایەک، چاوەڕوانییەک، ڕۆشتنێک، شوێن پێی ویست و حەسرەتێک. و لە پشت پەردەی نیگاکانەوە، کەسەرێک، پەژارەی بێچارەییەک، دوو دڵییەک.

«مەڕۆ»

بە بزەوە دەڵێ: «نا، من ئیدی دەڕۆم، من ماندووم، تۆیشم ماندوو کرد.»

«مەبەستم ئێستا نیە، مەچۆ بۆ ئەو وڵاتە...»

«ئەو وڵاتە... ئەو وڵاتە... سەری خۆتی پێوە مەیەشێنە» وا

دەڵێت و لە دەرگای گەورەی هۆتێلەکەوە دەردەچێت.

«من ناونیشان و ژمارە تەلەفۆنت بدەمێ، ڕەنگە ڕۆژێک پێویست بوو» وای پێدەڵێم و لەگەڵی دێمە دەرەوە ناو بەفر کە ئارام دەبارێ.

«نا سپاس، پێویست ناکات، ئیدی هیچ شتێک پێویست ناکات» و ماڵئاوایی لە من دەکات، هێدی هێدی، لە ناو بەفردا دەڕوا و ون دەبێ.

# ٨

# دڕدونگ

باز.

له پایتەختی باز، له لای باز.

چوار مانگ پاش هێرشەکەی گوند، له پایتەختی وڵاتی مەزن.

باز گەڕاوەتەوە، لە وڵاتی چیا، لە مەرگ و کوشتن، دوێنێ گەڕایەوە بۆ شاری گەورە.

لە سپێدەی بەیانییەکی سامالْدا، ئێمە لە بەر دەرگای ماڵی مادەرین. باز دەست بە زەنگی دەرگای ماڵی مادەردا دەنێ. دەنگێک لە ناوەوە، لە ماڵی مادەر، کە لە گەڕەکی ڕووسپیخانەی شارە، نایە. باز دیسان دەستی پێدا دەنێ. دەنگێک نایە. «وەرە» باز بە تووڕەییەوە دەڵێ «وەرە دەرگاکە بکەوە مادەر، دەرگای ژیانی من، وەرە.»...

لەم سپێدەشدا دیسان خوێن هەیە؛ ڕوخساری ئەو، دەستی، کراسە سپییەکەی خوێناوییە. قژی ئاڵۆزاو، پێشی پاڵتۆ و ژاکەت و سینگی کراوەیە. چاوی ماندووی سوور بووە؛ دەڵێی بۆتە دوو مۆمی داگیرساو. شوێنی سێ نینۆکی پەنجە هێڵێکی سووری لە سەر ڕوخساری درووست کردووە. جێ پەنجەکان قووڵن. خوێن بە دەوری لێویشیەوە دیارە.

چی بووە؟ چی قەوماوە؟

«دەرگا بکەوە» باز ماوەیەکی درێژ قامک بە دوگمەی زەنگەکەدا دەنێ و ئەمجار بە دەنگێکی بەرز بانگ دەکات «مادەر...، ژنی گەوواد، دەرگاکە بکەوە... مادەر، لە دەورت گەڕێم، دەرگاکە بکەوە»

بەڵام دەرگا ناکرێتەوە. باز کەمێک لە دەرگا دوور دەکەوێتەوە، سەری هەڵدێنێ و بۆ سەرەوە، بۆ پەنجەرەیەکی گەورە دەڕوانێ و دەقیرێنێ؛ «مادەر... مادەر...» دوای چەند جار بانگ کردن، دیسان دێتە بەر دەرگا و ئەمجار بە دەست لە دەرگا دەدا. «بیکەوە قەحبەی کچی قەحبە، بیکەوە قەحبەی تەواوی شار، تەواوی وڵات... بیکەوە، دایکەکەم بیکەوە...»

دەرگا ناکرێتەوە، دوای ئەوەی باز بێتاقەت دەبێ، بە ئارامی بەرەو زەوی لار دەبێتەوە و لە بەر دەرگا، لە سەر پلیکان دادەنیشێ. ئێستا چی بکات؟ بەرەو کوێ بچێ؟ دیسان بێ پشوو، بگەڕێتەوە وڵاتی چیا و بکەوێتە باوەشی شەوانی تاریک؟ دیسان ببێتەوە بە هاوڕێی خوێن، مەرگ و کوشتن؟ بکوژێ؟ خۆی بە کوشت بدات؟ مەگەر تازە لە هەرێمی مردن و کوشتن نەگەڕاوەتەوە؟ ئێستا چی بکات، لە کام دەرگا بدات، بە سەر کێدا بقیرێنێ، کێ بکوژێ، دەرد و خەمی دەروونی کە زۆر کوشندەیە، بە کێ بڵێ، لە لای کێ زار بگری؟ لەعنەت لە تۆ ئەی ژیان! خوا بتگرێ چارەنوس، بەخت! بەختی بێ شەرەف، بێ نامووس!

هەوا ڕووناک دەبێتەوە. تیشکی هەتاو دەگاتە کۆڵانی تەنگ و درێژ کەماڵی مادەری لێیە. کۆڵان خاڵییە، تەنیا چەند سەگی بەرەڵا، بێدەنگ، لە سەر پێ، دەگەڕێن. لە ماڵێکی کەمێک دوورتر دەنگی منداڵێک دێت. لە دوورەوە دەنگی ئۆتۆمبیل و تاکسییەکانی شار دێ، ڕۆژێکی نوێ، ڕووناک، بەڵام کەمێک سارد، بە گەرمای ڕووناکی ساماڵی زستان دەست پێدەکات.

باز سەری لە ناو هەر دوو دەستیدا دانیشتووە و بیر دەکاتەوە؛

لە خۆی، لە کوڕەکانی، ژنەکەی، ژیانی، کردە و وتەکانی و بیر لە چارەنووسی خۆی دەکاتەوە. باز؛ ماندوو لە ڕێگەیەکی یەکجار دوورەوە بە میوایەکی مەزن هاتووە. باز؛ کۆگای نەفرەت و بێزاری، چاوسوور، پیاوکوژ، بەڵام ئێستا یەکجار باریک بین، یەکجار دڕدونگ. گەلێک سست، گەلێک تۆراو. خۆزگە هەموو فیشەکەکانی باریتاکەی بن باخەڵی بنایە بە سەریەوە و مێشکی بپژاندایە، ئیدی بۆ هەمیشە بە دەستیەوە ڕزگاری دەبوو. بەڵام نەیدەوێرا، نا، نەک نەیدەوێرا، بەزەیی پێیدا دەهاتەوە. گۆناح؟ بە ڕاستی گوناح؟ نا گوناحیش نا. پێش چاوی گیرا، وەک ئەوەی دەست و لاقی زنجیر کرابن، بێ جموجۆڵ وەستا. پێدەچی باز ترسابێتیش. ترس؟

باز لە گیرفانی پاڵتۆ ڕەشەکەی، پاکەتی جگەرە دەردێنێ، جگەرەیەک دەگیرێنێ و چەند مژی قووڵ، یەکجار قووڵی لێدەدا. پەنجەکانی دەستی چەپی لە ناو قژی کورتکراویدا، لە سەر یەک، جگەرەکە دەنێ بە لێویەوە. مژ لێدانی جگەرە، دووکەڵ و بۆنەکەی، گەرمایەکی خۆش پێک دێنێ. وەک بڵێی باز هەندێک بەوە ئارام دەگرێ. دوای یەکەم جگەرە، یەکی دی لە پاکەت دەردێنێ و بە جگەرەکەی دەستی دایدەگیرسێنێ.

باز چارەیەکی پێویستە. چارەیەکی مسۆگەری پێویستە تاوەکوو بتوانێ ئەو تەم و مژەی دەوری ژیانی گرتووە، بڕەوێنێتەوە، لێڵی و تاریکیی دەوری خۆی بکاتە سافی و زوڵاڵی. ئاوەها بەم شێوە نابێ، قەت نابێ. باز مرۆڤی ئەم حاڵە نییە. بە قسەیەکی ئەم دەکرێ هەزاران مرۆڤ بکوژرێن، بە جووڵەیەکی دەکرێ چارەنووسی زۆر شت بگۆڕدرێ. بەڵام سەیری ئەم بەختە گەووادە بکە کە ناتوانێ بە سەر ژیانی خۆیدا زاڵ بێت، ناتوانێ دەسەڵاتداری ماڵەکەی خۆی بێت.

باز، کێیە ئەم بازە؟ لە کوێوە هاتووە؟ بنەچەکەی کێیە، چییە؟ بەڵێ، نەک تەنیا ژیانی لە ناو تەم و مژدایە، هەروەها ڕۆژانی ڕابردووی،

منداڵی و لاوی و ژیانی بەسەرچووشی لە ژێر سێبەری تەم و مژێکدایە. زولاڵی نەک تەنیا بۆ ژیانی ئەمڕۆی کە بۆ ژیانی دوێنێشی پێویستە. زولاڵییەکی ئاشکرا وەک تیشکی ئەم ڕۆژە نوییە ڕووناک.

دوای جگەرەی چوارەم، دیسان هەڵدەستێتە سەر پێ، لاقی تەزیوی ڕادەوەشێنێ و ماوەیەکی درێژ قامکی لە سەر دوگمەی زەنگی دەرگاکە دادەنێ. جارێک، دوو جار، سێ جار، دەنگ نایە. ئەگەر مادەر نەچووبێ و نەکەوتبێتە ئامێزی یەکێکی بێشەرەف، دەبێ لە ماڵەوە بێت. باز پێش ئەوەی بێتەوە بۆ ماڵ، چووبوو بۆ ڕووسپیخانە بەو هیوایەی مادەر لەوێ بێت. بەڵام مادەر لەوێ نەبوو. ئەوانەی ئەوێ بە چاوێکی سەیر لە باز و لە خوێنی سەر ڕوخسار و جلەکانیان ڕوانیبوو و وتبوویان کە مادەر چۆتەوە بۆ ماڵ، بەڵام مادەر ئێستا وەڵام ناداتەوە. ژنی قەحبەی قەحبەکان، ژنی قەحبەخانە نایەت و دەرگا ناکاتەوە!

«مادەر» باز بە دەنگێکی یەکجار بەرز دەقیرێنێ. «ژنی قەحبەخانەکان، ژنی کۆڵانان، وەرە دەرگاکە بکەوە!» دواییش دەست بە تێهەڵدانی دەرگا دەکات. جار جارە. بەقیرەوە. هەندێک کەس بێ ئەوەی شتێک بڵێن لە دەرگا و پەنجەرەوە سەیری باز دەکەن. لەگەڵ ئەوەش کە باز ئەوانە دەبینێ، دیسان بە شەق بەر دەبێتە دەرگا. قەینا با کێ سەیری دەکات، بیکات. ئەگەر کەسێکی بەهێز، کەسێکی بە خۆ باوەڕ هەیە با شتێک بڵێ، یان تەنیا دەمی بکاتەوە، خوا بزانە چی بە سەر دێت! باز ئەمجار بە مشت و شەق لە دەرگا دەدات.

لەم کاتەدا لە پشت دەرگاوە دەنگێک دێت. باز ڕادەوەستێ، پاشان دەرگا بە ئارامی دەکرێتەوە و مادەر، ژنی ئیتر پیر، ئیدی یەکجار قەڵەو و خڕ، لە کراسێکی تەنک و ناسکی شەودا، دەردەکەوێ. چاوی خەواڵووە، پەنجەی بە سەر چاو و ژێر چاوی هەڵامساویدا دێنێت و سەیری باز دەکات.

«وەی، وەی، وەی... کوڕی من، ئەفسەری من، پیاوی جوانخاسی من، قارەمانە تووڕەکەم هاتووە» مادەر بە بزەیەکەوە دەڵێ. «دەبوو من بمزانیبا کە تەنیا کوڕەکەم، دەتوانێ ئەم قیڕە قیڕ و ئاژاوە بگێڕێ، وەرە ژوورەوە، وەرە لای مادەری خۆت، وەرە باوەشی من، وەرە وەرە با بتحەوێنمەوە، وەرە...»

کاتێک باز مادەر دەبینێ، دەنگی لێوە نایە ئیدی. ئەو بێدەنگ بە نیگایەکی یەکجار تیژ سەیری مادەر دەکات و لە دەرگاکەوە دەچێتە ژوور.

مادەر دەستی باز دەگرێ و بە نەرمی دەڵێ: «ئەوە چ حاڵێکە؟ چی بووە؟ چی قەوماوە، بۆچی وەها خوێناویت؟»

باز کەمێک بە تووڕەییەوە لە باتیی ئەوەی وەڵام بداتەوە، دەڵێ: «بۆچی دەرگاکەت نەدەکردەوە، چەند کاتژمێرە کە من لە بەر دەرگام، چیت دەکرد؟»

«من چیم دەکرد؟» مادەر بە خەندەوە، «من خەوتبووم، لە خەوێکی قووڵدا، ماندوویەتیی ڕۆژێکی سەختم لە لەشم دەردەکرد» بە دەنگێکی یەکجار نەرم وەک دەنگی دایکان دەڵێ «دەنگی تۆم نەدەبیست، گەر بمبیستبا، مەگەر یەکی تۆم دەکردە دوو؟! وەرە کوڕەکەم وەرە.»

مادەر دەستی ئەو دەگرێ لە پلیکانەکانی ناوەوە کە دوو قات ساز کراوە هەڵیدەکێشێتە سەرەوە. ژووری نووستنەکەی زۆر گەورەیە، لە قاتی سەرەوەیە. مادەر لە پێشەوە و باز بە شوێنیدا دەچنە ژووری نووستن. بۆنێکی قورس و گەرم کە تێکەڵێکە لە بۆنی ئارەقە و کۆلۆنیای (ئۆدکۆلۆنی) هەرزانی ترشاو دێتە لووتی باز. ژوورەکە گەرمە، ئەو گەرمایەی کە باز زۆر پێویستی پێیەتی، ژوورەکەی گرتۆتەوە. باز چاوی دەنووقێنێ، دەمی دەبەستێ، بە پێوە چەند جاران هەناسە هەڵدەمژێ و دەیداتەوە.

«مادەر، من مردم» باز بێ ئەوەی چاو بکاتەوە دەڵێ «من مردم، مادەر».

«نا، نا، هیچت لێنەهاتووە، ئێستا لە ئامێزی دایکی خۆتدا ئیدی هیچ شتێک نامێنێ» وا دەڵێ، دادەنەوێت پێڵاوەکانی باز لە پێی دەردێنێ، هەڵدەستێتەوە و پاڵتۆکەی هەڵدەگرێ «ئێستا دەبینی، من سینگ و بەرۆکم دەکەمە مەڵهەم و تۆ چاک دەکەمەوە».

«ژیانی من تێکچووە مادەر»باز هەنووکە بە چاوی بەستراوەوە دەڵێ «ژیانی من لە حەرام گەڕا».

«ئێستا هیچ مەڵێ» مادەر دەڵێت و جل و بەرگی باز لە بەری دادەکەنێ. «دوایی، دوایی...»

پاش ئەوەی مادەر بە دەستی وەستای خۆی باز ڕووت دەکاتەوە، دەمانچە بارێتاکەی باز کە لە ناو جانتایەکی ڕەشی چەرمی نەخشێندراودایە، دەخاتە سەر مێزە بچووکەکەی لای تەختی نووستنەکە. کراسە ئاسکەکەی شەوی لە بەر دادەکەنێ، ڕووت دەبێتەوە. دیسان دەستی باز دەگرێ و بەرەو حەمامی تەنیشتی ژووری نووستنی دەبات. مادەر بە ئاوێکی گەرم سەری باز دەشوا، چەند جاران سابوونی لێدەدا و دەیشوا. باز خۆی دەداتە بەر ئاوەکە، هەر جارە کە دەست و پەنجەی قەڵەوی مادەر، بە سەر جەستەیدا دەگەڕێ، بە ناڵەیەکی زراف، ئەو و جەستەی سست دەبێتەوە. تورەییە بێپایانەکەی کەم دەبێتەوە. ئەوەندەی ماوەیەکی درێژ، ئەوان لە حەمام، لە ژێر ئاوی گەرمدا دەمێننەوە. «ئاو» باز دەڵێ، «ئاخ، ئاو...» ئاو؛ زوڵاڵی، ئارامی، هێمنی. ئاو؛ ڕەحمەت، بەرەکەت، ژیان. ئاو؛ بەهێزی، گەورەیی، بێپایانی. ئاو؛ هەتوانی ڕۆحی بریندار، جەستەی حەرام، دڵی پیس... ئاو.

پاش سەر شۆردن، مادەر بە خاولیی خاوێنی سپی، قژ و بەدەنی باز وشک دەکاتەوە، بە نەرمی وەک بڵێی دەستی منداڵێکی گرتبێ، دەستی

باز دەگرێ و دەیباتە سەر تەختە گەورەکەی خۆی، ناو نوێنان. نوێنی مادەر هێشتا گەرمە. هێشتا بۆن و هەڵمی بەدەنی قەڵەوی مادەری لێدێ. باز لە سەر نوێنان ڕادەکشێ، دوو سەرین دەخاتە سەر یەک و پاڵی پێوە دەدات و داوای جگەرەیەک لە مادەر دەکات. دوای ئەوەی مادەر جگەرە دەگیرێنێ و دەیداتێ، خۆیشی دێتە تەنیشت باز و ڕادەکشێ، دەستی ڕاستی بە سەر سینگ، زگ، بەرزگ و «سەربڵندی»ی بازدا کە ئێستا وەک قامکێکی بچووک دیارە، دەهێنێ و دەڵێ؛«دەی بێژە چی قەوماوە، کێ ڕوخسارتی وا لێکرد، کێ جەسارەتی وای کردووە؟»

باز وەڵام ناداتەوە. چەن خولەکێک نەفەس بە شوێن نەفەسدا جگەرە دەکێشێ. «دە بە دایکی خۆت بڵێ،» مادەر دیسان بە جەختکردنەوە دەڵێ «دەرد و خەمی خۆت بڵێ، دەرگای دڵت بکەوە»

«ژنی من... ژنە قەحب... «باز وشە بە وشە دەڵێ. بەڵام ناتوانێ قسەکە تەواو بکات. «ژنەکەم...» باز هەوڵ دەدا قسەکانی درێژە پێ بدات، بەڵام نابێ. ئەو دەگاتە ئاستی گریان، ڕووی لە مادەر هەڵدەگێڕێتەوە، چەند خولەکێک هەروا بێدەنگ دەمێنێتەوە و پاشانیش لە پڕ دەگری. بە دەنگی بەرز، توند، درێژ.

باز دەگری!

مادەر کە تا ئێستا بازی وەها نەدیبوو، دەحەپەسێ. مادەر چی بکات، چی بڵێ؟ ئەو، بێدەنگ سەری باز دەخاتە سەر زگ و بەرزگی پڕ بەز و چەوریی خۆی و دەست دەخاتە ناو قژی. وەک زەوییەک بوومەلەرزە لێی دابێت، هەموو جەستەی باز بە کوڵی گریانەوە دەهەژێ. ئەسرین لە چاوی دەبارێن. ئەو دەگری، جار جارە دەکۆخێ، جار جارەش دەپژمێ، گریان لە قوڕگیدا دەمێنێتەوە بەڵام تفەکەی قووت دەدات و تێر دەگری. ماوەیەکی درێژ وەها دەگری. پاشان هێدی هێدی، کوڵی گریان دادەمرکێ. «تۆ نازانی ئەو ژنە گەوواد بابە چیم بە سەر

دینێ» باز بە ئارامی بێ ئەوەی سەر هەڵبێنێ دەڵێ: «من نازانم چی بکەم... نا، نا، دەزانم چی بکەم، دەیکوژم، جگە لەمە هیچ چارەیەک نییە، تەنیا کوشتن دەتوانێ من لە دەستی ڕزگار بکات...».

«کوشتن بۆ چ شتێک بۆتە چارە کوڕەکەم؟» مادەر بێ ئەوەی قسەکانی باز ببڕێ، بە نەرمی ئەمە دەڵێ.

«چارەیە، من دەزانم، کاتێک پێویست بێ کوشتن و مردن چارەن...».

مادەر سەری باز لە ناو لنگی خۆی بەرز دەکاتەوە و دەیخاتە نێو هەر دوو مەمکی زۆر مەزنی. «من تۆ دەحەوێنمەوە» ئەو دەڵێ «بەڵام مردن و کوشتن هیچ چارە نییە... مردن، ون بوونە، ون کردنی هەموو شتێکە. کەی ون کردن دەتوانێ ببێتە چارە؟ بەڵام ژیان، من دەزانم ژیانی هەرە پیس، هەرە بێچارە، هەرە بێهوودە، دەتوانێ ببێتە چارە، چونکە هیوای تێدایە؛ هەمیشە لە هەر مەرجێکدا تەڕایی هیوا، تۆوی هیوای تێدایە...»

ماوەیەکی درێژ باز هەر بەو شێوە، سەر، ڕوو، دەم و لووتی لە نێوان مەمکی مادەردا دەمێنێتەوە. سینگی ئەو بە ئارامی بەرز دەبێ و دەنیشێتەوە. بۆنێکی سەیر لێ خۆش کە هەندێک لە بۆنی سێوان دەچێ، لە ناو مەمکی مادەر دێ. دواتر باز سەری لە ناو مەمکی مادەر دەردەکێشێ و دیسان وەک پێشوو، دوو سەرین دەخاتە پشتی و داوای جگەرەیەک لە مادەر دەکات. مادەر، بە مەمکی زۆر گەورەی کە تا ناو زگی دێت، بەز و چەوری کۆگا کۆگای کەمەر، ڕان و لاقی قەڵەویەوە هەڵدەستێ، جگەرەیەک لە پاکەتەکەی باز دەگیرێنێ و دەیهێنێ، دەیداتێ.

«ئێوارە بوو،» باز چەن مژێک لە جگەرە دەدات، بە چاوی تەڕ و سوورەوە لە مادەر دەڕوانێ و دەڵێ: «نا، ئێوارە نەبوو، بەرەو ئێوارە بوو. من گەیشتمە شار و چوومەوە بۆ ماڵ. بە خۆشحاڵی، بە جۆشەوە. لە گیرفانمدا ئەوەندەی دوو مشت زێڕ، ملوانکە، ئەنگوستیلە، گوارە،

بازنە کە لە ناو کیسەیەکی هەوریشمیی بچووکدا بوون، کە بۆ ئەو دێڵە دایک قەحبەم هێنابوو. لە دەستیشمدا جل و بەرگ، پێنووس و دەفتەر، سەعات و جانتا کە لە ناو پاکەتدا بوون، بۆ کوڕەکانم هێنابوو... کاتێک گەیشتمە ماڵێ، دایک قەحبە تەنیا بوو، هێشتا منداڵەکان لە خوێندنگە نەگەڕابوونەوە. کاتێک چوومە ژوورەوە و چاوی پێم کەوت، وەک بڵێی جندۆکەیەک، جانەوەرێکی دیبێ، وەها چاوی دەرپەڕاند و حەپەسا. بێ ئەوەی پێبکەنێ، بەخێرهاتنم بکات یانیش بێت و پاکەتەکانم لە دەست وەربگرێ، هەروا لە بەرانبەرم کەمێک دوورتر، ناو چاو گرژ، ڕاوەستاو، چەند خولەکێک بە نیگایەکی بەتاڵ یانیش ترساو سەیری کردم. هیچ قسەیەک بە زاریدا نەهات. من قسەم کرد، لە حاڵی خۆی و منداڵەکانم پرسی. ئەو تەنیا وتی؛ «باشم، باشن». مەگەر تۆ نایەیت و هاوکاریم ناکەی لەم پاکەتانەدا؟ من پێم گوت. بێدەنگ هات و چەن پاکەتی هەڵگرت و بردی لە سالۆنەکەی دانا. لەوێشەوە چوو بۆ چێشتخانە، مەتەرێزە تاهەتاییەکەی... دەی تۆ بڵێ، ئەگەر تۆ بی چ دەکەی؟»

مادەر وەڵامی ناداتەوە. لە باتیی وەڵام، تەپڵەکی سەر مێزی بچووکی نزیک تەختی نووستن پیشانی باز دەدا.

«من هیچم نەگوت» باز بەردەوام دەبێ «دوای ئەوەی پێڵاو و پاڵتۆکەم داکەند و پاکەتەکانی دیکەم برد و لە سالۆن دامنا، منیش بە شوێن ئەودا چووم بۆ چێشتخانە و لە گیرفانی پاڵتۆکەم زەرفی بچووکی زێڕم دەرهێنا و دامێ. زەرفەکەش یارمەتیی نەدام، ئەو زەرفەکەی گرت و بێ ئەوەی بیکاتەوە لە سەر مێزی مەتبەخ داینا. — بۆچی وادەکەی؟ من بە ناڕەحەتی لێم پرسی. ئەویش قسەکەی بۆ خۆم گەڕاندەوە: تۆ بۆچی وا دەکەی؟ من بە ئەزموونی خۆم دەمزانی کە دەرمانی ئەو، زەرفەکە و زێڕی ناویەتی. کیسەیەکی دیم دەرهێنا و دامێ و پاشان وشە بە وشە وتم؛ بڕوانە، لە مێژە من لێرە نیم، من لە ڕێگەیەکی یەکجار

دوورەوە هاتـووم، مـن لـە مـەرگ و کوشـتن، لـە سـووتان و گەردەلـوول و ئاگرەوە گەڕوامەتـەوە، لـە هەرێمـی یەکجـار دووری قیـن و نەفـرەت، شـەڕ و پێکدادان هاتوومەتـەوە. مانـدووم، جەستـەم، لەشـم، مێشـک و هۆشـم، گیـان و ڕۆحـم مانـدووە، مەکـە. تێکـی مـەدە. پێویسـتم بـە حەسانەوە، گەرمایـی و ئارامـی، نەرمـی و نزیکـی هەیـە.»

-پێویسـتیی مـن؟ ئێمـە؟ ئـەی ئێمـە پێویسـتمان بـە چییـە؟ ئـەو بـۆ ئـەوەی سـەیری مـن بـکات، وتـی مـن ئیـدی ناتوانـم لێـرە بـە تەنیـا، بـێ مێـرد، بـێ پشـت و پشـتیوان، بـە مانـگان و بـە سـاڵان ئـاگام لـە منداڵەکانـت بـێ، قەرەواشـی ماڵەکـەت بـم. مـن پێویسـتم بـە کیسـەی زێـڕ نییە، پێویسـتم بـە مێردێـک، بـە هاوڕێیـەک بـە ئینسـانێک هەیـە...

-تـۆ ڕەوشـی مـن دەزانـی. مـن وتـم، لـەو هەرێمانـە، لـە نـاو شـاخ، چیـا، شـیو و دۆڵـدا، مـن لـە نـاو خۆشـی و شـادیدا نیـم. مـن بـۆ دەوڵـەت، میللـەت و وڵات لـەو شـوێنانەم. هەمیشـە لەگـەڵ مەترسـیی مـردن، هەمیشـە لـە نـاو خوێـن و ئارەقـەدا، بـەردەوام تینـوو و برسـی، بـێ خـەو و بـێ پشـوو.

-دەوڵـــەت، میللـــەت و وڵات، ئێـــوە هـــەر وتتـــان و دیســـان دووبارەتـــان کـردەوە، دەوڵـــەت، میللـەت و وڵات... مـن؟ ئێمـە؟ لـە پێشـدا ماڵەکـەت، پاشـانیش ئەوانـــی دی...

بیبڕەوە، با دیسان دەست پێنەکەین...

-مـن قسـەکانیم بـڕی، زاری پـڕ ئـازار و ژاراوی دیسـان کردبـۆوە. هەرچەنـدە مـن دەمویسـت کـە قسـە بـکات، تاقەتـم نەبـوو گـوێ لـە قسـە قۆڕەکانـی بگـرم. مـن پێویسـتم بـە قسـەی نـەرم و نیـان، ئارامـی بەخـش و گـەرم بـوو. —وتـم دوایـی قسـە بکەیـن و چوومـە حەمـام. بانیـۆم پـڕ کـرد لـە ئـاوی شـیلەتین، بـە سـابوون ئاوەکـەم کەفـاوی کـرد، ڕووت بوومـەوە و چوومـە نـاوی و بیـرم کـردەوە... تـۆ دەزانـی بیـرم لـە چـی دەکـردەوە؟...

«بە ئەرک نەبێ جگەرەیەکی دیم بدەرێ»

مـادەر هەڵدەسـتێ و جگەرەیـەک لـەو لای دیکـەی ژوورەکـەوە دێنــێ، جگـەرە بـە پاکـەت و چەرخیشـەوە. پـاش ئەوەی جگەرە دەگیرێنـێ و دەیداتە بـاز، پاکـەت و چـەرخ لـە سـەر مێـزی بچووکـی کەنـاری تەختـی نووسـتن دادەنـێ و بێدەنـگ بـە هیـوای بەردەوامیـی قسـەکانی بـاز، لێـی دەڕوانـێ. بـاز جگـەرە دەکێشـێ. جارێـک لـە ژوورەکـە و لـە دیـواری جوداکـەرەوەی ڕەنگینـی ژوورەکـە و جارێـک لـە مـادەر دەڕوانـێ. مـادەر؛ ئیـدی پیرێژنێـک، ئیـدی زۆر قەڵـەو، گـەورە، کووپـەی ڕۆن و بـەزە. مـادەر؛ ڕانـی گـەورە و ئەسـتوور، ناولنگـی قـووڵ، وەک شـیوی بـێ بـن، بیـری قـووڵ و تاریـک. مەمکـی شـل بـووی داکەوتـوو، وەک مەمکـی دایکـی جن و پەریـان کـە بـاز ئـەو کات لـە ماڵـی هەتیـوان خوێندبوویـەوە. مـادەر؛ ئەسـمەر، چـاوڕەش، لێـو ڕەش هەڵگەڕاو، هەمـوو شـوێنی جەسـتەی پـڕ لـە مـووی ڕەش. مـادەر؛ سـەرەڕای هەمـوو ئەوانـە هەنووکـەش کانـی شـەهوەت و داخـوازی. وەسـتای بـەدەن و جۆشـی بەدەنـە. مـادەر؛ چارەنووسـی بـاز.

«مـن جەسـتەی مانـدووم تـا گـەردەن نوقمـی ئاوەکـە کـرد، چـاوم بەسـت و بیـرم کـردەوە. دانـە دانـە ئـاوا بیـرم کـردەوە؛ ئەمـە چ حاڵێکـە؟... مـن دەسـەڵاتم، هێـز و توانـای قسـە، کـردار و گۆڕینـم هەیـە. مـن شـتەکان، ڕووداوەکان، پێوەندییـەکان، مرۆڤـەکان، هەرێـم و وڵاتـەکان و کات و زەمـەن دەگـۆڕم. مـۆری مـن بـە ناوچەوانـی زۆر کـەس و زۆر چارەنووسـەوە هەیـە. مـن بـڕوام هەیـە کـە مـۆری مـن لـە پێشـکەوتنی وڵات، زەمـەن و مێـژووش دەدرێ. مەگـەر شـتی گرنـگ، ویسـت و خواسـت، زانیـن و کار نییـە؟ مەگـەر مـن بـە ویسـت و خواسـت، بـە زانسـت و کارەوە بـە شـوێن ئامانجـی خۆمـەوە نیـم؟ مەگـەر بـەم هۆیـەوە نییـە کـە مـن بەهێـزم؟ بـە دەسـەڵاتم؟ فەرمانـدارم؟ بەڵـێ وەهایـە، بەڵـێ قسـەکانم توانایـە، توانـا و هێـزی مـن لـە چەکەکەمەوەیـە. هـەر بۆیـەش مـن خـاوەن هێـزم. چەکـدارم. مەگـەر مـن بـە کـردار و کـاری خۆمـەوە نەمسـەلماندووە کـە بێـزاری، دوودڵـی، سسـتی،

دڕدونگی، لەمن، لە ژیانی من دوورن. کەواتە ئەو سستی و بێزارییەم لە ماڵەوە چییە؟ بۆچی کاتێک پێم دەنێمە ناو ئەو ماڵە هەستی دوودڵی و بێزاری بە سەرمدا زاڵ دەبێ، تیری دڕدونگی لە دڵم دەدرێ؟ بۆچی من، بازی وڵاتی کێوی و وەحشی دەرەقەتی ئەو ژنە نایەم؟ بۆچی ئەو ویست و داخوازییە پیرۆزانەم، ئەو زانست و کارە پسپۆڕانەم لەو ماڵەدا فرووشێک ناکات؟ بۆچی من، فەرمانداری هێزی هەرە لێهاتووی دونیا، بەڵێ هەموو دونیا، لە بەرانبەر ئەو ژنە سەگبابە، وەک پەپوولەیەکم لێدێ؟ دڵم وەک پەپوولەیەک بە هەڵپە هەڵپ لێدەدا؟ بەڵێ، ئەوەندەی ماوەیەکی درێژ، لە ناو ئەو ئاوە گەرمەدا کە خەوی لێدەخستم، ئاوەها قووڵ، بە دوودڵی، دڕدونگ، چڵکن، بیرم دەکردەوە... تا دەنگی منداڵەکان لە دەرەوە هات...».

باز دەستی چەپی بە سەر سینگیدا دەگەڕێنێ، بە وردی سەیری مووی سینگی دەکات و هەندێک تاڵی سپی دەگرێ و خێرا لێیدەنەوێ. قژی، ریش و سمێڵی، مووی سینگ و بەدەنی، سپی بووە. تاڵی سپی، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر دەبن، ژیان دەڕوا، دونیا دەڕوا، تەمەن دەڕوا... باز جگەرە دەبات بۆ دەمی و لە پەنجەرەی گەورەی ژوورەکەوە کە پەردەی تاریکی پێوە هەڵواسراوە، دەڕوانێ. وا دیارە کە ڕۆژ بە تەواوی هەڵهاتووە. تیرێژی هەتاو لە نێوان پەردەوە خۆی دەگەیەنێتە ناو ژوورەکە.

«منداڵەکانی من، ژیانی من، هەموو شتی من هاتبوونەوە.» باز جگەرەکەی لە تەپڵەکێکدا دەکوژێنێتەوە، سەرینەکەی پشتی ڕاست دەکاتەوە و دەڵێ: «من بە پەلە سەرم شۆرد، خۆم وشک کردەوە، خاولی لە دەست بە کراس و دەرپێوە لە حەمام هاتمە دەر. کوڕەکانم لە چێشتخانە، بە ڕوخساریانەوە دیار بوو کە چاوەڕوانی منن. من لە

باوەشم گرتن، ماچم کردن، بۆنم کردن، ئای خوایە کە چەندە بیریانم کردبوو! ئەوان چەندە بالایان کێشابوو، گەورە ببوون! پاش ئەوەی حاڵ و ئەحواڵیانم پرسی و پێکەوە پاکەتی دیارییەکانمان کردەوە، چووم بۆ ژووری نووستن تاوەکوو جلەکانم لە بەر بکەم. ژوورەکە خاوێن بوو؛ تەختی گەورە ڕێک و پێک لێفە و سەرینی لە سەر ڕاخرابوو بە خەیاڵی ئەوەی کە من لەوێ بخەوم. من تاقمێک جلی نوێ و کراسێکی سپیی نوێم لە بەر کرد، قژم شانە کرد، سمێڵم دروست کرد، دەمانچەکەم خستە کەمەرم، بۆینباخێکی نە زۆر ڕەسمیم خستە گەردنم و لە ژوورەکە هاتمە دەرەوە، -منداڵەکان دەی با بڕۆین، وام گوت. لە چێشتخانەوە بۆنی خواردن و شێو نەدەهات، قەحبە دایک هیچی ساز نەکردبوو. منداڵەکان برسییان بوو، مندال بە خۆشحاڵییەوە ئەو جل و بەرگەی بۆم هێنابوون لە بەریان کرد، خۆیان کۆ کردەوە و لە بەر دەرگا ڕاوەستان. بەڵام دایکیان هیچ جووڵەیەکی نەکرد، ئەو لە چێشتخانە بە شتێکەوە، بێگومان بە شتێکی پڕ و پووچەوە، سەرقاڵ بوو. من بانگم کرد —مەگەر تۆ برسیت نییە، لەگەڵ ئێمە نایەی؟ ئەو بە کورتی وتی نا. من منداڵەکانم هەڵگرت و چووین بۆ ڕێستورانتی شارۆچکەی سەربازی. لە ڕێستۆرانت لە بەر پەنجەرەیەکی زۆر گەورە و درێژ کە بە سەر چەمی شاردا دەیڕوانی، دانیشتین و شێوێکی بێ وێنەمان خوارد کە لە چەندین جۆر پێک هاتبوو. ڕێستۆرانت گەرم بوو، لە دەرەوە، گڵۆپی بولواری شار دەدرەوشانەوە. شەوق دانەوەی گڵۆپەکانیش لە سەر ئاوی ڕووبار نازدارانە دەڕۆیی. منداڵەکان بەردەوام باسی خۆیان، خوێندن و وانەکانیان، هاوڕێ و مامۆستاکانیان، دژواری و سەختییەکانی خوێندنیان بۆ دەکردم. کوڕەکانم ئیدی گەورە ببوون و مەراقی باوک و کار و باری باوکیان دەکرد. بێگومان ئەوان دەیانزانی کە من ئەفسەرم، ئەندامی ئەرتەشم. بەڵام ئەوان باش نەیاندەزانی کە من

خەریکی چ کارێکم. بۆچی من وەها بێ هیچ هەواڵ یانیش نامەیەک لە ناکاو ون دەبووم و بە مانگان لەو وڵاتە لە بیرکراوەی ئەوپەڕی دونیا دەمامەوە؟ دایکیان، داپیرەشیان بە باشی هۆکاری ئەمەیان نەدەزانی. ئەوان هەموویان تەنیا ئەوەیان دەزانی کە من خەریکی کار و باری قورس و گرنگی دەوڵەتم. هەر ئەوەندە. ئەم ئێوارەش من هیچ وەڵامێکی ئاشکرام نەدانەوە. هەر ئەوەندەم پێیان گوت؛ من ماندوو دەبم، لەو شوێنانە دوور لە ئێوە یەکجار ماندوو دەبم. – کەواتە بۆچی تۆ ئەوەندە لەو هەرێمانە دەمێنیتەوە، داوای گواستنەوە ناکەی؟ کوڕە گەورەکەم لە نێوانی قسەکانماندا ئەمەی پرسی. من ئێستا چ وەڵامێکم بدایەتەوە؟ بە وردی سەیری ئەوان، سەیری ناو چاویانم کرد و وتم؛ «من ناچارم، لە ناچارییدایە». بە خۆشی و گاڵتە نانەکەمان خوارد، بە خۆشحالی لە ڕێستۆرانت هاتینە دەرەوە و بە شادی و کەیفخۆشی گەڕاینەوە بۆ ماڵ. بەڵام کاتێک چووینە ماڵەوە شادی و خۆشحاڵیمان کۆتایی پێهات، ئەو کاتە حەشرێک بەرپا بوو...».

لە ناکاو باز لە تەخت دێتە خوارەوە، هەڵدەستێتە سەر پێ، ئەمجار بۆ خۆی جگەرەیەک لە پاکەت دەردێنێ، دایدەگیرسێنێ و بەرەو پەنجەرەکە دەڕوا. لە بەر پەنجەرە ڕادەوەستێ، هەندێک پەردەکە لادەدا و لە کۆڵان، خانووەکانی بەرانبەر و دووکانەکانی کۆڵان کە ئیدی کراونەتەوە، دەڕوانێ. دونیا ڕووناکە، هەرچەندە هێشتا زستانە ئەمڕۆ ڕووناکییەکی زوڵاڵی سەر لە بەیانی هەیە. دووکاندارێک لە بەر دووکان لە سەر کورسییەکی بچووک دانیشتووە، جگەرە دەکێشێ، چۆتە فکرەوە و خەیاڵ بردوویەتی. ژنێک و منداڵێک لە لای چەپی کۆڵانەکەوە دیارن. منداڵ لە پێش ژنەکەوە هەڵدێ، ژنەش خێرا دەڕوا. «سەیری ئارامیی ئەم ڕۆژە بکە» باز بێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای مادەر پێی دەڵێ؛ «ئەوەندە ئارام، ئەوەندە هێمن، سادە... بەڵام ئەی ئاڵۆزکاویی من؟

بۆچـی ئـەم ئاڵۆزییـە ویرانکـەرە ژیانـی منـی تەنیوەتـەوە، بۆچـی؟...»
ئەوەنـدەی چـەن خولەکێـک بـاز وەهـا بـە پێوە، جگـەرە لـە سـەر لێو، لـە بـەر پەنجـەرە ڕادەوەسـتێ و سـەیری دەرەوە دەکات. ئێسـتا چاوانـی بـاز دیسـان تـەڕ دەبـن. «ئـەو کاتـە، وەختێـک چووینـە ماڵـەوە حەشـر بەرپـا بـوو». بـاز بـە پێـوە، ڕووی لـە مـادەر، پشـتی داوەتـە دیـوار و پەنجـەرە و دەڵـێ «قەحبـە دایـک خـۆی ئامـادە کردبـوو، چاوەڕوانـی ئێمـە بـوو... — مـن دەمهـەوێ ئێسـتا لـە لای کوڕەکانـت لەگەڵـت قسـە بکـەم، ئـەو دیسـان بـە بێـزاری و توورەییـەوە وتـی...

-من بە نەرمی وتم با دواتر قسە بکەین.

-نـا ئێسـتا، لەگـەڵ منداڵـەکان، پێویسـتە ئێمـە کێشـەکە چارەسـەر بکەیـن، مـن ئیـدی ناتوانـم خـۆم بگـرم. بـە مانگانـە کـە مـن بـە هیـوای ڕۆژێکـی ئـاوام... ئێمـە دەپەیڤیـن.

دەنگی بـەرز دەبـۆوە، هـەر دەچـوو و دەنگـی بـەرز دەکـردەوە. مـن بەرەو چێشـتخانە چـووم، ئەویـش بـە شـوێن منـدا. منداڵـەکان تێگەیشـتبوون کـە شـەپۆلی تووڕەیـی هەڵدەسـتێ و بۆیـەش چوونـە سـاڵۆنەکە. لـە چێشـتخانە مـن خـۆم ڕادەگـرت، وتـم مەکـە. هـەر پێداگریـم دەکـرد کـە دەنگـی لێـوە نەیـەت. بـەڵام ئـەو هـەر درێـژەی پێـدا. هـەر دەیگـوت دەبـێ ئێمـە ئـەم کێشـە چـارە بکەیـن. دوایـی منیـش وتـم کام کێشـە، تـۆ باسـی کام کێشـە دەکـەی؟

– کێشـەی ڕۆیشـتن و ونبوونـی تـۆ، کێشـەی تـۆ و ژنـان، کێشـەی تـۆ و ژنـی قەحبەخانـە، کێشـەی بـێ خەمیـی تـۆ بـۆ مـاڵ و خێـزان، کێشـەی بارگرژیـت و سـەختییەکانی مـاڵ، کوڕەکانـت، کێشـەی تەنیـا بـوون... کێشـەی تـرس...

تـرس؟ مـن ئـەو کێشـانەی دی تێگەیشـتم، بـەڵام ئـەو ترسـە چـی بـوو؟ ترسـی چـی؟ دیسـان لێـم پرسـی.

– ترسی ئەوەی کە منداڵەکانت هەتیو بکەون، وەک خۆت بێ باوک بە هەتیوی و سەرکزی گەورە ببن.

من ئیدی خۆم پێ ڕانەگیرا، قیژاندم بە سەریدا: بیبڕەوە، حەیوان، بیبڕەوە!

نا، نایبڕمەوە، ئەو بە قیڕە و هاوار بۆ منی دووبارە دەکردەوە، مەگەر ئەمە ڕاستییەکەی تۆ نییە؟ بۆچی ڕووی خۆت لە ڕاستییەکەت وەردەگێڕی؟ تۆ هەتیو نیت؟ بێ باوک و بێ ماڵ نیت؟ بۆچی دەتهەوێ کوڕەکانیشت وەها بن؟

ئەمجار دیسان دونیا لە پێش چاوم تاریک بوو. ئەمجار دیسان برووسکەی نەفرەت و توندی لە دڵ و مێشکی دام:

– کەر، کچی کەران!... وام پێ گوت و زللەیەکی توندم لێدا. وەک بڵێی خۆی بۆ ئەمە ئامادە کردبێ، کەمێک خۆی لادا. پاشان بە نەفرەتەوە، بە ڕقێکی بێپایانەوە، سەیری منی کرد، بە نیگایەکی یەکجار تیژ لە منی ڕوانی و وتی...»

باز قسەکانی دەبڕێ. ڕووی لە مادەر وەردەگێڕێتەوە، دیسان دەڕواتەوە بۆ لای پەنجەرە، تۆزێک پەردەکە لادەدا، سەیری دەرەوە دەکات، پەردەکە بەر دەداتەوە، لە ژووری گەورەدا دەست بە پیاسە و هات و چۆ دەکات. ئەو بە باڵای بەرزیەوە ، ڕووت و قووت، زگی هەندێک کەوتۆتە پێش، بە هەنگاوی قورس، سەری لە بەر دەمی، دێت و دەچێت، دەچێت و دێت.

«ئەو وتی» باز دەگەڕێتەوە سەر جێگاکەی، ڕادەکشێ و دەڵێ:

«کەری کوڕی کەران، کوڕی بێکەس و نانەجیبان... و ئەو وەک بزنێکی کێوی خۆی هەڵدایە سەرم... ئیدی چی بوو، چی قەوما، نایەتەوە یادم. بەڵام دوای ماوەیەک، پێموابێ ماوەیەکی درێژ، بە هاوار هاواری کوڕەکان، بە خۆمدا هاتمەوە. خوێن هەموو جێیەکی چێشتخانەکەی گرتبوو. کوڕەکان وەک گەشکەیان لێ هاتبێ، چاوترساو، لە بەر دەرگای

چێشتخانە هاوار هاواریان بوو. هەرچی من بووم، لە زەویدا کەوتبووم. نا، نەک لە زەوی، بە سەر ئەو قەحبە دایکەوە دانیشتبووم. دەمانچەکەم بە دەستمەوە، بە قەبرخەی دەمانچە لێمدەدا. هیچ دەنگێک لەو دێڵەوە نەدەهات، لە زاری ژاراوییەوە ئیدی وشەی ژاراوی دەرنەدەهات. دەم، ڕوو، سەر، جل و بەرگەکانی یەکسەر خوێن بوو. دەستی من بە دەمانچەکەوە خوێناوی بوو. من ڕاوەستام، بە ئارامی لە سەری هەستام. بەرەو کوڕەکان هاتم. کوڕەکان هەڵهاتن و چوونە ناو ساڵۆنی بە شەوقی مانگ ڕووناک. دەمانچەکەم خستە گیرفانی ژاکەتەکەم، لە چێشتخانە دەستی خۆم شۆرد و چوومە ناو ساڵۆنەکە. کوڕەکان لە باوەشی یەکدا لە بەر پەنجەرەکە دەلەرزین. من بەرەو ئەوان چووم تاوەکوو لە باوەشیان بگرم. بەڵام دەستیان کرد بە قیڕە و هاوار. من بێدەنگ گەڕامەوە، هاتمە بەر دەرگا، پێڵاوەکانم لە پێ کرد، پاڵتۆکەم خستە سەر شانم و هاتمە دەرەوە. تا بەرەبەیان هەروا سەرگێژ، سەرسام لە بەر پەڕاوی چەم کە بە شەوقی گڵۆپی بولوار ڕووناک دەبۆوە، گەڕام. پاشانیش پێیەکانم منیان هێنا بەرەو ئێرە، بەرەو ماڵی تۆ...».

ئەمجار دوای ئەوەی قسەکانی تەواو دەبێ، بە ئارامی سەری هەڵدێنێ و سەیری مادەر دەکات. لە چاوانییەوە چەند فرمێسک بەر دەبێتەوە. «بەڵام من هەڵەم کرد» باز چاوی تەڕی لە مادەر و هۆشی لە جێگەیەکی دی دەڵێ؛ «دەبوو چەند فیشەکم بنایە بە سەریەوە...».

«نا» مادەر دەڵێ، هەندێک ڕوو بە لای بازدا دەکات و باز بەرەو لای خۆی دەکێشێ. «پێویستە بزانی مردن و کوشتن هیچ چارەیەک نین... تۆیش دەبێ بزانی ئەوانە چارە نین...».

باز دەڵێ «چارەیە» و بە هاوکاریی جووڵەی مادەر، سەری دەخاتە نێوان مەمکەکانی مادەر. بەڵام جێگەی مادەر، دانیشتنەکەی ئاسوودە نییە. جێگەی خۆی ڕاست دەکاتەوە، خۆی و باز، بە هەمان شێوە

سەری لە ناو مەمکەکاندا ، لە سەر نوێن ڕادەکشێنەوە . باز هێشتا دڵی پڕە، هەنووکە هۆشی، هەست و سۆزی لە جێگایەکی دیکەیە . مادەر بە نەرمی باز دەکێشێتە سەر خۆی، لاقە قەڵەوەکانی لە یەک دەکاتەوە و بە هەر دوو دەست ئارام ئارام گەردن، پشت و ڕانی باز دەماڵێ . «کوڕی من، کوڕەکەم، برینداڕەکەم، دە ئارام بەوە، من دەتحەوێنمەوە» مادەر ئەمە دەڵێ. پەنجە قەڵەوەکانی مادەر کە لە بەر بەز خڕخڕ بوون، لە سەر پشت، کەمەر و ڕانی باز دەگەڕێن. بەڵام باز کە هێشتاش دڵی پڕە، ناجووڵێ، ناتوانێ خۆی بجووڵێنێ. پاش چەند خولەکێک، مادەر بێ ئەوەی هەڵبستێ بە ئارامی باز لە سەر خۆی لادەبات و دەیهێنێتە تەنیشتی. باز چاو نووقاو، هەر دوو دەستی دەخاتە ژێر سەری خۆی و لاقەکانی درێژ دەکاتەوە و خەو دەیباتەوە. «ئەها، ئاوەها، ئەها، ئاوەها» مادەر وا دەڵێت و لێوە گۆشتنە ڕەنگ گیراوەکانی دەبا بۆ گەردنی باز. لە گەردنەوە تا بەرزگ، مادەر بە هونەرمەندی و وەک وەستایەکی بێهاوتا، جارێک باز ڕادەمووسێ و جارجارەش دەیمژێ. هێدی هێدی. بە گەرمی. بە لێوی تەڕ. سەری لە نێوان لنگی بازدا، لە دەور و پشتی ژێرزگی ماوەیەکی درێژ دەمێنێتەوە. تاوەکوو باز دەچێتە خەو. بەڵێ، باز کە لە گەرمای ژنان لە ناکاو ڕادەچڵەکا،[ئەمجارەیان] ماندوویەتی، سەرسامی و بێ خەوی بە ئارامی دەیخاتە ناو شەپۆلی خەو و لەگەڵ خۆی دەیبا .

کاتژمێر تێدەپەڕن، کات دەگاتە ئێوارە . کاتێک باز لە خەو هەڵدەستێ، لە ناو نوێندا بە تەنیایە . مادەر نییە . گڵۆپی بچووکی شەو لە پاڵ سەریدا داگیرساوە . باز کەمێک خۆی لە ناو نوێندا دێنێتە یەک. سەرینی تەنیشتی دادەنێتە سەر سەرینەکەی خۆی و لاقی ڕادەکێشێ و دادەنیشێ. سەر و بەدەنی دێشێ. باریکە ژانێک گەردن، شان و پێی ئازار دەدات. باز پاکەتی جگەرەی سەر مێزی تەنیشت هەڵدەگرێ، لەو

کاتــەدا کاغــەزی ســەر پاکەتەکــە دەبینــێ. مــادەر بــە دەســتخەتی هەڵــە و خــوار و خێچــی خــۆی کــە بــە ســەختی دەخوێنرێتــەوە، نووســیویەتی؛ کوڕە بێ باوکەکەم، بحەسێوە، هەمــوو شــتێک لــە ماڵــەوە هەیــە خــواردن، خواردنــەوە لــە چێشــتخانەیە. مــن درەنــگ دێمــەوە.

بــاز لــە پەیڤــی «کــوڕە بــێ باوکەکــەم» تــووڕە دەبــێ و دەڵــێ «قەحبــە دایــک، ژنــی قەحبەخانــە! مەگــەر قەحبــە دایــک هــەر یەکێکــە؟» بــاز نەفــەس بــە نەفــەس، ئــارام جگــەرە دەکێشــێ. «لێــرە ئــەم قەحبــە دایکەیــە کــە لــە بــەر چــەوری و بــەز خەریکــە دەخنکــێ و لەوێــش ئــەو قەحبــە دایکــە کــە لــە بــەر ڕق و نەفــرەت تەقیــوە»، بــاز دیســان وا دەڵــێ یــان بــا بڵێیــن وا بیــر دەکاتــەوە. ئــەو قەحبــە دایکانــە؛ لــە خۆبایــی، مەغــروور، پــارە و زێــڕ پەرســت، مــاڵ و موڵــک پەرســت، خوداکەیــان، ئاییــن و بڕواکەیــان پــارە، زێڕ، ماڵ و موڵکە. جگــە لــە خۆیــان بیــر نــە لــە کەســێک و نــە لــە شــتێک دەکەنــەوە. مەغــروور، بەڕەڵــڵا، بەغیــل. نــە وڵات و میللــەت، نــە دەوڵــەت و ئەرتــەش، هــەر تەنهــا خۆیــان. تەنیــا مــن. مــن، مــن، مــن. بەرژەوەندیــی مــن، ژیانــی مــن، ئاسایشــی مــن. هەمــوو شــتێک دەبــێ بــە مەیلــی ئــەو بــێ، بــە ویســتی ئــەو بــێ. هەمــوو جموجــۆڵ، پەیوەنــدی، خەبــات و کارێــک بــە دڵــی ئــەو بــێ. لــە ماڵــی خــۆی، لــە چێشــتخانەی خــۆی، پۆشــاکی خاوێنــی خــۆی، بــەڵام دڵ پیــس، ڕۆح وێــران، بــێ ویــژدان، ســارد و ســڕ، ڕۆح ســارد، وەک مارێــک کــە بــە مرۆڤــەوە دەدات. و لێــرەش ئــەم قەحبــە دایکــە؛ ئەحمــەق، ســادە، لــە دونیــا و لــە حــاڵ و وەزعــی مرۆڤــان بــە دوور. تەنیــا لێــزان و وەســتای شــتێک، خــواردن، خواردنــەوە، خەوتــن و لنــگ هەڵێنــان. کــێ دەمــرێ، کــێ دەمێنــێ، چــی دەبــێ، چــی دەقەومــێ؟ هــەر بــە خەیاڵیشــیدا نایــەت. تێرخــەو، تێــر خــوارن، میراتــی، بــەرازی، چــەوری و بــەز، بەرازێــک کــە لــە خــواردن و تێکوتــان و مژیــن قــەت تێــر نابێــت...

بــاز بــە تووڕەیــی لــە نــاو نوێــن هەڵدەســتێ. ســەیری ســەعاتی ســەر

مێزەکە دەکات و دەچێتە خوارەوە بۆ چێشتخانە. گڵۆپی چێشتخانە دادەگیرسێنێ، سەیری ناو چێشتخانە، مێز و کورسیی دەوری مێز دەکات و دەچێتە بەر سەلاجەکە و دەرگاکەی دەکاتەوە. ڕەفەکانی سەلاجە لەگەڵ مەنجەڵی لێوانلێو لە خواردن، سەوزە و میوە. باز سەری قازانێکی بچووک لادەبات؛ قازانەکە یاپراخی تێدایە. قازانەکە هەڵدەگرێ و دەچێتە بەر مێزەکە. لە سەر کورسییەک دادەنیشێت، بە دەست، دەست دەکا بە خواردنی دۆڵمەی سارد. دانە دانە، ئارام ئارام. پەردەی چێشتخانەش هەروەک هی ژوورەکە دادراوەتەوە. لە دەرەوە دەنگی چەند کەسێک و ئۆتۆمبیل دێت. دوای ئەوەی هەموو دۆڵمەکە دەخوات هەڵدەستێ کاسەیەک ئاویش دەخواتەوە و بەرەو تەلەفۆنە هەڵواسراوەکەی سەر دیواری چێشتخانە دەچێت. تەلەفۆنی ڕەشی بچووک دەگرێ بە دەستییەوە و دەست دەنێ بە دوگمەی ژمارەکانیدا؛ تەلەفۆن بۆ ئەفسەری سمێڵ قیت دەکات. بەڵام کاتێک دەنگی ژنێک دێتە گوێی، ڕووی ترش دەبێت. بەڵێ، ژنەکەی ئەفسەری سمێڵ قیتە. باز دەڵێ «منم، من» و بێ ئەوەی زۆر درێژەی پێ بدات قسەکەی دەبڕێ و دەڵێ «بیدە بە مامە» و چەند خولەکێک بێدەنگ ڕادەوەستێ. پاشان دەڵێ «نا من لە ماڵ نیم، نا لە ماڵی ئەفسەرانیش نیم... لە شوێنێکی دیم، لێی گەڕێ... مەقیرێنە» ڕوخساری باز سوور دەبێتەوە، بە دەنگێکی بەرز قسەکانی دووبارە دەکاتەوە «من دەڵێم مەقیرێنە... بەڵێ، منیش دەمهەوێ لەگەڵ تۆ قسە بکەم، ئێستا، ئەمشەو... کەواتە بەیانی، بەیانی یەکدی دەبینین... نا، لێرە نا، لەو بەری مەیدانەکە لە پشت پەیکەرەکەی ژەنەڕاڵ سەرداراوەوە کافتریایەک هەیە، لەوێ... باشە؟ کاتژمێر نۆی سەر لە بەیانی... کەواتە کاتژمێر دە... باشە؟...»پاش ئەوەی باز تەلەفۆنەکە دادەخات، دەڵێ «بێ ناموسی گەوواد، تۆ ڕاستییەکان مەڵێ و لە منی بشارەوە، بێشەرەف...».

باز لە چێشتخانە دێتە دەرەوە و دەچێتە سەرەوە و دیسان دەچێتە ژووری نووستن. ئێستا کەمێک سەرمایەتی. بۆ ئەوەی جلەکانی لە بەر بکات، پاڵتۆکەی دەخاتە سەر شانی و دەچێتە بەر دۆلابێکی درێژ ڕادەوەستێ. شووشەی خواردنەوە و قەدەحەکانی مادەر لە دۆلابەکەدان. دەرگای دۆڵاب دەکاتەوە، لە شووشە ڕیز کراوەکان دەڕوانێ؛ شووشەیەک ڤۆدکا لە ناویاندا هەڵدەگرێ و قەدەحێکی بچووکی لێ پڕ دەکات و بە جارێک دەیخواتەوە. قەدەحێکی دی پڕ دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ لای حەمامەکە. لە حەمامەکەدا، دوای ئەوەی گلۆپەکە دادەگیرسێنێ، لە بەر ئاوێنە درێژەکەی حەمام ڕادەوەستێ و سەیری خۆی، سەیری دەم و چاو و ڕوخساری خۆی دەکات، ئاوێنەکە لە سووچێکیەوە تا نیوەی شکاوە، بەڵام پارچە شکاوەکان لێک نەبوونەتەوە. وێنەی ناو ئاوێنەکەی بازیش، شکاو و شکستە لە باز دەڕوانێت.

وێنەیەکی شکستە، ڕوخسارێکی شکستە، نیگایەکی شکستە.

سێ خەتی قووڵی سوور لە سەر ڕوخساری باز، لە ژێر چاو، لە سەر لووت و گۆنایدا بەدی دەکرێت؛ شوێنپەنجەی ئەو قەحبە دایکە. مووی چەناگە و قژی باز ئیدی سپی دەچێتەوە. چرچ و لۆچیی سەر ناوچەوانی ئیدی ئێستا قووڵتر دیارن. یەک دوو کیسەی بچووک لە ژێر چاویدا درووست بووە. باز لە وێنەکەی بەرانبەری دەڕوانێت و دەقیرێنێ: «تۆ کێیت؟ بڵێ کێیت تۆ؟ ڕوخساری شکستە، ڕوخساری بریندار...» ئەو ڕوخسارە درێژە، ئەو چاوە بچکۆلانە... چاوی لە شێوەی چاوی بازێک. چاوانی نێچیرێک؛ چاوانی نێچیرێک؟ تەوێڵی کراوە، لووتی کەمێک درێژی داکەوتوو، چەناگەی درێژ و پان. ئەو ڕوخسارە، ئەو نیگایە لە هی کەسێک دەچێ؟ لە هی باو و باپیران؟ کوا باو و باپیران؟ ئەوان لە کوێن، کێن؟ لە هی مامە و برازا، خاڵۆ و خوشکەزا؟ کوا ئەوانە کێن؟ بێکەس... هەتیو... کوڕی بێ باوک و بێ بنەچە! بەڵێ، دەقاودەق

هەروەها، هەروەک ئەوەی ئەو قەحبە دایکە جار و بار دەیڵێ؛ بێکەس، بێ بنەچە. ڕاستییەکەی وەهایە...

«کێیت، تۆ کێیت؟» باز هاوار دەکات، پاشان لە قەدەحەکەی دەستی چەند قوم دەخواتەوە، ئەمجار بێدەنگ سەیری ئاوێنە دەکات و بیر دەکاتەوە؛ بیر بکەوە، لە شەوان و ڕۆژانی بێ خەویت، لە کات و کاتژمێرانی هەرە دژوارت. تۆ قەت بیرت کردۆتەوە کە تۆ کێیت. تۆ قەت لە خۆت، لە کەسێکی دیت پرسی کە تۆ کێیت و لە کوێوە هاتووی؟ دەور و بەرەکەت بەهایەکت پێدەدەن، و خۆشتیان دەوێ. بەڕێزیت، و ڕێزت هەیە، زۆر جاران لە بەر ترس و سام لێت نزیک دەبنەوە. تۆ؛ ئەفسەرێکی بەهێز، بەوەفا، ژیر، نەترس، خاوەن قسە. تۆ؛ نیگایەکی بەهێز، ڕۆیشتنێکی بەهێز و قایم. بەژنێکی جوان و ڕاست، بیر و باوەڕێکی بەهێز و ئارام، هزری جوان و ڕۆشن و دوور لە شک و گومان. دونیا و ژیانێکی بەهێز و دوور لە دڕدونگی. بەڵێ، هەموو کەسێک، دەور و بەرەکەت وا بیر دەکەنەوە. بەڵام تۆ، مێژووی تۆ؟ کاتە نەزانراوەکانی ئەم ژیانە؟ قۆناغە پێوراوەکانی ئەم دونیایە؟ دە بڵێ، تۆ کێیت! وەڵام بدەوە ڕوخساری شکستە، کێیت تۆ؟!

باز بە وردی دەست و ڕووی خۆی دەشوا. کە ئاو لە جێ پەنجەکان دەکەوێ، دەکزێنێتەوە. باز بە دەسترەیەک دەموچاوی وشک دەکاتەوە و جارێکی دی سەیری ئاوێنەی شکستە دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ ژووری نووستن. لە ناو ژوورەکە، دەچێت و لە دۆڵابەکە شووشەی قۆدکا دەردێنێ، پاڵتۆکەی دادەنێتە سەر کورسییەکە و دێتە سەر جێگاکە. دیسان قەدەحەکە پڕ دەکات و لە سەر جێگاکەی پاڵ دەدات بە سەرینەکانەوە و ڕادەکشێ. باز ماندووە، ماندوویەتیی شەوی ڕابردوو، ماندوویەتیی ڕۆژان، مانگان و سالآن، بازی سست کردووە. دوای خواردنەوەی سێ قەدەحی دی، باز دووبارە خەوی لێدەکەوێ و بە ئارامی دەچێتە قووڵایی خەوەوە.

دوای ماوەیەکی درێژی خەو، بە دەنگی پرخە پرخێکی بێکۆتایی خەبەری دەبێتەوە. مادەر هاتۆتەوە و لە تەنیشتی ئەم نوستووە. باز بەرەو مێزە بچووکەکە دادەنەوێ و سەیری سەعات دەکات. ڕۆژێکی نوێ دەستی پێکردووە. ڕۆژێکی نوێ، ژیانێکی نوێ. ڕۆژێکی نوێ، ئەزموونێکی نوێ. ئەمڕۆ، ئەمڕۆ ئەفسەری سمێڵ قیت دەبینێ کە باوکایەتی بۆ کردووە و ڕێگەی چارەنووسی ئەمڕۆی بۆ دیاریی کردوە. دوانیوەڕۆش، کاتژمێر دوو دەچێت بۆ قەرارگەی ئەرتەش بۆ لای ژەنەراڵ و سەرئەفسەرەکانی کە بەرپرسیار بوون. باز لە سەر تەختی نوستن بە ئارامی بێ ئەوەی مادەر خەبەر بکاتەوە، دێتە خوار و دەچێت بۆ حەمام. بەڵام سەرمایەتی. ژووری نوستن و قاتی سەرەوە ئێستا کەمێک فێنکە. ئەو بە هەنگاوی سووک، دەگەڕێتەوە ناو ژوورەکە. لە سەر ئەو کورسییەی کە باز پاڵتۆکەی دانابوو، ئێستا جووتێک گۆرەوی، دەرپێ، کراسێکی بەنی سپی و ژێر کراسێکی سپیی خاوێن دانراون. باز ڕوو دەکاتە مادەر و لێی دەڕوانێ. مادەر؛ هۆشمەند، دلسۆز، وەفادار، دایک، دۆست... باز جل و بەرگەکان هەڵدەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ حەمام. ئەوەندەی ماوەیەکی درێژ بە پێوە میز دەکات، دەست و ڕووی خۆی دەشوا، لە ئاوێنەدا سەیری خۆی، سەیری ڕوخساری بریندار و شکستەی خۆی دەکات. ئایا ڕیش و سمێڵی درێژبووی بتاشێ یان کەمێک کورتی بکاتەوە؟ باز دەستی لێ هەڵدەگرێ. خۆ دوای ماوەیەکی کورت، دیسان دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەرێمە وێران و لە بیرکراوانە، هەرێمی ڕێش و سمێڵان. بەڵام ئەو ئێستاکە چۆن بەو جێ پەنجانەوە بچێتە دەرەوە؟ خەڵک، ئەو کەسانەی دەیبینن چی دەڵێن؟ سەیری دەور و بەری خۆی دەکات، دۆڵابە بچووکەکەی حەمام دەکاتەوە و لێی دەڕوانێ. دۆڵاب پڕە لە شووشە و قوتووی بۆن و کرێمی مادەر. باز سەیریان دەکات و چاوی بەو پۆدرەی مادەر دەکەوێ کە چەند ڕەنگە. لەوەیان کە تۆزێک تاریکترە دەدا لە

ڕوومەتی خۆی. جل و بەرگەکان لە بەر دەکات و دیسان، بەهەنگاوی زۆر ئارام دێتەوە بۆ ژووری نووستن. دەچێتە پێش ئەو کورسییەی جل و بەرگی لە سەرە. پانتۆڵ و ژاکەتەکەی لە بەر دەکات. پشتێنەی بارێتا کە دەمانچە ومەخزەنی پێوەیە لە پشتی دەبەستێ. پاڵتۆکەی هەڵدەگرێ و بەرەو دەرگاکە دەچێ. بەڵام لە بەر دەرگا ڕادەوەستێ. ئایا هەروا بێ خەبەر بڕوات؟ ئایا مادەر خەبەر نەکاتەوە؟ ئایا ئەویش وەک ئەوەی مادەر کردبووی چەند دێڕێک بنووسێت و دایبنێتە سەر مێزەکە؟ مادەر بە پرخە پرخەوە خەوتووە. دەمارەکانی گەردنی ڕەش دەچنەوە، لە ژوور لێوی سەرەوەی، مووی ڕەش وەک سمێڵ دیارە. باز ماوەیەک بیر دەکاتەوە، پاشان دەمانچەکەی دەردێنێ و مەخزەنەکەی لێدەکاتەوە و فیشەکێکی لێ دەردێنێ و لە سەر مێزی بچووک دایدەنێ. بەڵێ، فیشەکێک، نە نامە، نە سڵاو، نە خەبەرکردنەوە، نە قسەیەکی دیش، تەنیا فیشەکێکی پڕ، ڕووت.

باز لە بەر دەرگا پێڵاوەکانی لە پێ دەکات و دەڕوات.

کاتێک باز بە سوارییی تاکسییەک، لە لایەکی پایتەختی گەورەوە، لە گەڕەکی قەحبەخانەوە، بەرەو لایەکی دیکەی شار، واتە مەیدانی مەزنی ماڵی ئەفسەران دێت و دەچێتە ناو کافتریای کەناری مەیدان، کاتژمێر ڕێک دەی بەیانییە. هێشتا کەسی دی لە کافتریا نییە. کافتریا تازە کراوەتەوە. ئەفسەری سمێڵ قیت هێشتا نەهاتووە. باز لە سووچێکی زۆر ناوەوە لە نزیکی پەنجەرەیەک کە لە مەیدان دەڕوانێ، دادەنیشێت و لەو گارسۆنەی کە تا پێش مێزەکە لەگەڵی هاتووە دەپرسێ ئایا شۆرباوێکی گەرمیان هەیە؟ بەڵێ، هەیە. باز داوای شۆرباوێک دەکات و پاکەتی جگەرە دەردێنێ. تەنیا یەک جگەرەی تێدا ماوە. ئەوەش دادەگیرسێنێ و سەیری دەرەوە دەکات. مەیدانی گەورە، لەو لاوەی مەیدانی ماڵی ئەفسەران، هەیکەلی لە ڕادە بەدەر گەورەی ژەنەڕاڵ سەردار، لە

هەمان شوێنی خۆیدایە. دونیا دەگۆڕدرێ، کات تێدەپەڕێ، ڕووداوی نوێ دەقەومن، بەڵام ئەو هەمیشە وەک خۆیەتی، لە جێگای خۆیدا. هەرچەندە ئێستا پشتی ژەنەڕاڵ سەردار لە بازە، بەڵام لە بیست و چەند ساڵێک پێش ئێستاوە، ئەو هەمیشە لەم مەیدانە، ڕێگەی پێشانی وڵات، دەوڵەت و میللەت داوە. ژەنەڕاڵ سەردار، سەرداری باز و ڕێبەریشیەتی. شەوی زەماوەندەکەی دێتەوە یادی. ئەو شەوەی ژەنەڕاڵ سەردار هاتبوو. شەوی هەڵپەڕکێ و شایی، شەوی زەفاف و پەردە، کە بە هیوا، جۆش و خرۆش دەستی پێکرد و بە خوێن، لێ نەک خوێنی سەر خامی سپیی تەختی نووستن، بەڵکوو بە خوێنی جەستە جوانەکان، کۆتایی هاتبوو.

«خۆزگە ئەو قەحبە دایکە ئەو کات دەمرد و لێی ڕزگار دەبووم» باز بیر دەکاتەوە. ئەو نەمرد، ئەگەر خەنجەر کەمێکی دی بچووبایەتە قووڵایی، دەگەشتە دڵی. بەڵام وا نەبوو. پاش دە ڕۆژ مانەوە لە نەخۆشخانە، ئەو لەگەڵ باوکی، ئەفسەری سمێڵ قیت و چەند ناسیاوێکی دی، گەڕایەوە بۆ ماڵ. ئەوان کێشەکەیان شاردەوە، سەریان گرت و پێکیان هێنانەوە. خۆزگە پێک نەدەهاتن! سارد، سارد، سارد، هەمیشە سارد و سڕ. بەردەوام بیانی، هەمیشە دوژمن — لە چیاییەکانی وڵاتی چیا غەریبتر، دوژمنتر... کوڕێکیان بوو، هیوای ڕۆژگارێکی گەرم ساز بوو، بەڵام وا دەرنەچوو. دیسان سارد و سڕ. دوای چەند ساڵێک کوڕێکی دی، بەڵام دیسان نا. هەمیشە سارد، تەنانەت کاتێک باز لنگی ئەوی دەکردەوە و دەکەوتە ناو قووڵایی ئەو و بە وشەی نەرم و گەرمی وەک مەرجانان ئەیدواند، تەنانەت ئەو کاتەش سارد. سارد و دوژمن. لە دوژمنەکانی چیاکان دوژمنتر. دوژمنێک کە لە ماڵەوە بێت، دوژمنی هەرە خراپە!...

شۆرباوەکەی دەگات. باز چەند پاروویەک نان دەخاتە ناو شۆرباو و بە کەوچک بەر دەبێتە سەر ئەو شۆرباوەی کە هەڵمێکی گەرمی لێ هەڵدەستێ. لەم کاتەدا ئەفسەری سمێڵ قیتیش دەردەکەوێ؛ کورتە باڵا،

هەژار، قژ ئاڵۆزکاو، تووڕەییەکی ئاشکرا لە سەر ڕوخسار، بە جل و بەرگی شەق و شڕ و کۆنی مەدەنیەوە. ئایا ئەو پیاوە کورتتر بۆتەوە؟ باز لە جێگاکەی هەڵدەستێ، دەستی ڕاستی بەرەو لای ئەو ڕادەکێشێ و ئاماژە بە شوێنی ڕووبەڕوی جێگەی خۆی دەکات. ئەو دەستی باز ناگرێ، ڕوو ترش لە بەرانبەر بازدا دادەنیشێ. هیچ ناڵێ. بازیش هیچ ناڵێ. ئەوەندەی ماوەیەک ئەوان هەروا بێدەنگ سەیری یەک دەکەن. چاوی ئەفسەری سمێڵ قیت چووە بە قووڵا، پێڵووی چاوە بەڵەکەکانی هەڵاوساون، سمێڵە قیتەکەی کە سپی دەچێتەوە، ئێستا باریکترە. پێستی ڕوخساری ئەسمەری پڕ چرچ و لۆچە. لە سەر گلێنەی چاوە ماندووەکانی تروسکەی تووڕەیی و بێزاری دیارن. ئەم مرۆڤە، تەنیا ئەم پیرەمێردە ئاگای لە بەسەرهاتی باز و لە هەموو ژیانی باز هەیە. ئەو باوکایەتی بۆ کردووە، خاوەنداریی لێکردووە. ئەو ئەمی خستە سەر ڕێگەی تیاچوون. ئەم پیرە پەڕپووتە بوو کە باز هێندەی نرخ و بەهای دەدایە و نەیدەهێشت قسەی بێتە دوو. ئەمڕۆ ئێستا دەبێ ئەو بپەیڤێ، دەبێ [دەروونی] داخراوی بکاتەوە و سەرجەم ئەو شتانەی دەیانزانێ و ئاگای لێیان هەیە، یەکە بە یەکە بە بازی بڵێ.

باز بە نەرمی لێیدەپرسێ: «تۆیش شۆرباوێک ناخۆی؟ گەرمە...».

ئەو وەڵام ناداتەوە، تەنیا لە باز، لە سەر و بەچکی باز دەڕوانێت.

«نەخۆشییەکەت چۆنە؟ بیستم کە دڵت ئێستا باشترە...»

وەلامێک نییە، ئەو تەنیا بە نیگایەکی تیژ، بە خێسەوە بەڵام غەمگین لە باز دەڕوانێ. قسە بێسوودە، باز ڕووی لێ هەڵدەگەڕێنێتەوە و دەچێتەوە سەر شۆرباوەکە و کەوچکی تێدەخات. شۆرباوەکە تەواو دەکات، دەمی بە کلینیکسێک دەسڕێ و دیسان سەیری دەکات. لەو کاتەدا ئەفسەری سمێڵ قیت زاری دەکاتەوە، قیڕەیەکی تیژ و بەرز لە زاری دێتە دەر؛

«کوڕە... ئەمە چ حاڵێکە؟ تۆ کەی دەبیتە ئینسان، کوڕە...»

«ئارام بە» باز بە ئارامی دەڵێ.

«ئارام؟... من ئارام بم! کوڕە تۆ دەزانی چیت بە سەر ئەو کچە بێ تاوانەدا هێناوە؟ کوڕە، گەوواد، کوڕی گەووادان! مەگەر مرۆڤ کاری وا دەکات؟ ئێمە تۆمان گەورە کرد. ئێمە ئەو کچە پەپوولەمان بە تۆ دا کە وای بە سەر بێنی؟ خوێڕی، کوڕە... تۆ کچەکەت خستۆتە کۆما... کوڕە بێویژدان، مرۆڤ دوژمنەکەشی وا لێناکات!»

«ئارام بە، ئێوە ئەوتان دا بە من وماڵمتان کاول کرد... بەڵام، بیبڕەوە.

«من ئارام بم!.. ئێمە بیبڕینەوە، هەموو شتێکت، هەموو تاوانێکت بشارینەوە و بێدەنگ بین! کوڕە ئەمە جاری چەندەمە، بڵێ جاری چەندەمە؟...»

«قیڕە قیڕ مەکە... من نەهاتووم بۆ ئێرە کە گوێ لە قیڕە قیڕی تۆ بگرم... من بۆ شتێکی دی هاتووم... پێم بڵێ کە من کێم، چیم، خەڵکی کوێم، دایک و باوکم کێن، ئەو شتانەی پێمت نەوتووە ئێستا دانە بە دانە پێم بڵێ...»

«سەرەتا تۆ وەڵامی من بدەوە، گەوواد! بۆچی وا دەکەی؟ بۆچی دەتەوێ ئەو بێ تاوانە بکوژی؟ تۆ نازانی کە منیش ئەو کات مێشکت پرش و بڵاو دەکەمەوە؟ کوڕی سەگ!...»

«بڕوانە» باز، کاسەی شۆرباو و سینیی نانەکە دەداتە لایەکی مێزەکە و هەر دوو دەستی دادەنێتە سەر مێزەکە و دەڵێ «دواجار پێت دەڵێم، بیبڕەوە، ئارام بە... و هەموو شتێکم پێ بڵێ...»

ئەمجار ئەو پەردە ڕەشەی کە پێش چاوی باز دەگرێ، دیسان چاوی دەگرێتەوە. وەک ئەوەی بوومەلەرزەیەک لە هەموو دڵ، مێشک و جەستەی دابێ، خۆی کۆ دەکاتەوە، لە سەر مێزەوە خۆی کەمێک دادەنەوێنێ

و بە دەستی ڕاستی بە هەموو توانای شەپەزللەیەکی یەکجار توند لە ڕوخساری ئەفسەری سمێڵ قیت دەدا. دەنگی تەقینەوەیەک لە زللە دێت. ئەفسەر لە جێکەی دادەکەوێ، بەڵام هێز لە خۆی دەدا، هەڵدەستێتەوە، دیسان دادەنیشێ و بە چاوی ئەبڵەق، ماتماو، لە باز دەڕوانێ. هەروا دەڕوانێ، بە تەنیا ڕاوەستاو و سەکناو، بێدەنگ دەڕوانێ. ئەو دەلەرزێ، هەر دوو لێوی دەخاتە بەر دانی و گازی لێدەگرێ. ڕوخساری ئێستا یەکجار زەرد هەڵگەڕاو، وەک بڵێی جەستەی خوێنی تیا نەمابێ، وەک ئەوەی هەموو جەستەی ئەنگاوتبێ، بە هەمان ئاقاری ڕاستدا دەڕوانێ. پاشان ئەو ڕووناکییە کەمەی چاوانیشی دەکوژێتەوە و بە ئارامی بەر دەبێتەوە سەر زەوی.

# ٩

## خەو

کۆتـر. کۆتـری ژیـان، کۆتـری سـترانی ژیـان. کۆتـری ژیانـی وڵاتـی چیـا. کۆتـری شـاخەکانی وڵاتـی چیـا. کۆتـر لـە وڵاتـی چیـا، لـە سـەر چیـاکان.

بەڵێ ئێمە دەگەڕێینەوە لای کۆتر.

لـە مانگـەکان، نیسـانە، سـەرەتای نیسـانە. کات سـپێدەی بەیانییەکـی ڕووناکـە. بەفـر ئـارام ئـارام دەبـارێ. ئێمـە لـە نێـوان زنجیـرە چیایەکـی یەکجـار بڵنـد، لـە بنـی شـیوێکی یەکجـار قووڵـی وڵاتـی چیادایـن. لـە نـاو ئـەو شـیوەی کـە تەنیـا لـە چیـرۆک و ئەفسـانەکاندا دەبینـرێ، ئێمـە لـە بنکەیەکـی سـەرهەڵدەرانی وڵاتـی چیـا، لـە پێـش دەسـتەیەک مرۆڤـی چەکداردایـن. دەسـتەکە لـە بیسـت و چـوار کـەس پێکهاتـووە؛ حەڤـدە پیـاو و حـەوت کـچ. لە ڕیزەکـەدا، لە لای دواوە، لـە ڕیـزی حەوتەمـدا، کۆتـر، بـەژن ڕاسـت، ڕاوەسـتاوە. ئێمـە لـە پێـش کۆتـردا ڕادەوەسـتین و لێـی دەڕوانیـن. کۆتـر، ئێسـتا نـە کۆترەکـەی بەشـە پێشـووەکانی ڕۆمانەکەمـان لـە پایتەختـی وڵاتـی مەزنـە، نـە کۆترەکـەی شـەوی ئەشـق و خۆشەویسـتی لەگـەڵ ژیـرە، نـە کۆترەکـەی ئـەو شـەوی گفتوگۆکـەی هۆتێلیـش. ئێسـتا ئـەو بووەتـە مرۆڤێکـی دی، مرۆڤێکـی نـوێ. ئێسـتا جـل و بەرگەکـەی [جـل و بەرگـی] ئـەو هەرێمانـە، هـی ئـەو شـیو و چیـا و شـاخانەیە. بـا جـل و بەرگـی شـەوانی بـاز

بێنینـەوە یـاد؛ پانتۆڵێکـی هـەراوی دەرلنـگ تەنـگ، کراسـێکی قـۆڵ درێـژ و گـەورە، کەوایەکـی هـەراو، گۆرەویـی بـەن و جووتێـک پێڵاوی قایـم بـۆ نـاو دار و بـەرد. واتـا جـل و بەرگـی هەژارانـی وڵاتـی چیـا. یانـی جـل و بەرگـی سـەرهەڵدەران، جـل و بەرگـی کەسـانی شـەڕڤان، ڕێبـوار و کۆچبـەران. ئێسـتا کۆتریـش لـە جـل و بەرگێکـی وەهادایـە. بـەڵام هەندێـک شـتی ئـەم لـە بـاز زیاتـرە؛ ژمـارەی کراسـەکانی دووانـە، جووتێـک دەستکێشـی بەنـی ڕەنگیـن لـە دەسـتیدایە، گۆرەوییـە بەنـە نەخشـێنراوەکانی کـە تـا سـەر ئەژنـۆی دێـت، دوو جووتـن و پێڵاوەکەشـی جووتێـک بووتـی نـاو پەمـۆی زسـتانییە. سەرپۆشـێکی ڕەنگینـی ڕێسـراو بـە سـەریەوە. بەڵـێ، جـل و بەرگـی کۆتـر گەرمتـرن. چونکـە بەفـر لـە زەوییـە.، سـەرەڕای ئـەوەی دونیـا هێـدی هێـدی چلـە و زسـتان بەجـێ دەهێڵـێ، لـەم چیـا و دۆڵـە ئەفسـانەییانەدا هێشـتا بەفـر دەبـارێ، هەنووکـەش سـارد و سـەرمای بەفـر و بـۆران مـاوە.

گۆڕانکارییەکانـی کۆتـر بـە تەنیـا جـل و بـەرگ نییـە، ئێسـتا کۆتـر ئـەو کۆتـرە قـژ درێـژە نییـە. قـژی ئێسـتا زۆر کورتـە و بـە ڕوخسـارییەوە جێـگای کرێـم، بۆیـاخ و ڕەنگـەکان دیـار نییـە. کۆتـر؛ لـە جـل و بەرگـی سـەرهەڵدەراندا، قـژ کـورت و پەلکـە کـورت، سـادە، زۆلاڵ. و شـتیکی دی؛ کڵاشـینکۆفێکی لوولـە کـورت و سـووک کـە پێـی دەڵێـن «کووبـی» بـە دەسـتی ڕاسـتی کۆترەوەیـە. و لـە هـەر دوو لاوە، ڕاسـت و چـەپ، دوو ڕەختـی پـڕ فیشـەک بـە سـەر سینگییەوە. لـە پـاڵ ڕەختەکەشـدا لـە هـەر دو لای کەمـەری باریکـی، دوو نارنجـۆک دیـارە. کۆتر؛شـەڕڤان، چەکـدار. کۆتـر ئێسـتا سـەرهەڵدەر.

کۆتریـش وەک دیکـەی هەڤاڵانـی دەسـتە، بـەژن ڕاسـت، سـینگ و سـەر لـە پێشـەوە ڕاوەسـتاوە و گـوێ لـە فەرمانـداری دەسـتە دەگـرێ.

ئەوان موسافیرن، ئەوان دەڕۆن.

ئـەو ڕۆژەی کـە ئـەوان هەمـووان و کۆتریـش، چاوەڕێـی بـوون، هاتـووە؛

ئەوان دەکەونە ڕێگە و دەڕۆن بەرەو ناوەوە، بەرەو قووڵایی وڵاتی چیا. ئەوان دەچنەوە بەرەو دڵی وڵات.

فەرماندار بە دەنگێکی زۆر بەرز، وشە بە وشە باسی ڕۆشتن، باسی چیا، دۆڵ و شیو، خەرەند، بەفر، هەرەس، با، باهۆز، گەردەلوول، ئاژەڵی درندە و دیکەی مەترسییەکانی بەردەمیان و سەر ڕێگەکەیان دەکات. ڕێگەکەیان درێژە، یەکجار درێژ. دەبێ سێ ڕۆژ بە ڕێگەوە بن، بێ وچان، بێ پشوو دەبێ هەر بە ڕێگەوە بن،- تاوەکوو بگەنە شوێنی شەڕ و پێکدادان. فەرمانداری باڵا بەرزی سمێڵ بۆر لە بەرانبەریان ڕاوەستاوە، نیگای لە ئەوانە، دەپەیڤێ، چلە ڕۆیشت، زستان دەڕوا، بەهار دێت. واتا کاتی شەڕ و پێکدادان، هێرش و لێدان، مردن و کوشتن دێت. ئەم بەهارە، ئەم هاوینەی کە دێ، دەبێ ببێتە زەمەنی نەمری، لێدان و هێرشی غەددار کە دوژمن هەرگیز لە یادی نەکات. دەبی دوژمن لە ژێر لێدان و هێرشەکاندا گێژ بێت، بخنکێ. دەبێ دوژمن تێبگات کە ئەم خاکە خاکی ئەو نییە. بەڵام هەموو شتێک، داهاتوو، هیوا، توانا، شەڕی پیرۆزی ڕۆژانی داهاتوو، بەڵێ هەموو شتێک گرێدراوی ئەم ڕۆیشتنەیە. ئەگەر ئێوە ئەم ڕۆیشتنە، بێ خەسار، بێ قەزا و بەڵا و بە سەرفرازی ئەنجام بدەن، ئەوا دەتوانن لە هەموو شتێکدا سەرکەوتوو بن. ئەوکات ئێوە سەردەکەون. سەرکەوتن بە شوێن ئەم ڕۆیشتنەوەیە.

«سەرکەوتن» فەرماندار بەمە قسەکانی تەواو دەکات، «سەرکەوتن بۆ ئێمە، بۆ بزووتنەوەی چەکداریمان، بۆ وڵات و گەلەکەمان!» دەستەش بە یەکدەنگ دەڵێن: «سەرکەوتن»

کۆتر، ڕوخساری بە کلووی بەفر تەڕ، گەرمای جۆش و خرۆشێک لە بەدەندا دەڵێ: «سەرکەوتن». فەرماندار بۆ دواجار سەیری ئەم بیست و چوار گەنجە دەکات، هەناسەی فەرماندار لە بەر دەمیدا پەڵەی بچووکی هەڵم و مژێک پێک دێنێ. ئەوەندەی چەند خولەکێک هەروا بێدەنگ

سەیریان دەکات و دواتر دوا قسەی خۆی دەکات؛ کەواتە با بکەوینە ڕێگە.

و ئەوان دەکەونە ڕێگە.

یەک بە یەک وەک دەنکی تەزبێحێک بە شوین یەکدا. پڕچەک بە ڕەشاشە، چەکی قورسی ڕۆکێت، کلاشینکۆف، دەمانچە و نارنجۆکەوە. باریان سووک، بە گشتی لە پشتی هەموویاندا کۆڵە پشتییەکی بچووک. لە نێوان هەرکامەیاندا مەودایەکی دە متری. دەستەی بیست و چوار کەسی بە خێرایی برووسکە، ڕێک و پێک، بێ ئەوەی ئاهەنگی ڕۆیشتن تێکبدەن، لە ناو خۆیاندا دەبنە سێ گرووپ؛ پیاوانی پێشەوە یان با بڵێین ڕێبەر، گرووپی ناوین و گرووپی دوایی. ڕێبەر، بەڵەد و شارەزای ئەو هەرێمانە، ژیر، لێهاتوو، پێشەنگانی دەستە. گرووپی ناوین؛ فەرماندار، دیکەی بەرپرسانی دەستە، شەڕڤانانی هەرە بژاردە. گرووپی دوایی؛ ساکار، تازە پێگەیشتوو، هێشتا شاگرد، لە سەرەتای شەڕڤانیدا، کەسانێک کە لە ڕۆیشتندا تووشی دژواری دەبن.

کۆتر دەکەوێتە ڕێگە. چاوی لە ڕۆیشتن و ئاهەنگی کەسی پێش خۆی، یەکەمین ڕۆیشتن! ڕۆیشتن بۆ وڵات، گەڕانەوە بۆ وڵات! بەم شێوە، بە چەک و فیشەکدان، لەگەڵ چەکدار و سەرهەڵدەران! لەم سپێدە زوڵاڵەدا، بەم بەفرە سپییەی نەرم نەرم دەبارێ، لەم هەوا خاوێنەدا، لە ژێر ئەم ئاسمانە کەمێک ئارام و شینەدا! هەموو شتێک ئارام، هەموو شتێک سپی، هەموو شوێنێک گەوهەری.

شەڕڤان هێدی هێدی لە بنکە فراوانەکەی سەرهەڵدەران، دوور دەکەونەوە و بەرەو ژوور، بەرەو سینگی چیا هەڵدەکشێن. ئەو دۆڵەی ئەمانی تێدا بوون، ئەو بنکەی ئەمانی بە مانگان حەواندبۆوە، هەڤاڵ و هۆگرێکی ئەوان لەم هەرێمە شاراوانەی ئەم پەڕی دونیا، ئێستا بەجێ دەمێنێ. کۆتر بێ ئەوەی ئاهەنگی ڕۆشتنی تێک بدات، بەخێرایی، سەری

دەسووڕێنێ و سەیری دۆڵ و بنکە، سەیری سەرهەڵدەرانی بەجێماو لە بنکە کە هێشتا دەستیان لێ ڕادەوەشاندن، دەکات. ئەوە چەند مانگە کە ئەم، لێرە، لەم شیوە قووڵە، لەم شوێنە لە بیرکراوەی دونیادایە؟ دوو مانگ؟ چوار مانگ؟ ئەو ئەشکەوتە، ئەم مۆغارە کە بووە شوێن و ماڵی ئەو، بووە لاپەڕەی یەکەمی ژیانی نوێی... ئەو ڕووبارەی کە سەرانسەری شیوەکە دەبڕێ و ئیستا لە ژێر پرووشەی سپیی بەفردا دیار نییە و دەڕوا... ئەو دار گوێز و قەزوانانەی کە ئێستا بە ڕووپۆشی سپی بەشداریی لە ژیانی سپیی دۆڵەکەدا دەکەن... بەڵێ، کۆتر لێرە فێری پرەنسیپی ژیانی نوێی شەڕڤانی بوو، ئەو لێرە هاوڕێیەتییەکی نوێی قایمی پێک هێنا کە بنەماکەی مان و نەمانە. هۆگرانی ژیانی سەرهەڵدانی ناسی. لێرە ئەو یەکەمجار چەکی هەڵگرت، دەمانچەی تەقاند، فیشەکی کلاشینکۆفی درەوشاوەی لە سینگی ئەو چیانەدا تەقاند، هەڵکشایە سەر لووتکەی چیاکان، بە کاتژمێران، دو کاتژمێر، پێنج کاتژمێر، حەوت کاتژمێر، دە کاتژمێر لە ناو شاخ، لە سەر گرد، تاشە بەرد، سەرچاوە و ڕێڕەوی شیو و دۆڵاندا پیاسەی کرد. لێرە بۆ یەکەمجار نانی برژاند، ساوەری خستە سەر ئاگری هێزن، لەگەڵ دە، بیست، سی، چل هاوڕێی خۆی، ساوەری زۆر جاران کەم ڕۆنیان لە کەوچک دەکرد.

پاش ئەوەی کۆتر لە پایتەختی وڵاتی مەزن کە ئێواران بە گڵۆپی بولواران ڕووناک دەبۆوە، بڕیاری چوونەوە بۆ وڵاتی چیای دا، لەگەڵ چەند کەسێک بە دزییەوە، یەکڕاست هاتنە ئەم هەرێمە یەکجار سەخڵەتانە کە لە سەر سنووری وڵاتن. لەو ڕۆژە بەملاوە، ئەو بە دوو هیوا لێرە مایەوە. ئەو هیوا یانیش هۆکارانەی کۆتریان خستە سەر ئەم هەوایە، ئەگەر بمانەوێ بە کورتی باسی بکەین، ئەمانە بوون؛ ژیر، بینینی ژیر، لەگەڵی بوون، لەگەڵی هاوبەشبوون لە ژیانێکی یەکگرتووی

سەرهەڵدەریدا. دووەم هۆکار؛ وڵات، گەڕانەوە بۆ وڵات، لە وڵاتدا بوون، لەگەڵی و لە ناویدا بوون و ژیان بە سەر بردن، بەشداریی لە ڕاپەڕین و هۆشیار بوونەوەی وڵات... لەم چەند مانگەی ژیانی ناو ئەم دۆڵە کە بە وانەی سەربازی و سیاسی تیپەڕ بوو، کۆتر ژیری نەدیت، نەک هەر نەیدیت، نەشیتوانی هەواڵێکی وەربگرێ. وەک بڵێی ژیر لە دەرەوەیە و ئێستا دێتەوە، ئاوەها چاوەکانی کۆتر لە سەر کەل و قوژبن و ڕێگەی تەنگی مەترسیداری دۆڵەکە هەمیشە چاو لە ڕێگەی ژیر بوو. ئەو ژیرەی کە دەستی لە هەموو شت هەڵگرت و کەوتە ناو ڕیزەکانی سەرهەڵدەرانەوە، دیار نەبوو. هەندێک کەس دەیانگوت کە ژیر بۆتە فەرماندارى دەستەیەک لە سەرهەڵدەران و لە لایەکی دیکەی سنوورە، هەندێکی دیش دەیانگوت ژیر لە ناو شەپۆلانی سەرهەڵدانی باشووری وڵاتدایە. یەکی دیش وتی ژیر لە وڵاتێکی دراوسێ لە بنکەی ڕێبەرایەتیی بزووتنەوەی ئازادیخوازدایە. بەڵام جارێکیش بیستی کە ژیر لە کەمینێکدا شەهید بووە، دڵی داکەوت. تا بە ئەمڕۆ، تاوەکوو ئەم ڕۆژی ڕۆشتنەش کۆتر ژیری نەدیت. بەڵام کۆتر بەهیوایە، ئەگەر ژیر ساخ بێت، ئەگەر کۆتر ساخ بمێنێ، ئەوا ڕۆژێک هەر دەیبینێ.

لێ هیوای دووەمی، ئەمڕۆ دێتە دی؛ ئەو دەڕواتەوە بۆ وڵات، دەچێتەوە بەرەو دڵی وڵات. ئازاد، سەربەست، سەربڵند. بەڵێ ئەم ڕۆژەشی دی... مەگەر کۆتر و ژیر، لە ڕۆژان و شەوانی بێکۆتایی پایتەختی ڕووناکدا، بەردەوام باسی ئەم ڕۆژەیان نەکردبوو؟ مەگەر ئەو کتێبانەی خوێندبوویانەوە، ئەو شێعرانەی لەبەریان کردبوو، لە سەر ئەم ڕۆژە ئازاد و سەربەست و ڕووناکە نەبوو؟ مەگەر ئەو هەمیشە نەیخواستبوو خۆی بگەیەنێتە ناخی ڕاستییەکان، بنەماکانی مرۆڤ بوون، خورپەی دڵ و جۆشی ڕۆح، بە هۆکارەکانی ئاڵۆزی و دژایەتییەکانی ژیان؟ مەگەر ئەو نەبوو کە هەمیشە حەزی دەکرد بێ شەرت و مەرج بژی، بێسنوور و

بێئاستەنگ بیر بکاتەوە، بە بێگومان و دوودڵی هەموو دەنگ و سەدا جیاوازەکانی ژیان ببیستێ و بێ شک و گومان حەز بکات. بەڵێ حەز بکات، هەموو شێوە و جۆرەکانی حەز کردن بناسێ. جۆرەکانی جۆش و خرۆش و شەیدایی و سەوداسەری بناسێ، بە یارمەتیی ئەو ئەزموونە بێپایانەی ئەم ڕۆژانە لە ناو وانە و مومارەسە، هاتن و چوونی زۆر دژوار، هەڵاتن و ڕەوی مان و نەمان، ژیانی شەر و پێکدادان، پێبگات، خۆی بناسێ، مرۆڤ و مرۆڤایەتی بناسێ، وڵاتەکەی بناسێ. بەڵێ، کۆتر هەر ئەمانەی دەویست، هەر ئەمانەی دەوێ.

«فەرموو» کۆتر وا دەڵێت و پێ هەڵدەگرێ «فەرموو کۆتری شاخەکان، فەرموو، ئەو ڕۆژەش هات، فەرموو، ئیدی ئەمڕۆ ڕۆژی سەلماندن و خۆ نیشاندانە، فەرموو...».

دەستە وەک مارێکی ڕەشی درێژ، خۆی نەقیزە دەدات و لە بناری چیاوە بەرەو ژوور هەڵدەکشێ. لەگەڵ ئەوەی کە ئەوان زۆرن و بارەکەیان، چەک و ڕەختیان قورسە، زۆر چالاک، زوو، بە ئاهەنگێکی توند و تۆڵ دەڕۆن، . چوست و چالاک، بە ئاهەنگێکی قایم و توند و تۆڵ، بێ کەوتن و ڕاوەستان. هیچ ڕێگەیەک لە ناو بەفردا بە دەرەوە نییە، بەڵام ئەو پێشەنگانەی ئاگاداری کارەکەیانن، ڕێگە دەدۆزنەوە و دەڕۆن. پێشەنگ هەم ڕێگە بۆ دەستە دەدۆزنەوە و هەم ڕێگە دەکەنەوە. کاری کۆتر لە چاو کاری پێشەنگەکان ئاسانترە؛ ئەو تەنیا بە شوێن پێی کەسانی پێش خۆیدا دەڕوات. ئەو لە ناو بەفردا بە شوێن پێی ئەو حەڤدە کەسەی لە پێشەوەن، دەڕوات. بەڵام لەگەڵ ئەمەش بە سەختی دەڕوات. لاقی تا سەر ئەژنۆ دەچەقێتە ناو بەفری نەرم. هەڵگرتن و دانانی پێ ئاسان نییە. ڕۆیشتن و جووڵە ئاسان نییە. هەڵکشان بەرەو چیای سەخڵەت ئاسان نییە. هێشتا لە سەرەتادا، کۆتر هەناسەی لە بەر دەبڕێ. «کۆتر، خۆت ڕاگرە، دەخیلت بم، خۆ ڕاگرە» کۆتر سەیری

چیای سەرکەش کە لە پێشیدا بەرز بۆتەوە دەکات و دەڵێ «ئەمە کاتی مان و نەمانە، بوون و نەبوونە، سەرکەوتن پێویستە، کۆتر سەرکەوتن...»

هەوا خاوێن، دونیا ڕووناکە. خۆری زوڵاڵ بە تیرێژی ڕەنگین لە پشت چیاوە، هێدی هێدی هەڵدێ. کلووی بەفر کە بە ئارامی دێتە خوار، بە شەوقی تیرێژ وەک مەرجان دەدرەوشێتەوە. تیرێژی ڕووناک لەگەڵ ڕۆشنایی بەفر دەبنە یەک و شەوقێکی بێهاوتا پێک دێنن. دونیای کەمێک ساماڵ لە ناو دەریای شەوقدا شەپۆلان دەدا. شەوق شەپۆل شەپۆل هەموو دونیا دەگرێتەوە.

بەڵام هەوا ساردە، هەر کە دەچنە سەرەوە، هەر هەنگاوێک کە بەرەو لووتکەی چیا هەڵیدەگرن، هەوا ساردتر دەبێ. شنەی با کە لەگەڵ هەڵکشان زیاتر دەبێ، ڕوخساری کۆتر دەبڕێ، هەناسەی لە بەر دەبڕێ. کۆتر، توند هەناسە دەکێشێ و دەیداتەوە. گەرچی باری کۆتر زۆر نییە؛ کڵاشینکۆف لە دەستدا، دوو نارنجۆک، ڕەختی سەر سینگ و جانتای سەر کۆڵ. لە جانتاکەشدا شتێکی وا نییە؛ چەند پلە گۆشتی برژاو، نان، کەمێک پەنیر، کەمێک هەڵوا و شەکر، دوو دەفتەر، پێنووس، دەسرەیەک، کەوکەمێک، چەقۆیەکی بچووک و هەندێک شتی پێویستی دی. هاوڕێکانی هیچ بارێکی زۆریان نەداوەتێ.

سەری دەستە ئێستا ئیدی دیار نییە. ئەوان گەشتنە ناو قەدی چیا. کۆتر تەنیا ئەو چوار پێنج کەسەی پێش خۆی دەبینێ. بە شوێن ئەویشدا پێنج شەش کەسی دی دێن. چیا، شاخ، دار و درەخت، بەرد لە پێش و کەناری کۆتر، دیمەنێکی بێپایان ئەفسانەیی پێک دێنێ. دونیا، ژیان، وڵاتەکەی لە ژێر ئەم بەفرەدا چەندە شیرینە. چەندە دەلالە! کۆتر هەرگیز بە خەیاڵیدا نەدەهات کە ئەم چیا ئەوەندە پڕ سام و ترسە، هاوکات ئەوەندەش جوان و قەشەنگ بێت.

چیا، چیاکانی وڵاتەکەی؛ پردی نێوان زەوی و ئاسمان، پردی

خۆشەویستی، خەون و خەیاڵی ئەوین. چیاکانی ئەو؛ هەتوانی دڵی بریندار، ئاوی قوڕگی وشک و تینوو، نانی برسی و هەژاران، سەرچاوەی هەموو شتێک، ئاوەزێی زولاڵی، ئارامی و ڕاستی، بەڵێ چیاکانی ئەو؛ سەرچاوەی جۆگە و ڕووباری درێژ، بەرەکەتی خاک و هەوا، بەرەکەتی ئاو و دەریا، سترانی تەیر و باڵندە، پەرەسێلکە و بولبولان، بێشەی شێر و پڵنگ، ورچ و گورگ، هێلانەی هەڵۆ و باز، واشە و سیمۆرغ. چیاکانی وڵاتی چیا؛ لە سەدان و هەزاران ساڵ پێش ئێستاوە پیر، بە جۆش و خرۆشی ڕاپەڕینەکانی دوێنێ و ئەمڕۆ، گەنج، نەمر، لە سەر سنوورەکان سەربڵند، سەرهەڵدەر، قسەی سەر زاری گۆرانیبێژان، وشەی نووسراوی شاعیران... ئەو چیانە، ئەو چیا سەرکەشانە، جوان... ئەو چیانەی کە ئێستا بوونەتە شوێنێ هیوا، بوونەتە هیوا...

«قەزا لە تۆ کەوێ دونیا» کۆتر، چاوی لە شەوقی سپیی چیاکان، دەڵێ «دونیا بۆچی ئەم چیایانە نابینی، دونیای نابەخێر» شەوق دانەوەی دەر و دەشت دەدا لە چاوی کۆتر، ئەو ناتوانێ زۆر لە دوور بڕوانێ. سەیری پێش خۆی، سەیری لاق و شوێن پێی کەسی پێش خۆی دەکات. لە بەختی باش، کەسەکەی بەردەمی لاوێکی چوارشانەی چالاک و شارەزایە. کۆتر ئەم لاوەی — کە ئێمە پێی دەڵێین ڕێناس- جار جارە لە بنکە دەدیت. ڕێناس دەهات بۆ بنکە، چەند ڕۆژان دەمایەوە و پاشان دەڕۆیشت و ون دەبوو. پێدەچوو کە ڕێناس خەڵکی گوندێکی ئەو نزیکانە بێت. کۆتر بە پارێزەوە بە شوێن پێی ڕێناسدا دەڕۆیشت.

لە ناو بێدەنگیی قووڵی دەر و دەشتدا دەستە دەڕوات. بە تەنیا دەنگی پێی ئەوان کە لە ناو بەفردا شوێن پێی قووڵ دەکاتەوە جار جارەش دەنگی پەلەوەر و باڵندەیەک بێدەنگیی تێک دەدا. و جار جارەش کەروێشکی ڕەش و سپی و سمۆرەی بەڵەک لە دوورەوە هەڵدێن و لە ناو دار و شاخەکاندا ون دەبن. دەستە ئێستا دەچنە ناو دار و

دەوەنێکی قووڵ و تێکچڕژاو، ڕۆشتن دژوارتر دەبێ. پووش و پەڵاش و دەوەن لە پێ، لنگ و جل و بەرگیان گیر دەبێ. بەڵام بەفری نەرم ئێستا یارمەتییان دەدا و ناهێڵێ درک و داڵ ڕێگەیان لێبگرێ.

ئەوان دەڕۆن، کۆتر دەڕوا.

کاتژمێرێک، دوو کاتژمێر، سێ کاتژمێر... سپێدە دەگاتە بەیانی، بەیانی دەگاتە نیوەڕۆ. خۆر هەڵدێ، تیشکەکانی زیاتر شەوق دەدەنەوە. خۆرێکی دوور لە گەرما، بێڕۆح و سارد لێ بە ڕەنگی تێکەڵی سوور و زەرد، بڵند دەبێ. ئەوان دەڕۆن. درک و داڵ دەبڕن، دار و دارستان دەگەڕێن. دار و دارستان کە پێکهاتەی سپیدار، بی و بەڕووە، تەواو دەبێ، گرد و تەپۆڵکەی سپی دەگەن. لە دوای گرد و گردۆڵکە، گاشەبەرد و شاخ، لە دوای شاخ، لووتکەی چیا کە لە ناو تەم و مژدایە. ئەوان دەڕۆن. هەر هەڵدەکشن. ڕێ و تووڵەڕێ دەدۆزنەوە و بەرەو ئامانجی دیاریکراو، بە ئەمانی چیاکان، دەڕۆن. بە جێگا و شوێنی هەرە سەختدا، بە کەناری هەڵدێر و ڕێچکەکاندا، بە سەر تاشەبەردی زوقم بەستووی بەستەڵەکدا، ئەوان دەڕۆن. لە هەندێک پەلەوەری بچووکی کێوی و درەختی زیاتر، نە مرۆڤێک، نە ئافرێنراوێکی دی بەدەرەوە نییە. لە ناو تەنیایی بێکۆتایی چیاکاندا ئەوان بەردەوام دەڕۆن.

کۆتر ماندوو بووە، هێزی تێدا نەماوە. بەڵام ئەوان دەڕۆن. چرکەساتێک، هەر ئەوەندەی چرکەساتێک وچانێکیان دا! قورگی کۆتر وشک بووە، ئەو ئیدی بە سەختی هەناسە هەڵدەمژێ و دەیداتەوە. ئەمجار بۆرانێکی بەهێز دوا تواناشی دەگرێ. هەموو هەڵکێشانی هەناسەیەک، هەر هەنگاوێکی نوێ، دەبێتە شکستێکی دژوار. نا، ئەو ئیدی ناتوانێ بڕوات. بەڵام چی بکات؟ ڕێناسی چوارشانە لە پێشییەوە، وەک بڵێی تازە ڕێکەوتووە، بە ئاهەنگێکی قایم ڕێ دەکات. کۆتر دەبێ بە شوێن ئەوەوە بێت. ئاهەنگەکە تێک نەدات. بەڵام چۆن؟ پێیەکانی کۆتر قورس دەبن. لە

هۆش دەچێ، بەڵام شتی هەرە گرنگ هەناسەیە. بە تەواوی هەناسەی لە بەر دەبڕێ، وەک بڵێی جەرگ و دڵی هاتبێتە ناو دەمی، وەک بڵێی کەوتبێتە ناو ئاوێکی قووڵ، ئاوەها ناتوانێ هەناسە بگرێ.

نا، نابێ، بە ئارامی لە ڕیزەکە دێتە دەرەوە و دەچێتە لاوە تاوەکوو بە شپرزەیی لە سەر بەفر دانیشێ. بەڵام نابێ. «خوشکە، نابێ» کچێکی کورتەباڵای خڕ کە لە پشت ئەمەوە ڕێ دەکات، دەڵێ؛ «وەرە ناو ڕیزەکە، خێراکە، ئەگەر لەم شوێنانە دانیشی ون دەبی، کەس چاوەڕوانی تۆ نابێ و ئیدی ناتوانی خۆت بگەیەنیتەوە بە دەستە، زووبە، خێراکە».

«ئیدی ناتوانم» کۆتر بە دوا توانایەوە دەڵێ «ئێوە بڕۆن...» لەم کاتەدا ڕێناس دەگەڕێتەوە بەرەو لای ئەوان. تێدەگات لە چ حاڵێکدایە، دێت بۆ لای کۆتر، بە بزەیەکەوە دەڵێ «خوشکە نابێ، خۆڕاگرە، پێموابێ پاش کەمێکی دی، دوای ئەم گردە، لە شوێنێکی نزیک ڕادەوەستین. دەستم بگرە و ڕێبکەوە...» کۆتر، بێچارە، بێدەنگ دەستی ڕاستی ڕێناس دەگرێ کەمێک لەدوای ئەوەوە دیسان دەست دەکاتەوە بە ڕێ کردن.

بەڵام تا کەی؟ کۆتر ئیدی نازانێ. خەوی دێت، دەیهەوێ بخەوێ، دەیهەوێ دەست لە ڕێکردن، ڕۆیشتن، وڵات و هەر شتێک هەڵبگرێ و بچێتە خەوێکی قووڵەوە. ئەو چۆن دەڕوات، بەرەو کوێ ئیدی تێناگات. تاوەکوو دەستە لە تەنیشت بنارێکی سەخڵەت ڕادەوەستێ، ئەو هەروا سەرسام، گێژ، دەستی بە دەستی کوڕەوە دەڕوات. کاتێک دەستە ڕادەوەستێ، کۆتر لە جێدا خۆی بەر دەداتەوە سەر زەوی، دەڕووخێتە ناو بەفرەکە و هەروا ئەوەندەی چەند خولەکێک، لە سەر پشت ڕادەکشێ. هەناسە، بۆچی هەناسەی دەرنایە؟ کۆتر کە پێی وابوو لانیکەم، بێ وچان ڕۆژە ڕێیەک ڕێ بکات، بۆچی وەها لە چەند کاتژمێردا سست بوو و لێکترازا؟

کلووی بچووکی بەفر بە ڕوخسارییەوە دەتوێنەوە. جل و بەرگ و بەدەنی تەڕ دەبن. تیشکی بەهێزی هەتاو کەمێک ڕوخساری گەرم دەکاتەوە. بەفر، تیرێژ، بۆران، لووتکەی چیا، تەم و مژی لووتکە، گەرمای بەدەنی کە دەرەنجامی ڕێکردنە، جۆش و خرۆشی ئەو، ترسەکەی، ئەو تەزووەی ئێستا بەسەریدا دێ... تێکەڵن، هەموو شتێک بە جۆرێکی سەیر ئاڵۆزکاوە. بە دەنگی ڕێناس کە یارمەتی دەدا، چاوەکانی دەکاتەوە. ڕێناس بە سمێڵی تەڕ و دەم بە پێکەنین بە سەر سەریەوە ڕاوەستاوە و شتێکی پێ دەڵێ. کۆتر خۆی کۆ دەکاتەوە، ڕاست دەبێتەوە و لە سەر بەفرەکە دادەنیشێ.

«وەرە چایەک بخۆ، چایەکی گەرم...» کۆتر تفەنگەکەی هەڵدەگرێ و بە یارمەتیی تفەنگ هەڵدەستێتە سەر پێ و دەکەوێتە شوێن کوڕە. کۆتر دەپرسێ: «بۆچی وەها بوو؟ بۆچی من وا بێزار بووم؟» کوڕە بە پێکەنینەوە دەڵێ «هیچ نییە، دڵت لە خۆ دانەمێنێ، تۆش وەک هەموو کەس فێر دەبێ، جەستەت هێشتا ڕانەهاتووە، بەڵام بە تێپەڕینی کات، جەستە پەروەردە دەبێ، لەگەڵی ببە بە یەک. ئێمە ئێستا لە جێگایەکی یەکجار بڵنددایـن، هەر لە بەر ئەمەشە کە هەناسەی مرۆڤ تەنگ دەبێ.»

کۆتر سەیری دەور و پشتی دەکات. ئەوان ئێستا لە لووتکەی چیایەکی سەرکەشدان. چەند گاشەبەردێک چیا دەبڕن و لە ژێر گاشەبەرددا، لەقوژبنێکدا سێ ئەشکەوت هەیە. ئەندامانی دەستە پرش و بڵاو لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکاندا دانیشتوون. لە تەنیشت دەرگای ئەشکەوتە گەورەکە ئاگرێکی بەگوڕی هێزن داگیرساوە و لە دەوری ئاگریش بازنەیەک لە شەڕڤانان دانیشتوون. ڕێناس و کۆتر بەرەو ئاگرەکە دەچن. دوای ئەوەی دەگەنە بەر ئاگر ڕێناس دەگەڕێتەوە و دەڕوا بۆ جێیەک. فەرماندەری دەستە و دوو سەرپەلیش بە دەوری ئاگرەکەوەن، شوێنێک نیشانی کۆتر

دەدەن کە کۆتـر دادەنیشـێ، شـەڕڤانێک پیاڵەیـەک چـای گەرمـی دەداتـێ. کۆتـر دەستکێشـەکانی دەردێنـێ، چـا وەردەگرێ و خێـرا دەیخواتـەوە.

«وا مەکـە خوشکە» فەرمانـدار پێـی دەڵـێ «بـە پەلـە مەیخۆوە. سـەیر کـە، یاسـای یەکـەم؛ لـە سـەرما و شـەختەدا، کـە ئاگـر، گەرمـا و گەرماییەکت بینـی، هیـچ پەلـە مەکـە، مەترسـیدارە. بـە وردی، بـە ئارامـی نزیکـی هەرچەشـنە گەرماییـەک ببـەوە». کۆتـر هیـچ ناڵـێ، ئێستا بـە ئارامـی چـا دەخواتـەوە. دەرگای ئەشـکەوت بـە چەنـد ڕیـز بـەردی ڕەش دیـوار کـراوە، لـە ناوەکەشـی بۆنـی کا و پـووش دێـت. وا دیـارە ئـەم ئەشـکەوتە وچانگـەی سـەر ڕێـی شـەڕڤانانە. ئـەو شـەڕڤانانەی بـە دەوری ئاگرەکـەوە دانیشـتوون وەک بڵێـی هاتـوون بـۆ سـەیران، ئاوەهـا دەم بـە پێکەنیـن لەگـەڵ یـەک قسـە دەکـەن. هیـچ ئاسـەواری ماندوویەتـی و سـەختیی ڕێکـردن بـە ڕوخسـاریانەوە دیـار نییـە. فەرمانـدار بـە قامکەکانـی جگەرەیـەک دەپێچێتـەوە. دوای ئـەوەی جگـەرە دەپێچێتـەوە و بـە چیلکەیـەک ئاگـر دەیگیرێنـێ، ڕوو دەکاتـە دوو شـەڕڤان و دەڵـێ «لـە ئەشـکەوتی ئـەرزاق و ئازووقـە، هەندێـک سـاوەر و گۆشـتی لـە قوتـوو نـراو دەربێنـن و دواییـش سـەرەکەی قایـم وەک پێشـوو ببەسـتن و بیشـارنەوە، پێـش ئـەوەی بڕۆیـن دەبـێ زگمـان تێـر بکەیـن. ڕێگەکەمـان هێشـتا یەکجـار درێـژە». «ڕێگەکەمـان هێشـتا زۆر درێـژە» ترسـێک دەخاتـە دڵـی کۆتـرەوە. بڵێـی بتوانـێ ڕێ بـکات و خـۆی بگەیەنێتـە دەسـتە؟ «کۆترەکـە بـە حەیرانـت بـم، خـۆت، مـن، ڕیسـوا مەکـە»، ئـەو بیـر دەکاتـەوە و دەسـتی بـەرەو گـڕی ئاگرەکـە درێـژ دەکاتـەوە. شـەڕڤان گـرووپ گـرووپ، بـڵاو دانیشـتوون. هەندێکیـان چـا دەخۆنـەوە، هەندێـک جگـەرە دەکێشـن، هەندێکیـش چەکەکانیـان خاوێـن دەکەنـەوە. کۆتـر کەمێـک حەساوەتەوە، سـەیریان دەکات؛ شـەڕڤانانی لاو، بەتوانـا، لـە شـەڕی مـان و نەمانـدا بـێ تـرس و دواییـش زۆربـەی جـار شـەهید. شـەهیدی بـێ نـاو، بـێ گـۆڕ و گڵکـۆ و گۆڕسـتان. فیـداکار و لـە خۆبـردوو. دڵێـک کـە تەنیـا بـۆ

وڵات، بۆ گەل و بۆ ئەم خاکە پیرۆزە لێدەدات. دڵێک کە بەم خاکەوە گرێدراوە و لەگەڵی بۆتە یەک. ئەویندارانی ئەم خاکە، ئەم شاخانە، سەرهەڵدەر؛ هیوای بەیانی و دواڕۆژ، قارەمانی مێژووی سبەی، شانازی و سەربڵندیی ڕۆژانی داهاتوو. ڕووناکیی تیشکی هەتاوی ئەم وڵاتە دیل و یەخسیرە، هەژارە، بێ پشتیوانە. تروسکەی شەوانی تاریکی ئەم شاخە سەرکەشە، بێ ڕێگە و بێ ڕێبوارە. ناوی ئەوان؛ شەڕڤان، سەرهەڵدەر. هەر ئەوەندە. ئەو بێ ناو [و نیشانانەی] کە لە بێچارەیی و مردن، ژینێکی نوێ ساز دەکەن. کوڕ و کچی ئەو مردووانەی کە لە ناو ئەم شیو و هەڵدێرانەدا سەریان ناوەتەوە، لە سەر ئەم کوێستان و شاخانە خوێنیان ڕژا، کوڕ و کچانێک کە بە ڕێبازی باو و باپیراندا دەڕۆن.

چاوەکانی کۆتر دەبەسترێ. سەری ئارام ئارام دادەکەوێتە خوار. بەڵام بە دەنگی فەرماندار بە خەبەر دێت؛ «یاسای دووهەم» فەرماندار دەم بە خەندە «کاتێک ئیش و کارێک نەبێ و خەوت بێ، دەبێ دەرفەت لە دەست نەدەیت، پێنج خولەک، دە خولەک جیاوازیی نییە، خەوی چەند خولەکیش مرۆڤ دەژیێنێتەوە... تا ساوەرەکە ئامادە دەبێت بچۆ لە ژوورەوە بخەوە...» چوار کەسی دیش، دوو کچ و دوو کوڕ، لە پاڵ یەکدا لە سەر کا و پووش ڕاکشاون. کۆتر خێرا دەچێتە لای ناوەوە. جانتاکەی لە پشتی دەکاتەوە و تفەنگەکەی دەنێتە بەر دیواری ئەشکەوت و لە تەنیشت یەک لە کوڕەکان ڕادەکشێ و یەکسەر دەچێتە خەوێکی قووڵەوە.

دوای ماوەیەک کەسێک دێت و کۆتر و ئەوانی دی بەخەبەر دێنێت. ساوەر ئامادەیە. ئەوان خۆیان کۆ دەکەنەوە و لە ئەشکەوت دێنە دەر. ئێستا لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکانی دیش ئاگر کراوەتەوە. سێ بازنەی گەورە لە تەنیشت ئاگرەکان، لە دەوری ساوەر سازکراون. کۆتر دەچێت و لە جێگەی پێشوو دادەنیشێت. کەوچک لە جانتاکەی دەردێنێ و ئەویش

وەک هاوڕێکانی دەست بە خواردنی ساوەر دەکات کە لە ناوەڕاست لە سەر سینییەکی قووڵ و گەورە دانراوە. بە پەلە پەل، وەک گورگێکی برسی، ساوەری گەرم، بەڵام بێ تام، دەروونی کۆتر گەرم دەکاتەوە. لەم کاتەدا دیسان فەرماندار دەڵێ یاسای سێهەم؛ «لە کاتی ڕۆیشتن و ڕێکردندا، زۆر خواردن خەسارە، جەستە قورس و هەناسە تەنگ دەکات. تێر تێر مەخۆ، کەمتر بخۆ»، پاش بەتاڵ بوونی سینی، شەرڤان دەچنە ئەو لاوە و بە دەوری ئاگرەوە دادەنیشن. فەرماندار جگەرەیەکی دی دەپێچێتەوە و لە شەرڤان و لە کۆتر دەڕوانێ. لەگەڵ ئەوەیش کە خۆرەتاوە، لەگەڵ ئەوەیش کە لە کەناری ئاگر دانیشتوون، هەوا ساردە. کۆتر دەلەرزێ. هەوایەکی تیژ وەک دەمی چەقۆ هەناسە لە بەر کۆتر دەبڕێ. دەست و ڕووی گەرم دەبنەوە، بەڵام بەدەنی سەرمایەتی. چکێکی دی خۆی لە ئاگر نزیک دەخاتەوە. «ناوت کۆتر بوو، نا؟» فەرماندار لێی دەپرسێ. کۆتر بە کورتی دەڵێ «بەڵێ». فەرماندار بەردەوام دەبێ «با پێت بڵێم، بەختت زۆر باشە، هەرگیز هیچ کات لەم کاتانەدا، هەوای ئەم شاخ و چیایانە ئەوەندە نەرم، زوڵاڵ و ئارام نەبووە، هەرگیز ڕۆژێکی ئەم چیایانە بێ باران و گەردەلوول، بێ با و بۆران نەبووە. تۆ شانست هەیە...»، کۆتر هیچ ناڵێ، هەر تەنیا دەڵێ «بەڵکوو». فەرماندار بە دەم جگەرەکێشانەوە دەڵێ «نا، نا وەهایە، چیای با و باپیران تۆیان خۆش دەوێ، بە ئارامی بەخێرهاتنت دەکەن... تۆش فێر دەبی... فێری زمانی چیا، زمانی ئەم سرووشتە سەرکەشە، زمانی با و گەردەلوول. بەڵام یاسایەکی دی کە پێویستە هەرگیز لە بیرت نەچێ؛ « دەبێ لە سەر ئەم شاخانە لە گورگ، گورگتر بی تاوەکوو بتوانی بژیت، لە بیر مەکە، لە گورگ گورگتر...».

دیسان کاتی هەستان و ڕێکردن دەکات. دەستە لە بەر ئەشکەوتی مەزن کۆ دەبنەوە. شوێن پێی سەر بەفر بە بەتانییەکی گەورە پاک

دەکرێتـەوە. ئاگـر دەکوژێتـەوە، چـاڵ دەکرێتـەوە و سـەر ئاگـرەکان بـە بەفرێکـی زۆر دادەپۆشرێ، دەرگای ئەشکەوتەکان خاوێن دەکرێنەوە. جل و بـەرگ قایـم دەکرێن، چـەک و فیشـەکدان گرێ دەدرێن. دەسـتە ئامادەیـە. فەرمانـدار و دوو سـەرپەل لـە پێش دەسـتە کـە بـە سێ گـرووپ ڕیـز بـوون، ڕادەوەسـتن. کـەم و کورتـی نییـە. هـەر کـەس لـە ڕیـزی خۆیدایـە. فەرمانـدار دەڵـێ: «لـە ئێسـتا بـەدواوە ڕێگەکەمـان دژوارتـر دەبـێ، مەترسـیش زیاتـر دەبـێ، ئەگەرچـی پێـم وا نییـە تووشـمان بـە تووشـی دوژمنـەوە بێـت، بـەڵام کۆپتەرەکانیـان دێـن. ئـاگادار بـن. ئـاگاداری خۆتـان و ڕیزەکەتـان و هاوڕێکانتـان بـن. خۆتـان سسـت مەکەنـەوە. لێـرە بـەدواوە ئیـدی پشـوو نییـە. تـا بگەیەنـە وێسـتگەی شـەو، ڕاناوەسـتین. وێسـتگەی شـەو لـە پشـت هـۆ ئـەو چیاوەیـە.» فەرمانـدار بـە دەسـتی ڕاسـتی ئامـاژە بـۆ شـاخێکی زۆر دوور دەکات. دەسـتەواژەی «هـۆ ئـەو چیایـە» ڕاسـت نییـە، چیـا هـۆ ئـەو چیایـە نییـە! دیسـان ترسـێک دەکەوێتـە دڵـی کۆتـر. ئـەو چـۆن خـۆی بگەیەنێتـە ئـەو چیـا یەکجـار دوورە، چـۆن تـا ئـەو شـوێنانە بـڕوات؟ چیـا، داوێن و لووتکـەی چیاکان، وەک یـەک، لـە نـاو دڵـی یەکدا، وەک دەسـتەی چەکدار، بەڕیـز بـوون. چیـای وێکچـوو بـەڵام بێکۆتایـی، بڵنـد، سـەرکەش. کۆتـر جارێکـی دی بـۆ چیـای دوور، بـۆ وێسـتگەی شـەو دەڕوانـێ. ئەگـەر بـە هەڵـەدا نەچووبـێ، دەبـێ ئـەوان ئێسـتا بـەرەو خـوار بـڕۆن، پاشـان دیسـان هەڵکشـێن بـۆ سـەر چیـای بەرانبـەر، دوای لووتکـەی چیـای بەرانبەریـش دەبـێ خۆیـان بگەیەننـە ئـەولای چیاکـە. ئـەی خوایـە!

فەرماندار دەڵێ «کەواتە با بڕۆین».

و کۆتر دەکەوێتە ڕێگە و دەڕوا.

دیسـان سـێ گـرووپ، دیسـان وەک پێشـوو. دیسـان ڕێنـاس لـە پێش، کچـە خڕەکـەش لـە دوای کۆتـر. دیسـان وەک مارێکـی گـەڕۆک، شـیو بـە شـیو. دیسـان لـە نـاو شـەوقێکی بێپایانـدا. لـە سـەر گەوهـەری بەفـری

هەورێشمین کە شەپۆل شەپۆل دەدرەوشێتەوە.

فەرماندار و دوو سەرپەل بە ناو ڕیزەکاندا دێن و دەچن. کە دەگەنە لای گرووپی دواوە، فەرماندار دێتە نزیکی کۆتر و پێی دەڵێ «یاسایەکی دی؛ شیرینی بخۆ چەند دەنکە هەڵوا، زیاتر دەتژێنێتەوە... و یاسای بنەڕەتی، هەرە بنەڕەتی، لە ڕێدا، لە ڕێکردنی ناو بەفر و بۆراندا مەخەوە، چی دەکەی بیکە با نەخەوی، گاز لە خۆت بگرە، نەقۆرچک لە خۆت بگرە، چەقۆ بدە لە خۆت، چی دەکەی بیکە، بەڵام مەخەوە. لەم شاخانە مردن بە خەوێکی شیرین، بە نووستنێکی نەرم و جوان دێت. لە بەفردا، مەرگ خائینە، کراسی خەو لە بەر دەکات، دێت و دەخڵەتینێ، فریوت دەدات... لە بیرت نەچێ. پێویستە نەخەوی، هیچ نەخەوی...» و بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامێک بێت، ڕێدەکات، بەڵام پاش چەند هەنگاو، دیسان ڕادەوەستێ و دەگەڕێتەوە بۆ لای ڕێناس و دەڵێ «ڕێناس چاوت لە کۆتر بێت».

ئەوان دەڕۆن، ئەمجار بەرەو خوار. لەگەڵ ئەوەی پێیەکانی کۆتر ماسیون، ئەو خۆی بەتوانا و زیندوو هەست پێدەکات. بە شوێن ڕێناسدا بێ هیچ سەختییەک بەرەو خوار دەبێتەوە.

لووتکە، گاشەبەرد، دوو ئەشکەوت کە پڕ زەحمەت دیار بوون، بەجێ دەمێنن. شاخێکی سەرکەش بەجێ دەمێنێ. دارستانێکی چڕ و پڕ لە داری قایم و ئەستوور بەجێ دەمێنێ. ئەوان بە جێگایەکی یەکجار تەنگ کە لایەکی گاشەبەردێکی بەستەڵەک بەستووە و لایەکی دیش هەڵدێرێکی قووڵی بێ بنە، ڕادەبوورن. کاتژمێریک دەڕوا، دوو کاتژمێر تێپەڕ دەبێ. دەستە، گرووپ و کۆتر بێ ئەوەی ئاهەنگی ڕێکردن تێکبدەن، بە خێرایی ڕێدەکەن. بەرەو ئێوارە دیسان دەستە بە ڕێچکەیەکی تەنگدا دەست بە سەرکەوتن دەکەن. ئەمجار لەگەڵ هەڵکشان، کۆتر توانای نامێنێ. دیسان هەناسەی لە بەر دەبڕێ، پێیەکانی قورس دەبن. لە شوێنێک،

پێی ڕاستی دەکەوێتە ناو چاڵێک و خۆیشی دەمەو ڕوو دەکەوێتە زەوی. ڕێناس دێت بە هاوارییەوە. ئەو دەستی ڕێناس دەگرێ و هەڵدەستێتە سەر پێ، خۆی کۆ دەکاتەوە، تفەنگەکەی هەڵدەگرێ و دەست دەکاتەوە بە ڕێکردن. بەڵام نابێ. ڕێناس دەڵێ «شیرینی بخۆ، کەمێک شیرینی بخۆ... و لە دەمتەوە هەناسە مەکێشە، لە لووتەوە، لووت...» کۆتر کەمێک شەکر دەکاتە دەمی، دەیمژێ و ڕێدەکات. بەڵام دوای ماوەیەک دیسان دەکەوێ. ئەمجار خۆی هەڵدەستێتەوە. کۆتر هەڵدەستێ، ڕێدەکا و دەکەوێ، هەڵدەستێ، ڕێدەکا و دەکەوێ.

گرووپی پێشەوە ئیدی دیار نین. لە گرووپی دواوە چەند کەسی دیکەش وەک کۆتر بە سەختی، بە کەوتن و داڕووخان ڕێدەکەن. کۆتر پێی خۆشە کە لە بێزاری و سست بووندا تەنیا نییە. ئەوان هەر سەردەکەون. خۆر، تیشکی خۆر لە پشت چیاکاندا ون دەبێ. بۆران توندتر دەبێ، سارده، ئێستا هەموو بەدەنی کۆتر تەڕە. ئەو هەم ئارەقە دەکات و هەم بێداد سەرمایەتی. هەوای وشک وەک خەنجەرێک، قوڕگی دەبڕێ. لاقی، بووتەکانی ئێستا بوونەتە بارێکی قورس، وەک چیا ئەستوور و قورس بوون. هەر جارە کە کۆتر هەوڵ دەدا لاقێکی خۆی هەڵبێنێ وەک ئەوە وایە شاخێک لەو شاخانە لە زەوی بەرز بکاتەوە، وا ماندوو دەبێ و ئازار دەکێشێ. بەڵام هەر ڕێدەکات، سەرەڕای هەر شتێک هەر دەڕوات.

نزیک لووتکەی ئەو چیایەی کە ئەوان بەرەو ئەوێ دەچن، لە شوێنێک، کچێک کە لە ڕیزەکەدا بە شوێن کۆترەوەیە، دەکەوێت و ئیدی ناتوانێ هەڵبستێت. چەند خولەکێک ڕادەوەستن و دەیانهەوێ یارمەتیی کچەکە بدەن. بەڵام کچە ناتوانێ هەستێت. ڕێناس، کۆتر و چەند شەڕڤان بەسەرییەوەن. ڕێناس دەڵێ: «ڕامەوەستن، ئێوە ڕێبکەن، بەجێ مەمێنن... « گرووپ دەکەوێتەوە ڕێ. ڕێناس و دوو شەڕڤانی کوڕ لای کچە

دەمێننـەوە. پـاش ماوەیـەک ڕێنـاس و ئەوانـی دی خۆیـان دەگەیەننـەوە بـە گرووپ. کچە ئێستا بـە کۆڵـی کـوڕە شـەرڤانێکی چـوار شـانەوەیە. کاتێـک کۆتـر ئـەم کچـە لـە سـەرخۆ چـووە بـە کۆڵـی شـەرڤانەوە دەبینـێ، لـە لایـەک دڵـی بـۆی دەسـووتێ، لـە لایەکیشـەوە شـەرم دەکات. بـەڵام سـەیرە. لـە لایەکیشـەوە خۆشـحاڵە کـە کەسـی سـەر کۆڵـی شـەرڤان خـۆی نییـە، یەکـی دیکەیـە. ئـەو دەبـێ ڕێبـکات، خـۆ ڕاگـرێ، سـەرەڕای هـەر شـتێک، لەگـەڵ هەمـوو سـەختییەک خـۆی بگەیەنێتـە دوا قۆنـاغ. ئـەو دەبـێ ڕێ بـکات. بـۆران نابێتـە ئاسـتەنگ، بـە پێچەوانـەوە دەبێتـە یارمەتیـدەر؛ بەفـر نابێتـە کەمیـن، دەبێتـە مافوورێکـی سـپی و ناسـک کـە ڕێگـەی پیشـان دەدا. سـارد و سـەرمای دەر و دەشـت نابێتـە کفـن، دەبێتـە فێنکاییەکـی ناسـکی ڕۆژانـان، لاقـی ئیـدی نابێتـە بارێکـی قـورس، دەبـێ ببێتـە لاقـی سـووک و چالاکـی ئـەو کەروێشـکانەی لێـرە و لـەوێ دەردەکـەون و پسـپۆڕانە هەڵدێـن. کۆتـر دەبـێ ڕێ بـکات؛ دەنگـی بـۆران دەبـێ ببێتـە دەنگـی سـترانێکی کەونـارا، ڕێچکـە و ڕێبـازی نـاو شـاخ و چیـا دەبـێ ببێتـە دەرگای کـراوەی نهێنیـی ئەفسـانە و چیرۆکـەکان و ڕێگـە بدەنـە کۆتـر.

بەڵـێ، کۆتـر دەبـێ ڕێ بـکات. کۆتـر خۆشـحاڵە کـە هێشـتا ڕێـدەکات. کۆتـر خەمینـە کـە یـەک لـە هاوڕێکانـی ئیـدی ناتوانـێ ڕێ بـکات. دوای ئـەو هەمـوو ڕێکردنـە، ئێسـتا بیـری کۆتـر دەڕوا. نـا، بیـری نـاڕوا، خـەوی دێـت. شـەوە، شـەو کاتـی خـەوە. کۆتـر دادەنەوێتـەوە، مشـتێک بەفـر هەڵدەگـرێ و دەم و چـاوی خـۆی پـێ دەشـوا. کەمێـک ماندوویەتیـی دەحەسـێتەوە. بـەڵام پێیەکانـی، بۆچـی پێیەکانـی وەهـا تەزیـون؟ بۆچـی پێـی ئیـدی ناجمـن؟ کۆتـر ڕێ دەکات، دەبـێ ڕێ بـکات. بـەڵام پـێ نـاڕوات. وەک بڵێـی پێـی لێکرابێتـەوە، ئیـدی پێیەکانـی هـی خـۆی نییـە. جـل و بەرگیشـی ئێسـتا وەهـا قـورس بـووە دەڵێـی لـە ئاسـن درووسـت کـراوە. ئەمـە چ قورساییەکە کـە لـە هـەر لایەکـەوە بـە سـەریدا دێـت؟ نـا، دەبـێ غیرەتـی بـێ، «کۆتـر،

غیرەت» وا دەڵێ بە خۆی. بەڵام خەوی دێت. خەو چاوەکانی گرتووە. پێدەچێ ئەو بتوانێ بە چاوی بەستراو، لە خەویشدا، ڕێگە ببڕێ. غیرەت... کۆتر دەکەوێ... دەگلێتە ناو بەفر و جمەی لێ نایەت. خەوی دێت، خەوی شیرین، خەوی خۆش و نازەنین، نەرم و ئارام. بەڵام کۆتر بە دەنگێک بە خەبەر دێتەوە. «کۆتر، وەخەبەر بێ کۆترا» ڕێناسە، کۆتر چاو هەڵدێنێ و لە ڕێناس کە ئێستا بە سەر سەریەوە ڕاوەستاوە، دەڕوانێ. ڕێناس وەک کۆتر بێ ئەزموون نییە. کۆتر پێدەکەنێ و دیسان چاوی دەبەستێ. «کۆتر هەستە». کۆتر دەنگی ڕێناس دەبیستێ، دیسان چاوەکانی دەکاتەوە. کە چاو دەکاتەوە ڕێناس شەقازلەیەکی توندی لێدەدا و دەڵێ «هەستە» شەقازلەیەکی دی و یەکی دی. کۆتر کەمێک دێتەوە سەر خۆ، بە زەحمەت دەڵێ: «ئێوە بڕۆن، من خەوم دێت، ئێوە بڕۆن. ڕێناس دو شەقەزلەی دی لێدەدا، بە هەر دوو دەست ڕایدەوەشێنێ، پشتی تێدەکا لە سەر چۆک لە بەر دەمی کۆتر دادەنیشێ، بە هەر دوو دەست دەیگرێ و دەیکاتە کۆڵی خۆی.

«نەخەوی» ڕێناس بە سەریدا دەقیڕێنێ «نەخەوی، ڕێگەکەمان زۆری نەماوە، قسە بکە، گاز لە زمان و لێوت بگرە، نەخەوی...»

کات دەڕوات، ئەوان دەڕۆن، خەو دێت، خەیاڵ دێت، خەون دێت. ئەوان دەڕۆن، بە ئاهەنگێکی خێرا و توند. بەهەنگاوی گەورە، کۆتر بە کۆڵی ڕێناسەوە، ئەوان دەڕۆن. کۆتر دەڕوا، لە نێوان خەو، خەون و شاخ و چیادا دێت و دەڕوا. ئەوان چەندە دەڕۆن، کات چەندە دەڕوا کۆتر ئیدی ئاگای لێ نییە. کاتێک کۆتر دیسان چاو دەکاتەوە، لە ناو نەشکەوتێکدان. کۆتر لە سەر کا و پووش ڕاکشاوە. ڕێناس و چەن کەسی دیش بە دەوری کۆترەوەن. ڕێناس دەڵێ «هەر بژیت کۆتر، ئێمە سەرکەوتین، هاتین... چاوەکانت بکەوە... مەگری...». ئینجا کۆتر بە خۆی دەزانێ کە دەگری. لە ناکاو بێدەنگ دەبێ. بۆنی ئاگر

و دووکەڵـی هێـزن دەگاتـە لووتـی. کۆتـر هەندێـک خـۆی کـۆ دەکاتـەوە، دەیهـەوێ هەسـتێتە سـەر پـێ، بـەڵام ئـاگای لـێ نییـە بەدەنـی دێشـێ، هەموو گیانی تەزیوە، کوتـراوە. لـە گشتی سـەیرتر، پێیەکانی دێشـن. نا، نایێشـن، پێـێ دەسـووتێن، وەک بڵێـی لـە نـاو ئاگردا بن، وەها دەکزێتـەوە.

«بمبەنـە لای ئاگرەکـە» کۆتـر وشـە بـە وشـە بـە زەحمـەت وا دەڵـێ. دەنگێـک دەڵێـت «نـا». فەرمانـدار، ئەویش ئێسـتا هاتۆتـە لای کۆتـر «هـەر بژیـت کۆتـر، ئەزموونـی تـۆ بـێ وێنـە بـوو... بـەڵام دەبـێ لـە ئاگـرەوە دوور بیـت.» ڕێنـاس سـەتڵێکی قووڵـی پـڕ لـە بەفـر بـە دەسـتەوە، دێتـە سـەر سـەری کۆتـر. خەنـدەڕوو پێـی دەڵـێ «ئێسـتا پـاش کەمێکـی دی هیچی تیدا نامێنـێ» و پۆتینەکانـی کۆتـر لـە پێـی دەردێنـێ. دوای پۆتیـن، گۆرەویـی بەنـی ئەسـتووریش لـە پێـی دادەکەنـێ، دەرەلنگـی پانتۆڵەکـە تـا ئەژنـۆی هەڵـدەکات و بـە بەفـر پێـی کۆتـر دەماڵـێ. سـووتانێکی کـەس نەدیـو و بێکۆتایـی دەگاتـە دڵـی کۆتـر. دەیهـەوێ بگـری، هـاوار بـکات، دەیهـەوێ بمـرێ. کۆتـر گاز لـە لێوەکانـی دەگـرێ. تـا هێـزی هەیـە لێـوی لـە ژێـر ددانیدا دەگووشـێ. لێـوی خوێنـی لێدێـت. خوێـن دەچێتـە قوڕگـی. ماسـاژدان ماوەیەکـی درێـژ بـەردەوام دەبێـت. ڕێنـاس دوای ماسـاژەکە، هـەر دوو پێـی کۆتـر دەخاتـە نـاو سـەتڵێکی پـڕ لـە ئـاو و ئـارام ئـارام بـە دەسـت و پەنجـە قەڵەوەکانـی دەیماڵـێ. ئەوەنـدەی ماوەیەکـی درێـژ ڕێنـاس سـترانێکی کەونـارا دەڵێتـەوە و پێیەکانـی کۆتـر بـە وردی دەماڵـێ. گۆرانییەکـەی ڕێنـاس کـە وشـەکانی بـە جوانـی ناگەنـە گوێـی کۆتـر، کۆتـر خـەو لێدەخـات و دەیباتـە نـاو خەوێکـی نـەرم.

پـاش چـەن کاتژمێرێـک، کۆتـر لـە دەنگـی ناڵە ناڵێـک خەبـەری دەبێتەوە. لـە تەنیشـت کۆتـرەوە دوو کەسـی دی، کوڕێـک و کچێـک خەوتـوون. کوڕەکـە دەناڵێنـێ. دەور و پشـت تاریکـە. لـە لای چەپـی کۆتـرەوە چرایەکـی دەسـتیی بچـووک لـە سـەر دیوارەکـە دەگـڕێ. ئـەوان لـە لای دواوەی ئەشـکەوتێکی

یەکجار قووڵن. بەتانییەکی گەرم بە سەر کۆترەوەیە. بۆنی قورسی کا، پووش، سووتان و خوێن و میز ناو ئەشکەوتی گرتۆتەوە. لە لای ڕاستی ئەوانەوە لە پاڵ دیواردا چەند ڕیز هێزن دیارە. لە دوورەوە، لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکە، ڕووناکی بچووکی ئاگرێک دیارە و دەنگیش لەوێوە دێت.

کۆتر دەژی، سەیرە، کۆتر لە خەوی شیرینی بێ گەڕانەوە وەخەبەر هات!

کۆتر بە پارێزەوە خۆی دەجووڵێنێ و بە ئارامی هەڵدەستێتە سەر پێ. پێیەکانی بە خاولیی گەرم داپێچراون. جل و بەرگ و فیشەکدان و ڕەختی لە بەرە. ئەو هێدی هێدی، هەنگاوێک، دوو هەنگاو دەگوێزێتەوە. بەڵێ ئەو دەتوانێ ڕێ بکات. بە ئارامی خۆی دەگەیەنێتە بەر دەرگای ئەشکەوت، لای ئاگرەکە، لای هاوڕێکانی. «خوشکە وەرە» یەک وا دەڵێت و لە تەنیشت خۆی جێیەکی بۆ دەکاتەوە. کۆتر دادەنیشێ. شەڕڤان چەند ڕیز هێزن دادەنێنە سەر ئاگر و وەک ئەوەی بیانەوێ قەڵایەک ساز بکەن، ئاگر بەگوڕ دەکەن. مەشخەڵانی ئاگر لێک دەئاڵێن و بەرز دەبنەوە. کۆتر چاو لە ڕێناس و فەرماندار دەگەڕێنێ. بەڵام ئەوان دیار نین. «تۆ چۆنی؟» ئەو شەڕڤانەی جێگای نیشانی کۆتر داوە لێی دەپرسێ، «باشی؟... چایەکی بۆ بێنن.»

«بەڵێ، من باشم، باشترم»

ئێوارە گەشتۆتە شەو. بەفر ڕاوەستاوە. نابارێ. شەوێکی سارد و بێدەنگ دەستی پێکردووە. بەڵام دونیا ڕووناکە. لە سەرەوە، لە ئاسمان، ئەستێرە دەدرەوشێن. لە خوارەوە، لە سەر زەوی بەفرێکی سپی، زۆر و بێکۆتایی تراویلکەیەک ساز دەکات. ئەو شوێنەی ئەوانی تێدان، بەرەو ئاسمان لە نزیکی ئەستێران، هەڵدێرێکی خوار و خێچە. ئەستێرە چەندە نزیکی ئەوانن! ئەوەندەی دە ئەشکەوت [قووڵ] شاراوە،

یەک لە دوای یەک، دیارن. لە بەر دەرگای هەندێک ئەشکەوتی دیش ئاگر کراوەتەوە. چەند شەڕڤانێک لە ژێر [شەوقی] ئەستێرەی زێڕینـدا وەک سێبەری ئەو شاخە مێژوییانە، لە بەر دەرگای ئەشکەوتەکان دێن و دەچن. دیمەنێکی بێ هاوتا لە پێش چاوی کۆتردایە. کۆتر ئازاری پڕ و ماندوویەتیی بەدەنی لە بیر دەچێتەوە. بیر دەکاتەوە «وڵاتی من، وڵاتی بێچارە و بێکەسم...» چیا، چیای سپیی گەوهەری، وەک یەک، هەر وەک خۆی، بێ گۆڕان، شوێنی هەمیشەیی و تاهەتایی ڕێبوار و کاروانی جودا جودا و تێکەڵ. دوێنێ، پێری، بەسەر پێرێ، هەندێکی دی، ئەمڕۆ، ئێمە، سبەینێ و دوو سبەی ئەو خەڵکانەی بە شوێن ئێمەدا دێن. ڕێبواری جودا، ڕوو و ڕوخسار جودا، جل و بەرگ جودا، ڕۆژ و ڕۆژگار جودا، بەڵام شوێن هەمان شوێن، ڕەنگ هەمان ڕەنگ، زستان هەمان زستان. سارد و سەرما هەمان. بەفر هەمان، ئەستێرە هەمان. «وڵاتەکەم، یەکەم ئەسرینی ئەوینی من... دوایین وشەی ئەشقی من کە ئێستا ونە» کێ هات؟ کێ چوو؟ کێ تۆی داگیر کرد؟ کێ حەزی لێتکرد؟ کێ نەفرەتی لێکردی؟ کێت حەواندەوە، کێت خۆشویست، باوەشت بۆ کێ ئاوەڵا کرد، کێت لە باوەشی خۆتدا بردە گۆڕ؟

«مێژووی تۆ؟ زمانی مێژووەکەت؟ زمانی ئەو چیایانە؟ کێ دەڵێ کە تۆ ون دەبی و لە مێژوو لە لاپەڕەکانی ژیان ماڵئاوایی دەکەی؟ فەرموو من هاتووم، لە ئامێزی تۆدام، لەگەڵ جۆشی ئەوینمدا، بە کەفەنی مردنمەوە، بە بیر و هۆشمەوە، بە نەزانی و بێ ئەزموونیمەوە، هاتووم. فەرموو بمحەوێنەوە، ئاشقم بە، بمکوژە... وڵاتە هەژارەکەم، ئیدی خۆت دەزانی، فەرموو» کۆتر چاوی بڕیوەتە گۆپکەی چیا و ئەستێران و بیر دەکاتەوە.

شەڕڤانێک پیاڵەیەک چای گەرم دێنێ و دەیداتە کۆتر. کۆتر چا دەخواتەوە. دوای چاکەش، یەکی دی چەن پاروو نان و سینییەکی پڕ

لە ساوەری گەرم دێنن و دەیداتێ. ساوەر پڕی پلە گۆشتە. کۆتر هێدی هێدی نان و ساوەریش دەخوا. شەڕڤانەکەی تەنیشتی دەڵێ «خوشکە سەیری ئەم جوانییەی ئەو چیا ڕووناکە بکە، خۆشترین خۆشیی دونیا ئەمەیە. هۆ ئەو چیا حەشارگەیە، حەشارگەی هەر کەسێک، هەر شتێک، هەر ئافرێنراوێک. هەر کەسێک هەر کاتێک کەوتە تەنگانە، ڕوو لەم چیا بە وەفایانە دەکات... خوشکە سەیری کە...».

چیا، حەشارگە، بەوەفا؟ کۆتر هیچ ناڵێ. کۆتر کەسانی دانیشتووی دەوری ئاگر دەژمێرێ. ئەوان هەشت کەسن. سێ کچ، پێنج کوڕ. ڕوو بە خەندەن. دووکەڵی جگەرە تێکەڵی دووکەڵی ئاگر دەبێ. وەک بڵێی بە ڕۆژدا هیچ ڕێگەیان نەکردبێ، وەک ئەوەی بە ڕێگەی شەڕ، پێکدادان و مردندا نارۆن، وەها خۆشحاڵ و زیندوو، دەپەیڤن و گاڵتە دەکەن. هەموویان گەنجن، تەمەنیان لە نێوان هەژدە تا بیست و پێنجدایە. کوڕ؛ بەهێز. بەڵێ، کوڕ خوێن گەرم، چاونەترس، بە خۆ باوەڕ و ژیر. ژیر؟ کوا ژیر؟ تۆیش کەوتیتە ناو شیو و دۆڵ و چیا، هەڵکشایتە سەر لووتکەی تەم و مژاویی ئەم چیایانە؟ تۆیش خۆت سست کرد، تۆیش کەوتی؟

لەگەڵ دەنگی سترانێک کۆتر بە خۆیدا دیتەوە. شەڕڤانێکی باریکی درێژی سمێڵ قەیتان کە لەو بەر ئاگرەکەوە لە بەرانبەر کۆتر دانیشتووە، سترانێکی خەمگین دەڵێتەوە، دەنگی نەرمە و ئاوازیشی ئارامە.

بێ ئەوەی دەنگی هەڵبڕێنێ، بە ئارامی گۆرانی دەڵێ و بە وشەی زۆر زوڵاڵ و سادە، باسی چیا، وڵات، سرووشت و خاک دەکات. تۆ ئەی خاک، ئەی شاخ، ئەی چیا، ئەو وا دەڵێ. لە بیر مەکە، ئەو کەسانەی بۆ تۆ، لە شەڕدا کوژران، بە گوللەی غەددار لە زەوی گلان، لە بیریان مەکە. ژمارەیان بێ ئەژمار، یەک بە یەک لە بیری ئێمەدا [ماون]، ناویان لە سەر دڵی ئێمەیە، لە بیر مەکە. بێنەوە بیر، بە ناوی خۆیان

بانگیان بکە، بە ئەوینی خۆت ئەوانت خۆش بوێ، خوێنیان هەنووکە گەرمە، نەفەسیان لەگەڵ بای کوێستانان لە دەر و دەشتە. تۆ ئەی خۆر، ئەی ئەستێرە، ئەی مانگ، تۆ شەهیدی، ئەوان ئەستێرەی ئەم خاکە، مانگی ئەم شاخە، هەتاوی ئەم چیایە، بەختی ئەم وڵاتەن، هۆ لە بیر مەکە...

خۆزگە کۆتر ئێستا دەیتوانی وشەکانی ئەم شەڕڤانە بنووسێ. ئەو سترانە، ئەو وشانە هی ئەو شەڕڤانەن؟ یان کەسانی دی پێیان وتووە؟ یان بەندەکانی گۆرانییەکی فۆلکلۆرین؟ ئاواز و شێوەی وتن کۆنە، بەڵام وشەکان نا. شەڕڤان هەندیک دەحەسێتەوە، کەمێک بێدەنگ دەبێ و دیسان دەست پێدەکاتەوە.

هۆ تۆ، هۆ ئێمە، ئێمەی بریندار، ئێمەی پێشەنگ، ئێمەی قوربانی. خوێن رێدەکەوێ، لە مێژووەکەمان، لە ئێمە، ئێمەی کەوتوو، ئێمەی ڕابوو، ئێمەی وشیار، ئێمەی ئەفسانە، ئێمەی پەسن و خاوەن پەسن، ئێمەی دڵ و دڵدار، نا نا، ئێمە لە بیر ناکەین، نە خوێنی ڕژاو، نە خۆری گەرم، نە تیشک و درەوشانەوەی ڕووناک، ئێمەین، ئێمەی سەرهەڵدەر، ئێمەی دۆستی تۆ، دۆستی کۆن، تۆ هەی خاک، هەی شاخ، هەی چیا...

گۆرانیی شەڕڤان وەک شینگێڕی دێتە گوێی کۆتر. کۆتر قورس دەبێ، شەکەتە و خەوی دێت. لە لایەکیشەوە دەیهەوێ گوێ بۆ شەڕڤان شل بکات. وشەکان باش ببیستێ. بەڵام خەو بە سەریدا زاڵ دەبێ. کە سەری دادەکەوێتە خوار، شەڕڤانی تەنیشتی وەخەبەری دێنێت. «هەستە، بەیانی ڕۆژێکی دژوارتر بەهیوامانە، بڕۆ بخەوە» و دەینێرێ بۆ ناو ئەشکەوت. کۆتر بە چاوی خەواڵوو دەڕوا بۆ جێگەکەی پێشووی و بە جل و بەرگ، ڕەخت و فیشەک و خاولیی پێچراو لە پێیەکانیەوە ڕادەکشێ، بەتانی دەکێشێ بە سەریدا و دەخەوێ.

«کۆتر، خوشکە، کۆتر...» کۆتر بە دەنگی ڕێناس وە خەبەر دێت. «خوشکە، کۆتر، هەستە، هەستە، سپێدەی داوە، هەستە، ئێمە ڕێدەکەوین.» کە کۆتر ڕوخساری دەم بە خەندەی ڕێناس دەبینێ، خەندە لە لێوی خۆیشی دەنیشێ و دەڵێ «سپاس ڕێناس» کۆتر پێدەکەنێ و بەرەو لای ناوەوەی ئەشکەوت دەڕوا. کۆتر بە ئارامی خۆی دەجووڵێنێ. بەڵێ، لاق دەجووڵێ. لاقی بەرەو خوار و بەرەو ژوور دەکات، پێی خۆشحاڵە. لەگەڵ ئەوەش کە لاقی ژان دەکات، بەڵام توانای بە سەریدا هەیە. کۆتر هەڵدەستێتە سەر پێ، خۆی کۆ دەکاتەوە، گۆرەوییە وشکەکانی دەکاتەوە پێی، بە زەحمەت پۆتین دەکاتە پێ ماسیوەکانی، دۆخینی پانتۆڵەکەی توند دەکات، پشتوێنی درێژی دەبەستێ، سەرپۆش دەدا بە سەردا، تفەنگ لە تەنیشتی هەڵدەگرێ و دێتە دەرەوە. بەڵام لە ناکاو وەک ئەوەی دەرزییەک چووبێ بە چاویدا، چاوی ژان دەکات؛ شەوقی دەر و دەشت دەدا لە چاوی. چەند خولەکێک لە بەر دەرگای ئەشکەوت، چاو نووقاو، دەست و پەنجەی بە سەر چاویەوە ڕادەوەستێ. پاشان بە ئارامی چاوی دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەش کە هێشتا سپێدەی نەداوە، خۆر و تیشکی خۆر هێشتا دیار نییە، بەڵام دونیا سپی دەکاتەوە. دونیا دیسان لە ناو شەوقێکی سپیدایە. بایەکی سارد، وەک چەقۆ ڕوخساری کۆتر دەبڕێ. ئەمڕۆ هەوا ساردترە، با زیاترە. پێدەچێ لە بەر بەرزایی [شوێنەکە] بێت. لەوانەیە کاتێک بەرەو خوار بوونەوە هەوا گەرمتر بێت. کۆتر دەلەرزێ. «یاسایەکی دی» دەنگێک لە تەنیشت کۆترەوە دێت. بەڵێ فەرماندارە. ئەو بە بزەوە سەیری کۆتر دەکات و دەڵێ «ڕۆژباش، بەڵێ یاسایەکی دی، ژێر چاو، تەوێڵ و دەور و بەری چاوت ڕەش بکە. ئەم شەوقی بەفرە زۆر مەترسیدارە، دەتوانێ چاوان کوێر بکات. دوێنێ سەرەتا بوو، بەڵام ئەمڕۆ مەترسییە. تەنیا تەدبیر خەڵووزە.» کۆتر بە فەرماندار دەڵێ: «سوپاس، سوپاس بۆ یارمەتیت...».

«یارمەتیی چی؟ لێیگەڕێ، ئێمە هێشتا زۆر جار یارمەتیی یەک دەدەین و پشت بە یەکتر دەبەستین. ئەوەش یاسایەکی ژیانی شەڕڤانییە. تۆ ئەمڕۆ چۆنی؟ پێیەکانت چۆنە؟ بەڵام با شتێک بڵێم، تۆ قارەمانی. تۆ وەک پڵنگ هەڵکشایتە سەر چیا. هەر بژیت... ئێستا خۆت کۆ بکەوە، ئامادە بە، پاش کەمێکی تر دەکەوینە ڕێ.» بەڵام ئەوان ئەوەندەی کاتژمێرێکی دی لە لای ئەشکەوت دەمێننەوە. شەڕڤان دەچنە پشت تەپۆڵکە و بەردان، پێویستیی خۆیان بە جێ دەگەیەنن و دێنەوە لە دەوری ئاگری داگیرساو دادەنیشن، چایەکی گەرم و پیاڵەیەک شەکراو دەخۆنەوە، نانی وشک و دۆشاوی لە قوتوو نراو دەخۆن، بە سەر ئەوەشدا حەوت قوتوو دۆشاو دەخۆن، جگەرە دەکێشن، چەکەکانیان کۆنترۆڵ دەکەن و پاشان هەڵدەستنە سەر پێ. کە هەڵدەستن، ڕێناس پیاڵەیەک بە دەستەوە دێتە لای کۆتر و دەڵێ «ئەمە بخۆوە، شەربەتە، بەهێزت دەکات، بەم بادا دیارە هەوا ئەمڕۆ زۆر غەدداره، ئەمڕۆ زمانی با دۆستانە نییە» کۆتر شەربەتەکە دەخواتەوە و دوایی دەچێتە ناو ڕیزەکەی خۆی.

فەرماندار و دوو کەسی تەنیشتی، دیسان لە پێش ئەوان لێیان دەڕوانن. فەرماندار دەڵێ: «لێرە ڕێگەکەمان جودا دەبێتەوە، دەبین بە دوو بەش، دوازدە، دوازدە. ئەو یازدە کەسەی کە ئێستا ناویان دەڵێم دەبێ لە ڕیزەکە بێنە دەرەوە و بێن لە لای چەپەوە ڕیزێک درووست بکەن. فەرماندار بە دەنگێکی بەرز ناوەکان دەخوێنێتەوە. ناوی کۆتر و ڕێناسیشی تێدایە. ئەو یازدە کەسە بە خێرایی برووسک لە ڕیز دێنە دەر و ڕیزێکی نوێ ساز دەکەن و چاوەڕوانی دەنگی فەرماندار دەبن. «منیش لەگەڵ ئەم دەستە دەبم، ئەو دوو برایەشمان لەگەڵ دەستەی پێشوو... خۆتان گورج بکەنەوە، ئازا و بەهێز بن. بە گڤەی بادا دیارە ئەمڕۆ دژوارە، زۆر دژوار. بەڵام ئێمە ناچارین، دەبێ بە ڕێگەکەماندا بڕۆین. دەی

ماڵئاوایی لە یەک بکەن با ڕێبکەوین، سەرکەوتن... سەرکەوتن...

ئەو بیست و چوار کەسەی کە تا ئێرە پێکەوە هاتن، ئێستا لێک دادەبڕێن، باوەش بە یەکدا دەکەن، ماڵئاوایی دەکەن و دەڵێن «سەرکەوتن»

و ئەوان دەکەونە ڕێ. و کۆتر دەکەوێتە ڕێ.

بەڵام هێشتا لە یەکەم هەنگاودا با توانای ڕۆشتن لە کۆتر دەستێنێ. خۆر هێشتا هەڵنەهاتووە. بڵێی پاش کەمێکی دی هەوا نەرمتر بێت؟ بڵێی بە هەڵهاتنی هەتاو و تیشک، با ڕاوەستێت و هەوا گەرمتر بێت؟ بەڵام ئەگەر خۆر هەڵنەیەت و هەوا هەروا گیراو بێت؟ کۆتر هەر دوو گۆشەی سەرپۆشەکەی بە ژێر ملیدا دێنێ و سەرپۆش تا سەر دەمی دینێ و دەست بە ڕێکردن دەکات. ڕێناس هەروەک دوێنێ لە پێش ئەمەوەیە، بەڵام بە شوێنیدا ئێستا کچێکی باڵابەرز و قەڵەو هەیە، پاش کەمێک ڕێکردن، دیسان کۆتر ماندوو دەبێ. «نا» کۆتر دەڵێ «نا، دەخیلت بم، نا، شەرمەزارم مەکە» بۆچی ئەوان بەرەو خوار نابنەوە؟ ئەگەر بەرەو خوار ببنەوە بڵێی با ڕاوەستێ؟ ئەوان لە سینەی چیاوە، نزیک لە لووتکەکان، ڕاستەو ڕاست ڕێدەکەن.

با توندتر دەبێ، هەوا ناکرێتەوە. تیرێژی هەتاو دیار نین. بەفرێکی سووکی وشک دەست بە بارین دەکات. بەفر تۆز دەکات. با، بەفری سووک و بەفری سەر زەوی تێکەڵ دەکات و دەیکاتە بۆران. با توندتر دەبێ، با دەگڤێنێ. بەڵێ، با وەک مارێک دەفیکێنێ. ترسێکی قورس دڵی کۆتر دادەگرێ. ئاهەنگی ڕێکردن توند و خێرایە. ڕێناس بە هەنگاوی گەورە، وەک بڵێی لە گۆڤەنددا بن، بە ئاهەنگ ڕێدەکات. کۆتر دەبێ وەک ڕێناس ڕێ بکات، وەک ئەو هەنگاو هەڵبگرێت. کۆتر بە مانگان لەم شوێنانە، لەو دۆڵە قووڵەدا تەمرینی کردبوو، چووبوو، هاتبوو، لە ژێر بەفردا مابۆوە، لە ناو بەفردا بە جێ ببوو، برسی مابوو، تینوو مابوو،

لێوەکانی، جەستەی قەڵەشیبوو، مەگەر ئەو ڕاهێنانە، ئەو زەحمەتانە، ئەو فێر بوونە بۆ ڕۆژێکی وەک ئەمڕۆ نەبوو؟ مەگەر ئەوانە نابێ ئەمڕۆ بێن بە هاوار و یارمەتییەوە؟ «کۆتر غیرەت». کۆتر بە دەنگێکی بەرز دەڵێ «غیرەت، خۆت خەمگین مەکە، تۆ مرۆڤی، مرۆڤ دەرەقەتی هەموو شت دێت، بە سەر هەموو سەختییەکدا زاڵ دەبێت، غیرەت، تۆ دەبێ بە سەر بەفر و بۆران و با و سەرمادا زاڵ بیت، غیرەت، تۆ دەبێ سەرکەوی...» بەڵام دوا وشە لە زاریدا دەمێنێتەوە. ئەو دەکەوێتە سەر زەوی و ناو بەفر. ڕێناس دەگەڕێتەوە بە لایەوە، بەڵام ئەو دەڵێ «نا، من هەڵدەستم تۆ بڕۆ» «من هەڵدەستم، من ڕێدەکەم، من بە سەر سرووشتدا زاڵ دەبم، دەبم... کۆتر هەنگاوێک هەڵدەگرێ و دەڵێ «دەبم» هەنگاوێکی دی و دیسان «دەبم...»

ئەوان دەڕۆن، لە سەر سینگی چیای بێکۆتایی، بەرەو چیایەکی دی ڕێدەکەن. با بەهێز دەبێ. بە دەور و پشتی شەڕڤانانەوە، وەک پڵنگی سەر شاخەکان دەخولێتەوە، وەک مارێک دەخشێ، وەک زەبرێکی کوشندە، دەیدا بە بن گاشەبەرد و هەڵدێراندا، دەنگێکی سەیری پڕ ترس و سام درووست دەکات و بە هەموو لایەکدا دەڕوات. با دەبێتە گەردەلوول، گێژلووکە. با بەفری زەوی هەڵدەگرێ، تێکەڵی ئەو بەفرەی دەکات کە دەبارێت، کلووی وشک و ئەستووری گەردەلوولی پێ ساز دەکات و دەیتەقێنێ بە ڕوخسار و ناوچەوانی شەڕڤاناندا. با ناهێڵێ کۆتر چاوەکانی بکاتەوە. ئەو چۆن ڕێ بکات؟ ئەوان چۆن بڕۆن؟ کۆتر دیسان دەکەوێتە ناو بەفر، بەڵام هەر یەکسەر هەڵدەستێتەوە. «پاشەوپاش» ڕێناس هاوار دەکات «پاشەوپاش بڕۆن، با لە پێشەوە دێت»، ئەوانیش هەڵدەگەڕێنەوە و وەها ڕێدەکەن.

ڕێناس هەڵە دەکات. کۆتر و ئەوانی دیش هەڵدەگەڕێنەوە و وەها پاشەوپاش بە ڕێ دەکەون. بەڵام ئەم شێوە ڕۆشتنەش بێ کەڵکە. با و

بۆران لە هەر لایەکەوە دێت. هێرشی با، بەفر و بۆران لە هەر لایەکەوە هەیە. کۆتر دەیبەستێ، جل و بەرگ، سەرپۆش، ڕوخسار و سەر و چاوی پڕ دەبێ لە بەفر. «ڕێناس» کۆتر دەقیڕێنێ «ڕێناس مەگەر ناتوانین تۆزێک ڕاوەستین؟» ڕێناس باش تێناگات کە کۆتر چی دەڵێ، دێت بۆ لای کۆتر «با ڕاوەستین» کۆتر بە گوێیدا دەقیڕێنێ «با ڕاوەستین تا با تەواو دەبێ، بڵێ با ڕاوەستین».

«نا» ڕێناس دەڵێ «نا، نا» کە ڕاوەستین هەموومان دەتەزین، لەم نزیکانە هیچ حەشارگەیەک نییە، دەبێ تا ئێوارە ڕێبکەین. ڕێبکە، تا دوایی هەر برۆ، ڕاوەستان نییە، برۆ...» پاش قسەکانی، ڕێناس بەرەو دوا دەڕوات و بەو کەسانەی بە شوێن کۆترەوەن هەمان شت دەڵێت و دەگەڕێتەوە جێگاکەی خۆی.

«نا» کۆتر دەڵێ «نا، نا...» هەتا ئێوارە؟ بە چ جۆرێک؟ بە چ شێوەیەک؟ چۆن؟

دەستە دەڕۆن. کۆتر دەڕوا. بە کەوتن، بە هەستانەوە، هەڵکشان، حەسانەوەی چرکەساتی، پاشەوپاش، ڕوو لە پێش، ئەوان هێدی هێدی دەڕۆن. کاتژمێرێک، دوو کاتژمێر، پێدەچێ سێ کاتژمێر. «بۆران زیاتر دەبێ، هەموو شت دەداتە پێش خۆی و تێکەڵی دەکات. بەفریش توندتر دەبێ. با، بەفری تۆز خول دەدات و گێژەڵووکی وەها ساز دەکات کە شەڕڤانان ناتوانن چاوان بکەنەوە. بۆران وەک حوشترێکی هار و تووڕەی لێدیت، گڤەی بۆران ئۆلان دەدات. کۆتر بە تەواوی لە توانا دەکەوێ. جل و بەرگ یەکجار قورس دەبن، جەستە قورس دەبێ، پێ قورس دەبێ چاو قورس دەبێ، دیسان خەوی دێت، هۆشی دەڕوات. سەرما، شەختە، سەخڵەت، خودایە! خودایە! چیا، هاوار چیا! قەزا لە تۆ کەوێ چیا! خودا غەزەبت لێبگرێ چیا. با، بۆران، بەفر، چیا، هاوار چیا، من دەخیلت بم چیا! ئێستا دەستە گەشتۆتە سەر لێواری

هەڵدێرێک و بە هەزار زەحمەت بەرەو ژوور هەڵدەکشێ. کۆتر چی بکات، دەتوانێ چی بکات؟ هەنگاوێک، دوو هەنگاو، نا، نابێ، کۆتر ڕادەوەستێ، هەناسە دەگرێ و دەیداتەوە. دیسان دوو هەنگاوی دی هەڵدەگرێ، بەڵام لە شوێنێکدا ئیدی ناتوانێ بڕوات. بە پێوە ڕادەوەستێ، نەفەس دەگرێ، هەندێک خۆی کۆ دەکاتەوە تاوەکوو هەنگاوێک هەڵبگرێ. بەڵام لە باتیی هەنگاوهەڵگرتن، لە زەوی دەگلێ و دەکەوێتە ناو بەفر. و ئیدی ناتوانێ هەستێتەوە. هێز و توانای بە تەواوی لە بەر بڕاوە. جەستەی بە تەواوی تەزیوە و ئیدی هەست بە هیچ شتێک ناکات. هیچ دەنگ و سەدایەک نایەتە بەر گوێی. ڕێناس دێتە سەر سەری و دەڵێ «هەستە، هەستە دانیشتن مەرگهێنەرە.» کۆتر بە دەنگێکی زۆر خەمین دەڵێ: «دەزانم، بەڵام ئیدی ناتوانم، ئێوە بڕۆن، من بە چارەنووسم ڕازیم، تۆ بڕۆ...».

ئەو شەڕڤانانەی بە شوێن کۆتردا دێن، بە پاڵ کۆتر و ڕێناسدا ڕادەبوورن و دەڕۆن. کۆتر و ڕێناس بە تەنیا دەمێننەوە. [دەستە] لە چاو ون دەبێ. «هەستە» ڕێناس بە تووڕەییەوە دەڵێ «وەک شێتان قسە مەکە، هەستە، زوو هەستە.» کۆتر هەوڵ دەدات هەستێ، هێدی هێدی بە یارمەتیی ڕێناس هەڵدەستێتە سەر پێ. بەڵام هێشتا لە یەکەم هەنگاودا دیسان دەکەوێ. با، بۆران، بەفر وەک شەقازلەیەک بە سەر ڕووی ئەودا دەتەقێت و دەیهێڵێتەوە. کۆتر ئیدی ناتوانێ بپەیڤێ و بە ئاماژەی دەست دەڵێ «بڕۆ». ڕێناس دادەنەوێتەوە بە سەریدا، دەستی چەپی دەخاتە ژێر گەردنی و سەری تۆزێک هەڵدێنێ و بە دەستی ڕاستی چەند شەقازلەی زۆر توند بە ڕوومەتیدا دەدات و دەڵێ «من دەڕۆم و دێمەوە، لێرە بەهیوام بە». کۆتر سەیری ڕۆشتنی ڕێناس دەکات. وەک ئەوەی تازە دەستی بە ڕێکردن کردبێت، وەک ئەوەی هیچ بارێک بە کۆڵیەوە نەبێت، بە هەنگاوی گەورە، وەک کەروێشکی ئەو شاخانە، وەک

ئەستێرەی ئەو ئاسمانانە کە لە نیوەشەودا دادەچن، ڕێناس بە خێرایی بە هەڵدێردا هەڵدەکشێ و [لە چاو] ون دەبێ.

«ئەمها، ئاوەها» کۆتر لە سەر بەفرەکە ڕادەکشێ و بە خۆشحاڵییەوە دەڵێ «ئاوەها.. بە تەنیا، لە سەر ئەم چیا خەیاڵکراوەدا، لە ژێر بەفردا... ئەمها، ئاوەها، ئۆغر بێ هاوڕێکانم، ماڵتان ئاوا هەڤاڵانم... ئەمها، ئاوەها...» کۆتر چاوەکانی دەبەستێ. لە بن گوێیدا ویزەی با دێت. بەفر، کلووی بەفر لە سەر ڕوومەتی دەتوێنەوە، دەیبەستن. تەزووی بەدەنی، دەست، پێ، لنگ، هۆش و مێشکی ڕوو لە زیاد بوونە. خەوێکی نەرم و شیرین دایدەگرێ. بەڵێ ئەمها ئاوا، ژیان و مەرگ، مەرگێک لە سەر زەویی بەفرگرتوو، لەگەڵ بەفر دێت، ئەو ژانەی لەگەڵ تەزین دێت. زەوی سارد، ئاسمان سارد، لە نێوان با و بۆرانی سارد و خەو و خەونی گەرمدا. لە نێوان ژین و مەرگدا. ئەها ئاوەها، بێ دەرەتان، بێکەس، بێچارە، بێهیوا، نە کەس و ئینسانێک، نە باڵندە و پەلەوەرێک، نە گوڵ و گوڵ خونچەیەک، نە شێعر و سترانێک لە داری دونیادا بە تەنیا، لە ناو بەفری بێکۆتایی، کفنێکی سپیی یەکجار گەورە، بەڵام بەختەوەر، بەڵام وەک شەوقی بەفری دوێنێ ڕووناک، دڵ ڕۆشن، ئاهها ئاوەها، خەو دێت، هەنگاو بە هەنگاو، شەپۆل بە شەپۆل، خەو دێت.

بەڵام قیرەیەک ئەو لە خەو ڕادەچڵەکێنێ؛ «هەستە» ڕێناسە لەگەڵ دوو شەڕڤانی دی. ڕێناس گەڕاوەتەوە. «نا» کۆتر بە زەحمەت بە بێزارییەوە دەڵێ «بۆچی هاتیتەوە، ئێوە گەڕانەوە!» ڕێناس و هەر دوو هەڤاڵەکەی، بە پەلە، کۆتر لە ناو بەفر هەڵدەستێنن، هەر کامەیان شانێکی دەگرن، ڕێناس بە پەنجە پانەکانی چوار پێنج شەقازلە لە کۆتر دەدات. نا، کۆتر ناتوانێ بە پێوە ڕاوەستێ. ئەوان، لە سەر بەفر درێژی دەکەنەوە، هەر دوو شەڕڤانەکە، پۆتینەکانی کۆتر کە بەستوویەتی

بە هەزار کێشە لە پێی دەردێنن و ئەمجار لاقی هەڵدێنن. دوایی ڕێناس بە قۆنداخی تفەنگە ژ-٣ کەی بە پێی کۆتردا دەکێشێت. لێدانێک، دوو، سێ، چوار، پێنج، شەش. ڕێناس پێی کۆتر بە لێدانی تفەنگ پان دەکاتەوە. «خێراکەن، پەلە بکەن، سەرەتا نایلۆنێک ڕاخەن، دواییش بەتانییەک لە سەر نایلۆن، خێرا کەن». دوای ئەوەی شەڕڤان نایلۆن و دوو بەتانی لە سەر بەفر ڕادەخەن، ڕێناس دەڵێ «کۆتر لە لایەکی پاڵ بخەن، منیش لە لایەکی ڕادەکشێم، جانتا و تفەنگەکانمان، کەمێک نان، هەڵوا، چەند دەسرە و چەند خاولیش بخەنە نێوانمان و نایلۆن و بەتانی بپێچنەوە، هەر دوو سەری بەتانیش باش ببەستن».

کۆتر و ڕێناس دەخرێنە ناو بەتانی، سەر و دەور و پشتیان گرێ دەدرێ. دەنگی پێی شەڕڤان دوور دەکەوێتەوە و ون دەبێ. ئەوان هەر دوویان ئێستا لە پاڵ یەکدا لە سەر بەفر لە ناو بەتانی دا ڕاکشاون. دونیا ئیدی سپی نییە، ئیدی بەفر و بۆران ڕوخساریان نابڕێ، ئیدی کلووی بەفر بە ڕووخساریانەوە نایبەستێ. بەڵام ویزە و فیکەی بۆران لە بن گوێیاندایە. ڕێناس دەڵێ: «کۆتر بپەیڤە، شتێک بڵێ. نەفەس و هەڵمی هەناسەی ڕێناس گەرمایەک دەڕژێنێتە سەر ڕووی کۆتر. کۆتر چاوەکانی دەکاتەوە. ئەو چاوی ڕێناس و سمێڵە بەستەڵەک بەستووەکانی ڕێناس دەبینێ و دەڵێ «دەبوو بڕۆشتبای».

«لێیگەڕێ خوشکە، قسە بکە، باسی خۆت بکە»

کۆتر چاوەکانی دەبەستێ و دەڵێ «برا»

«خوشکە بپەیڤە، باسی خۆت بکە، خوشکە...»

«من» کۆتر دەڵێ «من کۆتر، کۆتری شاری مەزن، کۆتری گوندەکەمان، moi، خوێندکاری زمانی فەڕەنسی، من، منێک، دوو من، سێ من،... ون، deux، trois... من هیوادار، چاوەڕوان، ئەحمەق، کەر...» کۆتر ناتوانێ درێژەی پێبدا و دەڵێ «ڕێناس خەوم دێت».

خەو دێت، نا، نەک خەو، سەرەتا خەون دێت، خەیاڵ دێت. گوندێکی پڕ دار و بەر، دارستان، ئاو، جۆگە، گۆلی ئاو، ڕووبار، دەنگی باڵندە و پەلەوەر. خانووی سازکراو لە بەردی ڕەش. دونیا ڕووناک، گەرم، قژەقژی هەتاو. بۆنی گوڵ و گوڵخونچە کە لە دەر و دەشت دێت. لە ژێر خانوەکان، لە پاڵ باخچەی ڕەنگین، کانیاوێک و لە پێش [کانیش] ئەستێڵێک. داری بی و سپیدار کە بەرەو ئاسمان چوون. کانی و ئەستێڵی فێنکی ژێر سێبەری داران. کۆتر و چەند منداڵی دی لە تەنیشت ئەستێڵەکەدان. کۆتر لاقی دەخاتە ناو ئاوەکە. تەزوویەک دێت و جەستەی کەمێک دەچەمێتەوە. دایکی کۆتر کە لەگەڵ هەندێک ژن و پیرەژنی دی لە ژێر دارێکی زۆر بەرزدا دانیشتوون، بە نیگایەکی یەکجار نەرم و گەرم سەیری کۆتر دەکات. کۆتر پێدەکەنێ. دایکی پێدەکەنێ. کۆتر دێت بۆ لای دایکی و دەڵێ «دادە» دایکی دەڵێ «دادە بەقوربانت بێ کۆترەکەم» و کۆتر دەکاتە باوەشی. کۆتر سەر دەخاتە سەر سینگی دایکی، ئەنگوستی گەورەی خۆی دەخاتە دەمی، دەیمژێ و هێدی هێدی دەچێتە خەو.

کۆتر ئارام ئارام دەچێتە خەو.

## ١٠

# خوێن

لە وڵاتی چیا دوو ڕووبار هەیە. دوو ڕووباری گەورە، قووڵ و درێژ. دوو چەمی ناوداری هەموو هەرێمەکە. دوو ڕووباری کۆن کە لە مێژوو و وانەی مرۆڤایەتیشدا باس دەکرێن. ناوی یەکێکیان چەمی ڕۆژهەڵاتە، ئەوی دی چەمی ڕۆژئاوا. بەڵێ، یەک لە دڵی ڕۆژهەڵاتەوە سەرچاوە دەگرێ و بەرەو خوارووی وڵات دەڕوا، ئەوی دیش سەرچاوەی لە ڕۆژئاوای وڵاتە و بەرەو خوار دەبێتەوە. هەر دووکیشیان زیکزاک، بە کەند و لەند لە دڵی وڵاتدا دەگەڕێن، بە ناو چیا و شیو و دۆڵاندا دەڕۆن، دار و درەخت و دارستان بە جێ دەهێڵن و لە لای خوارووی وڵات دەگەنە یەک. چارەنووسی هەر دوو ڕووبار لە خوارووی وڵاتدا دەبێتە یەک. هەر دوو چەمی گەورە و خوڕ لە خوارووی وڵات لە شوێنێکی فراواندا دەبنە ئاوێکی بێپایان وەک دەریا.

چەمی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا و چارەنووسی ئەوان.

باز و کۆتر و چارەنووسی ئەوان.

لەم لاپەڕە نوێیەی ڕۆمانەکەماندا ئەگەر ئێمە دیداری ناو بیابان نەهێنینە ئەژمار، باز و کۆتر، یەکەم جارە وەک چەمی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا تووشی یەک دەبن. کۆتر لە لایەک، باز لە لایەکی دی. بەڵام

لە چەپەری گوندێکی لای خوارووی وڵاتی چیا، ئەوان ڕووبەڕووی یەک دەبنەوە. وەها؛

ئێمە ئێستا لەم لاپەڕە نوێیەی چارەنووسی باز و کۆتردا، دەچینە سپێدەیەکی بەهاری وڵاتی چیا و خۆمان دەگەیەنینە ڕێکردنی درێژی کۆتر و هەڤاڵانی. بەڵێ، بەڵێ، ئێمە لە کۆترەوە دەست پێدەکەین. سەرەتا دەچین بۆ لای کۆتر.

سەرەتای سپێدەیەکی بۆن خۆشی بەهارە، تیشکی سەر لە بەیان هێشتا لێینەداوە. ئەستێرە هێشتا بە تەواوی ون نەبوون. ڕووناکیی هێشتا پڕاوپڕ بە سەر تاریکیدا زاڵ نەبووە، بەڵام ڕۆژێکی نوێ دەستی پێکردووە. لە سەرەتای ئەم ڕۆژە نوێیەدا، شەڕڤانی سەرهەڵدەری وڵاتی چیا هێشتا ڕێدەکەن. لە ئێوارە بەملاوە ئەوان هەروا بە ڕێگەوەن. دونیا، دەر و دەشت، ئاسمان زوڵاڵ و ئارامە. دواپین ئەستێرەکانی شەوی دوێ، هێشتا بە ڕەنگێکی مەیلەو سوور دەدرەوشێنەوە. داری بڵاوی دارستان کە شەڕڤان بە ناویدا ڕێدەکەن، بە ڕەنگێکی تێکەڵ دەبریقێتەوە. گژ و گیا کە شەونم تەڕی کردوون، ئەوەندەی دوو بست سەریان دەرهێناوە و دەئاڵێنە پێی شەڕڤانان.

شەڕڤان، کۆتر و هەڤاڵەکانی، بیست کەس دەبن. ئەوان بە ڕەوتێکی ڕێک و پێک، نە زۆر ئارام و نە خێراش ڕێگە دەبڕن. ڕوخساریان، چەک و فیشەکدانیان، بە ڕەنگێکی ئەسمەر و بەڵەک دەبریقێتەوە. دەستەکانیان، پەنجە و نینۆکەکانیان دەبریقێتەوە. شەشیان کچن، ئەوانی دی پیاو. شەڕڤان؛ بیست کەس کە جل و بەرگی یەکدەستیان لە بەرە، وەک یەک ڕێدەکەن، وەک یەک هەناسە هەڵدەمژن و دەیدەنەوە. وەک یەک سەیری دەور و پشت دەکەن، وەک یەک پێدەکەنن و وەک یەک دەپەیڤن. سەرهەڵدەر؛ ئەوەندەی بیست کەس کە چارەنووسیان وەک یەکە. بەگشتی بە پشتی هەموویانەوە کۆڵەپشتییەک هەیە. کەوا

و پانتۆڵــی بەنــی وەک یەکیــان لــە بــەرە. ســەرهەڵدەرانی کــچ سەرپۆشــی ڕەنگینــی گوندییەکانــی ناوچەکەیــان بەســتووە بــە ســەریانەوە. شــەڕڤانی پیاویــش جۆرێــک کڵاو و جامانەیــان نــاوە بــە ســەریانەوە. بــە کەمــەری هەمووشیانەوە پشتێنێکی گەورە و ڕەنگین بەستراوە. بە سەر پشتێنەوە ڕەخت بەستراوە. ڕەخت تەنیا ئەوەی دەوری پشتیان نییە، وەکی تر لە سەر سینگیشیان ڕاست و چەپ [فیشەکدان] بەستراوە. ڕەختی چەرمین لەگەڵ خۆ جووڵاندنەوەیان، دەبریقێتەوە. گۆرەویی بەنی ڕەنگین کە تا سەر ئەژنۆ دێت لە پێی هەموویاندایە و پێیان لە ناو پێڵاوێکدا کە لە چەرم و قایشی سووک درووست کراوە و بە ئاسانی وەک پڵنگ پێوەی دەڕەخسن. ئاوەها دەجووڵێن. بە دەست یان بە پشتیانەوەش چەکیان هەڵگرتووە؛ تفەنگ، کلاشینکۆف، ئارپیی جی، بی کەی سی و بە ئاوقەدی زۆربەشیانەوە دەمانچەی قورس و درێژ و بە کەمەر و پالاسکەکانیانەوە نارنجۆک. نارنجۆکی مەرگ کە بە ئاهەنگی ڕێکردن لەرەی دێت.

ئەوان بە ئاسانی لە ناو دار و بەردی و دەوەن و گیادا ڕێگەی خۆیان دەدۆزنەوە و دەڕۆن. لەگەڵ ئەوەش کە باریان قورسە، پێیەکانیان چالاک، پسپۆڕ و سووکن. وەک بڵێی گۆڤەندیان گرتبێ وەها ڕێک و پێک، زۆر هاوئاهەنگ، بە ئاهەنگێکی سووک دەڕۆن. دیارە؛ ئەوان ڕێناس. دیارە؛ ئەوان ئاگاداری دۆخی ئەو ڕێکردنە سەیرەن. دیارە؛ ئەوان زمانی ئەو هەرێمانە، زمانی دار و درەخت، شاخ و دۆڵان دەزانن.

بیست شەڕڤانی سەرهەڵدەر؛ یەک لەوان کۆترە. یەکیشیان ڕێناس. هەر دوو لە ڕیزی پێشەوە لە تەنیشت یەک، ڕێناس کەمێک لە پێشترە، [ئەوان] ڕێدەکەن. لە ڕەوتی سپێدەی ئەم بەیانییە گەشەی بەهاردا، کۆتر بە مننەت، بە دڵخۆشی سەیری ڕێناس و ڕێکردنەکەی دەکات. ڕێناس هەر وەک فریشتەیەکی بەهەیبەت، بە ئارامی پێ بە

زەویدا دەنێت و ڕێدەکات. ڕێناس وەک شاخێک وەک چیایەکی ڕاست، لە خۆبایی، سەرکەش، بە چەک و باری قورسەوە هەنگاوی بڵند دەنێت و ڕێگەی نەناسراو دەبڕێت. ئەو وەک چەمێکی بەهار کە دەبێتە لافاو بە پارێزەوە لە سەر خۆ دەڕوات. ناوچەوانی کراوەی، چاوانی ڕەشی، ڕوخساری ئەسمەری، سمێڵی بۆری، جارجارە لەگەڵ هەنگاو هەڵگرتن دەدرەوشێتەوە. فریشتە، فریشتەیەک لە شێوەی مرۆڤ، فریشتەیەکی بێدەنگ و لە هەڵسوکەوتدا دڵنزم. فریشتەیەک کە چەندین جار کۆتری لە مەرگ و تیاچوون و ون بوون، ئاستەنگ و سەختی، شەرمێونی و شەرمەزاری ڕزگار کردووە. فریشتەیەک کە لە ڕۆژ و ڕۆژگاری ڕابردووەوە هاتووە و سەرجەم بەسەرهات و ئەزموونی با و باپیران، بە کەم قسەیی و پڕکاریی بێ کۆتایی خۆی، بۆ کۆتر و دیکەی هەڤالانی، پێشەنگیی دەکات. نیگای گەشی کۆتر لە ڕێناس و ڕەوتی ڕۆشتنی. «برا» کۆتر بە بزەیەکەوە دەڵێ «تۆ برای مان و نەمانمی ڕێناس...».

«تۆیش خوشکی من» ڕێناس بە خەندەوە، ئاوڕێکی دەم بەخەندەی لێدەداتەوە.

«تۆ منت لە گەورەترین دوژمنی جیهان، لە سارد و سەرما، بەفر و شەختە ڕزگار کرد، تۆ منت لە هۆڤترین، دژوارترین دوژمن، لە سرووشتی مۆڤ کە ببووە حەیوانێک و دوام کەوتبوو، ڕزگار کرد.»

«لێی گەڕێ، تۆیش ڕۆژێک یارمەتیی من دەدەیت و ڕزگارم دەکەیت... لێیگەڕێ و سەیری بەر پێت بکە، ئاگادار بە لە شوێنێکەوە بەر نەبیتەوە...».

«تۆ منت ڕزگار کرد، ژیانی منت لە مەرگ ڕزگار کرد. تۆ ژیانت گەڕاندەوە بۆم. ژیانێکی نوێت پێ بەخشیم...».

«کۆتر لێی گەڕێ، ئەمە جاری چەندەمە کە ئەمە دەڵێیت، بەسە، بیبڕەوە.»

«تۆ منت لە دژوارترین دوژمن ڕزگار کرد...».

«بەسە... دوژمنی هەرە دژوار سرووشت نییە، مرۆڤە، لە بیرت نەچێ، مرۆڤ دوژمنی هەرە دژواری مرۆڤە...».

کۆتر دەیبڕێتەوە. ئیدی ناپەیڤێ. ڕێناس کەمێک خێراتر دەڕوات و لە کۆتر دوور دەکەوێتەوە. کۆتر لە پشتەوە سەیری بەژن و باڵای دەکات. ئەم هاوڕێیە منی ڕزگار کرد، ئەم هاوڕێیە منی ڕزگار کرد. کۆتر وا بیر دەکاتەوە، ئەگەر ئەو نەبوایەت لەو سەرما و بەفرەدا دەست و پێی من دەیبەست و سەرما دەیبرد، من ڕەق هەڵدەهاتم. پێدەچوو منیش وەک زۆر هەڤاڵی دی کە ئێستا شان و قۆڵ یانیش پێ و لاقیان لە دەست داوە، سەقەت بوایەتم. من دەبووم بە ژێر هەرەسەوە و لووتکەی زستان دەبووە کفنی من و لەو دوند و هەورازانە بەر دەبوومە ناو هەڵدێر و شیو و دۆڵان. ئەو ڕزگاری کردم. ئەو زۆر کەسی تازەکاری وەکوو منی ڕزگار کردووە. بەڵام وەک ئەوەی هیچ شتێکی نەکردبێ وەها سادە، وەها بێ فیز ڕەفتار دەکات، هەمیشە هەر بەو شێوە بە هانای کەسانی کەوتوو و بێچارەوە دەچێت. خودایە قەت ئەو نەخەیت، قەت نەهێڵی بێچارە بێت، ناچاری نەکەی. من؟ من چۆن لە ژێر قەرزی باشییەکەی، پیاوەتییەکەی بێمە دەرێ؟ لە ناو ئەم ژیانی شەڕڤانییە کە بەردەوام بە مەرگ، بێچارەیی و ناچاری تەنراوە، چ دەرفەت و توانایەک بە دەست بێنم کە لە ژێر قەرزی ئەم پیاوەتییە بێمە دەرێ؟

ئەو ڕۆژە زەحمەتەی بەر با، بەفر، بۆران و باووە دێتەوە یادی کۆتر. کۆتر لە سەر خۆی چووبوو، چووبووە خەو، خەوی مەرگ. مەرگ بە سەریدا زاڵ ببوو. بەڵام پاش ماوەیەکی درێژ، لەوانەیە دوای ماوەیەکی درێژی چەند ڕۆژێ کاتێک چاوەکانی کردبۆوە، لە ناو تاریک یدا جووتێک چاوی دیتبوو کە وەک مرواری دەدرەوشانەوە. بەڵێ، چاوی ڕێناس بریقەی دەهات. بەڵێ ڕێناس لە تەنیشتی ئەمدا بوو، ئەمی لە

ژێر بەفر و بۆراندا بە تەنیا بەجێ نەهێشتبوو.

«خودایە تەمەنێکی درێژی بدەیتێ» کۆتر بە ئارامی دەڵێت.

بە شوێن ڕێناسدا، بە سەر ئەو ڕێگەی ڕێناس دەیکاتەوە، کۆتر بە هەنگاوی سووک ڕێدەکات. هەنگاو نانی ڕێک و پێک و بە پارێزەوەن. هەناسەی درێژ و ڕێکردنی ئاسانە. سەیرە، کۆتر بیر دەکاتەوە، سەیرە، من ئەو ڕۆژانەشم بدیبا! کە من بمتوانیبا هەروەها بە کاتژمێران لە ناو شاخ، چیا، دار و دەوەن و هەڵدێراندا ڕێم بکردبا! سەیرە، من ماندوو نەبووم، برسیم نییە، تینووم نییە، لە سەر خۆ ناچم، نابوورێمەوە، لە ئێش و ژان و شەرم و بێزاری ناگەڕم. سەیرە، بەدەنم ناچەمێتەوە، دڵ و مێشکم ناتەزێ. سەیرە، من کچی ماڵە دەوڵەمەندێک، جگەرگۆشەی باوکێکی پارێزەر، دایکێکی خانزاد، من کچی شاری گەورە، دەبستان و خوێندنگای باڵا، شاگردی ئەدەبیاتی فەڕەنسی، ئێستا لەم دەر و دەشتە هۆڤ و پڕسامەدا بە ئاسانی ڕێدەکەم. ئەو دەست و پەنجە نەرمۆڵانەی من کە تەنیا دەفتەر و کتێب و پێنووسیان هەڵدەگرت، ئێستا [فێری] ڕەقیی چەک و خۆپاراستن بوون. لێوە قەڵەشیوەکانم، قژی کورتی چڵکنم، پێیە هەڵاوساوەکانم، جەستەی نەشۆراوم... لە کەنگێوەیە کە خۆم نەشتووە؟ بۆنی چڵک، بۆنی قورسی ماندوویەتی، ئارەقە، ئەشکەوت و شاخەکان... سەیرە منیش هێدی هێدی دەبم بەو قارەمانە گوندییەی پێش خۆمەوە، منیش وەک ئەو ئیدی هەست بە دەنگ و سەدای ئەم سرووشتە تەنیا هۆڤە دەکەم، لەگەڵی تێکەڵ دەبم و دەبمە پارچەیەک لەو. ئەم دارستانەی کە ئێستا بە شنەی با نەوازشم دەکات، لە ئامێزم دەگرێ، بە با، دەنگ و سەدای خۆی دەچێتە ڕۆحمەوە، دەچێتە ناو خوێنمەوە، کە بەدەنم، دڵ و ڕۆحم دەکاتە پارچەیەک لە ژیانی خۆی... سەیرە، من بمتوانیبا ئەوەشم هەست بکردبا... سەیرە، ئیدی من دەتوانم گوێ لە سترانی شنەی بای بەیانییان بگرم، ئەو

دەنگە ببیستم کە لە قووڵایی دڵ و ڕۆحی ئەم شاخانە، ئەم هەڵدێر و دۆڵانەوە دێت...*Oui, c'est moi q'est ici...

شەڕڤان ڕێگە دەبڕن. دونیا ڕووناک دەبێتەوە، تیشکی هەتاوی ڕۆژهەلات بە ئارامی خۆی دەگەیەنێتە دار و دەوەن، گەڵا و لقەکانیان. دار کەم دەبێتەوە، ڕووناکیی بەردەم شەڕڤانان زیاتر و بەهێزتر دەبێ و پاش کەمێک لە ناکاو دارستان تەواو دەبێت. کۆتر سەری سوور دەمێنێ. ئەو دارستانە چڕە کە وا دیار بوو چ کۆتاییەکی نییە، ئێستا بە جارێک تەواو بوو. وەک ئەوەی کەسێک سیحرێکی کردبێ. سرووشت... سرووشتی فرت و فێڵاوی و فریوکار... دیمەنێکی بێهاوتای بەهەشت لە پێش چاویان دێتە ڕاخستن. کۆتر و هاوڕێکانی ئێستا گەیشتوونەتە بناری زنجیرەیەک چیای بڵند. ئەوەندەی سەد مەتر لەو لایانەوە، چەمی گەورەی ڕۆژهەڵات وەک حوشترێک کە هار بووبێت، بۆتە لافاوێکی بێپایان و دەڕوات. لە دوای چەم و جۆگەی ئەوپەڕ چەمیش، زنجیرەیەک چیا بەرەو ئاسمان هەڵکشاون. دەر و دەشت، دار و دەوەنی دەور و پشت لە ناو سەوزاییەکی کەمێک تاریک دا وەک بووکێکی نازدار، بە شنەی بای بەیانی کەرۆیشکە دەکات. هەموو شوێنێک سەوزە. چیا، سینگ و بناری چیا لە ناو سەوزاییەکی بێپایاندایە. لە سەر شاخەکان هەنووکەش بەفر هەیە. ڕەنگی گەوهەریی سەر شاخەکان لەگەڵ لێدانی تیشکی هەتاو، بەرزاییەکان دەگرێتەوە. ڕەنگی ئاسمانی شین، داری سەوز و بەفری سپی تێکەڵی یەک دەبن و وەک یاقووت و مرواری دەدرەوشێنەوە. کۆتر بە ئارامی لە بەر خۆوە دەڵێ: خودایە! و سەیری دەور و پشتی خۆی دەکات، ئەم جوانییە، وەک دایکێکی میهرەبان، باوەشی دەکاتەوە و هەموو شتێک لە باوەشی خۆیدا دەحەوێنێتەوە. من بەهاری ئەم شاخانەم بدیبا، بەهاریش لەم هەرێمانە بووبام! کوا پەردەی سپیی بەفر، لە کوێیە ئەم

* بەڵێ، ئەوەی لێرەیە منم..

چل و بەرگە سەوز و شینەی کە ئێستا سرووشت لە بەری کردووە، ئەو دەنگی ژیانە، ڕەنگی ڕۆژێکی نوێ، کات و زەمەنێکی نوێ. ڕەنگی ڤەژین، ژیانەوە. ئەو چەم و ئاوانەی کە هەموو بەربەستێک دەدەنە پێش و دەڕۆن، ئەو گوڵ و گوڵخونچانەی کە سەرەڕای هەموو سەختییەکان، ئێستا دەپشکوون و خۆیان بە ڕەنگی تێکەڵ دەخەملێنن. ئەو گیا و ڕووەکانەی کە خاکی ڕەش دەقڵەشێنن و وەک ئەوەی بیانهەوێ بگەنە ئاسمان، سەر دەردێنن. ئەو باڵندە و پەلەوەرانە و دەنگیان، خوێندنیان، گۆرانیی ئازا و سەربەستیان، فڕین و سەمایان لە ئاسمان. سرووشت و وڵاتی ئازا، زەوی و خاکی ئازا، چیا، ڕووبار و شیو و دۆڵی ئازا.

چەند وشەی داستانی گلگامێش دێتەوە یادی کۆتر؛ تۆ دەبێ دۆڵ و شیوێک و ڕووبارێکی مەزنی ناو [دۆڵەکە] ببینی. لە نێوان دۆڵەکەشدا ئەو دارە کەمێک سەوز کە لق و گەڵای لە داری هەرە سەوزی ڕووبارەکەش شینتر دەبێ، لە ژێر دارەکەشدا کانیاوێکی گەورە هەیە... بۆچی ئێستا گلگامێش دێتە یادی کۆتر؟ گلگامێش و ئەم شوێنە، کۆتر بیر دەکاتەوە. تۆ بڵێی وڵاتی گلگامێش ئەم شوێنە بێت، تۆ بڵێی ئەو لە داستانەکەدا باسی ئەم شوێنەی کردبێ؟...

چەم بە هاژە هاژ دەڕوات. جۆگە و جۆباری بچووک کە لە توانەوەی بەفر پێک دێن، بە دڵی شاخەکاندا بەرەو خوار دەبنەوە و خۆیان دەگەیەننە چەمی گەورە. چەم هەر دوو لای شاخەکە لە نێواندا دەبڕێ و گۆمی قووڵ و گەورە درووست دەکات. ئەو دیمەنەی ئێستا لە پێش چاوی شەڕڤانان ڕاخراوە، ماتیان دەکات. شەڕڤان هەر وەک کۆتر لە کەناری دارستان ڕادەوەستن و سەیری دەر و دەشت و دیمەنی خەونان دەکەن. ئەوەندەی ماوەیەک ئەوان هەر وا بە پێوە، بە بێ ئەوەی لەگەڵ یەک قسە بکەن یانیش شتێکی دی بکەن، گوێیان لە سەر دەنگی تێکەڵ هەڵخستووە و لە دەر و دەشت دەڕوانن. کۆتر بە هەنگاوی نەرم،

نیگای لە سەر دەر و دەشت بە ئارامی دەچێت بۆ لای ڕێناس کە چەند هەنگاوێک لێی دوورە. «ڕێناس» کۆتر بێ ئەوەی لێی بڕوانێ دەڵێ «من دەمهەوێ بگریم».

«بۆچی؟»ڕێناس کەمێک سەر سووڕ ماو دەڵێ «ئەمجار بۆچی؟»

«ئەمجار بۆ ئەو هەموو خۆشی و جوانییە...»

«نا ئێستا مەگری، هێشتا ماوەیەک ڕێگەمان ماوە، با بەجێ نەمێنین...»

پاش کەمێک ڕاوەستان، شەڕڤان دیسان، هاوتەریبی چەم لە کەناری دارستانەوە دەکەونەوە ڕێگە.

«ئایا تۆ ئەم شوێنانە دەناسی؟» کۆتر لە ڕێناس کە لە پاڵیدا ڕێ دەکات، دەپرسێ.

ڕێناس دەڵێ «بەڵێ، ئەمە چوارەمین بەهارە کە دێم بۆ ئەم شوێنە، هاتن بۆ ئێرە هێمای جەنگە. ئەمڕۆ، لەمڕۆ بەدواوە شەڕی غەددار دەست پێدەکات، شەڕی مان و نەمان...»

«ئەمڕۆ؟»

«بەڵێ ئەمڕۆ، واتا کاتێک گەیشتینە ئەو شیوە. لەو دیو ئەو شیوەوە، لە پشت چیاکان، ئیدی گوند هەیە، گوندی هەن، سەرباز هەن، شەڕە... لەم ڕۆژانەدا، لە هەر لایەکی سنووری وڵاتەوە ئەوەندەی دوو سەد- سێ سەد گرووپی وەک خۆمان، شەڕڤان بەرەو ناو وڵات دێن. تۆ ئیدی لەمڕۆ بە دواوە لە هەر شوێنێک دەنگی تانک، تۆپ، موسەلسەل،، تفەنگ و کۆپتەر دەبیستی. شەڕڤانیی ئەمڕۆ دەست پێدەکات... مەرگ، کوشتن، ڕەو و هێرش ئەمڕۆ دەست پێدەکات، غیرەت و بەهێزی، هونەرمەندی و وریایی ئەمڕۆ دەست پێدەکات...».

کۆتر هیچ ناڵێ. ترسێک دەکەوێتە دڵی. دەلەرزێ. بەڵام نا، ئەو هەستە، هەستی ترس نییە. هەیەجانە، جۆش و خرۆشە. بەڵێ

هەیەجانێک داڵدەدی دەدات. ئەم ڕەنگەی سرووشتی بەهەشتی و ڕەنگی شەڕ، پێکدادان، مردن و کوشتن لە پشت ئەم شاخانەوە. ئەم بۆنە بژاردەی سرووشت کە لە دەر و دەشت دێت و لە مرۆ بەدواوە بۆنی چەک و باروت، خوێن و ئارەقەی لێ دێت، دەوریان دەدات. هەستێکی غەریب هەناسەی لە بەر دەبڕێ. ترسە، بەڵێ، ئەو هەستە ترسە. «من ماندووم» کۆتر سەری داخستووە، وا دەڵێت.

«زۆرمان نەماوە، ئەوەتا، ئێمە گەیشتینە شوێنی خۆمان» ڕێناس بە پەلە وا دەڵێت و لە سەر چاڵێکەوە باز دەدات، «لەم شوێنە لە ژێر بناری ئەو چیایەدا چەند ئەشکەوت هەیە. ئێمە لەوێ ڕادەوەستین...»

کۆتر خەمگین دەبێ. ئەو بە باشی نازانێ بۆچی بەڵام مەلوولی و کوڵی گریان دێت و تەنگی پێ هەڵدەچنێ. ئەگەر بگری، دانیشێ، یان بەجێ بمێنێ، دیسان شەرمەزار دەبێت. نا، نا، نا... دەنگی ڕێناس دەگاتە بەر گوێی. «بەڵام مەراق مەکە و مەترسە» ڕێناسە وا دەڵێت. کۆتر سەرنج دەداتە سەر قسەکانی ڕێناس تاوەکوو بتوانێ خۆی لەو هەستی خەمینییە ڕزگار بکات. «خۆت ناڕەحەت مەکە...» ڕێناس درێژەی پێ دەدات، «خۆت ڕاگرە، حاڵ و هەوای شەڕ شتێکی ترە، کاتێک مرۆڤ دەکەوێتە ناو مەیدانی شەڕ، کاتێک ئاگری شەڕ دەوری مرۆڤ دەگرێ، مرۆڤیش دەبێتە شتێکی دی. بەهێز دەبێ، دڵی قایمتر دەبێ، مێشکی ژیرتر دەبێ. شەڕڤان لە شەڕدا دەبێتە شەڕڤان. گڕی ئاگری شەڕ، دڵ، مێشک و جەستەی مرۆڤ پەروەردە دەکات. بەڵام بە مەرجێک؛ پێویستە مرۆڤ هەمیشە ئاگادار بێت، چاوکراوە و زرت و زیندوو بێت... لە بیر مەکە، ئاگاداری و وشیاری...

ئەوەندەی ماوەیەکی دی هەروا بەرەو خوار دەڕۆن. کۆتر ئیدی قسە ناکات. نیگای جارێک لە پێی ڕێناس و جارێک لە دەر و دەشت، ڕێدەکات. لە ناکاو ئەوان لە کەناری چەم، لە بەر بناری چیا، ڕادەوەستن. لەو

کاتـەدا کـە ڕوو لـە بنـاری چیـا دەکـەن، دەرگای چەنـد ئەشـکەوت کـە لـە بنـی بناردایـە، دەردەکەوێت. شـاخ و گاشـەبەرد بـەرەو چـەم ئـەوی بـوون و دەرگای ئەشـکەوت دەشـارنەوە. تاکوو مرۆڤ نەیەتە بەر دەرگای ئەشـکەوتان، مومکیـن نییـە بتوانـێ ئەشـکەوت بدۆزێتـەوە. ئیـدی ئـەوان هاتـن، گەشـتنە جێگـەی خۆیـان؛ قۆناغـی نوێـی سـەر ڕێگەکەیـان. کاتێـک گـرووپ هەمـوو دەگەنـە بـەر دەرگای ئەشـکەوت، فەرمانـداری دەسـتە کـە یەکـی کورتـە بـاڵای قەڵـەو، سـمێڵ درێـژ، ڕوو ئەسـمەرە و ئێمـە پێـی دەڵێیـن فەرمانـدار چیـا، بـە دەنگێکـی بـەرز دەڵـێ «ئێمـە لێـرە ڕادەوەسـتین، چـەک و فیشـەکدان و جانتاکانتـان دانێـن، ئەوەنـدەی چـەن کاتژمێریـک لێـرە دەبیـن، بحەسـێنەوە. ئێسـتا سـەربەسـتن. ڕێـک و پێـک بـە نـاو ئەشـکەوتەکاندا بـڵاو ببنـەوە.»

زۆربـەی ئەندامانـی دەسـتە و ڕێناسـیش، فەرمانـدار دەناسـن. بـەڵام کۆتـر نـا. یەکـەم جـارە کـە کۆتـر دەیبینـێ. پێـرێ ئێـوارە کاتێـک چیـا و چەنـد کـەس لەگەڵـی هاتـن بـۆ ئـەو شـوێنەی کۆتـر و هەڤاڵانـی لـەوێ بـوون، ئـەو کاتـە بـوو کـە کۆتـر ئـەوی دیـت. ئـەو کەسـانەی لەگـەڵ چیـا هاتبـوون، بڕیـاری بڕیارگـەی ناوەنـدی هێـزی چەکـداری بزووتنـەوە، کـە چیـای وەک فەرمانـداری سـەربازیی دەسـتە دیاریـی کردبـوو و دەسـتەی خسـتە سـەر ڕێگـەی ڕۆشـتن، هێنـا و وتیـان، شـیوی شـەو بخـۆن، چیـا بـۆ خۆشـی خـواردی و ئـەوان ڕۆشـتن. چیـا مایـەوە. ئـەو کاتـە کۆتـر یەکەمجـار چیـای ناسـی. چیـا لاوێکـی چوارشـانەی ناوشـان پـان، سـەرزل، چـاو چکۆلـە، بـرۆ و برژۆڵ قـەوی، ئیـدی لـە دوو ڕۆژ پێـش ئێسـتاوە، فەرمانـداری نوێـی ئەمانـە. ئیـدی کۆتـر فێـری ئـەم ژیانـە بـووە؛ هەمـوو ڕۆژێـک یەکێـک دەڕوا، یەکـی نـوێ دێـت. هـەر ڕۆژەو لـە شـوێنێکن، بـە شـەو دەڕۆن، بـە ڕۆژ دەنـوون. بـە گشـتی نـاوی هەموویـان لـە نـاوی سرووشـت گیـراوە؛ زنـار (شـاخ)، چیا، دەشـت، ئاسـمان، ڕۆژ، ئەسـتێرە، مانگ، شـەوگەڕ، ڕوناهی، هەڵەسـۆر، کەسکەسـۆر، هەیڤـەڕوون، شـیو، لافـاو، گوڵسـتان، گوڵخونچـە، ... وەک نـاوی

کۆتر؛ کۆترە...

کۆتر ئیدی فێر بووە؛ کەس لە کەس ناپرسێ کە ئەوە کێیە، چییە، خەڵکی کوێیە، چی کردووە، لە کوێوە هاتووە... کە کەسێک لەوان دێت و دەڕوات کەس ناپرسێ کە ئەو بۆچی و بەرەو کوێ دەچێ. کاتێک بڕیار و فەرمان لە «سەرەوە» دێن، کەس ناپرسێ کە ئەوە چییە، چۆنە. کۆتر ئیدی دەزانێ؛ فەرمان بۆ قسە و باسکردن نابێ و بۆ کردن و بەجێ هێنانە. ژیانی ئەوان ژیانێکی ئاسایی خەڵکی نییە. ژیانی ئەوان بە دزییەوە، بە شاراوەییە. ژیانی ئەوان، ژیانی شەوە، هی خۆپاراستن و هێرشە. پارووییەک نان، چەن تیکە گۆشتی برژاو، نارنجۆک و گوللەیەکی دەمانچە و تفەنگیشیان هەمیشە پێیە. نان و گۆشتی برژاو بۆ کاتی تەنگانەی برسی بوون، نارنجۆک و گوللەش بۆ کاتێک دەوریان لێدەگیرێ و ئیدی هیچ ڕێگە چارەیەک نییە. بۆ خۆکوژی.

ژیانی ئەوان؛ تاڵێک مووی باریک لە سەر پردی سیڕاتی مان و نەمانە.

کۆتر کڵاشینکۆفەکەی و کۆڵەپشتییەکەی دادەنێتە تەنیشتی خۆی و لە سەر بەردێک ڕادەکشێ. ڕێناس و ئەوانی دی بەرەو ئەشکەوتەکان دەچن. بەڵام کۆتر ناچێ و کەمێک دوورتر لە ئەشکەوتان دادەنیشێ. تیرێژی هەتاو ئێستا گوڕتر بووە. فێنکایی بەیان ئێستا بۆتە گەرمایەکی سووک. لە ژێر تیریژی ڕووناکی هەتاودا، جۆگە و ڕووبار، دار و بەرد، گاشەبەرد و شاخ دەدرەوشێنەوە. پۆلێک باڵندەی مەزنی بەڵەک لەلای پێشەوەی چیا باڵ دەگرنەوە، بە سەر شیو و دۆڵدا دەفڕن و دەڕۆن. چەن باڵندە کە لە واشە یان باز دەچن لەلای خوارووی دۆڵەکە بە سەر چەمەوە دەفڕن. بێ ئەوەی باڵ لێدەن و خۆیان بجووڵێنن، وەها ئارام وەک تاڵە موویەک دەڕۆن. کۆتر چەن خولەکێک لێیان دەڕوانێ. بازەکان خەریکی یارییەکن. ئەوان بەرەو ئاسمان دەبنەوە، هەڵدەکشن

و لە ناکاو بە خێرایی برووسک خۆیان بەرەو خوار، بەرەو ڕووبار، بەر دەدەنەوە. کاتێک دەگەنە سەر ئاوی چەم، ماوەیەک بە سەر ئاودا بە ئارامی دەفڕن و پاشان دیسان بەرەو ئاسمان دەفڕن و باڵیان لە هەوران دەدەن، پێدەچێ ئەم باڵندانە بێچووە تازە باڵەوازەکانیان فێری فڕین بکەن. لەوانەیە ئەم باڵندانەش بەخێرهاتنی بەهار و ژیانی نوێ بکەن. لەوانەیە ئەوانیش وەک ئەم سرووشتە، وەک ئەم ڕووبارە، بە ڤەژینی ژیان، هار بووبن. کۆتر فیشەکدانی سەر سینگی دەکاتەوە و لای کڵاشینکۆفەکەی دایدەنێ. لەگەڵ لێدانی تیشکی هەتاو، بەردەکەش گەرم دادێ. ئەو جانتا قورسەکەی هەڵدەگرێ، دەرگاکەی دەکاتەوە و نان و گۆشتی برژاوی لێ دەردێنێ. نانی ساجی لە یەک دەکاتەوە، پلە گۆشت دەخاتە ناوی، هێدی هێدی، پارو پارو دەیخوات. ئەو ئێستا هەست بە ماندوویەتی و برسیەتی دەکات. پێ، چۆک، شان، مل، گەردن، هەموو بەدەنی ئێستا ژان دەکات. پاش ئەوەی نانەکەی خوارد، هەڵدەستێتە سەر پێ و بەرەو جۆگە ئاوەکەی تەنیشتی دەڕوا، دادەنەوێتەوە سەر ئاوەکە و بە مشت لەو ئاوە ساردەی وەک سەهۆڵە دەخواتەوە. دەستی لە سەرمادا دەتەزێ. قوڕگی دەتەزێ. دوای داگرتنی سەرپۆشەکەی دەست و ڕووی خۆی دەشوا، دەست و دەم و چاو بەسەرپۆشی ڕەنگین وشک دەکاتەوە، دەگەڕێتەوە سەر جێگەکەی و دادەنیشێ. هاوڕێکانی هەرکام بە شوێنێکدا بڵاو دەبنەوە. ڕێناس، چیا و فەرماندارى سیاسی دیار نین. وا دیارە کە چووبێتنە ناو ئەشکەوت و خەوتبێتن. کۆتر بیر دەکاتەوە، ئەمە چ ئارامییەکە خودایە! ئەمە چ هێمنی و هێورییەکە کە لە دەنگی ئاو، باڵندە، پەلەوەر و گەڵای داران پێکهاتووە! کۆتر دیسان جانتاکەی هەڵدەگرێ و دەفتەرێکی بچووک و پێنووسێکی سووری لێ دەردێنێ. بە ئارامی دەست بە بەرگە سوورەکەی دەفتەردا دێنێ، تەزوویەک بە سەریدا دێت. دەفتەری سپیی هێلداری کۆتر؛ تامەزرۆی دەنگ، سەدا،

هەستەکانی دەروونی کۆتره. نەک بۆ نووسینی ڕاپۆرت و بەسەرهاتی سەربازیی ژیانی شەڕڤانی، بەڵکوو بۆ بەسەرهاتی سەدا و هەستەکان. وەک شیعرێکی درێژ، وەک داستانێک کە لە پەخشانە شیعرێکی درێژ پێک هاتبێ. کۆتر پێدەکەنێ و یەکەم لاپەڕەی دەفتەر دەکاتەوە. لە لاپەڕەی یەکەمدا، لە لای خوارووی پەڕەکەوە بە دەستنووسێکی زۆر جوان، لار و باریک، بە پێنووسێکی سوور وەها نووسراوە: من کۆتر... کۆتری چیا بەرزەکان... کۆتری وڵاتی چیاکان، وڵاتی مەرگ... مردن، کوشتن... ئەو شتانەی کە یەکجار زۆر دەیانبیستم... مردن، کوشتن، سووتان، ڕووخان، لێرە ئاسانترین ڕووداو و کردارەکانن، بە سانایی لێرە ئەنجام دەدرێن. بۆچی؟ مردن وەک نان و ئاو، هەوا و هەناسەی لێهاتووە... بۆچی؟ لێرە مرۆڤ هەرزانە- زۆر هەرزان... بۆچی؟ لێرە پێوان و پێوەر، ژیان نییە، مەرگە... بۆچی؟

لە لای خوارووی پەڕەکەشدا بە پیتی گەورە، لە ناو ئاوێنەیەکدا وەها نووسراوە: ترس... من نامهەوێ بترسم... من ناخوازم بترسم... ترس... هەستی هەرە خراپ، هەرە دژواری مرۆڤ...

کۆتر لاپەڕەی دووهەم دەکاتەوە و دێڕەکانی دەخوێنێتەوە. لە لاپەڕەی نوێدا بە دێڕی شیعر، لە ژێر یەکدا وەها نووسراوە: ژیر... تۆ لە کوێیت؟ ژیر، من هاتم، تۆ لە کوێیت؟ دەخیلت بم ڕوخسار لە بەر دڵان، دە بڵێ، تۆ لە کوێیت؟ منی شێتی دونیا لێرەم. تۆ لە کوێیت، شێتە، شێتی دونیا؟ دەتگوت تۆڵە، هەمیشە تۆڵە، فەرموو ئەویندار خەونان، خەونە شێتەکەم، فەرموو/ تۆڵە. فەرموو من لێرەم. تۆ لە کوێیت؟! ئاخ لە تۆ، جوامێری خەونان، هەژاری خەونان. ئاخ لە من، هەژاری خەونی خەونان. پڕ خەمی خەونان... دە وەرە کوڕی بێزاری و خەمان، لە سەر ئەم شاخەوە، لە ناو ئەو دارستانەوە خۆت بەردەوە، وەرەوە. منی پڕ خەمی خەوان، منی یەخسیری خەونان وەخەبەر بێنە.

بانگم لێ بکە. دڵ و ڕۆحم بژیەنەوە. ژیانەوە، ڕووناکیی ئەستێران، تینی هەتاو، جووڵانەوەی جیهان و دەنگی جەستەی من، ڕۆحی ژیانەوەم... بیهێنەوە یادت، شێتی هەژار، دوایین شەو بێنەوە یادت، ئەو شەوەی لە ناو شەپۆلانی تۆڵە، تۆواو و کۆرپەلەدا دەهات و دەچوو. ئەو شەوەی بەدەن دەینالاند، دڵ نزای دەکرد. دە بڵێ شێتە گیان ئەو کاتە دەنگی من، دەنگدانەوەی دڵی منت پێدەگەیی، دە بڵێ... بڵێ مەگەر دڵم لە دەورت نەگەڕا. مەگەر چاو ئەسرینی نەڕژاند، مەگەر دڕدونگی بانگی لە تۆ، لە شەوەکە، لە بێدەنگیی دەور و پشت نەدەکرد؟ دە بڵێ ژیر، شێتی ئەوین، بانگ چی دەوت، بەدەن چی دەوت، من چیم دەگوت؟ ئاخ لە تۆ، شێتە... تۆ ڕۆشتی، وەک مەغریبی ئێوارە، وەک ئەستێرەی بەربەیان تۆ ڕۆشتی... بەڵێ وەک ئەستێرەی ئاسمانان تۆ داچوویت و ونبووی... ژیر فەرموو من لێرەم... تۆ لە کوێی؟ دە بڵێ تۆ لە کوێی ژیر؟...

دوای ئەوەی کۆتر دێڕەکانی پەڕەکە دەخوێنێتەوە، لەگەڵ خەمێکی قووڵ، چەن دڵۆپ فرمێسک لە چاوانی بەر دەبێتەوە، بە ئارامی دەڵێ؛ ژیر، ژیر وەرە... ژیر وەرە... من هاتم دە وەرە. من گوێم نەدایە دایک و باوکم، ناسیاو و خزمان، من هاتم. هەر کەسێک لێرەیە، هەر کەسێک دێت و دەچێت، کەچی تۆ لە کوێیت؟ تەنیام، کەس نییە. دەر و دەشت تەنها، دەر و دەشت خاڵی. من هاتم، من دەڕۆم. چەک، ڕەخت و فیشەکدان، فەرمان، ڕێکردن، تەمرین و دەفتەرەکەم. دەفتەرەکەم؛ یادگاری خەونەکانی تۆ.

خۆر هەڵدێ، خۆر ئاوا دەبێ، ڕۆژەکان دێن، ڕۆژەکان دەچن، کەچی تۆ، بیرەوەرییەکانت، خەون و خەیاڵەکانت هەر زیندوون. نە لە بیر کردنێک، نە ون بوونێک. ژیندار و زیندوو. بڕوانە دونیا دەژیێتەوە. گوێ بگرە، جریوە جریوی باڵندانە، گفەی بایە، هاژەی ئاوە، بەهار هاتووە. هەموو شت زیندوو وەک تۆ، وەک شەو و ڕۆژانی خۆمان... بیهێنەوە

یادت، تۆ دەتگوت «تۆڵە» من دەمگوت «تۆواو»، تۆ دەتگوت «تۆڵە» من دەمگوت «کۆرپەلە». ژیر، هۆ نەزان، هۆ بێ ئاگا، تۆڵەکەت بوو بە تۆواو، تۆواو بووە کۆرپەلە، بەڵێ تۆڵە بوو بە کۆرپەلە. ئاسەواری تۆواوەکەت لە دەروونمدا شین بوو. تۆواو گەشەی کرد و بوو بە «کۆرپەلە»، بەڵام کۆرپەلە گەورە نەبوو، هۆ ژیر! گەورە نەبوو. لە شوێنی عەمەلیاتی دکتۆرێکی بێڕەحم و بێویژداندا من کۆرپەلەم کوشت. من کۆرپەلەم دا بە کوشت. کۆرپەلەی من و تۆ... بەڵێ، من ئەوەم کرد، من پارچەیەک لە بەدەن، دڵ، ڕۆح و مێشکی خۆم لێکردەوە – تاوەکوو بتوانم بێم بۆ لای تۆ، تاوەکوو خۆم بگەیەنم بە تۆ، تاوەکوو پێکەوە بین. ژیر، من هاتووم، کۆتر هاتووە... تۆ لە کوێیت؟

کۆتر دەگری.

لەم سەر لە بەیانەدا لە سەر بەردی ڕەش، ژانێکی وێرانگەری هەست و حەسرەتێکی مەزن لە سەر دڵ، بیرەوەریی ڕۆژانی ڕابردووی جیهانێکی دی لە یادا، بە چاوی ڕەشی بە کلەوە، کۆتر دەگری. لێوە قڵەشیوەکانی بە کوڵی گریان دەجووڵێن، ڕوخساری کە بە خۆر، بەفر، باران و ڕەشەبا داگیرساوە، دەهەژێ، لە ڕۆحیدا دەنگی ژیانێکی دی ئۆلان دەدات. بە هەموو بەدەنی، دڵی، گیان و ڕۆحی خۆی، بێدەنگ، بە شەرمنی، بە پارێزەوە کۆتر دەگری.

کۆتر لاپەڕەکانی دەفتەر دەبەستێت، دەفتەر دەخاتە جانتاکەی، هەڵدەستێتە سەر پێ و بەرەو ئاوەکە دەڕوات. دیسان دەست و ڕووی دەشوات، مشت بە مشت ئاو بە ڕوو، ناوچەوان و گەردنی خۆیدا دەکات و ماوەیەک بەمجۆرە لە سەر بەردی کەناری ئاوەکە ڕادەوەستێ. کۆتر سەرسووڕماو لە ئاوەکە دەڕوانێ. ئەوەندە زوڵاڵ، لە بن کانیاوی زوڵاڵدا کە بە خێرایی دەڕوات، زیخ و چەو دیارن. لە دەور و بەری ئاوەکە گوڵی تێکەڵی ڕەنگین سەریان دەرهێناوە. مێش هەنگوینێک لە سەر گوڵان

دەنیشـێتەوە. چەنـد پەپوولـەی بەڵـەک بـە دەوری کۆتـرەوە هەڵدەفـڕن. «مـن ماندووم» کۆتـر دەڵێت، هەڵدەستێتە سـەر پـێ، بەرەو ئـەو بـەردەی لـە سـەری دانیشـتبوو دەگەڕێتـەوە، چـەک، جانتـا، ڕەخـت و شـتەکانی هەڵدەگرێ و بـەرەو ئەشـکەوت دەڕوات. لـە بـەر دەرگای یەکـەم ئەشـکەوت، لـە لای نـاوەوە، لـە کەنـاری دوو شـەڕڤانی ژن کـە سەرپۆشـەکانیان کێشـاوە بـە خۆیانـدا، بـە جـل و بـەرگ، پۆتیـن و ڕەختـی پشـتیەوە، وەک دیکـەی هەڤاڵەکانـی کـە بـڵاو، چـۆک لـە نـاو زگـدا نوسـتوون، سەرپۆشـە بەنەکـە دەکێشـێ بـە سـەر خۆیـدا و لـە سـەر گیـای وشـک ڕادەکشـێ. بـە جارێـک کـە سـەری دادەنێتـە سـەر جانتاکـەی، چـاوی دەچێتـە خـەو و ئەویـش وەک دیکـەی هەڤاڵانـی دەسـت دەکات بـە پرخـە پـرخ. کاتێـک کۆتـر بـە دەنگێـک وە خەبـەر دێـت و یەکسـەر خـۆی کـۆ دەکاتـەوە و دێتـە دەرەوە لـە ئەشـکەوت، ئیـدی ئێـوارە، پـاش عەسـرە. ئەویـش وەک شـەڕڤانانی دی لـە ژێـر بەردێکـی شـاخەکەدا جێگەیـەک دەدۆزێتـەوە، پێویسـتیی خـۆی پێـک دێنـێ، دەچێتـە سـەر ئاوەکـە، دەسـت و ڕووی خـۆی دەشـوا، پشـتوێن و ڕەختەکـەی دەبەسـتی، سەرپۆشـەکەی دەدا بـە سـەریدا و دەگەڕێتـەوە بـەر دەرگای ئەشـکەوت. لـەم کاتـەدا بۆنێکـی گـەرم دەگاتـە لووتـی. «شـۆرباو» کۆتـر وا دەڵـێ و پێدەکەنـێ. «بۆنـی شـۆرباو، شـۆرباوی گـەرم...». بۆنـی شـۆرباو ئـەو نـاوەی گرتۆتـەوە. چـوار شـەڕڤان لـە بـەر دەرگای ئەشـکەوت، بـە دەوری ئاگرێکـی گـوڕەوە بـە پێـوە ڕاوەسـتاون. یەکیـان کچێکـی بـاڵا بـەرز، ڕوخسـار درێـژ، لـووت درێـژ و هـەژارە کـە پێـی دەڵێـن شـیلان، بـە هەسـکێک* قازانـی گـەورەی سـەر ئاگـر دەشـێوێنێ. کۆتـر دەم بەخەنـدە و خۆشـحاڵ دەچێـت بـۆ لای ئـەوان. بـەدەن و پشـتی ئـازاری هەیـە، بـەڵام بۆنـی شـۆرباو هەمـوو ئـازار و ئێشـێکی لـە بیـر دەباتـەوە. کۆتـر دەچێتـە بـەر قازانەکـە، دادەنەوێتـەوە سـەری و بۆنـی شـۆرباو دەکات. جارێـک،

* کەوچکی گەورە.

دوو جار، سێ جار... شۆرباو، شۆرباوی نیسک... بۆنی شۆرباو کۆتر دەژیێنێتەوە. بە دەنگێکی زیندوو بە کچە باڵابەرزەکە دەڵێ: «خوشکە، ئادەی هەسکەکە بدە بە من، منیش دەمهەوێ یارمەتیت بدەم...».

شیلان دەڵێ: «خۆ ئیدی کوڵاوە، ئێمە خوێ و بیباریشمان تێکردووە، بەڵام خۆزگە کەمێک ڕۆنیش دەبوو» و هەسک دەداتە کۆتر. ئاگر، شۆرباو، بۆنی شۆرباو، ڕوخساری گەش و خۆشحاڵی لاوی بە خۆ باوەڕ و مەغروور، هەوای خاوێن و زوڵاڵ، سرووشتی ئارام، ڕەنگی ژیان و جیهان. ئێستا کۆتر خۆشحاڵە، بێپایان دڵخۆشە.

دەنگێکی بەرز بانگی شەڕڤانان دەکات «وەرن شۆرباو ئامادەیە...» شەڕڤان دێن، یەک بە یەک، بە خۆشحاڵی، گەرم، ئاخاوتن، هەر یەک کاسەیەکی قووڵ یانیش دەورییەک بە دەستەوە، دێن، بەشی خۆیان لە کۆتر وەردەگرن و دەڕۆن. قازانی گەورەی ئالۆمینیۆمی لێوانلێوە لە شۆرباو و لانیکەم بەشی پەنجا کەس دەکات. دوای یەکەمجار، شەڕڤانان جارێکی دیش دێن، کاسە و سینیی نایلۆنیی خۆیان پڕ دەکەن و دەڕۆن. پاش هەمووشیان، کۆتر سینییەکی قووڵی نایلۆنی و کەوچکەکەی لە جانتا دەردێنێ، سینی پڕ دەکات لە شۆرباو و لە پشت ئاگر دادەنیشێت و دەست بە خواردن دەکات.

دوای ئەوەی کە ئەوان شۆرباوەکەیان بە نانەوە دەخۆن، دەچنە سەر ئاوەکە و ئاو دەخۆنەوە، هەموویان بە دەنگی چیا دێنە بەر دەرگای ئەشکەوت و بە دوو ڕیز بە شوێن یەکدا ڕادەوەستن. ڕوو لە پێش، بەژن ڕاست، تفەنگ و کلاشینکۆف بەدەستەوە، لە چیا، فەرماندارى سیاسی و دوو پێشەنگی دی کە لە بەرانبەریان ڕاوەستاون، دەڕوانن. پاش خەو و خواردن ئەوان دیسان گەڕاونەتەوە سەر ڕاستیی خۆیان؛ ڕاستیی سەربازی. جیددی، ئاگادار، چاو لە فەرماندار، بە نیزامێکی سەربازی، ڕاوەستاون. کۆتر لە دەستەی یەکەم، ڕیزی دووهەمدا لە تەنیشت ڕێناس

کە لە پێش هەمووانەوەیە، ڕاوەستاوە. کەس قسە ناکات، کەس نابزوێ.

ئێستا تەنها دەنگی بای سەر لە ئێوارە، باڵندە و پەلەوەر و چەم دێتە بیستن. چەمی گەورە، درێژ و پڕ پێچ. چەمی کەنارای مرۆڤایەتی ئێستا بە تیرێژی بێزاری سەر لە ئێوارە ڕەنگین، شوێنی خۆی دەکاتەوە و وەک ئەوەی لافاو هەستابێ، وەها بەهێز لە تەنیشت شەڕڤانانەوە دەڕوات. چەمێک کە ئێستا قەت کەسێک نازانێ لە کوێوە دێت و بەرەو کوێ دەڕوات، دیسان بێپشوو، بێگۆڕان، هەر وەک هەمیشە بەرەو دیاری نەناسراو، بەرەو هەرێمی غەریب دەڕوات. چەم، کێ هات؟ کێ چوو؟ کام بەگ، میر، قەیسەر، ئیمپراتۆر و سەرۆک خۆی بە ئاوی فێنکی تۆ شۆرد، لەگەڵ دەنگی هاژەی تۆ چاوی چووە خەو، لەگەڵ ڕۆیشتنت ڕۆیشت و کەوتە ناو لاپەڕە تاریکەکانی مێژوو؟ کێ؟ ئەم شەڕڤانانە؟- کە کوڕ و کچی تۆن، بە ئاوی تۆ گەورە بوون، بە خەیاڵی ئاوی تۆ پەروەردە بوون؟

مەودایەک بێدەنگی، بە دەنگی چیا تێک دەچێت: «ئێمە ئێستا دەکەوینە ڕێگە، ڕێگەیەکی زۆرمان نەماوە. تەنیا قۆناغە ڕێیەک لە پێشماندایە. دوای ئەوەش ئیدی مەیدانی شەڕە. من هیوادارم سبەی ئەم کاتانە گەیشتبێتینە گوندی ئەو دیوی چیا. ئێوەش دەبێ ئاگادار بن لە ئێستا بە دواوە هەر هەنگاوێک کە هەڵیدەگرن، هەنگاوی شەڕە. هەنگاو دەبێ بەهێز، جێگیر، بە وردی و زانایی بن. با گوێتان لە هەر جۆرە دەنگ و سەدایەک، چاوتان لە هاوڕێ و هەڤاڵانتان بێت. ئێوە دەبێ بزانن لە پشت هەر چیا، شاخ، گاشەبەرد، بەرد و دارێکەوە دەکرێ دوژمن بێت. کۆپتەرەکانیان لە ئێستا بە دواوە لەوانەیە لە هەر شوێنێک دەرکەون. بە تەدبیر بن، دەبێ فیشەک هەمیشە لە بەر چەکەکانتاندا بێت، دەبێ هەمیشە نارنجۆک ئامادە بن...».

چیا ڕادەوەستێ، بە وردی سەیریان دەکات، دانە دانە چاویان پێدا

دەگێڕێ و دواییش دەقیرێنێ: «ئێوە ئامادەن؟»

شەڕڤان بە یەک دەنگ دەڵێن «بەڵێ». پرسیار و وەڵام دووبارە دەبێتەوە.

«ئێوە ئامادەن؟»

«بەڵێ»

«کەواتە ئێمە ڕێدەکەوین»

ئەوان ڕێدەکەون. بە قەراخی چەمەکەدا بەرەو ژوور دەبنەوە. خۆر و تیشکی خۆر ئێستا داچوون. هەر چەندە هێشتا سەر لە ئێوارەیە، هەوا کەمێک تاریک بووە. پەڵە هەوری گەورەی تاریک ئاسمانیان داگرتووە و بە خێرایی خۆیان دەجووڵێنن. ئەوان، بە سەر چیادا لە باشوورەوە بەرەو باکوور دەڕۆن. کۆتر کە کەوا و پانتۆڵەکەی ڕێک و پێک کردووە، ڕەخت و فیشەکدانی ڕاست کردۆتەوە و قەیتانی پێڵاوەکەی قایم کردووە، بە ئاسانی بە ناو گژوگیا، بە سەر چاڵ، بەرد و دەوەندا دەڕوات. ڕێناس ئەمجاریش لە پێشی ئەوە. ڕێناس دیسان ڕێگەی بۆ دەکاتەوە، چیا، چیا، چیا، هەموو شوێنێک، هەموو لایەک بە چیا گەمارۆ دراوە. زنجیرەی چیا بە شوێن یەکدا، لە دڵی یەکدا درێژ دەبنەوە و دەڕۆن. چەمی ڕۆژهەڵاتیش لە دڵی چیاکاندا، بە دەیان ئاو، جۆگە و کانی لە سینگ، سەر، پشت و بناری چیادا دەزێن و هەڵدەقوڵن و دەکەونە ڕێ. بە سەدان شاخ، هەڵدێر، گاشەبەرد و بەرد، لێرە و لەوێ پێک دێن و دەبنە تەواوکەری زنجیرەی چیاکان. هەرچی ڕێچکە، ڕێڕەو و سەرچاوە، شیو و دۆڵ، خەرەند، ئەشکەوت و موغارەن، ئەوانیش بێ ئەژمارن. دار و دەوەن و باخچە و دارستان... کەروێشک بە دەور و بەریانەوە، بە خێرایی هەڵدێن. غەزاڵ لەگەڵ بینینیان بە خێرایی برووسک سەر هەڵدێنن، بە نازەنینی، بە ترسەوە... مەغروور هەڵدێن، سمۆرە هەڵدەکشنە سەر داران، ژیانێکی نوێ دەستی پێکردووە، بەفر چۆتەوە، پونگە، ڕێحانە،

گیا و گوڵ و گوڵخونچە سەریان دەرهێناوە. کۆڵکە زێڕینەی ڕەنگامە دونیا دەخەڵمێنێ و ئەوان دەڕۆن. ڕێک و پێک، بێ ئەوەی بزانن کە چی لە پێشیانە. ئەوان هەنگاو بە هەنگاو دەچنە دڵی چیاکان و دەڕۆن بەرەو مەیدانی جەنگ، بەرەو مەرگ، مان یان نەمان...

کۆتر بیر لە دەفتەرەکەی و شیعرەکانی ناو دەفتەر دەکاتەوە و بە ئارامی لە بەر خۆوە دەڵێ: چیا، دۆست، دوژمن، هەڤاڵ، نەیار، چیا... من لە ئامێزی تۆدام، ڕۆحی من، جەستەی من، تەسلیمی تۆیە/ چیا دەی ڕێم پێبدە، ڕێم بدەیە. چیا ڕێ بدە با من داستانی خەمین و حەزین، سترانی بەرخۆدان و خۆڕاگری و سەرهەڵدان بڵێمەوە. خەم بەسە، حوزن و تاریکی با بەس بن... بهێڵە من سترانی ڕووناکی و ئازادی بهۆنمەوە. چیا بڕوانە من بەرەو لووتکەی تۆ هەڵدەکشێم، بەرەو دڵ و مێشکت. چیا ئاخ لەم ناڵینە، ئاخ لەم زاری و گریانە. ئاخ لەم قیڕە و هاوارە، چیا ئەم دەنگانەت پێ دەگات؟ چیا جیهان و ژیان بە تۆوە دەستی پێکرد، بە تۆوە بوون بە ژێر ئاوەوە، بە تۆوە ژیانەوە. چیا ژیانی من، ژیانی ژیانەوەی ئێمە. چیا من دەخیلت بم. چیا بە دار و بەردەکەت، بە ئاو و چەمەکەت، بە تووڕەیی و خەمت، بە جۆش و کوڵت، من، ئێمە، هەبوونی من، هەبوونی ژیانەوەی ئێمە، چیا. چیا ئەم بندەستییە هی تۆیە؛ ئەم تاریکییە، ئەو ڕووناکییە، ئەو سەرما، ئەو گەرما، هی تۆن؛ ئەم سەبرە، ئەم سەبوورییە، ئەم جموجوڵە بۆ تۆیە. ئەم نفرینە، ئەو پیاهەڵگوتنە، ئەم وشە ساکارانەی من هی تۆن چیا، چیا...

وشەکانی دوایی بە دەنگێکی بەرزتر لە زاری کۆتر دێنە دەر. ڕێناس دەگەڕێتەوە بەرەو لای کۆتر و دەڵێ: «تۆ بانگی چیات کرد؟»

کۆتر وەڵام دەداتەوە «بەڵێ» بەڵام نەک چیای فەرماندار، بەڵکوو ئەم چیا کە لە ئامێزی خۆیدا دەمانحەوێنێتەوە...».

ڕێنـاس بـێ ئـەوەی هیـچ لـە قسـەکانی کۆتـر تێبـگات قسـەکانی دووبـارە دەکاتـەوە «ئـەم چیـای کـە ئێمـە لـە ئامێـزی خۆیـدا دەحەوێنێتـەوە ...!» و لێـی دوور دەکەوێتـەوە و دەڕوات.

ماوەیەکـی درێـژ هـەر بـەو شـێوە بـە کەنـاری چەمـدا ڕێدەکـەن. پاشـان دەکەونـە نـاو دارسـتانێکی چـڕ، پـاش ڕێکردنێکـی دژواری نـاو دار و دەوەن، دێنـە بـەر چـەم و ڕادەوەسـتن. ئـەو شـوێنەی لێـی ڕاوەسـتاون، ئـەم بـەر و ئـەو بـەری چـەم زۆر لێـک نزیکـن و بـە یارمەتیـی هەندێـک گاشـەبەرد کـە لـە هـەر دوو لاوە بـەر بوونەتـەوە بـۆ نـاو ئاوەکـە، ئـەم بـەر و ئـەو بـەر دەگەیەنـن بـە یـەک. شـەڕڤان دانـە دانـە لـەم بـەر چەمەکـەوە بـە قەڵەمبـاز خۆیـان دەگەیەننـە ئـەو بـەری چـەم و بـەم شـێوەش دەپەڕنـەوە بـۆ ئـەو بـەری شـیوەکە و بـێ ئـەوەی ڕاوەسـتن بـە دڵـی دارسـتان و چیـادا بـەرەو ژوور هەڵدەکشـن. هەنـگاو بـە هەنـگاو، نەفـەس بـە نەفـەس، دار بـە دار، گاشـەبەرد بـە گاشـەبەرد، شـاخ بـە شـاخ هەڵدەکشـن. ئەوەنـدەی کاتژمێرێـک دەڕۆن. کاتژمێـر دەبـێ بـە دوو، دوو دەبـێ بـە سـێ. هـەوا بـە تـەواوی تاریـک دەبـێ. ڕووناکـی نییـە، ئەسـتێرە نییـە، مانـگ نییـە. شـەڕڤان زۆر زیاتـر لێـک نزیـک دەبنـەوە و ڕێدەکـەن. پێـش ئـەوەی بگەنـە سـەر چیـا، بـاران دەسـت پێـدەکات. سـەرەتا نـم نـم، دواییـش تونـد و بـە لێزمـە. بەڵام هـەر دەڕۆن. جل و بەرگەکانیـان تـەڕ دەبـێ. کـراس و ئێلەکـی بەریـان تـەڕ دەبـێ، بـەڵام هـەر دەڕۆن، بـێ وچـان، بـێ پشـوو. ئێـوارە بـەرەو شـەو دەڕوات، ئێـوارە دەگاتـە شـەو، ئـەوان دەڕۆن. بـە ئاهەنگێکـی سـووک هەنگاوی گـەورە. لـە ژێـر لێزمـە بارانـدا، لـە شـوێنێکی زیکـزاک و پڕپێچـدا، بـە نـاو دار و دارسـتانی ئـارام و بێدەنگـدا. هـەوا سـارد دەبێـت، بایەکـی تونـد دەسـت پێـدەکات، بـەڵام سـەیر ئەوەیـە گەرمیشـە. کۆتـر ئارەقـە دەردەدات. لـە لایـەک تەڕیـی بـاران لـە لایـەک تەڕیـی ئارەقـە. خوێـن لـە دەمارەکانـی کۆتـردا لـە بـەر گەرمـای جەسـتەی خێراتـر دێـت و دەچێـت. خوێـن لـە دەمارەکانیـدا لـە بـەر بـاران و

سەرما، بەستوویەتی. ئایا یاوی هەیە و تای لێهاتووە؟ تووشی هەڵامەت بووە؟ بۆچی ئاهەنگی هەناسەکانی تێکچووە؟ بۆچی دڵی ئەوەندە توند لێ دەدات؟ ئەو تەرپیە دڵۆپی بارانە یان هی ئارەقەیە؟ کۆتر هەست بە هیچ شتێک ناکات، هیچ نابیستێ، تەنیا دەڕوات، ڕێکردن، ڕێکردن، ڕێکردن.

بەڵام کاتێک شەڕڤان دەگەنە سەر چیا و ماوەیەک بە سەر چیادا ڕێدەکەن و پاشان خۆیان بەرەو خوار بەر دەدەنەوە، لەو کاتەدا لە تەنیشت لووتکەی چیا، لە شوێنێک کە لە ئەشکەوتێکی گەورە دەچێ، دەستە ڕادەوەستێ. «ئێمە لێرە ماوەیەک ڕادەوەستین» ئەمجار نەک چیا، بەڵکوو ڕێناسە کە بە ناو شەڕڤاناندا دەگەڕێ و بە دەنگی گوڕی دەڵێ «بەڵام زۆر نا، ئەوەندەی چەند خولەکێک، ئێوە سەریەستن...».

کۆتر بە زەحمەت خۆی دەگەیەنێتە بەر بەردێک، جانتا و کلاشینکۆفەکەی دەخاتە تەنیشتی و لە سەر بەردی تەڕ وەک ئەوەی داڕووخابێ لاقی ڕادەکێشێ و دادەنیشێ. هەناسەی لە بەر بڕاوە، دەنگی لێوە نایە. هەر تەنیا بە ڕاکشاوی، بە قووڵی هەناسە دەگرێ و دەیداتەوە. ئێستا ئەو هەست بە دەنگی دڵی دەکات کە خێرا لێ دەدات، دوای ماوەیەک کە کەمێک گیانی پێدا دێتەوە، لە جانتاکەی چەندێک شەکر دەردێنێ، دەیخاتە دەمیەوە و دەیمژێ. دونیا تاریکە، باران دەبارێ. کۆتر دەست و چەند جاریش ڕوخساری پاک دەکاتەوە، بەڵام بێسوودە. دواتریش دەست و پێی هەروا بڵاو، جەستەی سست، چاوەکانی دەبەسترێن و دەچێتە خەو. کاتێک کۆتر بە دەنگی کچێک، شیلان، وە خەبەر دێت، چەندە کات بە سەر پشوودا تێپەڕیوە؟ نازانێ. لە تاریکە شەو و خرمەخرمی باراندا ئەو دەرفەتە نییە سەیری کاتژمێر بکات. خۆ کاتیش نییە. «خێرا کەن» ئەمجار چیایە دەقیڕێنێ «خێرا کەن پێش ئەوەی ڕۆژمان بە سەردا بێت، دەبێ بگەینە حەشارگەکەمان،

خێرا کەن» ئەوان هەموو خێرا لە پاڵ شاخەکە وەک پێشوو بە ڕیز دەبن. یەک لە فەرماندەران دێت و دانە بە دانە دەیانژمێرێ. دواتر بە دەنگی چیا دیسان دەکەونەوە ڕێگە: «ئێمە دەڕۆین...».

ئەوان دەڕۆن. لە ناو دار، دەوەن، دارستان، بەرد، شاخ، جۆگە و ئاودا، بە سەر چیادا، بەرەو خوار دەڕۆن. لە تاریکیدا، لە ژێر باراندا. بەڵام بەر لەوەی ڕۆژێکی نوێ دەست پێبکات، لە سپێدەی بەیاندا ئەوان دەگەنە دوا قۆناغ. ئەو شوێنەی ئێستا بۆی هاتوون چەند ئەشکەوتە لە بەر پێی چیا، لە تەنیشت چەمێکی گەورە. هەوا بە ئارامی ڕۆشن دەبێتەوە، باران بە ئارامی ڕادەوەستێت. ئەوان هەموو یەکسەر دەچنە لای ئەشکەوت و بە ناو ئەشکەوتەکاندا بڵاو دەبنەوە. ئەوان ماندوون. بێخەون. ڕێبوارن. پشوویان پێویستە، حەسانەوە و خەویان پێویستە...

دیسان ئەشکەوت. لە ئەشکەوتێکەوە بۆ ئەشکەوتێکی نوێ، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی نوێ. هەتا کەی؟

ئەوان، بێدەنگ، بەپارێزەوە، بە شێوەیەکی ڕێک و پێک لە ناو ئەشکەوتەکاندا بڵاو دەبنەوە، دیسان خەو، دیسان پرخەپرخی خەو. لە تەنیشتی یەک، بە جل و بەرگ، پێڵاو و گۆرەوییەوە. جانتا وەک سەرین، سەرپۆش و پشتوێن وەک پێخەف، چەک و ڕەخت لە تەنیشت. لە ناو بۆنێکی قورس و گەنیودا. لە تاریکییەکی پڕترس دا. بە تەنیا. لە شوێنێ هەرە دووری جیهان، مرۆڤ و مرۆڤایەتی.

بەڵام کۆتر ئەمجار خەوی لێ ناکەوێ. هەرچی دەکات خەوی نایە. هەڵدەستێت بە ئارامی جانتاکەی هەڵدەگرێ و لە ئەشکەوتی نزم و تاریک دێتە دەرەوە. هەوا ڕۆشن دەبێتەوە. ڕۆژێکی نوێ دەست پێدەکات. چیا ئێستا لە پشتەوە بەجێ مان. لە پێشەوەش دەشتێکی کاکی بە کاکی دیارە، و چەم، چەمی ڕۆژهەڵات. ئەو چەمەی هەمیشە لە گەڵیاندایە، هەمیشە بە شوێنیانەوەیە، هەمیشە لەگەڵیان بەڕوات. دونیا

ئارامە بە تەنیا دەنگی چەم و دەنگی باڵندە و باڵداران دێت. ئەوەندەی ماوەیەک کۆتر، هەندێک ڕۆشنایی بە سەر چاو و ڕوو و تەوێڵیەوە، لە پاڵ دەرگای ئەشکەوتدا دانیشتووە و گوێ لەو دەنگانە دەگرێ. ئەو ئارامی و هێمنییە... ئەو دەشتە بێپایانە. دەشت... بەڵێ، دەشت هێمای قۆناغ و کاتی نوێی ڕێکردنیانە. دوای چیاکان دەشت دێت و لە دەشتیشدا شەڕ. ئایا وەها دەبێ؟ کۆتر لەو پاسەوانە دوورە کە پاڵی داوە بە بەردێکەوە و بە تفەنگەکەی یاری دەکات، دەڕوانێ و بیر دەکاتەوە، مەگەر وەها دەبێت؟ کۆتر سەری دەخاتە ناو هەر دوو دەستی خۆی و بە نیگایەکی قورس، بە چاوی ڕووناکەوە، لەو دیمەنە دەڕوانێ. ئەم وڵاتە، ئەم چەمە، ئەم ڕووناکیی تیرێژانە، ئەو چیا و دارستانەی پشتەوە، ئەو ئاسمانە زوڵاڵەی ئێستا... ئەوانە هەموو چین؟ هیوا؟ بێ هیوایی؟ ڕووناکی؟ تاریکی؟ هێز و توانا؟ بێزاری؟ سستی؟ مان؟ نەمان؟ و بۆچی؟ ئەم هەموو شتە بۆ چی؟... کۆتر جانتاکەی هەڵدەگرێ و دیسان دەفتەر و پێنووسەکەی دەردێنێ. دەفتەرەکەی لە باوەش دەگرێ، دەیخاتە بەینی سینە و مەمکی و وەک ئەوەی منداڵێکی شیرەخۆرە بلاوێنێتەوە، خۆی دەلەرێنێتەوە. «دەفتەرەکەم» کۆتر زۆر ئارام دەڵێ «هیوای پاشەڕۆژی من، زمانی خەم و کەسەری من، سەرچاوەی جەسارەتم، هێزم، توانام...» کۆتر دەفتەرەکە دەکاتەوە. دێڕ، کۆپلە، ڕستە، وشە. لاپەڕە بە لاپەڕە. بەڵام پەرش و بڵاو. هەموو بە دەست خەتێکی زۆر جوان نووسراوە. کۆتر پێدەکەنێ، بەڵێ ئەو لە ئێستاوە بیست لاپەڕەی نووسیوە.

کۆتر لاپەڕەیەکی نوێ دەکاتەوە، پێنووس بە دەست سەیری دیمەنەکەی بەر دەمی دەکات و بیر دەکاتەوە. پاش کەمێک بە ئارامی یەکەم دێڕ دەنووسێ؛ ئەشکەوت، بەردەم ئەشکەوت و دەشت... دوای یەکەم دێڕ دانە بە دانە بەردەوام دەبێت؛ تۆ تیشکی نوێی دەرهاتووی

هەتاو، گژوگیای تەڕ و دەشتی شینی مردن لە دەرگای ئەشکەوتی نزمەوە دەبینی. هەر تەنیا لێرەوە. ئەوەندەی دەتوانی لێرەوە بیبینی. تۆ بە تەنیا ڕووناکیی خۆری کۆن دەبینی نە شتێکی دی. بە تەنیا ئەو ڕووناکییە لە سەر تەوێڵت، لە سەر ڕوخسارت دەدرەوشێتەوە نە هیچی دی. دڵت بەم ڕووناکییە گەرم دەبێت نە بە هیچی دی. هەر ئەوەیە نەفەست پێ دەدا نە هیچی دی. ڕووناکیی هەتاو، بە تەنیا ڕووناکیی هەتاو کە بۆنی خاک، بۆنی دار و بەرد و گیا، ڕەنگی ئەو دەشتە شینەی کەروێشکانیەتی، بە تۆ دەگەیەنێ. ئەگەر تۆ بژیت، ئەو جار جارە، هەنگاو هەنگاو، تۆ، جەستەت، مێشک و دڵت دەژیەنێتەوە. بە تەنیا ئەوە و هیچی دی نا... ئەگەر تۆ ئەو لە دەست نەدەیت، ئەگەر ئەو تۆ لە دەست نەدات...

لاپەڕەیەکی نوێ، شەپۆلێکی نوێی هەست، پێش ئەوەی هەنگاوی نوێی ئەمڕۆ دەست پێبکات، قسەکانی ناو ڕێگەی ڕێناس دێنەوە یادی؛ «هەموو شتێک ئەمڕۆ دەست پێدەکات...» بۆ ئەمڕۆ ئامادەکاری و تەدبیر پێویستە. کۆتر لاپەڕەکانی دەفتەر دەبەستێ، دەفتەر و پێنووس دەخاتەوە ناو جانتا، هەڵدەستێت و دەچێتە ناو ئەشکەوت. بەڵام خەوی نایەت. ئەو لە پاڵ چوار شەڕڤان کە پرخەی خەویان دێت، ڕادەکشێ، سەر دەکاتە سەر جانتاکە، سەرپۆشەکەی تا سینگی دەدات بە خۆیدا، نیگای لە بن میچی تاریکی ئەشکەوت، بیر دەکاتەوە.

ئەو بیر دەکاتەوە تاوەکوو خەو دێت و داگیری دەکات.

خەو، تێرخەوی. ئامادەکاری هەرە گرنگی ڕۆژ بۆ شەو...

کاتێک کۆتر لە خەو هەڵدەستێت و چاوەکانی دەکاتەوە، یەکەم شت کە دەیبینێ تیشکی ڕووناکی هەتاوە کە لە دەرگای ئەشکەوتەوە هاتۆتە ژوور. دەرگای ئەشکەوت لە ناو شەوقێکی بێپایاندایە. شەوقێک کە گەرما دەبارێنێ بە سەر مرۆڤدا. کۆتر خۆی کۆ دەکاتەوە و لە

ئەشـكەوت دێتـە دەرەوە. ئـەو ئێسـتا دەر و دەشـت زۆر باشـتر دەبینـێ. ئـەو شوێنەی ئەمانـی لێـن هێشـتاش لـە بەرزایـی لـە نـاو چیـادا بـە داران تەنراوەتـەوە. لـە بـەر ئەمـەش مرۆڤ دەتوانـێ تەنیـا پێـش خـۆی، هەمـوو دەشـت، چـەم و دەر و دەشـت بـە ئاسـانی ببینێـت. بـەڵام کۆتـر ئێسـتا لـە دەور و بـەری خـۆی ڕوخسـاری نـوێ دەبینـێ. نـە یـەک، نـە دوو، نـە سـێ، لەوانەیـە پەنجـا کـەس، سـەد کـەس، سـەدوپەنجا کـەس. جموجۆڵێکی زۆر بەرپایـە. هاتـن و چـوون زۆرە. چـەک و فیشـەکدان پـڕ دەکرێـن. ڕەخـت دەبەسـترێن. دووربیـن خاوێـن دەکرێنـەوە. ئـەم شـەڕڤانانە کـەی هاتـن؟ لـە کوێـوە، چـۆن؟ چـۆن کۆتـر ئـاگای لـە هاتنیـان نەبـوو؟ لەوانەیـە کاتێـک کۆتـر و هاوڕێکانـی هاتـن ئەمـان لێـرە بووبێتـن؟

«ڕۆژباش!»

ڕێناسـە، کـە کۆتـر هەڵدەگەڕێتـەوە بـە لای دەنگەکـەدا ڕوخسـاری گـەش و بـەژن و بـاڵای بـەرز و شـەنگی ڕێنـاس دەبینـێ. بـە پێکەنینـەوە دەڵـێ «ڕۆژبـاش، ئەوانـە کەنگـێ هاتـن ڕێنـاس؟»

«ئەوانـە دێـن و دەڕۆن... ئـەم شوێنە دوا حەشـارگەی سـەر سـنوورە. شـەڕڤان هەمیشـە دێـن و دەڕۆن... بـە گوێـرەی زانیارییـەکان لـە دەور و بەری گونـد و ئەشـکەوتی خـوارەوە شـەڕی گـەورە کـراوە... شـەڕێکی قـورس دەسـتی پێکـردووە، دە زووکـە کۆتـر ئێمـە دەڕۆیـن. لـە بـەر دەرگای ئـەو ئەشـکەوتە هەڤـاڵان سـاوەریان لێنـاوە. سـاوەری گـەرم بـە گۆشـتەوە!... بـڕۆ بخـۆ و دواییـش وەرە بـەر ئـەو ئەشـکەوتەی خـوارەوە. ئێمـە لـەوێ کـۆ دەبینـەوە و دەڕۆیـن...»

«بەرەو کوێ؟»

«بەرەو شەڕ... زووکە...»

کۆتـر زوو دەکات. دوای چەنـد خولەکێـک پێداویسـتی، خـواردن و خواردنـەوە، کۆتـر خـۆی دەگەیەنێتـە گرووپـی هاوڕێکانـی و دەچێتـە نـاو

ڕیزەوە. لەم کاتەدا کۆتر بە شتێک خۆشحاڵ دەبێ. ئەو، فەرماندارى ڕۆژانی زستان دەبینێ کە لێرە لە بەر دەمی هەڤاڵاندا ڕاوەستاوە. ئەو فەرماندارە باڵا بەرزە سمێڵ بۆرەکە کە لە ڕۆژانی بەفر و بۆرانی زستاندا ڕێبەریی دەستەی دەکرد. فەرماندار بە پێکەنینەوە بەو دەنگە گوڕ و کراوەی دەڵێ؛ «ڕۆژباش کۆتر»

«ڕۆژباش...» کۆتر بە خەندەوە دەڵێ بەڵام قسەکەی تەواو ناکات. ڕادەوەستێ. برا ناوی فەرماندار چی بوو؟ نا، کۆتر ناوی ئەو نازانێ، سەیرە، دوای ئەو هەموو شتەی بەسەریاندا هات، هێشتا کۆتر ناوی نازانێ.

«چەکدار» فەرماندار وەک ئەوەی بزانێ لە بیری چۆتەوە دەڵێ «ناوم چەکدارە، بچۆ ڕیزەکەوە، ئەمجارەش ئێمە پێکەوە دەبین، بەڵام هیوادارم ئەمجار لەو جارەکەی زستان باشتر بێت.»

«بەڵێ بەهیوای باشتر بوون...»

پاش ئەوەی دەستە کە ئەژماری ئێستا گەشتۆتە سی کەس، ئامادە دەبێ، فەرماندار چەکدار دەست بە قسەکانی دەکات. ئەو وتانەی کە کۆتر لە زستانەوە دەیانزانێ، بە وشەی ڕۆشن، ئاهەنگێکی ئارام و ورد؛ دژواری، شەڕ، قارەمانیەتی، ئەوینداری، وڵاتپارێزی و خۆشەویستیی گەل، مێژوو و ئەو مێژووە نوێیەی ئێستا دەنووسرێ، بەهێزی و وریایی، دوژمن و خراپییەکانی، ڕزگاری، تێکۆشان و دوایین کردەوەی ژیان. شەهادەت... پاش وتارێکی درێژ، دەڵێت «ئێستا چەک و فیشەکدانی خۆتان کۆنتڕۆڵ بکەن، خۆتان ئامادە بکەن، دوای نیو کاتژمێری دی لێرەوە دەکەوینە ڕێ...» دوای نیو کاتژمێر دەکەونە ڕێگە. کۆتر دەکەوێتە ڕێ. بە ڕێکردنێک کە ئێمە ئێستا باش نازانین چۆنە. بە کەناری بناری چیادا، هاوتەریبی چەم و دەشت بەرەو ڕۆژهەڵات. کاتژمێرێک، دوو کاتژمێر، دوو کاتژمێر هەر وەک پێشوو ڕێدەکەن. بەڵام پاش دووهەم کاتژمێر

ڕەوت ئارامتــر دەبێتــەوە، بێدەنگتــر و بەپارێــزەوە. ئەژمــاری پێشــەنگانی دەســتە زیاتــر دەبــن. دەســتە باشــتر ئاگایــان لــە خــۆ شــاردنەوە دەبێــت. دەســتەی کەشــف دێنــە دەرەوەی ڕێگــە، دێــن و دەچــن. ڕێنــاس لــە ڕیزەکــە دێتــە دەرەوە، بــەرەو پێــش و دواوە، بــە درێژایــی دەڕوات و دێــت. هەڤاڵــی دەســتەی دیکــەش، پێشــەنگ و پاشــەنگ بەیــەک دەگەیەنــێ. لەگــەڵ درێژایــی ڕۆشــتنەکە ، ئێســتا دەنگــی باڵــدار و باڵنــدەش کەمتــر دەبێتــەوە. گیانلەبــەر ئیــدی دیــار نیــن. لەگــەڵ ئــەوەش کــە هێشــتا لایەکیــان چیــا و دارســتانە، لایەکــی دیــش چــەم و دەشــت، هێــدی هێــدی لــە لای دەشــتەوە، ڕەنگــی دەر و دەشــت دەگــۆڕدرێ. خــاک دەردەکــەوێ. زەویــی بــوورە و کــەس نەکێــڵ دەردەکــەوێ. زەویــی کشــت و کاڵ و مــەزرا و ســنووری نێوانیــان دیــارن. کــۆگا و کۆشــکەڵە بــەرد کــە بــە دەســتی مرۆڤــان ســازکراوە، دیــارن. لای دەشــت هەنووکــەش شــینە، بــەڵام ئیــدی نــەک ئــەو شــینایییە چڕوپــڕە.

کۆتریــش وەک شــەڕڤانانی دی تێــدەگات، نــەک هــەر دەبینــێ، بەڵکــوو هەســتیش دەکات؛ ئــەوان ئێســتا دەچنــە ڕۆژگارێکــی نــوێ، دونیایەکــی نــوێ. دونیایــەک کــە جودایــە لــەو دونیایــەی لێــی دێنــە دەر. دونیایەکــی بێدەنــگ، پرســام، فریــودەر. کۆتــر ســەیری کاتژمێرەکــەی دەکات. ســێ کاتژمێــر دەبێــت، ســێ کاتژمێــرە کــە کەوتوونەتــە ڕێــگا. ئێســتاش شــتێکی نــوێ لــەو دەشــتە بێپایانــەدا دەردەکــەوێ، ئــەو چکــە شــینایییەش کــە بــوو تــەواو دەبــێ و شــوێنی خــۆی دەدات بــە تاریکــی و ڕەشــی. تاریکییەکــی ســەیر، ڕەشــایەکی نائاســایی. کۆتــر بــە وردی بــە هزرینــەوە، ســەیری لای دەشــت دەکات. دووربینــی ئــەو هەڤاڵــەی لــە پشــتیەوە دەڕوات لێــی وەردەگــرێ و بــە دووربیــن تەماشــا دەکات. لــەو کاتــەدا کۆتــر دەترســێ. تاریکــی هــی ســووتانە. ئــەو ڕەشــاییەی دەیبینــێ، هــی ئاگــر و ســووتانە. زەوی ســووتاوە. دار و بــەرد ســووتاون، گیــا و شــینایی، بــەرد و گاشــەبەرد، هەمــوو شــتێک ســووتاوە.

ئــەوان دەڕۆن. ئــەوان ئــارام ئــارام لــە چیــا دوور دەکەونــەوە و لــە چــەم

و دەشــت نزیــک دەبنــەوە و دەڕۆن. ئێســتا ئــەوان بــە چاڵێکــی قووڵــدا بــە کەنــاری چەمــدا و هاوتەریبەتــی دەڕۆن. ئێســتا تەنیــا ســەریان دیــارە. بــەڵام ئــەوان دەبینــن. کۆتــر دەبینــێ. ئــەو ڕاســتییەی کــە ئــەوان باســیان دەکــرد، ڕاســتیی ئــەم وڵاتــی مردنــە لــە بــەر چاویەتــی. داری کۆنــی گــەورە سووتاون! گوللــەی تۆپــی هــاوەن بــە نــاو قەدیانــدا تەقیوە. داری هەمیشــەیی تێکڕووخــاون. ئاســەواری چەکــی قــورس، تۆپــی هــاوەن، ڕەشاشــەی مــەرگ، بــە هەمــوو شــوێنێکەوە دیــارە، تەنانــەت لــە ســەر بــەرد، کۆگابــەرد، شــاخ و گاشــەبەرد! تەنانــەت بــەرد، کۆگابــەرد، شــاخ و گاشــەبەردیش سووتاون و ڕەش بوونەتــەوە! لــە زەوی شــتێک بــە نــاوی شینایی نەمــاوە، هەمــوو شــت، هەمــوو جێگەیــەک ســووتاوە. هەمــوو شــوێنێک وەک خەڵــووز ڕەشــە. هەمــوو شــوێنێک داڕووخــاوە، تــەرک کــراوە. دار، دەوەن، کشــتوکاڵ بــە گــڕی ئاگــر ســووتاو، دونیــا تەنهــا، ئــارام، نــە کەســێک، نــە پەڵەوەرێــک. مــرۆڤ نیــن، جموجۆڵــی مــرۆڤ نییــە، حــەز نییــە، ســەودا نییــە، هەمــوو شــوێن، هەمــوو شــت مــردووە. بــە تەنیــا شــوێن پێــی ڕق، شــوێن پێــی نەفــرەت هەیــە و قیــڕە و گازنــدە و هــاوار و گازنــدەی بێدەنگــی سرووشــت کــە گرێــدراوە بــە ڕەشــایی ســووتانی ڕەشــی خۆیــەوە.

ڕەشایی، ڕەشاییەک کە بە دەستی مرۆڤان ساز کراوە.

هەســتێکی تێکــەڵ بــە تــرس، ســام، دڕدۆنگــی، ماتــی، مەلوولــی کۆتــر دادەگرێــت. شــەپۆل بــە شــەپۆل. وەک ئــەوەی شــەپۆلی ئــەم هەســتە کۆتــر بخنکێنــێ، قورگــی پــڕ دەبــێ. کۆتــر دەیهــەوێ بگــری.

دەســتە ئارامتــر دەبنــەوە. هەندێــک دەنــگ دێــن، دەنگــی هەندێــک پەلەوەر و باڵنــدە. دەســتە بــە سیســتەمی خــۆ پاراســتن، بــڵاو ڕادەوەســتن. دەنگێکــی ســەیر کــە لــە دەنگــی باڵنــدان دەچێــت، نزیکتــر دەبێتــەوە. داوای کەمێــک، لــە لای پێشــەوەی چاڵەکــە، دوو پێشــەنگ، ژنێکــی مامناوەنــد لــە نێــوان هــەر دووودا، دەردەکــەون. ڕێنــاس، بــە کۆتــرەوە ســێ کــەس هەڵدەبژێــرێ و

بەرەو ئەوانەی دێن، دەڕۆن. دوای ئەوەی دەگەنە لای یەک، فەرماندار چەکداریش خۆی دەگەیەنێتە ئەوان و بە دەست بانگیان دەکات. ئەوان هەموو پێکەوە دەڕۆن و هەندێک دوورتر لە شەڕڤانان لە شوێنێکی خۆڵاوی دادەنیشن. ژنە سەیری ئەمان دەکات. بە ڕوخسارێکی پرچین و بە چاوانی دەرپەڕیوەوە، بە نیگایەکی بێ واتا. جل و بەرگی کۆنی هەموو دڕاوە، هەرچی چۆنێک بێت ئیدی پێڵاوی بە پێوە نەماوە، پێڵاو هەمووی دڕاوە. چەکدار، ڕێناس، کۆتر و ئەوانی دی بێدەنگ لە یەک دەڕوانن. پاش ماوەیەک بێدەنگی چەکدار دەڵێ «دادە لە کوێوە دێی؟ چی قەوماوە؟»

ژنە بە ئارامی دەڵێت «من لە گوندەوە دێم، لە گوندی دوای چەم... هەر تەنیا دێیەکەی ئێمە مابوو، بەڵام ئەویش سووتا، ئەوان ئەویشیان سووتان...»

«کێ؟»

«ئەوان... ئەوان سووتاندییان... ئارد، ئەرزاق و زەخیرەی ئێمەشیان سووتاند... ئەو چەند خانووە وێرانەی گوندیشیان سووتاند... گوند نەما، گوندی باو و باپیران [لەدەست] چوو،ماڵەکەی من نەما... ماڵەکەم، ماڵی من...».

«ئەوان لە گوندن؟»

«نا ئەوان ڕۆشتن، چەند ڕۆژێک پێش ئێستا ڕۆشتن... چەند ڕۆژە کە من بە ڕێگەوەم... بە شوێن کوڕەکەمدا دەگەڕێم، کوڕەکەم، کوڕی من، ماڵەکەم، کوڕەکانم، ماڵەکەم...»

ڕێناس دەڵێ «دایە» و دەیهەوێ شتێک بپرسێ، بەڵام چەکدار قسەکەی دەبڕێ و بە سەر پێی دەڵێ لێیگەڕێ، بهێڵە.

«ماڵی من... کوڕە، کوڕەکەم لە کوێیە؟ ئێوە کوڕەکەمتان نەدیوە؟ ماڵی من... سێ کوڕم بوو... سێ شێر، سێ لاوچاک، سێ چیا، یەکیان

مرد، ئەوان یەکیان، گەورەی گشتیان، لە مەیدانی گوند کوشت، یەکیان لەگەڵ خۆیان برد. بچووکی هەمووشیان هەڵهات بەرەو ئەم شوێنانە بۆ ئەوەی بێتە ناو ئێوە. کوڕە، کوڕەکەم لە کوێیە؟ ئەو هێشتا منداڵە، تەمەنی هێشتا چواردەیە.ماڵی من، ماڵەکەم...»

کۆتر دەستی ڕاستی ژنە بە هەر دوو دەستی خۆی دەگرێ و دەیماڵێ. بەڵام ژنە لێی ناڕوانێ. نا، ژنە لێی دەڕوانێ. لە هەمووان دەڕوانێ، بەڵام وەک ئەوەی نەیانبینێ، چاوی کراوەتەوە بەڵام وەک ئەوەی لە خەودا بێت، قسە دەکات.

«کوڕەکەم بدۆزنەوە، کوڕەکەم بێنن، ماڵەکەم... ماڵی من...»

کۆتر قومقومەی ئاو دەداتە ژنە. لەم کاتەدا ژنە هەست بەوان دەکات، وەک ئەوەی تازە هەستی بە بوونی ئەوان کردبێ سەیریان دەکات. قومقومە وەردەگرێ، هەندێک ئاو دەخواتەوە و دەیداتەوە بە کۆتر. چرچ و لۆچی تەوێڵ و دەم و چاوی قووڵە. دەمارەکانی گەردن و قوڕگی ڕەش داگیرساون بەڵام ئەو ئارامە. بە ڕوخسارییەوە نە شوێنی دوودڵی و کەسەر، نە هی ڕق و قینیش هەیە. لە گیرفانی کولۆنجە ڕەنگینەکەی کە بە تەپ و تۆز داپۆشراوە، چەند نوقڵی ڕەنگین و کون کون دەردێنێ و دەیداتە کۆتر. «ئەوانە نوقڵی کوڕەکەمن، من بۆم شاردۆتەوە، بیدەنێ»

«نا دایکە تۆ بیدەیێ، کاتێک کوڕەکەت بینی بیدەیێ» چەکدار ئەمەی پێ دەڵێت و دەگەڕێتەوە بە لای ڕێناسدا؛ «با یەکێک دایە هەڵگرێ و بیبا بۆ مەقەڕ، لەوانەیە کوڕەکەی لەوێ بێت... ئێمە دەبێ بڕۆین...»

ئەو پێشەنگانەی ژنەکەیان هێنابوو دەستیان دەنێن بە بەر دەمیانەوە، دەنگێکی وەک دەنگی باڵندە دەردێنن و هەڵدەستن، دەڕۆن. دەستەش

بە دەنگەکە هەڵدەستێ و بەڕێ دەکەوێ. دەستە بەرەو ڕۆژهەڵات، ژنە لەگەڵ شەڕڤانێک بەرەو ڕۆژئاوا. کاتێک دەستە دوور دەکەوێتەوە کۆتر هێشتا دەنگی ژنە دەبیستێ «ماڵەکەم، ماڵی من...»

ماڵەکەم، کۆتریش بە ئارامی ئەمە دەڵێت و ڕێدەکا، ماڵی من... ئێمەی ڕێبوار، ئێمەی موسافیر، ئەم سووتانە، ئەم کردەوانە. ماڵی من... ئەم ژیانە، ئەم جیهانە لە بیرکراوە، بێچارە و بێکەسە! ماڵی من، ئەم ژیانە وەها دوور لە دونیا، دوور لە مرۆڤ و مرۆڤایەتی، پڕ لە سووتانە! بە مەرگە! ماڵی من، مردن، یاسای تایبەتی مردن کە لێرە پێک دێن. ڕێ و ڕێچکەی مردن هی ئەم وڵاتە بێ پشتیوانە، تەنیا و هەژارە... ماڵی من، خاکی سووتاو، زەویی سووتاو، داری سووتاو و مردن و مردوو. مردن و مردووانێک کە کردەی دەستی مرۆڤە. مرۆڤ، ماڵی من، مرۆڤ، عەقڵی مرۆڤ کە توانای هەموو شتێکی هەیە، دەسەڵاتە، دەتوانێ هەموو شتێک بکات. ماڵی من، خۆشی و خۆشحاڵی، ترس و سام، پەژارە و خەم، تووڕەیی و نەفرەت، بەهێزی و جەسارەت و هەموو تایبەتمەندییەکانی مرۆڤ. ماڵی من، هەمووی بۆ مردن، کوشتن، سووتان و تێکدان. ماڵی من. پیرەژن، ماڵی من، ڕاستی، ڕاستیی مرۆڤەکان، ڕاستیی ئاوەلا، ئاشکرا، بێ دەمامک و بێدرۆ. ماڵی من، ڕاستی، سووتان، مردن و مردوو. مردووەکانی ئێمە، ماڵی من، هۆ مردن، هۆ سووتان، قەزاتان لێ کەوێ! ماڵتان بسووتێ، مردن، سووتان!...

کۆتر دەگری، بە ئارامی، بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ، سەری داخستووە.

چەم و چاڵ کە دەستەی پێدا دەڕوات، هێدی هێدی لە چیا دوور دەکەوێتەوە. لەگەڵ ئەوەی کە هەور بە ئاسمانەوەیە، دونیا ڕووناکە. بۆچی ئەوان ئاوەها بەم ڕۆژە ڕۆشنە دەڕۆن؟ بێگومان فەرماندارەکانیان شتێک دەزانن. کۆتر سست، ئەنگاوتە، دڵشکاو ڕێدەکات. لە شوێنێک

کە هەر دوو لای چەم، وەک کانالْ و جەمسەر بە بەردی ناو چەمەکە دەگەنە یەک، دەستە یەک بە یەک دەپەڕنەوە ئەو بەری چەم. ئەوان ئیدی قسە ناکەن. ئەوان مەودای نێوانیان زۆر دەکەن و ڕێدەکەن. کاتێک ڕێناس بە بەر دەمی کۆتردا ڕادەبرێ، بە دەست هێما بۆ گردە گەورەکەی بەرانبەریان دەکات. ڕێگەکەیان بەرەو گردەکەیە. دوای ماوەیەک، لە دوورەوە گوندێک دەبینن. گوندێکی کاول، خانووەکانی وێرانە، گوندێکی ڕووت و چۆڵ، گوندێکی سووتاو. دیوارە تێکڕووخاوەکانی گوند، کۆتەی داری سووتاوی دەر و دەشت [لە دوورەوە] ڕەش دەچێتەوە.

دەستە ڕاناوەستێ، ڕێگەکەی بەردەوام دەکات تاوەکوو دەگەنە گردە بەرزەکە. گرد پڕە لە بەرد و گاشەبەرد. نە دارێک نە دەوەنەوێک دیار نییە. بەڵام بۆ خۆ شاردنەوە و خۆ پاراستن بێ هاوتایە. لە دڵی گردی بەرزدا، گەلێک قڵەش، ڕێچکەی بچووک و قووڵ و پاڵپشتی قایم هەیە. چەکدار، ڕێناس و سێ کەسی دی کە لە پێش هەموانەوە ڕاوەستاون، بێدەنگ، بە دەست و پێ، دەستە بە ناو قڵەشەکاندا بڵاوە دەکەن. کۆتر، شیلان و دوو شەڕڤانی کوڕ دەچنە ناو قڵەشێک. ئەوان جانتاکانیان لە کۆڵیان دادەگرن و دادەنیشن. شەڕڤانێکی سمێڵ باریک پاکەتی جگەرە لە گیرفانی دەردێنێ و دەستی بەرەو ئەوان ڕادەکێشێ، خۆیشی جگەرەیەک دەردێنێ و بە چەرخ، لە ناو لەپی دەستەکانیدا دایدەگیرسێنێ و هەر لە ناو دەستیدا دەیکێشێ. کۆتر ناکێشێ. ئەو جانتاکەی دەخاتە ژوور سەری و لە سەر بەردێکی ڕاست پاڵ دەداتەوە. تاوەکوو ڕێناس دێت بۆ لایان، ئەو هەروا پاڵی داوەتەوە و لە ناو دەنگی شەڕڤانان و دەنگی چەم کە لە دوورەوە دەڕوات، گوێ لە دەنگی هەستە تێکەڵەکانی خۆی دەگرێ.

ڕێناس بانگی دەکات: «کۆتر وەرە» کۆتر هەڵدەستێت و دەڕوا بۆ لای ڕێناس کە هەندێک دوورتر لەوان ڕاوەستاوە. «کلاشینکۆفە نوێیەکەت

و دووربینەکەش بێنە» ڕێناسە وا دەڵێت. کۆتر ئەوانەش هەڵدەگرێت و دێ. ڕێناس بە خێرایی دەڵێ «گرووپی ئێوە چوار کەسە، تۆ بەرپرسی گرووپی، ئێمە ئێستا زۆر لە گوند نزیکین، ئەگەر هیچ ڕوو نەدات، ئێوارە دادەبەزین بۆ گوند. وەرە»

کۆتر دەکەوێتە شوێن ڕێناس و پێکەوە دەچنە سەر بەردەکان. کە دەگەنە سەر بەرزترین شوێنی گاشەبەرد، لەوێ کۆتر لەگەڵ چەکدار چەن کەسی دیکەش دەبینێ. هەموویان لێرە لە پشت گاشەبەردێک کە لە چەپەرێکی پتەو دەچێت، دانیشتوون. یەک لەوان هەندێک هەستاوەتە سەر پێ و بە دووربین سەیری پێشەوە دەکات. ڕێناس و کۆتر دێن بۆ لای ئەوان. لە تەنیشتی ئەوان، ڕێناس کەمێک خۆی بەرز دەکاتەوە و بە دەست بانگی کۆتر دەکات و دەیهەوێ کۆتر بە دوربین سەیر بکات. کۆتر دەڕوانێ. گوندێک دیارە. گوندێکی نەسووتاو، پازدە بیست خانوویەکی تێدایە کە ژیانی لێیە و لە ژێر شەوقی خۆردا دیارە. چەند منداڵ لە نێوان خانووەکاندا هەڵدێن. هەندێک مریشک و کەڵەشێر بە تەوەزەلی لە ناو حەوش و بەرەی ماڵەکاندا دەگەڕێن. لە لای خوارووی گوند مەڕ و بزن دەلەوەڕێن. کەر، هێستر و ئەسپ دیارن. دوو پیرەپیاو بێ ئەوەی ئاگایان لە شتێک بێت لە بەر دیواری ماڵێک لە سەر کۆتە دارێک دانیشتوون و جگەرە دەکێشن. ژنێکی گەنج، سەتڵێک بەدەستەوە بەرەو خوار دەڕوات. کەمێک نزیک لە شاخەکە سێ پیاو لە ناو بێستانێکی زۆر گەورەدا خەریکی کارن. لە تەنیشت گوند و لە لای خوارووەوە کانییەکی گەورە هەیە. هەر دوو بەری کانی پڕە لە داری بەرزی بی و سپیدار. لە بەر کانی و دارانەوە ڕێگەی گەورەی گوند بەرەو خوار دەبێتەوە. لە دوورەوە، چەم و ئاوەکەی لەگەڵ تیرێژی خۆری سەر لە ئێوارە لەیلان دەدات.

هەموو گوند، تەواوی دیمەنی گوند و دەور و پشتی، ئێستا لە

بەر چاوی کۆتر. ڕێناس بە ئەنگوستی ئاماژە بۆ شوێنێک دەکات لە گوند. کۆتر سەیری ئەو شوێنەش دەکات. خانوویەکی درێژ و نزم کە بە بەردی ڕەش ساز کراوە، دیارە.ماڵەکە حەوشێکی گەورەی هەیە، ژنێک لە حەوشەکە شت دەشوات، ئەو جل و بەرگانەی شۆردوونی لە پاڵ خانوودا هەڵخراون. لێ لەو بەری خانووەکەش تەنیا کراسێکی سپی هەڵخراوە. ڕێناس بە ئارامی لە کۆتر دەپرسێ «کراسەکە دەبینی؟»

«بەڵێ»

«ئەو کراسە سپییە بۆ ئێمە هەڵخراوە، ئەوە هێمایە، هێمای مەترسی. مەترسی لە دەور و پشتی گوندە، سەرباز لەم دەور و بەرەن، ئێمە چاوەڕوان دەبین...»

«لە کوێ؟ لێرە؟»

«بەڵێ لێرە، مەگەر جێگەیەکی دیش هەیە؟ ئێمە چاوەڕوان دەبین، ئەگەر سەرباز نەیەن، ئێوارە دادەبەزین بۆ گوند، ئەگەریش ئەوان بێن، ڕەوش دەگۆڕدرێ.»

«ڕەوش دەگۆڕدرێ؟» کۆتر قسەکەی ڕێناس بە شێوەی پرسیار دووبارە دەکاتەوە، بەڵام بەرسڤ ناداتەوە. کۆتر و ڕێناسیش لە پاڵ چەکدار و ئەوانی دی لە سەر بەرد دادەنیشن. کۆتر سەیری ڕوخساری ئەسمەریان دەکات کە ئێستا لەگەڵ تیشکی هەتاو بریقەی دێت. بە سەر ڕوخساری هیچ کەسەوە نە دوودڵی و ترس، نە گومان و پرسیارێک دیار نییە. بە پێچەوانەوە، خۆشحاڵی بە ڕوخساریانەوە دەبینرێت. دوو کەسیان لە ناو لەپی دەستیاندا جگەرەیان شاردۆتەوە و دەیکێشن. چەکدار بە دانیشتنەوە لاقی ڕاکێشاوە و بە قسەی زل باسی ئەو شوێنانە و خەڵکی ئەو گوندانە بۆ گرووپ دەکات. بە جۆش و خرۆشەوە.

پاش کەمێک کۆتر بە ئارامی دەجووڵێتەوە و خۆی کەمێک بەرز دەکاتەوە و سەیری گوند دەکات. سەرەتا بە چاو، دواتر بە دووربین.

گوند لەوێیە، کەمێک دوورتر لەمان خەریکی ژیانی ڕۆژانەی خۆیەتی. خانوو، باخچە، دار، کانی، باخ، بێستان، ڕێ و ڕێچکە دیارن. خاک دیارە. خاکی ڕەش و سەوزی بەبەرەکەت. خاکی وڵاتی چیا. خاکی کۆتر. بێدەنگییەک باڵی بە سەر دەر و دەشتدا کێشاوە. جگە لە دەنگی ناوە ناوەی باڵندە و پەلەوەر، دەنگی سووکی با و ئاو، هیچ دەنگێکی دی نابیسترێ. دەشت، گاشەبەرد و شاخی تەنیشت، دار، دەوەن و گیا لە ناو بێدەنگیدان. بێدەنگیی شکاندن و کەوتن؟ بێدەنگیی تێکۆشان و هەستان؟ بەڵێ خاک دیارە، کۆتر بیر دەکاتەوە، خاکی ئاوسی بەهار، خاکی بێ زمان، خاکی هیوادار، خاکێک کە ئارامی و هێمنی لێ هەڵدەستێ...

ئارامیی ئەم گوندە چەند لە ئارامیی گوندەکەی کۆتر دەچێت! لە گوندی منداڵیی کۆترەوە تاکوو ئەم گوندەی ئەمڕۆ... پوختەی ژیانی کۆتر. چارەنووسی وەهایە، یان وەها دەبێ؟ تۆ بڵێی گوند چارەنووسی ئەم بێت؟ بڵێی ژیانی ئەو وەها بێت؛ گوند، کراس و جل و بەرگی ڕەنگینی گوند، هەڵهاتن و شوێن کەوتنی بەرخ و کاریلە، ساباتی پڕ لە میوەی گوند، ئێوارانی دۆشینی شیری مەڕ و بزن و دەوار. هەڵقوڵینی کانی و خوڕەی ئاو، دواییش، دوای گوند، خوێندنی سەرەتایی و ناوەندی و باڵای شارە گەورەکان، ژیانی گشتیی پەروەردە و فێر بوون. فێربوونی ئەوین و شێوەکانی دڵداری و دیسان گوند. واتا خاک و دیسان خاک. واتا سەرەتا و کۆتایی... کۆتر وەک بڵێی سەیری گوندی منداڵییەکەی بکات ئاوەها ژیر و هۆشمەندانە بۆ گوند دەڕوانێ. کۆتر، کچی گەنج، جەستەی جوان و گەرم، گوڵی تازە پشکوتوو، لەم ڕۆژە گەرم و ڕووناکەدا، بە دڵێکی گەرمەوە، لە شوێنێکی سەرکەش، بۆ گوندی وڵاتی خۆی دەڕوانێ و بیر لە گوندی منداڵییەکەی، لە دایک و خزمانی و لە ژیانی بەختەوەری ئەو گوندە دەکاتەوە.

بەڵام لە ناکاو دەنگێک دێ. دەنگێک کە بێدەنگی و ئارامیی دەر و دەشت بە یەکجاری دەشێوێنێ. دەنگێکی بەهێز و پڕترس و سام. کۆتر هیچ شتێک نابینێ. کەس هیچ نابینێ. بەڵام دەنگ دێ. «خۆتان بدەنە سووچێک، خۆتان بشارنەوە» چەکدارە وا دەڵێ، چەکەکەی هەڵدەگرێ و دادەگەڕێ، «کۆپتەر دێن...خێرا کەن، پەلە بکەن...».

جموجۆڵێکی توند دەکەوێتە ناو شەڕڤانان. بە پەلە و هەڵاتن هەریەک بە لایەکدا دەچن. دەر و دەشت و دەور و بەری شاخەکان بەجارێک چۆڵ دەبێ وەک ئەوەی کەسی تێدا نەبێ. کۆتر فریا ناکەوێ خۆی بەر بداتەوە و بچێتەوە لای هەڤاڵانی. ئەو، ڕێناس، چەکدار و دوو شەڕڤانی دی دەچنە ناو قڵەشێکی پاڵ گاشەبەردەکەی لە سەری دانیشتبوون. چەک بەدەستەوە، لە پاڵ یەکدا و هەڵترووشکاو چاوەدێری دەکەن. دەنگ بەهێزتر دەبێ، پەردە بە پەردە بەرزتر دەبێتەوە. بەڵام سەیرە، لەگەڵ ئەوەی کە دەنگ نزیکتر دەبێتەوە، چەکدار، ڕێناس و ئەوانی دی ئارامن. چەکدار دەڵێ «کۆتر مەترسە، دەنگی کۆپتەر لە زۆر دوورەوە دێت، بە کیلۆمەتران دوورترەوە دێتە بیستن، زۆریش بەهێز دەفڕن، ئەگەر مرۆڤ خۆی بە باشی بشارێتەوە، ناتوانن لەو سەرەوە کەسمان ببینن...» بەڵام هەر دەڕوات و دەنگ نزیکتر دەبێتەوە. پاش کەمێک، ئەوان نووک و پەڕەی کۆپتەری گەورەی سەوز بە بەرزایی ئاسمانەوە دەبینن. پاشانیش ناوقەدیان دەردەکەوێت. کۆپتەر وەک جانەوەرێک، بە هێواشی دەجووڵێ، ئارام ئارام بە سەر گوند و دەور و پشتی گونددا دەگەڕێ. مارێکی ژەهراوی، مارێکی مەرگ. دوای یەکەمین کۆپتەر، یەکی دیش پەیدا دەبێ. دوای ئەویش یەکی دی. هەر سێ ماوەیەکی درێژ بە سەر گوند، گردەکەی شەڕڤانان، چەم و دارستان و دەور و پشتی گونددا دەفڕن و دواییش هێدی هێدی دانە دانە ون دەبن.

چەکدار خێرا مەخزەنی کلاشینکۆفەکەی دادەنێتە بەر دەمی خۆی

و دەڵێ «ڕێناس، زووکە بە هەڤاڵان بڵێ، با کەس نەجووڵێ؛ کەس بەهیچ لایەکدا نەڕوات. با هەرکەس چەک و فیشەکدانی خۆی ئامادە بکات و چاوەڕوان بێت...». ڕێناس وەک مارێک بە بن بەردەکاندا دەڕوات و ون دەبێ.

لەم کاتەدا دەنگێکی تر دێتە بیستن. دەنگێک وەک دەنگی مۆتۆڕ و مەکینە. چەکدار بەرز دەبێتەوە و بە دووربین سەیری ئەو لا دەکات کە دەنگ لەوێوە دێت. ئەوەندەی چەند خولەک هەروا بێدەنگ دەڕوانێ و دواییش دەڵێ «بەڵێ، وەک ئەوەی مەزندەم کردبوو...» دەنگ زیاتر دەبێ. دوو شەڕڤانەکەی دیش لە پاڵ چەکدارەوە بە دووربین سەیر دەکەن. کۆتر خۆی پێ ڕاناگیرێ، ئەویش بە مەراقەوە بە دووربین سەیر دەکات. بەڵێ کامیۆن. کامیۆنی خاکیی سەربازی. یەک، دوو، سێ، چوار... لە نێوان هەر دو کامیۆنیشدا جیپێکی بچووکی سەربازی. کامیۆن بە پاڵ دار و دارستاندا، بە ڕێگەی گونددا ئارام بەرەو گوند دێن. کۆتر دووربین دەچەرخێنێ بەلای گونددا. ئەمجار لە گوند هات و چوونێک دیارە. گوندی کەوتوونەتە جموجۆڵ، پیاوانی ناو بێستان بەرەو گوند هەڵدێن، ژنێک کە دوو سەتڵی بە شانەوەیە خێرا دەچێتە حەوشەی ماڵەکەی، سەتڵەکان لە حەوش دادەنێت و هەڵدێتە ماڵەوە و دەرگاکە دادەخات. دوو ژنی دی دەستی دوو منداڵ دەگرن و بە پەلە بەرەو ماڵ دەڕۆن. پیرە پیاوێکی گۆچان بەدەست بە شوێن ئەو ژنەدا دەچێتە ناو ماڵ و دەرگاکە دادەخات.

کامیۆن دێن. گوند چۆڵ دەبێ. هەرکەس دەچێتە ژوورەوە و دەرگا دادەخات. «قشقرە دێن، قشقرەی ڕەش..» ڕێناسە. ڕێناس گەڕاوەتەوە و لە پاڵ کۆتردا سەیری گوند دەکات، دەنگی هەیەجانێکی تێدایە. چەکدار دەڵێ «ڕێناس خێراکە با ئاپیی جی و بی کەی سی بێن بۆ ئێرە، با هەرکەس ئامادە بێ...خێرا کە...».

کامیۆن دێن و لە مەیدانی گوند ڕادەوەستن. سەرەتا شەش سەرباز و دە گوندیی کە هاوکاریی و پێشەنگیی سەربازەکان دەکەن، لە کامیۆن دادەبەزن و چەکی قورس بە دەستەوە لە سووچەکانی مەیدان بڵاو دەبنەوە. دواتر سەربازی دی دادەبەزن. بە جل و بەرگی سەربازیی خاکی و گوڵ گوڵی کە هی خۆ حەشاردانە. بە چەکی قورسی ئاگر تێبەردان و سووتاندن و کوشتنەوە. بە پۆستاڵی چەرمیی درێژەوە. بە جموجۆڵی بەهێز، قایم، لە خۆ ڕازی و بەخۆ باوەڕەوە. بەتایبەت جل و بەرگەکانیان؛ جل و بەرگی شەڕ، سووتاندن، لێدان و کوشتن. هی ترس و سام. هی فەرمانی سەربازی. جل و بەرگی سارد و غەریب کە لە مرۆڤ و گەرم و گوڕیی مرۆڤەوە زۆر بەدوورە. ترسێکی قووڵ دەکەوێتە دڵی کۆتر. زیاتر لە سەد سەرباز لە کامیۆنەکان دادەبەزن. پاشانیش دوو ئەفسەر لە جیپێکی بچووک دادەبەزن. ئەفسەر بە دەست هێما بۆ هەندێک شوێنی گوند دەکەن و هەندێک شت دەڵێن. سەرباز بە گونددا بڵاو دەبنەوە.

کات بەرەو عەسر دەڕوات. چەند پەڵە هەوری خۆڵەمێشی لە ناو ئاسمانی کەمێک شیندا دەجووڵێن. خۆر و تیشکی، لە پشت سەری شەڕڤانانەوە هێدی هێدی دادەگەڕێ. نەرمە سوورایییەک، دەر و دەشت دەگرێ. تیرێژ بە سەر چەمەوە دەدرەوشێتەوە. خۆر بە سەر بەردی ڕەشی خانووەکانی گوندەوە بریقەی دێت. گەڵای داران کە بە نەرمەی بای پاش نیوەڕۆ کەوتوونەتە جووڵە، سوور دەچنەوە. باڵندە دەفڕن. چەند ئەسپ و جوانوو دوورتر لە گوند لە ناو زەوییەکانی گونددا، دەحیلێنن و لە گوند، لە نێوان خانووەکاندا سەرباز هەڵدێن. ترس و سام، گوند و دەور و پشتی گوند دەگرێتەوە. سەرباز دەچنە ناو ماڵەکان و قیژە و هاوار دەست پێدەکات. سەرباز خەڵکی گوند لە ماڵەکان دێننە دەرەوە و بە زۆر و لێدان دەیانهێنن بۆ مەیدانی گوند.

کچ، ژن، منداڵ، پیر و بەساڵاچوو، پیاو و کوڕ هەمو تێکڕا لە مەیدانی گوند خڕ دەکرێنەوە. پیر و بەساڵاچوو لە زەوین. پیاو، ژن و کوڕ دەست و سەریان لە پێشەوە، بە پێوەن. نزیکەی سەد- سەد و پەنجا کەسی هەژاری گوند، ترس لە سەر ڕوخسار و لە ناو چاویان، ئێستا لە مەیدانی گوند کۆ بوونەتەوە. یەک لە ئەفسەرەکان دێتە پێشەوە، دەستی لە سەر دەستەی دەمانچەکەی، مەغروور، پۆستاڵی ڕەشی درێژی تا سەر ئەژنۆ، بە قیرەقیرِ بۆ کۆمەڵی هەژاری گوندی قسە دەکات. ئەو ماوەیەک هەروا دەپەیڤێ.

«ئەحمەق» ڕێناسە کە گەڕاوەتەوە و وا دەڵێ «ئەحمەقی کوڕی ئەحمەقان...» ڕێناس پێدەکەنێ، «ئەو وا دەزانێ کە خەڵکی گوند لە زمانی ئەو تێدەگەن... ئەحمەق... بە زمانی خۆی قسە دەکات، ئەگەر بە ڕۆژانیش قسە بکات، گوندی هیچی لێ تێناگەن. ئەو هێشتا تێنەگەیشتووە کە خەڵکی گوند زمانی ئەو نازانن...»

دوای ئەوەی ئەفسەر گوتاری درێژی تەواو دەکات، سەرباز، چوار لاوی گوند لە ڕیز دەهێننە دەرەوە و لە سەر زەوی پاڵیان دەخەن و بە تفەنگ و قۆنداخی تفەنگ تێیان بەر دەبن. سەرباز لەوان دەدەن. ژن دەقیژێنن. کچ دەگرین. دوو پیرەژن هەوڵ دەدەن خۆیان بدەن بە سەر کوڕەکاندا. بەڵام سەرباز شانیان دەگرن و دەیانخەنە لاوە. لە ناکاو یەک لە لاوەکان لە ژێر دەستی سەرباز ڕزگاری دەبێ و دەست بە هەڵهاتن دەکات. لەو کاتەدا دەنگی تەقەیەک دەبیسترێ. لاوەکە لە جێدا ڕادەوەستێ. بە پێوە. چەند چرکەیەک ڕادەوەستێ و دواتر بە هەنگاوی ئارامەوە بێ ئەوەی بگەڕێتەوە و سەیری دواوەی خۆی بکات، بەرەو ئەو لایەی کە هەڵدەهات، چەند هەنگاو هەڵدەگرێ. دیسان دەنگی تەقەیەکی دی دێت. بە دوای ئەوەشدا ئەمجار شتێک دەتەقێ. جموجۆڵی گوند ڕادەوەستێ. دەنگی سەربازان تەواو دەبێ. و بە ئارامی دەرگای جیپ دەکرێتەوە و

پیاوێکی باڵا بەرزی ڕێک و پێک دادەبەزێ. پیاوەکە بە ئارامی دادەبەزێ، هەنگاو بە هەنگاو دێتە مەیدان و سەیری دەور و بەری دەکات. پیاوەکە چل و بەرگی مەدەنیی ناوچەکەی لە بەرە. سمێڵ و کەمێکیش ڕیشی هەیە. بە هاتنی ئەو، ئەفسەر بەژن ڕاست لە پێشی دەوەستن.

«باز». چەکدار، دۆشداماو وا دەڵێ «ئەوە بازە، من دەیناسم، ئەوە بازە...» بە هاتنی ناوی باز، جموجۆڵێک دەکەوێتە ناو شەڕڤانان. شەڕڤان دەکەونە پچەپچ...باز...سەرۆکی مردن و کوشتن...باز فەرماندەی ئەم شەڕە وێرانکەرە... باز؛ ناوی ئەفسانەیی گوڵی خوێن...

«سەیرە بازیش هاتووە، بازیش لەگەڵ ئەوانە!»

ئێستا بۆ یەکەم جار کۆتر چاوی بە باز دەکەوێ. ترسێکی نادیار و بێ پێناسە دەکەوێتە دڵی کۆترەوە، بە دووربین لە باز دەڕوانێ. ئێستا باز بە بەژن و باڵایەوە لە پێش چاوی کۆتردایە؛ پیاوێکی باڵابەرز کە تەمەنی لە نێوان چل- چل و پێنجدایە. مەغروور، سەنگین، نیگایەکی وشیار، ژیر. بۆچی باز؟ وەک باڵندەی باز دڕندە و گۆشت خۆرە؟ دووربین و بەهێز؟ باڵندەی باز؛ بە بەرزاییەکانی ئاسمانەوە، باسک کراوە، سینگ و دەنووک بەرەو نێچیر، مەغروور؟ ئەی چاو؟ چاوی بچووک وەک تەیری باز؟ باز؛ باڵا، بەژن، قامەت، پێکەوتە، بەهێز و وەک شەڕڤانان، ئەسمەر.

ڕێناس کەمێک خۆی لە فەرماندار چەکدار نزیک دەکاتەوە و دەڵێ «ئەم دەرفەتە لە دەست نەدەین، پێویستە شتێک بکەین. باز، ئەفسەر و سەرباز هەموویان لە ناو مەنزڵی ئێمەدان. دەتوانین هەموویان بکوژین...».

«نا، چەکدار، برا، من لۆژیک دەزانم. ئەگەر ئێمە بە لێدانێک هەموویان بکوژین و خێرا بکەین، پێش هاتنی کۆپتەرەکان، خۆمان دەگەیەنینە چەم و چیا... با لێیان دەین... مەگەر ئێمە بۆ کەمین نەهاتووین؟

سەیری ئەم دەرفەتە باشە بکە کە سەرۆکەکەشیان لەگەڵیاندایە...»

چەکدار بە دووربین سەیری دەور و بەر دەکات و دەڵێ: «نازانم... باوەڕ ناکەم... با چاوەڕوان بین بزانین چی دەبێ...»

لە مەیدانی گوند باز قسە ناکات. ئەو لە دەوری خۆی دەڕوانێ، چەند خولەکێک سەیری گوند، گوندییان و دەور و پشتی گوند دەکات و پاشان دەستی ڕاستی هەڵدێنێ و خانووەکانی گوند نیشان دەدات. ئەمجار ئاگر دەست پێدەکات. ئەمجار ئاگر دەبارێ. بە فەرمانی باز، سەربازەکان بە خێرایی برووسکە دەبنە سێ دەستە. دەستەیەک لە مەیدان گوندییەکان گەمارۆ دەدەن. دەستەیەک چاوەدێریی دەور و پشتی گوند دەکەن و دەستەی سێهەمیش دەچنە حەوشی ماڵان. ئەم دەستەیە کە با بڵێین سی کەس دەبن، بە چەکی قورس، ئاگر بە سەر خانووەکاندا دەبارێنن. ئاگر، گوڕ گوڕ لە لوولەی چەکەکانیانەوە دێتە دەر و ماڵان دەگرێ. خانوو، ماڵ دەسووتن. دەرگا، پەنجەرەکانی خانووەکان، بانی کا و قوڕ، ئاخوڕ و کادێنەکان دەست بە سووتان دەکەن.

کۆتر دەڵێ: «ماڵی من...»

حەوش و حەسار دەسووتن. دار، بەرد، دارستان، دەوەن دەسووتن. گوند و دەور و پشتی گوند دەبێتە بەندەری ئاگر. لە سەر لە ئێوارەی بەهارێکی گەشدا، دەنگی چەک دەر و دەشت داگیر دەکات. تەقە تەقی چەک و گوللە لە دڵی سرووشتدا ئۆلان دەدات. ئۆلانی دەنگی چەک و فیشەک بە سەر گوند، دار، دارستان، چەم و شاخەکاندا بەرز دەبێتەوە. هەموو دەشت پڕ دەبێت لە دەنگی چەک. ئاسمان هەمووی پڕ دەبێ لە دووکەڵی سووتانی خانووەکان. ئاگر زۆر دەبێ، گوڕتر دەبێ، دووکەڵ و دوومان بەرزتر دەبێتەوە. ڕەشایی دەگاتە هەورەکان، بۆنی سووتان و پزیسکی ئاگر هەموو شوێنێک دەخنکێنێ. هەموو جێگەیەک دەسووتێ؛ داری سپیدار و بی، دەوەنی چڕی کورت، گوڵ و گوڵخونچەی چوار دەور

دەسووتێن. تەیر و باڵندە دەدەن لە شەققەی باڵ و دوور دەکەونەوە. حەیوان هەڵدێن، سەگ، پشیلە، کەر، جاش، ئەسپ، جوانوو، مەڕ، بزن، کاریلە، بەرخ، دەوار، مریشک، کەڵەشێر هەڵدێن. تەنیا خەڵکی گوند ناتوانن هەڵبێن. ئەوان وەها لە ناو چەنبەری ئاگردا سەیری سووتانی خانووەکانیان دەکەن.

«ماڵی من..» کۆتر دڵشکاو، دۆشداماو، بە بێزاری و خەمگینییەوە دەڵێ... «ماڵی من...» چەکدار، ڕێناس، شەڕڤانی دی بە خەمێکی قووڵەوە وا دەڵێن.

چەند پیرەژن لە تەنیشت کۆمەڵی گوندییەکان لە مەیدان خۆیان دەدەن بە زەویدا و دەست بە قیژە و هاوار دەکەن. «هەیڕۆ!.. هەیڕۆ!...» دەنگی «هەیڕۆ»یان ئۆلان دەدات. دەنگدانەوەی دەنگ بە شوێن یەکدا تاوەکوو شاخەکان دێت. تەنیا «هەیڕۆ» دەبیسترێ، نەک قسەکانی دی، تەنیا «هەیڕۆ»... قیژە جار جارە بەرز دەبێتەوە، لە ناکاو دەبڕدرێ ودیسان دەست پێدەکات و بەرز دەبێتەوە. قیژە، قیژەی پیرەژنان؛ دەنگی ژانە، ژانی دڵ، ژانی گەلێکی بێ پشت و پەنا. ژانی سالان، سەد سالان. قیرە؛ دەنگی کەوتن، شپرزەیی و بندەستی. دەنگی کەسەر و خەم. قیرە؛ دەنگدانەوەی هاوارێکی بێ هیوا. هاوار، هاوار، قیرە، سترانێک، سترانی مردن. سترانی سووتان و ونبوون. سترانێکی سارد، پڕ سام. سترانی وڵاتی چیا...

«ماڵەکەم»کۆترە دەگری و دەڵێ «ماڵی من، سترانی وڵاتی چیا، ماڵی من...»

ڕێناس کە لە نێوان کۆتر و فەرماندە چەکداردایە لە توورەییدا مووی سمێڵی دەخوات، جەستەی دەلەرزێ، دەڵێ: «چەکدار، برا، ڕێگەمان بدە، لە پێش چاوی ئێمەدا گوندێک دەسووتێنن، خەڵکی ئێمە دەچەوسێنن. ڕێگەمان بدە، با هەموویان بکوژین...»

بە شوێن قسەکانی ڕێناسدا، شەڕڤانانی دیکەش پشتگیری دەکەن و دەڵێن «ئەوان ناتوانن ڕزگار بن».

«بڵێی ئێمە بتوانین هەموویان بکوژین؟» چەکدار بە دووربینەوە نیگای لە سەر جموجۆڵی گوند دەپرسێ «بە لێدانێک بیانکوژین و بە خێرایی پاشەکشە بکەین؟»

ڕێناس دەڵێ «بەڵێ، خەمت نەبێ تا کۆپتەرەکان بێن، ئێمە دەگەینەوە چیا...»

«بەڵام ئێمە زۆر لە چیا دوورین»

«نا، نا خۆمان دەگەیەنین...»

«کەواتە ئامادەکاری بکەن. باز... ئامانجی یەکەم بازە. کێ لێیدەدات؟»

ڕێناس؛ «من، من بە گوللەیەک مێشکی بڵاو دەکەمەوە.» شەڕڤان خێرا دەست بە ئامادەکاریی هێرش دەکەن. دووان دووان و سیان سیان لە دەور و بەری بەرزاییەکانی گردەکە، لەو شوێنانەی لە کەپر دەچن، دادەنیشن و لوولەی چەکەکانیان بەرەو گوند دەکەن.

چەکدار؛ «ئاگاتان لە خەڵکی گوند بێ. باز، ئەفسەر، کامیۆن، سەرباز و گوندییە جاشەکان ئامانجن. دەبێ کەس ڕزگار نەبێ. دوای فیشەکی ڕێناس گوللە باران بکەن.» ڕێناس سمێڵی با دەدات، چەند جاران پەنجەکانی دەبەستێ و دەیکاتەوە، ملی دەتەقێنێ. قەناسی دووربین دار لە هاوڕێکەی تەنیشتی وەردەگرێ، بۆ نیشانە دادەنیشێ. ئەو بە دووربین لوولەی تفەنگەکە میزان دەکات، چەند جاران هەناسەی قووڵ هەڵدەکێشێ و دەیداتەوە، ئەنگوستی ئاماژەی دەستی ڕاستی بە ئارامی دەچێتە سەر پەلەپیتکەی تفەنگەکە. بەڵام دەستی پێدا نانێت و ڕادەوەستێ.

باز دەجووڵێ. ئەو دەڕوات بۆ لای ئەفسەرەکان و لەگەڵیان قسە

دەکات. دواییش، دیسان هەندێک لە ئەفسەرەکان دوور دەکەوێتەوە. لەم کاتەدا ڕێناس بێ سەبر و بیر کردنەوە، دەست بە تفەنگەکەدا دەنێت. ئەمجار دەنگی تەقەیەکی قووڵ و درێژ بە سەر هەموو دەنگاندا زاڵ دەبێت. بەڵام فیشەک لە باز ناکەوێ، کاتێک ڕێناس تەقە دەکات، بازیش دادەنەوێتەوە و شتێک لە زەوی هەڵدەگرێ. لەگەڵ تەقە باز خۆی دەدا بە زەویدا. ڕێناس دەڵێ «ئای داخەکەم» و دیسان تەقە دەکات. باز لە زەوی خۆی دەتلێنێ. لەگەڵ تەقەی تفەنگی ڕێناس دەنگی چەکی شەڕڤانانی دی، حەشرێک بەرپا دەکات. دەنگی ئار پی جی، بی کەی سی، کلاشینکۆف و تفەنگ دەور و پشتی گوند کە خۆیشی دەسووتێ، دەکاتە جەهەننەم. سێ ڕۆکێتی ئار پی جی بە سێ کامیۆندا دەتەقنەوە. پارچەکانی کامیۆن بە هەوادا دەفڕن. سەربازانی دۆشداماو لە ژێر بارانی گوللەدا، وەک گەڵای داری پاییزی، دەڕژێنە زەوی. هەر دوو ئەفسەرەکەش لە زەوییەوە دەگلێن. لە ژێر گوللەباراندا سەرباز ناتوانن دەست بکەنەوە. گوللەبارانی بێوچان بە جارێک سەربازانی سەرسووڕماو لە دەست و پێ دەخات. ئەو سەربازانەی دەوری گوندیان گرتووە، نازانن چی بکەن. سەرەتا بەرەو خانووەکان هەڵدێن. لە بەر گڕی ئاگری خانووەکان، دەگەڕێنەوە و بەرەو زەوییەکان هەڵدێن. بەڵام گوللەیان هەر پێدەگات. سەرباز یەک بە یەک لە زەوی دەگلێن. تەنیا سییانیان دەگەنە سەر کانییەکە و خۆیان هەڵدەدەنە پشتی کانی. بەڵام ئار پی جی، دەور و پشتی کانیش دەکاتە جەهەننەم.

کۆتر، ئیستا وەک ئەوەی لە سەر خۆ چووبێ، بە کلاشینکۆفە کۆنییەکەی کە بریقەی دێت، گوللە دەبارێنێ. کە گوللەباران دەست پێدەکات، وەک دەنگی هەور دێتە بەر گوێی کۆتر. ئەو هەورانەی گرمە گرم دەکەن، ئەو هەورانەی بە با و بۆرانەوە دەبارن، بەڵام کاتێک کەوتنی سەربازەکان دەبینێ، ئەو کات بیری دێتەوە سەر دەنگەکان.

ئەمجار دەزانـێ کـە دەنگـی مردنـە [ئـەم دەنگانـە]. سـەرباز دۆشـداماو، تارومـار، پـەرش و بـڵاو، هـەوڵ دەدەن بـە لایەکدا هەڵبێـن، بـەڵام بـەرەو کوێ؟ هەمـوو شـوێنێک ئاگرە. سـەرباز بە نـاو یەکدا بـێ ئـەوەی بیریـان بچێتـە سـەر شـتێک، بـە خێرایـی هەڵدێـن- تاوەکـوو فیشـەکێک یانیـش چەنـد فیشـەک لـە سـەر و جەسـتەیاندا برینـی قووڵـی غـەدداری مـەرگ دەکاتـەوە. کۆتـر دەبینـێ؛ سـەرباز، حەیـوان، گوندیـی بـە قیـڕەوە دەگلێـن. هەندێکیـان دوای کەوتـن دیسـان هەڵدەسـتنە سـەر پـێ و دەیانهـەوێ هەنگاوێـک هەڵبگرن، چەنـد هەنگاویـش هەڵدەگرن، بـەڵام لەگـەڵ تەقەیەکـی دی، دیسـان دەکـەون. هەندێکیشـیان لەگـەڵ دەنگـی تەقـە وەک باڵندەیـەک دەکەونـە باڵەفرتـە و دواتـر دەگلێنـە زەوی. دەسـت، پـێ، شـان، لاق، سـەر هـەر کامـەو بـە لایەکدا دەفـڕن و دەنـگ، دەنگـی تێکـەڵ، دەنگـی یەکجـار سـەیریان لێـوە دێـت. کۆتـر دەڵـێ «ماڵـی مـن» و گولـلە دەبارێنـێ. هەمـوو بەدەنـی ئارەقـەی دەرداوە، قوڕگـی لـە بۆنـی سـووتان و بـاروووت دەکزێنێتەوە، چاوەکانـی دەگریـن و دەڵـێ «ماڵەکـەم» و بـە تفەنگەکـەی کـە ئێسـتا گـەرم بـووە، تەقـە دەکات.

هەتـا کـەی؟ کـەس نازانـێ، بـەڵام بـە دەنگیـک کۆتـر، ڕێنـاس و دیترانیش بـە خۆیانـدا دێنـەوە؛ «زوو ئێـرە بەجـێ بهێڵـن... زوو ئـەم شـوێنە چـۆڵ بکـەن، زووکـەن زوو...»

شـەڕڤان بـە پەلـە خۆیـان کـۆ دەکەنـەوە، چـەک، فیشـەکدان و جانتـا و شـتەکانیان دەدەنـە یـەک و لـە شـاخەکە دێنـە خـوارەوە. بەهەڵاتـن بـەرەو چـەم، بـەرەو چیـا دەڕۆن. پـەرش و بـڵاو لـە نێوانیانـدا مەودایەکـی زۆر. کۆتـر دەکەوێتـە شـوێن ڕێنـاس. کۆتـر، دار، بـەرد، چێـو، زیـخ، چـاڵ و قوڵکـە دەداتـە بـەر و هەڵدێـت. کلاشـینکۆفەکەی کـە ئاگـری دەباراند، بـە دەسـتییەوە، جەسـتە، سـەر و قوڕگـی تایەکـی سـەیری گرتـووە، هەڵدێـت و دەڵـێ «ماڵـی مـن». ماڵـی مـن، لـەم سـەر لـە ئێـوارەدا مـردن، سـووتان،

باڕووت، فیشەک، لە دەست دان، حەسرەت، خەم، ترس و خوێن، ویست، خواست، قین و نەفرەت. ماڵی من، ڕق و نەفرەت، کۆکی* ئەم وڵاتە بێچارە، بێکەسە، ئەم وڵاتی بێبەختی مەرگە... هەڵێ، خێراکە...ڕەو، پەلە، هەڵهاتن... چارەنووسی ئەم وڵاتە خوێنینە. دووکەڵ و دوومانی ئاگر لە پشتەوە، هەور و تیشکی خۆر لە پێش، هەڵبێ، کۆتر هەڵێ. کوا باڵندە؟ کوا ئارامی؟ کوا هێمنی؟ خێراکە کۆتر خێراکە. ئەو گۆرانییە، گۆرانیی مردن، گۆرانیی سووتان، ماڵی من. ڕوخساری ئەوان، ڕوخساری ئینسانی داماو، بێچارە، بێپەنا. ڕوخساری ئەوان کە دەمرن، ماڵی من... ڕوخساری ئەوانەی لە خوێندا دەگەوزێن، ماڵی منی... کوا هیوا؟ کوا ڕووناکی؟ ماڵی من...

«کۆتر خێرا کە» ڕێناسە دەگەڕێتەوە و بە سەریدا دەقیرێنێ.

کۆتر خێرا دەکات. بەڵام دەنگ دێ. لە هەورەکانەوە، لە ئاسمانەوە. کۆتر خێرا دەکات. بەڵام دەنگەکان لە کۆتر خێراترن.

«کۆتر خێراکە کۆپتەرەکان هاتن...»

دەنگ دێت. کۆپتەر دێت. دەنگێکی تیژی وەک فیکە دێت. بە دوای دەنگی فیکەدا دەنگی تەقینەوەیەک دێت. کۆتر هەڵدێت.

«کۆترا کاتێک دەنگی فیکە هات، خۆت بدە بە زەویدا...»

جارێکی دیش دەنگی فیکە دێت، کۆتر خۆی دەدا بە زەویدا. تەقینەوەیەکی بێپایان ساز دەبێت. کۆتر هەروەها لە زەوی سەیری دەور و پشتی دەکات. سەد- سەدو پەنجا مەتر دوورتر لەم دووکەڵێکی چڕ لە خاک بەرز دەبێتەوە. کۆتر هەڵدەستێ و هەڵدێ. دیسان دەنگی فیکە. ئەمجار شەپۆل شەپۆل ڕاست بەرەو کۆتر. کۆتر دیسان خۆ فڕێ دەدات. تەقینەوە. کۆتر زیندووە؟ هەست بە چی دەکات؟ خۆی دەجووڵێنێ، نا هیچی لێ نەهاتووە. سەیری ئەو شوێنە دەکات کە

* ڕەگ، ڕیشە.

دووکەڵـی لـێ هەڵدەسـتێ. دوو سـێ شـەڕڤان لـە سـەر زەویـن. یەکیـان دەنگـی کچێکـە دەقیرێنـێ «لاقـم، لاقەکانـم...» کۆتـر چـی بـکات؟ بـەرەو شـەڕڤانەکان بـڕوات؟ هـەر لـەو شـوێنەدا پـاڵ کـەوێ؟ هەسـتێ و هەڵبـێ؟ ئـەو نازانـێ، نـا نازانـێ. بـەڵام لـە نـاکاو دیسـان هەڵدەسـتێت و هەڵـدێ. دەنگـی تێکەڵـی فیکـەکان لـە نزیـک و دوورەوە. بەهێـز و نـزم هـەر دێـن. لـە بـەر تەقینـەوە و دووکـەڵ ئیـدی کـەس کـەس نابینـێ. بـەڵام کۆتـر زینـدووە، هیچـی لێنەهاتـووە. پێدەکەنـێ و دەڵـێ «هیچـم لێنەهاتـووە». نـا، ناڵـێ، هـاوار دەکات «هیچـم لێنەهاتـووە». دیسـان دەنگـی فیکـە بـەڵام ئەمجـار یەکجـار نزیـک، شـەپۆل بـە شـەپۆل دێـت. کۆتـر دەکـەوێ. دەنگـی تەقینـەوە و داڕووخانێـک لـە پشـت کۆتـرەوە دێـت. هەندێـک لـەو لای کۆتـرەوە دارێکـی ناوقـەد ئەسـتوور دەسـووتێ. بۆنێکـی قورسـی سـووتان و بـاڕووت دەگاتـە لووتـی کۆتـر. سـەیری بەردەمـی دەکات. چەمەکـە دوور نییـە. ئەگـەر بتوانـێ جارێـک، دوو جـاری دی هەڵبێـت خـۆی دەگەیەنێتـە چـەم. هەندێـک هەڤـاڵ گەشـتوونەتە قەراخـی چـەم. ئەویـش دەبـێ بـگات. هەڵدەسـتێتە سـەر پـێ و بـە هەمـوو توانـای خـۆی هەڵدێـت. وەک کارمامزێـک. وەک باڵندەیـەک دەفـڕم، کۆتـر بـە خۆشـحاڵییەوە بیـر دەکاتـەوە. ڕەو، فڕیـن و دیسـان دەنگـی فیکـە. ئەمجـار یەکجـار نزیـک، یەکجـار بەهێـز.

لەگـەڵ ئـەم دەنگـە دواییـە ئیـدی کۆتـر هەڵناسـتێتەوە. وەک ئـەوەی کەسـێک دەسـتی بردبێتـە دەروونـی و هەمـوو هێـز و توانـای لـێ سـەندبێ وەهـا بـێ توانـا دەکەوێـت. هەناسەشـی لـە بـەر دەبـڕێ. ئایـا برینـدار بـووە؟ ژانێـک، تەنیـا ژانێکـی تەنـک و باریـک لـە کەلەکەیدایـە. ئایـا ئـەوە ژانـی برینـە، ئێشـی کەوتـن و هەسـتانە؟ تەزوویـەک بـە سـەریدا دێـت و دەڕوات. ئارەقـە؟ خوێـن؟ کۆتـر دەسـت دەبـات بـۆ ناوقـەدی خـۆی، بـۆ ئـەو شـوێنەی ئـازاری هەیـە. دەسـتی تـەڕ دەبـێ. ئارەقەیـە؟ نـا، خوێنـە. دەسـتی خوێنـاوی دەبێـت.

خوێن. لە سەر خاکی ڕەش، نا خاکی ڕەش نا، خاکی شین، خوێن. خوێنێکی سووری تاریک، کەمێک تاریک. کۆتر پێدەکەنێ و دەڵێ؛ من بریندارم. لەو ژانە باریکە زیاتر هیچ ئازارێکی نییە. خۆی دەجووڵێنێ. لاق، دەست، سەر و بەدەنی دەجووڵێنێ. هۆشی لە سەر خۆیە. کۆتر پێدەکەنێ. خاک، خاکی ڕەشی وڵاتی چیا. خاکی کەونارا، خاکی کۆن، خاکی شەڕ و پێکدادان. خاکی ناڵین و گازندان. خاکی سترانی مردن، وشەی خەم. کۆتر ئێستا هەستی پێدەکات؛ ئەو ماندووە. خاکی ماندوویەتی، خاکی کارەسات. خاکی بە خوێن ئاو دراو. خاکی خەونان، خاکی تاریک... هەور، ئاسمان و خاک و لە سەر خاکیش کۆتر و خوێن. خوێنی کۆتر.

پاشان دونیا تاریک دەبێ. تین و ڕووناکی، هێز و توانا لە کۆتر دوور دەکەونەوە. دەنگی فیکە، قیڕە و چەکیش لێی دوور دەکەونەوە. بێدەنگی دێت. شەو دێت. پەردەی ئارامیی دەکشێت. بێدەنگیی تاریکی دێت و کۆتر لە ئامێز دەگرێ. بێدەنگییەکی قووڵ باڵ بە سەر دونیادا دەکێشێ. تاریکی دەر و دەشت دەگرێتەوە. لە بێدەنگی و تاریکی زیاتر ئیدی هیچ نییە.

کۆتر لە ناو تاریکی و بێدەنگیدا ون دەبێت.

# ١١

## ترس

باز و کۆتر.

یەکتـر بینینـی سـەیریان لـەو گونـدە کـە دەسـووتا. لـە نـاو ئاگـر و شـەڕدا. یەکەمجـار – ئەگـەر جـاری پێشـووی کـۆچ و لـە دایـک بوونـی تەمەنێـک پێـش ئێسـتا نەیەنینـە ئەژمـار.

چەمـی وڵاتـی چیـا. چەمـی ڕۆژهـەڵات و چەمـی ڕۆژئـاوا. ئـەو چەمانـەی لـە دڵـی چیـاوە سـەرچاوە دەگـرن و بـەرەو خـوار، بـەرەو ئـاو و دەریـای نەنـاس دەڕۆن. سەرشـێت، پـڕ پێـچ و خـەم. نازەنیـن. هـار. جارجـارە مەنـد، جارجـارەش خـوڕ. ئـەو چەمانـەی کات و ڕۆژگار، دەور و دەوران تێپـەڕ دەکـەن و دەڕۆن.

چەمـی ڕۆژهـەڵات و چەمـی ڕۆژئـاوا؛ ئـەو چەمانـەی لـە دەشـتێکی بـێ سـەر و بـن و زەرددا دەگەنـە یـەک، دەبنـە یـەک و پێکـەوە دەڕۆن بـۆ دەریـای دوور و لـە دڵـی دەریـادا ون دەبـن.

ئێسـتا لـەم قۆناغـە نوێیـەی بەسـەرهاتی بـاز و کۆتـردا، ڕۆژگارێکـی نـوێ دەسـت پێـدەکات. ڕۆژگارێـک لـە ڕۆژگارە بـێ ئەژمـارەکان، ڕۆژگارە بـێ کۆتاییەکانـی ڕووبـارەکان. کات؛ دوو مانـگ دوای گلانـی کۆتـرە. شـوێن، ئـەو پادگانـە سـەربازییەیە کـە بـاز وەک حەشـارگە بـەکاری دێنـێ. ئـەو

پادگانە سەربازییەی کە ئێمە لە بەشی پێشووتری ڕۆمانەکەدا لەگەڵ باز لەوێ بووین.

ئێستا ئێمە دیسان لەوێین. لە ژێرزەمینی پادگان، شوێنی زیندان و ئەشکەنجەدان. پادگان نەگۆڕاوە، هەر وەک خۆیەتی. بەڵام چەند کەسێکی پێ زیاد بووە؛ کۆتر. کۆتر ئێستا لە پادگانە.

کۆتر لە پادگان گیراوە.

کۆتر لە پادگان لە ژوورێکی بچووک و تاریکدا زیندانییە.

کۆتر لە پادگان لە ژوورێکی تەنگ و تاریک و لە زیندانێکی گەنیودا، لە ژێر ئەشکەنجەدایە. ئەمڕۆ دوا ڕۆژی کۆترە. ئەگەر ئەمڕۆ قسە نەکات و هیچ نەڵێ و نەبێتە هاریکاری سەربازەکان، دەیکوژن. وەهایان پێ گوتووە.

ئێمە ئێستا لە لای کۆترین. لەو ژوورە تەنگ و تاریکەی کە ئەوی تێدایە. ژوورەکە چۆڵ و ڕووتە. لە تەختێکی شەق و شڕ و تەق و ڕەقی نووستن کە دۆشەکەیەکی پووشی خوێناوی و ئارەقاویی چڵکنی لە سەرە، زیاتر، هیچی تێدا نییە. ژوورێکی بۆگەن کە بۆنی قورسی خوێن، میز، ئارەقە و شێی لێدێت. کۆتر ئاگای لێ نییە بەڵام ئەوە دوو مانگە کە لەم ژوورەدایە. لەو ڕۆژەوەی کە سەربازەکان ئەویان بە بریندار و بوراوەیی، لەسەر خۆ چوو، لە ناو خوێن لە قەراخی چەمەکە هەڵگرت و هێنایان، تا ئێستا هەر لەم ژوورەدایە. ژووری کۆتر، شوێنی نوێی ئەو؛ پزیشکەکان کۆتریان لەم ژوورەدا دەرمان کرد. ئەو لێرە ژیانی پێ بەخشرایەوە، لێرە چاوەکانی کردەوە و زانی کە هێشتا زیندووە. لێرە ئاخی هەڵکێشا و گوتی «خۆزگە دەمردم و نەدەکەوتمە دەستی ئەمانە» برینی قووڵ و پڕ ئازاری ناوقەدی، لێرە هاتەوە یەک و هێدی هێدی ساڕێژ بوو. ئەو، لێرە، دوای ئەوەی کەمێک باش بوو، بێحەد و ئەژمار ئەشکەنجە درا کە پێویست ناکات

لێرەدا باسی ئەوە بکەین. ژووری بۆگەنیوی کۆتر، ژووری ژێر زەوی، ئەو ژوورەی کە هەرگیز ڕووناکی نابینێ، هەرگیز هەوای خاوێنی پێ ناگات. ژوورێک کە بۆنی قین و نەفرەت، مەرگ و کوشتنی لێ دێت. ژوورێک کە تەنیا ئەو کاتانەی کە ئەفسەر و سەربازی لێیە، ڕۆشن دەبێتەوە. ژوورێک -کە تەنیا ترس، سام و خۆفی لێ هەڵدەقوڵێ، کە لە ترس ساز کراوە و بۆ ترسە. ژوورێک کە بە ئارامی زیندانی دەکاتە حەیوان، دەیکاتە بوونەوەرێکی ترساو. ژووری کۆتر؛ سەرەتا، ساڵانی خوێندن لە شاری گەورە، دواتر کات و زەمەنی ئازادیی سەر چیا بەرزەکان و ئێستاش ئەم ژووری تەنگەلانیی بێچارەییە. ژووری کۆتر؛ دیوار، تەنیا دیوار. ئەو دیوارانەی بە بەردی ڕەشی گەورە و چیمەنتۆ ساز کراون. ئەو دیوارانەی دەنگ دەخنکێنن، سەدا دەخنکێنن، بینایی کوێر دەکەن. لەو دیوی ئەو دیوارانەوە چی هەیە؟ کێ هەیە؟ ڕۆشنە؟ تاریکە؟ کۆتر نازانێ. بەڵام لەو دیو دیوارەکانەوە تەنیا دەنگ دێت، دەنگی هاوار، قیژە و لێدان. دەنگێک کە دەنگ و سەدا و هەستەکان دەکوژێت. دیوار؛ پاسەوانی کەوتن و لە بیر چوون. دیواری کەڕ/ کوێر/ لاڵ بوون. دیواری گەنیو و تەمگرتوو کە ترس دەقرێنن. دیوارێک کە هەمیشە، هەر ساتێک، هەر خولەکێک، هەر چرکەیەک دەقیڕێنن؛ زیندانی تۆ بێچارەی، تۆ ورەت لە دەست دەدەی، تۆ ون دەبی، تۆ دەترسێی، تۆ سەر دادەنەوێنی، زیندانی تۆ دەبێ نەبی، دەبێ دیلی من/ ئێمە بی، من و ئێمە خاوەنی تۆین، تۆ دەبێ تەنیا دەستت بدەیتە من و ئێمە، تەنیا دەست بە من و ئێمەدا بێنی... من، ئیمە، تەنیا من و ئێمە، جگە لە من و ئێمە هیچ کەسی دیکە نییە... ئەو دیوارانەی دەقیڕێنن، دیواری ژیانی نوێی کۆتر و هەستەکانی لەم دوو مانگەدا؛ [ورە] کەوتن و داڕووخان، تێکچوون و ون بوون. ئەو ئەشکەنجە و لێدانانەی کۆتر دیویەتی؟ دانە دانە پێویست

ناکات [باس بکرێن] بەڵام خراپترین جۆری ئەشکەنجە و لێدان و غەدارترینیان کە مرۆڤ بتوانێ وێنای بکات. هەموو شێوەیەک، هەمو ڕەنگێک و هەمیشە بۆ تێکدانی ورەی زیندانی. بۆ داڕووخان و خۆ ون کردن و ڕیسوا بوونی...

کۆتر ئێستا دەلەرزێ، دەترسێ. کۆتر بریندار و نەخۆشە. کۆتر کەوتووە؛ بریندار کەوتووە، زیز کەوتووە، دیل کەوتووە*، گەردنی، مەچەکی، دەست و لاقەکانی ڕەش بوونەتەوە. نینۆکی دەست و پێی ڕەش بوونەتەوە. لێوەکانی ترەکیوە، قەڵەشیوە. بەدەنی نیوە ڕووتی ماندووە. هەمو جەستەی ژان دەکات. هەموو جەستەی چڵکی گرتووە. دڵۆپێک هەستی شادی و ئارامی لە گیانیدا نەماوە. چاوەکانی بەستراون. دوو سەربازی پاسەوان، کەمێک پێش ئێستا هاتن و بە دەسرەیەک چاویان بەست. ئەو کچە جوان و قەشەنگە، ئەو جەستە جوان و ڕێک و پێکە، چاو بەستراو، یەخسیر لە زینداندا، لە دەستی فەرماندەکانی زینداندایە. بە دەوریەوە ئێستا چوار کەس هەن. دوای ئەوەی پاسەوان لە ژوورەکە چوونە دەرەوە، ئەم چوارە هاتن. چوار پسپۆڕی ئەشکەنجە کە زۆر حەزیان لە ئەشکەنجەدانە. چوار ئەفسەری وڵاتی مەزن، وڵاتی ژەنەڕاڵ سەردار کە پسپۆڕی کارەکەیانن، پسپۆڕی لێدان، ترساندن و ئەشکەنجە. سێ ئەفسەر و فەرماندەکەیان.

فەرماندەکەیان؛ باز... بەڵێ، ئەو بازەی کە دەیناسین...

باز و سێ ئەفسەرەکەی دی بە پێوە سەیری کۆتری نیوە ڕووت دەکەن. کۆتر کراسێکی ناسکی ڕزیوی لە بەردایە. مەمکەکانی تا

---

* ئەم کەوتنە لە کرمانجیدا چەندین مانا لە خۆ دەگرێت و دەربڕی واتای جیاوازە، لێرەدا واتای بوون دەدات، بریندار بوون، زیز بوون و دیل بوون.بەڵام لە بەر کێش و هەر وەها بۆ ئەوەی بتوانین فەزا و مانای وشەکان وەك خۆیان بگەیەنین، بە شێوە کرمانجییەکەی نووسیومانە.

نیوە بەدەرەوەن. دەست و پێی، ڕان و لاقی ڕووتن. مووی پێ، دەست، پەنجە و لاقی دەرهاتوونەتەوە. کۆتر؛ ڕووت، چاو بەستراو. ئێستا ئەفسەر دانە دانە لە ژێر ڕووناکیی تیژی گڵۆپێکدا تەماشای کۆتر دەکەن. بەڵام کۆتر ئەوان نابینێ. ئەو دەسرەیەی بە چاویدا کێشراوە، زۆر ڕووتتر پیشانی دەدات. ئەو زیاتر هەست بە ڕووتیەتیی خۆی دەکات. بەڵێ کۆتر داڕووخاوە، کەوتووە. دیلیەتی، بێچارەیی و ناچاری، ژان و ئازار کۆتری ڕوخاندووە. کۆتر، بێهیوا، ترساو، تەسلیم بوو لە سەر کورسییەکی دار دانیشتووە و گوێ لە دەنگەکان دەگرێ. چاو نابینن، بەڵام گوێ دەبیستن. ئێستا گوێ، کاتی گوێیە. بە پێی ئەزموونی دوو مانگی ڕابردووی، کۆتر هەست دەکات کەسانی ناو ژوورەکە چوارن. کۆتر هەست دەکات کە ئەو چوار کەسەی ناو ژوورەکە، سەرباز نین و ئەفسەرن. کۆتر تێدەگات کاتی بڕیار، بڕیاری مان و نەمان هاتووە.

کۆتر بڕیاری خۆی داوە، دەبێ بمرێ، بەڵێ بمرێ و ڕزگار ببێ. خۆ لە کۆتری پێشوو، لە ژیانی ڕابردووی هیچ شتێک نەماوە. کۆتر ئیدی هیچ نییە، ئیدی بەرخەکەی دایکی، کۆتری گوندی منداڵییەکەی، نازەنینی شاری گەورەی چیا، ئارامیی گیانی ژیری ونبوو، کۆتری چیا بەرزەکان، نییە. خۆ ئیدی هیچ پێوەندییەکی بە جیهان و ژیانەوە نەماوە، ئیدی کەس ئاگای لە بوون و ژیانی ئەو لەم شوێنەدا نییە. خۆ هەر ڕۆژێک لە ژیانی ئەم زیندانە، مردنێکە و ئەو هەموو ڕۆژێک دەمرێ. کەواتە مەرگی ڕاستیی لەم ژیانە مردووە باشترە. کەواتە مردن، ڕزگارییە، ڕزگاری.

یەک لە ئەفسەرەکان لێی نزیک دەبێتەوە و لە پشت سەریەوە ڕادەوەستێ و بە زمانی ڕەسمیی دەوڵەت دەڵێ: «کۆتر! ناوێکی خۆشە... کۆتر، باڵندەیەکی جوان، باڵدارێکی نازەنین، بەڵام ترۆریست،

سەرهەڵدەر، جەردە... کۆتر و کردەوەکانی... وێران کردن، تێکدان، کوشتن، پیاوکوژی... چەند سەربازت کوشتووە کۆتر؟... کۆتر قسە ناکات. کۆتر گۆرانی ناڵێ... کاتی گەیشت کۆتر. تۆ خۆت، بڕیاری خۆت بدە. دوو ڕێگەت لە پێشە؛ یان قسە بکە، هاوکاریی ئێمە بکە و بژی، یانیش قسە ناکەیت، هاوکاری ناکەیت و دەمریت... ئەمڕۆ دوا ڕۆژی تۆیە لێرە. دوا ڕۆژ دوو ڕێگەی هەیە؛ ڕێگەی مردن و ڕێگەی مان. بڕیاری خۆت بدە.»

کۆتر بە ئارامی سەری هەڵدێنێ، لێوە وشک و قەڵەشیوەکانی بە زمان تەڕ دەکات و بە زمانی ئەفسەر دەڵێ «نا، هیچ شتێکم نییە بیڵێم. من تازە هاتبووم، من تازە هاتبوومە مەیدانی شەڕ، من هیچ نازانم... بمکوژن...»

دەنگی کۆتر دەلەرزێ، ڕوخساری دەشکێتەوە، دەستەکانی لە سەر ئەژنۆی دەلەرزن. وەک بڵێی یاو و لەرزی بێ، جەستەی جار و بار دەلەرزێ.

«ئێمە ئەو قسانەمان بیستووە. دەست لەو قسانە هەڵگرە، ڕاست قسە بکە و حەشارگە و مۆڵگەی سەرهەڵدرانمان نیشان بدە» ئەفسەرێکی دی بە دەنگێکی کەمێک تووڕەتر ئەمە دەڵێت «کەس ئاگای لە بوونی تۆ نییە. تۆ مردوویت. ئەگەر هاوکاریمان نەکەیت دەمریت، دەمریت...»

کۆتر لا دەکات بە لای دەنگەکەوە و دەڵێ؛ «بمکوژن، ئەوە ویستی منە. بمکوژن، من...» بەڵام ناتوانێ قسەکەی تەواو بکات. کوڵی گریان، یانیش ترسێک، تووڕەییەک یانیش خەمێک، قوڕگی دەگرێت. دەنگی لێدەبڕێ. دەنگی لێوە نایەت، بەڵام لە مێشکیدا ئۆلان دەدات؛ من دەمهەوێ بمرم، کوڵی گریان... بهێڵە کۆتر، بهێڵە با ئەسرین بڕژێن، با ئەسرین، ترسەکەت بڕەوێنێتەوە. با قورسایی ترسی ڕۆژ،

حەفتە و مانگانت لێ دوور بخاتەوە، لێیگەڕێ با ئەسرین وەک پەپوولە، سووک، ناسک، زولاڵ، بەخوڕ بەر ببێتەوە. با ئەسرین، تاریکیی ترست لێ بکاتە شەوق... دەنگ ئۆلان دەدات؛ سەرم ژان دەکات، مێشکم، ڕۆحم، بەدەنم ژان دەکات. وازم لێ بێنن، بمکوژن... چیتان لێم دەوێ! دادە بەقوربانت بم دادە، وەرە، وەرە بە هاوارمەوە... دادە، ئەوانە چییان لێم دەوێ! نە شەوە، نە ڕۆژە، دادە من کەوتوومەتە ناو بیرێکی قووڵ کە ناتوانم لێی بێمە دەر. دادە ساردە، دونیا ساردە، ژیان ساردە، ئەمانە ساردن، ئەم زیندانە ساردە، دڵ ساردە، جەستە ساردە... هەموو شت ساردە. دادە، کۆترەکەت سەرمایەتی، گەرمی بکەوە. دادە هەڵمبگرە و بمبە، یان بەوانە بڵێ با هەڵمبگرن و بمبەن، با بمکوژن... من مەرگ دەخوازم، تەنیا مەرگ، نەک هیچی دی...

«قسە بکە کۆتر، شتێک بڵێ»

«من... چ چ « کۆتر ناتوانێ قسە بکات. دەگری. سەرەتا بە ئارامی، دواتر بە دەنگی [بەرز] چەند خولەکێک.

ئەفسەر هیچ ناڵێن، بە ئارامی سەیری گریانی کۆتر دەکەن.

دوایی، پاش ماوەیەک، دەستێک بە ئارامی شانی ڕاستی دەگرێ. کۆتر دادەچڵەکێت و دەقیڕێنێ. دەست بە ئارامی دەکشێتەوە.

ئەمجار دەنگێکی نوێ کە کۆتر پێشتر نەیبیستووە دەڵێ: «کچی من، کچەکەم» دەنگی خاوەنی دەستەکە وەک لاواندنەوەیە دەنگێکی ئارام، نەرم، قورس و زولاڵ.

دەنگی باز...

باز لە پشت کۆتر بە پێوە دەوەستێت و زۆر ئارام دەڵێ «کچی من، ئێستا باش گوێم لێ بگرە. تۆ دەبێ هاوکاریی ئێمە بکەیت. مەگەر تۆ گوناح نیت؟ لەم تافی لاوێتییەدا کەوتوویتە سەر ڕێگەی هەڵە. وەک دەڵێن تۆ کچێکی خوێندکاری، باوکت پارێزەرە و خێزانێکی

ناسیاون. قسە بکە، هەرچی دەزانی بیڵێ. هەر ئەوەندە، خۆ زۆر نییە. تەنیا قسە بکە. ئەو کات بژی، ئەو کات بگەڕێوە سەر ژیانی خۆت...»

«من چی بڵێم؟ چی دەزانم؟»

«باسی خۆت بکە، باسی ئەو خراپییانەی تێیدا بەشدار بوویت، باسی ئەو هەزرە غەڵەتەی تۆی فریو داوە... قسە بکە، بڵێ کە دەوڵەت یەکێکە، میللەت یەکێکە، سەرۆک یەکێکە، ئاڵا یەکێکە، خودا یەکێکە، بڵێ کە هەڵەت کردووە، بڵێ کە تۆ لە ڕێگەی ڕاست، ڕێگەی ئەوین، برایەتی، یەکسانی، شادی، باشی و سەلامەتی لات داوە و بە ڕێگەی هەڵە، وێرانکاری، سەرکوت کردن، لە ناو چوون، سووتان و کوشتندا چوویت. بڵێ کە ئەوانە لە کوێن؟...»

«من نازانم، ئێمە نەمانسووتاندووە، ئێمە نەمانکوشتووە...»

«کچی من، دەڵێی تێنەگەیشتی کە ئێمە و ئێوە نییە، تەنیا ئێمە و هی ئێمە هەیە. تەنیا ئێمە و هی ئێمە، وڵاتی ئێمە، ئاڵای ئێمە، سەرۆکی ئێمە، ئەرتەشی ئێمە، دەوڵەتی ئێمە، میللەتی ئێمە، نامووس و حەیسییەتی ئێمە، هەبوون و یەکیەتیی ئێمە، هی ئێمە، تەنیا ئێمە و هی ئێمە... کچەکەم، ئەمجار قسە دەکەیت؟»

«من هیچ نازانم...»

باز دیسان بە ئارامی دەڵێت: «کەواتە درێژی مەکەنەوە، ئەمە تەمەنی خۆی کردووە، بیبەنە دەرەوە...» سەیرە، بەڵام ئەم قسەیە کە کۆتایی بە ژیانی کۆتر دێنێ، ئارامییەک دەخاتە دڵی کۆترەوە. تەنانەت دەتوانی بڵێی؛ کۆتر لەم قسەیە خۆشحاڵ دەبێت، دڵی دەکرێتەوە. دوو ئەفسەر هەر یەک لە لایەکەوە شانی کۆتر دەگرن و هەڵیدەستێنن و لە دەرگاکە دەیبەنە دەرەوە. ئەوان کۆتر کە ناتوانێ باش ڕێ بکات، لە نێوان خۆیاندا ڕادەکێشن. ئەوان دەڕۆن، ئەوەندەی

ماوەیەک هەروا ڕاست دەڕۆن. پاشان لە پلیکانەوە بەرەو ژوور دەبنەوە و دواییش ڕاست و پاش کەمێک دەچنە دەرەوە.

بایەکی فێنک و خاوێن دەیدا بە ڕوخساری کۆتردا. کۆتر خۆشحاڵە. ئەو بۆنە گەنیوەی بەجێ‌هێشت، زیندانی تاریک و لێدان و ئەشکەنجەی بەجێ هێشت. ئیدی کەس ناتوانێ کۆتر ئاوا داڕووخاو، ئەوەندە ڕووت، وەها ترساو ببینێ. کەس شوێنی برین، خوێن، لێدان و ئەشکەنجەی سەر جەستەی نابینێ. ئیدی کۆتر هەست بە ئەوەندە چڵکنی و پیس بوون ناکات. تەواو، هەموو شتێک تەواو بوو. ژیان وەهایە، ئەوەندەیە؛ خاوەن هەست، هۆشمەند، پێنەگەیشتوو، سەرنەکەوتوو، شکست خواردوو، مراز بە با. ژیان وەهایە؛ هیواکان ناگەنە سەر، مرۆڤ بێ توانا دەبێت، بێچارە دەمێنێتەوە، بێ هیوا دەڕوات. بەڵام خۆشحاڵ، ئارام، سەیرە، بەڵێ خۆشحاڵ... کۆتر نەیدەویست وەها بێت، بەڵام ژیان وەهایە. کۆتر بە دەم و لووتی هەناسە دەکێشێت؛ ئەو هەوا خاوێنەی کە زۆر بیری دەکرد دەباتە دەروونی خۆی. ئایا ئێستا ڕۆژە؟ شەوە؟ دواجار کە سرووشتی بە چاوانی دیتبوو، بەهار بوو، دونیا وە خەبەر دەهاتەوە و دەژیایەوە. ئەی ئێستا؟ هاوین؟ پاییز؟ ئێستا کۆتر پاڵتۆیەک لە سەر شانی، بە پێوە ڕادەوەستێ و لاقەکانی کە هەر نەجووڵابوونەوە، دەلەقێنێ. دونیا ساماڵە، نە باران، نە بەفر و نە تینێکی گەرمی هەتاویش هەیە. بە تەنیا شنە بایەکی فێنک لە ناو قژی کورتی چڵکنی کۆتردا جووڵەی دێت. کۆتر کەمێک دەلەرزێ. ساردە؟ یان ترسە؟ ترسی دڵ؟ یان بێ ئاگایی، بێ ئاگایی لە ئێستا؟

«جیپەکە بێنە بەر دەرگا...» دەنگە نەرمەکەیە قسە دەکات، بەڵام ئەمجار کەمێک سارد و تووڕە. دوای چەند خولەکێک دەنگ دێت. سەرەتا دەنگی مەکینەی سەیارەیەک، دواییش دەنگی جیپێک و بە دوای

ئەویشدا دەنگی ئەفسەران. چەند کەس دەڕۆن و دێن، قسە دەکەن، هەندێک شت دەڵێن. سەگ دەوەڕن. یەک دوو ئەسپ دەحیلێنن. لە پشت دەرگاکان یانیش دیوارەکانەوە چەند دەنگی تێکەڵ، بۆڕ، ناسک، تێکەڵ، دەنگی مرۆڤان دێت. جارجارە بێدەنگ دەبێ، جار جارەش بەرز دەبێتەوە. ئەوان کێن؟ بەڵام کۆتر گوێ لەم دەنگانە ناگرێت. ئیدی کێشەیەکی نییە. کۆتر ڕزگار دەبێ لە هەموو شتێک، لە هەموو دەنگێک...

«سوار بن با بڕۆین...» دیسان ئەو دەنگەیە. دیسان هەر دوو ئەفسەر شانی کۆتر دەگرن و دەیخەنە ناو جیپەکە و هەر یەک لە لایەکی دادەنیشن. جیپ دەکەوێتە ڕێگە. هێدی هێدی.

خۆزگە ئێستا چاوانی کۆتریان دەکردەوە تاوەکوو بیتوانیبا جارێکی دی لەم دونیایەدا، دونیا بە چاوی کراوەوە ببینێ. ئایا تکای ئەوەیان لێ بکات؟ نا، نابێ تکا بکات و داوای هیچیان لێ بکات.

ئەوان، ئەوانن، کۆتریش کۆتر. هەر ئەوەندە!... ئێستا ئیدی ئەو ژیانی لە دەست دەدات. ژیانی ئەو ئێستا لەم کاتە وێرانەدا، لە دەستی ئەواندایە. هەر ئەوەندە!... کێشە نییە، با وەها بێت. ژیانی بێدەنگ و شکستی کۆتر، ئیدی نە هیوا و نە دڵخواز و مرازی ماوە. ئیدی کۆتر هیچی نەماوە.

ئێستا بە تەنیا ئەو ئەفسەرانە، ئەم جیپە و ئەم ڕۆشتن و ئەم شنەبا ئارامە هەیە. کێشە نییە، کۆتر حەزی دەکرد سەر بکەوێت، ژیان برازێنێتەوە، خۆشتری بکات. بنووسێ، بخوێنێ، حەز بکات، لە کانیاوی ئەشق بخواتەوە. بەڵێ حەزی دەکرد. بەڵام نەکرا. کێشە نییە، ئیدی کێشە نییە.

ئەو دەیویست... ئەو ڕۆژ و شەوانەی خوێندکاری لە شاری گەورە، پایتەختی ژەنەڕاڵ سەردار، سەرداری ئەم ئەفسەرانە. هەر ڕۆژێک،

هەموو شەوێک بێ پایان خۆش، جوان و قەشەنگ. جۆش و خرۆش... ئەو خوێندکاری، ئەو گفتوگۆ، ئەو هیوا و ویستە تازە پشکوتوو و زوڵاڵانە، جەستەی تەڕی پاش خۆشەویستی، پیاسەی ژێر خوناوکەی باران و خۆری هاوین، ئەو دەست و پەنجانەی بە سەر جەستەدا دەگەڕان، بە تایبەت ئەو ویستە، ئەو خواستانە... بەڵێ، کۆتر دەیویست، حەزی دەکرد... خۆزگە ئێستا ژیریش لێرە لە لای ئەم دەبوو. خۆزگە ئێستا هەر دوو پێکەوە دەمردن و سەریان دەنایە سەر خاکی سارد. نەک ئاوەها دوور لە یەک، هەر یەک لە لایەکی چیای وڵاتی چیا. مەگەر بڕیاری ئەوانیش وەها نەبوو، [مەگەر بڕیار نەبوو] لە بەفر و باراندا، لە سارد و سەرمادا، لە تین و گەرمادا هەر پێکەوە بن؟ بەڵام نەکرا. بەڵێ، دڵی کۆتر شینگێڕە. شیوەن لە دڵیدا هێلانەی کردووە. خۆزگە ئاوەها دڵبریندار نەدەچوو. ئاوەها بێ توانا، شکست خواردوو، تێکشکاو و زامدار نەدەچوو. خۆزگە ئەو سووتان، گوند و کوشتن، قیژە و هاوارەی نەدەدیت، نەدەبووە شاهیدی تێکڕووخانی دار، خانوو، ماڵ و مرۆڤان. خۆزگە نەدەبووە قوربانی، نەدەبووە جەللاد. بەڵام نەکرا، بەڵام ئیدی کێشە نییە.

خۆی ویستی، خۆی حەزی کرد. ئەو، ئەوەندەی هێز و توانای خۆی لە دژی شەڕ، شەڕی کرد. بەڵام شەڕ بە سەر ئەمدا زاڵ بوو. بەڵێ، ئەو ئێستا تێدەگات؛ نە قسە و بڕوا، نە ویست و هەست، نە دۆعا و نزا ناتوانن ڕێ لە شەڕ بگرن. شەڕ، یاساکانی شەڕ؛ چەک، فیشەکدان، گوللە، فیشەک، سەرهەڵدەر، سەرباز، کەمین، سەنگەر، هێرش، پاسەوان، هێز و توانا. و داڕووخان و تێکشکانی مرۆڤەکان، یەک بە یەک، کۆمەڵ بە کۆمەڵ، بێناو، بێگۆڕ، بێکەس، بێ شینگێڕی، بێپرسە و سەرەخۆشی و فرمێسک هەڵڕشتنی پاش تێکڕووخان، هەستی تۆڵە. پەژارە و خەمێک کە دەبێتە ویستی

تۆڵەسەندنەوە و دیسان لێدان، کوشتن، تێکڕووخان... شەڕ، بەڵێ شەڕ. خۆزگە وەها نەدەبوو. خۆزگە کۆتر بیتوانیبا ڕێی لێبگرێ. بەڵام نەکرا. لێ کۆتر ئێستا بەختەوەرە، بەڵێ بەختەوەر. خەندەیەک لە سەر ڕوو، چاو بەستراو، هۆشی لە شوێنێکی دی، لە نێوان ئەفسەراندا، دەڕوا.

«کچی من» دیسان دەنگە نەرمەکەیە لە لای پێشەوەی جیپەکە «تۆ دەبێ قسە بکەیت»

بەم دەنگە کۆتر دێتەوە سەر خۆ. وەڵامێک پێویستە، بەڵام چی؟ هیچ، هیچ شتێک. دەبێ کۆتر ڕووی لە مەرگ وەرنەگێڕێ. کۆتر، کۆتر بیر دەکاتەوە، خۆی لۆمە دەکات، کۆتر، بە حەیرانت بم، ئەز بەنی، خۆت مەدۆڕێنە کۆتر. کۆتر یاری بە پەنجەکانی دەکات و دەڵێ؛ «هیچێکم نییە بیڵێم»

«باشە، کچی من، کەواتە ئێمە ڕێگەکەمان ڕاست دەڕۆین، تۆ دەمری...»

دەنگەکە ئەوەندە نەرم و ئارامە وەک دەنگی لاواندنەوە، وەک ئەوەی باسی مەرگ و کوشتن نەکات و چیرۆکی هەزار و یەک شەو بگێڕێتەوە.

ئەوان دەڕۆن. تا کەی؟ تا کوێ؟ کۆتر ئیدی نازانێ، ئیدی خەمی نییە.

بەڵام با بڵێین پاش کاتژمێرێک، جیپ ڕادەوەستێ و هەموو یەک بە یەک دادەبەزن. کۆتریش بە هاوکاریی ئەفسەرەکان دادەبەزێت. هەوا کەمێک فێنکە. لە دوورەوە دەنگ دێ. یەکەم شت کە کۆتر هەستی پێدەکات بۆنی گژ و گیایە. بۆنی سرووشت لە دەر و دەشت هەڵدەستێت.. کۆتر شان و دەست و پێیەکانی دەجووڵێنێ. شان و قۆڵ و لاق و پێی کۆتر ئێستا ئازادە، بەڵام چاوی نا؛ ئایا دەست بیبات و دەسڕەکە لە سەر چاوی داماڵێ؟ یانیش تکا لەوان بکات؟

نا، نە ئەوان و نە کەسی دیش. کێشە نییە، ئیدی لاق و جەستە بە دەوری ئەودا دێن و دەڕۆن. خاوەنی ئەم لاق و جەستانە چەند کەسن؟ چی دەکەن، چۆن ئەم دەکوژن؟ کێشە نییە. کۆتر کەمێک پێدەکەنێ. لێوی گۆشتیی خرپنی کەمێک دەکرێتەوە. لێوەکانی؛ وەک کۆلکە زێڕینەی کەوانی، ترەکاو، قڵەشاو، بەڵام نەرم، گۆشتی، زیندوو. لێوەکانی؛ هەم شۆخ وەک لێوی ژنێکی هەوەسکار، هەم مەعسووم وەک لێوی منداڵێک. کۆتر؛ سەرەڕای شەڕ، برین، لێدان و زیندانی بوونیش، جوان، قەشەنگ، قژ کورت، باڵابەرز، زراف، کەمەر باریک، پا و پووز درێژ، زەریف و ناسک. کۆتر؛ ڕوخساری کە ئێستا دەدرەوشێتەوە، ناسک، جوان و کەمێک درێژ، کەپۆ و لێو ڕێک و پێک. کۆتر؛ جەستەیەکی جوان وەک نەمام، ڕانی پان و پۆڕ، مەمکی کەمێک گەورە، بەڵام بێپایان جوان.

«چاوی بکەنەوە» دەنگە نەرمەکە، واتا بازە.

یەک لەو ئەفسەرانەی بە دەوری کۆترەوەن، لە پشتەوە دەسرەکە کە توند گرێ دراوە، دەکاتەوە. چاوەکانی دەکرێنەوە. چەند خولەکێک چاو نووقاو ڕادەوەستێ، دواتر بە ئارامی چاوی دەکاتەوە، چەند جار دەیترووکێنێ و سەیری دەور و پشتی دەکات. هەوا تاریکە، نا تاریک نییە، ئێوارە یانیش شەوە. بەڵام دەر و دەشت سەیر ڕووناکە، وەک ڕۆژ. سەرەتا کۆتر بە خێرایی سەیرێکی دەور و پشتی خۆی دەکات. چوار کەسن، دووان بە جلی ڕەسمیی سەربازییەوە، و دوانیش مەدەنی. دواییش سەری هەڵدێنێ و سەیری ئاسمان، ئەستێرە و مانگ دەکات. ئەستێرە دەدرەوشێنەوە. مانگ پێدەکەنێ. کۆتر پێدەکەنێ. لێوەکانی بە بێ پارێز دەکرێنەوە و پێدەکەنێ. ئەو هەمووە ئەستێرە ئەوەندە نزیک. کۆتر دەستی هەڵدێنێ وەک ئەوەی بیەوێ ئەستێرە بگرێت. کەوانێک لە هەوادا درووست دەکات. مانگ ئەوەندە ڕووناک،

مانگە شەو وەک سینییەکی زێڕین. شەوێکی نەرم، جوان، شنە بایەک. بایەک کە بە ئارامی دەجووڵێ وەک سترانێک بهۆنێتەوە. بە بەرزایی ئەم شەوە جوانەوە، مانگ لە سەرەوە لە سەر سەرەوە هەڵواسراوە. بێدەنگ، ئەوەندە دوور، ئەوەندە نزیک. مانگ... دونیا لە جموجۆڵی ڕووناکی مانگدایە. کۆتر پێدەکەنێ، سەیری ئەم بەختە باشە بکە،» کۆتر بێ ئەوەی چاوی ببەستێت سەیری مانگ و ئەستێرە دەکات و بیر دەکاتەوە. من لەم شەوە بێ پایان و جوانەدا دەمرم... مانگ، مانگی نازەنین، مانگی گوندی منداڵییەکەم، ژیانی منداڵیم کە چۆن من دەستم ڕادەوەشاند، چۆن دەمویست بە تۆ بگەم و بە جۆش و خرۆش، بە کوڵ لەگەڵت ببمە یەک. ئەی مانگ ئەمشەو من لەگەڵت دەبمە یەک. مانگ تۆ دەبیتە کفنی من.

کۆتر سەیری دەور و پشتی خۆی دەکات. دەر و دەشت بێدەنگە. زۆر دوورتر لەمان لە لای خوارەوە، شارێک لە ناو ڕووناکیی گڵۆپەکاندا دیارە. لە لای سەرووشەوە تارمایی چەند خانوو و ئاواییەک دیارە. لەم لای تریشەوە هەندێک ڕەشایی دیکە کە لە تانک دەچێت، دیارە. تانک، لوولەی درێژی تانکەکان. یەک، دوو، پێنج، دە؟ بیست؟ چل؟ پەنجا؟ کێ دەزانێ؟ دیسان ترسێک دەکەوێتە دڵی کۆتر و ئەمجار سەیری کەسانی دەوری خۆی دەکات. هەموو ئەفسەرن بە دەوورییەوە ڕاوەستاون و بێدەنگ لەم دەڕوانن. کۆتریش دانە دانە سەیری ئەوان دەکات. یەک، دوو، سێ و چوارەم کەسیش کە کەمێک دوورتر لەمان ڕاوەستاوە. چوارەم کەس! نیگای کۆتر دیسان دێتەوە سەر کەسی چوارەم. ئەو؟ بازە؟ ناوی ئەفسانەیی، فەرماندەری ناودار، پیاو کوژی ترسناک؟ ئەو کەسە ئەمەیە؟ کۆتر ڕادەچڵەکێ، کەمێک بەرەو دوا دەڕوات و بە وردی سەیری چوارەم کەس دەکات.

«بەڵێ» بازە. بە دەنگێکی هەندێک گاڵتەجاڕانە دەڵێت «پێم وابێ

منت ناسی، بەڵێ مەزەندەکەت ڕاستە، بەڵێ منیش لەو گوندە بووم. سەربازەکانم، ئەفسەرەکانم، گوندییەکانم لەوێ کوژران. دوو ئەفسەرم لە بەر پێمدا کەوتن، خوێنەکەیان پرژا بە سەرمدا، بە سەر جل و بەرگ و ڕوخسارمدا. تۆ دەزانی کە تامی خوێن چۆنە؟ من بە ڕێکەوت ڕزگارم بوو. لە ئێوە، لە گوللەکانتان. من لە مردن ڕزگار بووم، بەڵام تۆ ڕزگار نەبووی... بەڵام هەنووکەش ڕێگەی ڕزگاریت لە بەر دەمدا ئاوەڵایە... بیر بکەوە...»

کۆتر دۆشداماو لە باز دەڕوانێ. ئەو دەنگە نەرمە، ئەم پیاوکوژە خاوەنی ئەو دەنگەیە. سەیرە نەرمیی ئەو دەنگە وەک بڵێی پەژارەیەک، خەمێکی تێدا شاردرابێتەوە و ئەو پیاوکوژە خوێنڕێژە. حوکمداری خوێن. فەرمانداریێک کە حوکمداریی خۆی بە خوێن بونیات ناوە و خوێن نیشان دەدات. کەسێک کە بە خوێن دەژی، ژیانی بووەتە خوێن، بە خوێن خۆی سەلماندووە. ئەو پێدەکەنێ، باز پێدەکەنێ! ئەو سەیری کۆتر دەکات و پێدەکەنێ. کۆتر دەترسێ. پێکەنینی باز وەک تیرێک دڵی ئەم دەپێکێ. کۆتر هەروا ڕاوەستاوە وەک بڵێی جن گرتوویەتی، وەک ئەوەی شەیتانی بووبێ، سەیری باز دەکات.

«تۆ چی دەڵێیت؟» باز هەنگاوێک بەرەو کۆتر دێت و لێی دەپرسێ. کۆتر بەرەو دواوە دەڕوات. باز سەیری دەکات، قووڵ، ورد، بەڵام بە نیگایەکی نەرم. باڵای باز بەرزە، کەمێک بە سەر باڵای کۆتردا هەیەتی. باز دێتە لای کۆتر و دەستی ڕاستی دەخاتە سەر شانی چەپی کۆتر. بۆنێکی ترشاو دێتە لووتی کۆتر و گەرمایەک. گەرمایەکی سەیر کە کۆتر هیچ تێیناگات، دەکەوێتە سەر ڕوخسار و جەستەی کۆتر. کۆتر بیر دەکاتەوە. ئەوە نەفرەتە. ئەو گەرمایە دەبێ نەفرەت بێت. ئەو ڕوخسارە، ئەو مرۆڤە تەنیا دەتوانێ نەفرەت ساز بکات. بەڵێ تەنیا قین و نەفرەت... بەڵام ئەی ئەو نیگا نەرمە،

ئەو دەنگە نەرمە؟ ئەو چاوە بچووکانە کە بە ڕووناکیی مانگ و ئەستێرە بە خەندەوە، دەدرەوشێنەوە؟

باز و کۆتر؛ باز باڵندەی ڕاو. کۆتر؛ باڵندەی ڕاو. باز؛ سەربازی دەوڵەت، وڵات، ئاڵا و سەرۆکی دەوڵەت؛ پارێزگار و چاوەدێری دیسیپلین، سیستەم، نیزام؛ خاوەن ئامانج و مەبەست، شوێن و پێگە. باز؛ هەموو شت بۆ خۆی و دەوڵەتەکەی، سەرۆک و پێگەکەی؛ هەموو شت بۆ دیسیپلین و یاساکانی ئەو. کۆتر، هەرچی کۆتریشە؛ سەوداسەری ئازادی، بە شوێن هزر و شەپۆلی نوێوە، دوور لە دیسیپلین و سیستەم، ئازاد لەم شتانە؛ نیگای لە گۆڕان و پێشکەوتن... باز و کۆتر ئێستا لە بەرانبەر یەک. چاو لە چاو. چاو بە چاو. یەک سەردەست و دەسەڵاتدار، ئەویدی بندەست و ژێردەسەڵات. بەڵام چاو لە یەک، سەیری یەک دەکەن. نیگای چاوان؛ ڕاست، دوور لە هەموو کەند و کۆسپێک، ئاشکرا، سادە، ڕووت. ڕوانینی چاوان؛ لەگەڵ خوێن و قین، تێکڕووخان و ڕق، گەرمی و گەرم بوون...

«من هیچ ناڵێم بمکوژن...»

«باشە کەواتە ئیدی من ناتوانم هیچ بکەم، باشە بیکوژن...»

کۆتر چاوەکانی دەنووقێنێ، کەمێک سەری بەرز دەکاتەوە و چاوەڕوان دەبێ، بەڵام هیچ ڕوو نادات. ئەفسەرێک دەڵێ «چاوت بکەوە» ئەو دیسان چاوی دەکاتەوە. ئێستا ئەفسەرێک هاتووە و لە بەرانبەر ئەم ڕاوەستاوە. ئەوەندەی هەنگاوێک مەودای نێوانیانە. کۆتر هەست بە بۆنی قورسی ئەفسەرەکە دەکات. ئەفسەر دەمانچەکەی لە کەمەری دەردێنێ. لە دەرهێنانندا دەمانچە بە هەواوە دەبریقێتەوە. سمیت ویلسۆنێکی لوولە درێژی تۆپەکدار بە دەستی ڕاستی ئەفسەرەکەوەیە. ئەفسەر بە ئارامی تۆپەکی دەمانچە دەکاتەوە و بە دەستی چەپی چەند جار دەیگەڕێنێ و دەڵێ «دەمانچەی شەش فیشەکە، تەنیا فیشەکێکی

تێدایە. من پەنجە دەنێم بە پەلەپیتکەکەیدا، جار بە جار تاوەکوو فیشەک دەگاتە بەر دەرزیی دەمانچەکە و بە ناوچاوانتدا دەتەقێتەوە و مێشکت پەرش و بڵاو دەکاتەوە. خۆت و شانسی خۆت...

کۆتر هیچ ناڵێ. ئەو بیر دەکاتەوە؛ کاتی هات، کاتی ڕۆشتن هات، مەتین بە کۆتر، خۆت بگرە، مردن مردنە. ئەمڕۆ بێ یان بەیانی و یانیش دوو بەیانی. بەشی من ئەمڕۆیە، مەتین بە ...

باز دیسان دەڵێ «کچی من تۆ گوناحی، دەست لەم سەودایە هەڵبگرە، قسە بکە، شتێک بڵێ»

کۆتر ناپەیڤێ، بیر دەکاتەوە، هەست دەکات کەوتۆتە ڕێگە و دەڕوا. ڕۆشتن... من دەڕۆم، کۆتر بیر دەکاتەوە. وڵات، وڵاتی بێچارەی هەژاری بێ پەنا، من دەڕۆم، لە سەر خاکی تۆ، یانیش لە سەر خاکی باو و باپیران. من دەڕۆم. شنەبای شەوانت گۆرانیی تۆم بە گوێدا دەچرپێ. گۆرانیی تۆ، مانگی تۆ دەست بۆ ڕۆشتنی من ڕادەکێشن. من دەڕۆم هەروەک باو و باپیران، بەڵام تۆ دەمێنی هەروەک سەردەمی باو و باپیران. دایکی پەژارە و خەم و کەسەران. گۆرانی بڵێ، بە شوێن مندا گۆرانی بڵێ و فرمێسک ببارێنە. من ویستم بژیم، ویستم تۆ بژیێنمەوە. بەڵێ خەون بوو، خەیاڵێکی شیرین بوو. بەڵام من حەزم کرد، تۆ بزانە، من دەڕۆم، من بڕازێنەوە وەک بووکێک، من لە ئامێز بگرە وەک منداڵێک. دایک، دایە، دادە، خاکی پڕ ڕەحمەت، دایکی گەرم، من لە بیر مەکە بمحەوێنەوە، من دێم، من دەڕۆم...

ئەفسەر دەمانچە ڕاست دەکاتەوە، دەیباتە بەر ناوچەوانی کۆتر، دەمی ساردی لوولە بە قورسی دەنێت بە تەوێڵی کۆترەوە و ڕادەوەستێ. ئەفسەر بەو ئەزموونانەی هەیەتی، لە کاری خۆی باش شارەزایە. هەروا ڕادەوەستێت.

«کچی من قسە دەکەیت؟»

هیچ دەنگێک لە کۆترەوە نایەت، چاوەکانی دادەخات، بەژن ڕاست، دەست و پەنجەی خۆی پێکەوە دەگووشێ و ڕادەوەستێ. دڵی لێدەدات، توند، تەپ، تەپ، تەپ تەپ...

باز دەڵێ «کەواتە بیکوژە.»

ئەمجار ئەفسەر پەنجە دەنێت بە پەلەپیتکەی دەمانچەدا. دەنگێکی تیژی ترسێنەر بەرز دەبێتەوە. چیققق... کۆتر لەگەڵ بزووتنی دەمانچە هەنگاوێک دەچێتە دواوە، کۆتر دەلەرزێ، وەک ئەوەی لە سەرەمەرگدا بێت، دەلەرزێ. هەموو بەدەنی دەڕوات و دێت. دەنگی لێدانی دڵی خۆی دەبیستێ. دڵە!... ئەو دەنگی دیش دەبیستێ. کۆتر هەست دەکات کە نەمردووە. ئەو نەمردووە؛ ئەو نەمردووە. بە چاوی بەستراوەوە نەفەس دەگرێ و دەیداتەوە. نا، ئەو نەمردووە. ژیان، گەڕانەوە لە مەرگ... نەفەس، هەوا، سرووشت، دەنگ، سەدا، دڵ، مێشک، هۆش، هەست... ژیان... کۆتر چاوەکانی دەکاتەوە. ئەو، باز، ئەوانە، ئەفسەرانی مەرگ و کوشتن. مەرگ ئەوەیە، کۆتر کەمێک بە خۆشحاڵییەوە بیر دەکاتەوە. زیاتر لەوە نا. بە تەنیا ئەو. ڕۆشتن، ڕۆشتنی بێ گەڕانەوە... خۆت ڕاگرە، جارێکی دی پەلەپیتکەی دەمانچە، تەقە و تۆ دەڕۆیت... هەر ئەوەندە. لایەکی ڕوخساری ئێستا بە شەوقی مانگ و ئەستێرە بریقەی دێت. ڕوویەکی یەکجار خۆش وەک بڵێی لە مێژوو، لە ڕۆژگار و زەمەنی کەوناراوە گەڕاوەتەوە. وەک فریشتەیەک. ڕوویەکی نەرم، ئارام، ڕازی، بە هەموو شت ڕازی. لووتی بچووکی، ناوچەوانی کراوەی، قژی کورتی کە ئێستا لای ڕاستەوە بریقەی دێت، لێوە نەرمەکانی کە ئێستا لەگەڵ ئەوەش کە شەوە بە هەموو جوانییەکی خۆیەوە دیارە، پەنجەی درێژ بەڵام ڕێک و پێکی و چاوەکانی، چاوەکانی کە ئێستا تا بیلبیلە و گلارە هەر هەمووی دەدرەوشێتەوە.

باز زوو بە وردی سەیری چاوانی دەکات. چاو، نیگایەک کە لە هیچ شتێکی دی ناچێ. نیگای چاوان، پێوەندیی چاوان، وەک بڵێی ڕووبارێک لە ڕووبارەکانی ئەم وڵاتی موسیبەتە بەرەو دەریاکان بڕوات، خۆی بە دەریا بگەیەنێ، وەک برووسکەیەک کە چەخماخە دەدات و دەیدا لە دڵی شوێنێکی کەونارا و مێژوویی و دەتەقێتەوە. باز سەیری ئەو ڕوخسارە جوانە دەکات کە سەرباری ئەو هەموو ئێش و ئازارەش، هێشتا ئارامە. ڕوخساری کۆتر؛ مات بەڵام مەغروور، ماندوو بەڵام سەربڵند.

«کچەکەم سەرپێچی مەکە، قسە بکە» باز دیسان یەکجار نەرم، وشە بە وشە بە گوێی کۆتردا دەیچرپێنێ.

دەنگێک لە کۆترەوە دەرنایەت.

«کەواتە بیکوژە...»

ئەفسەر دیسان تۆپەکی دەمانچە چەند جار دەگەڕێنێ، لوولەی دەمانچە دادەنێتە سەر تەوێڵی کۆتر، پەنجەی دەخاتە سەر پەلەپیتکە و ڕادەوەستێ.

«کچی من تۆ حەیفیت، قسە بکە»

کۆتر ناپەیڤێ، وەک هەیکەلێکی کەونارا کە لە دەور و زەمەنی کۆن، یەکجار کۆنەوە، هەر ئاوا ڕاوەستابێ، چاو نووقاو، ئەمجار دەستەکانی لە پشتەوە لە یەک ئاڵاو، ڕادەوەستێ.

«بیکوژە...»

ئەفسەر بە ئارامی پەلەپیتکە دەکێشێت. لەگەڵ ڕاکێشانی پەلەپیتکە، کۆتر دەڕووخێتە سەر زەوی. ئەوەندەی ماوەیەک هەروا داڕووخاو لە سەر خاکی شێدار دەمێنێتەوە، بەڵام ئەو دەژی! ئەمجاریش دەژی! ئەمجاریش دەمانچە بەتاڵ بوو! ترس. لە ترسا کەوت، دەبێ وەها بێ... ترس، دەمانچە، مردن، ڕۆیشتن... کۆتر ئیدی ناتوانێ خۆ

ڕابگرێ. دەگری، لە ژێر لێوەوە، بێ دەنگ، لە زەویدا دەگری.

باز دێتە سەر سەری، دەستی بۆ درێژ دەکاتەوە، دەستی ڕاستی کۆتر دەگرێ و هەڵیدەستێنێ. باز زۆر بە نەرمی، دیسان سەیری چاوی کۆتر دەکات و دەڵێ: «ئەمجار قسە دەکەیت، وا نییە؟ کچی من؟»

کۆتر ناتوانێ بپەیڤێ، دەنگی لێوە نایەت، هەر بە تەنیا سەری خۆی بە هێمای بەڵێ دەلەقێنێ.

## ١٢

# ژان

ئێمە دەبێ بەسەرهاتی باز و کۆتر درێژە پێ بدەین.

ڕۆژ، مانگ، ساڵ، کات، زەمەن، شوێن، جێ، کۆمەڵگا، جڤات، هەرێم، ڕەنگەکان دەگۆڕدرێن. بەڵام ڕەوت بەردەوامە. ڕەوتی بەسەرهاتی باز و کۆتر لە ناو ڕۆژ و ڕۆژگاراندا دێت و دەچێت تاوەکوو دەنگی لێدانی دڵیان بێتە بیستن، ڕوخسار و نیگا، سەدا و هەستەکانیان دیاریی بکرێت. ڕەوت دەبێ بە پێچ و خەم و تەنگ و چەڵەمە و جارجارەش ڕاست و درووست بەردەوام بێت تاوەکوو ڕەنگەکانی بەسەرهاتیان وەک ڕەنگی کۆڵکە زێڕینەیەک دەربکەوێت. پێویستە ببیسترێ. دەبێ هەست پێبکرێ، دەبی دەنگ و سەدا و هۆشمەندی تێدا بێت. دەبێ تام و ڕەنگی ببێت.

باز و کۆتر؛ ئێستا هەر دوو پێکەوە لە وڵاتی چیا لە سەرەو لێژێکی چیای سەرکەش. لە کۆتایی شەوێکی ساماڵ و سەرەتای ڕۆژێکی فێنکدا.

ئەوان دەڕۆن؛ باز، کۆتر، سێ ئەفسەر، ئەوەندەی بیست سەرباز و حەوت گوندی کە هاوکارییان دەکەن. ئەوان هەموو پێکەوە بە شوێن یەکدیدا دەڕۆن. جل و بەرگی خەڵکی وڵاتی چیایان لە بەرە و بە چەکی قورس و ڕەخت و سیلاحەوە دەڕۆن و بەرەو خوار دەبنەوە.

چۆن؟ بۆچی؟

پێش ئەوەی وەڵامی ئەم پرسیارانەی بدەینەوە، با ئەو زەمەنی ڕابردووە کە لە بەشی دووی ڕۆمانەکەدا - با بڵێین بەشی سووتان- کە وەک ڕووبارەکانی ئەم وڵاتە بە خەمگینی دەڕۆشت، بێنینەوە یاد؛ بەجێ هێشتن و ڕەوی گوندییان، گوندێکی چۆڵکراو، چیاکانی گوندییان، ڕۆشتنیان بە شەو، باران، سەرما، ماندوویەتی، خێرا کردن لە ناو شاخ و داخ و ڕەهۆڵە و شیو و ڕێچکەدا بێنینەوە یاد؛ بنەوەی شیوی قووڵ، ئەشکەوت و موغارەی ناو دۆڵ، زستانی ناو ئەشکەوت، بەهار و سرووشتی وەحشی و هێرشی سەربازەکان بێنینەوە یاد؛ مردن، مردنێک کە بووە چارەنووسی ئەم وڵاتە، مرۆڤی ئەم وڵاتە و ئاگر و سووتان بێنینەوە یاد. دەنگی بێ پشووی ڕەشاشە، تۆپی بچووک و چەکی قورس بێنینەوە یاد. با بێتەوە یادمان کە تووتکێکی بچووک چۆن لە ناو دووکەڵ و مژی ئاگر و سووتانی ئەشکەوت هاتە دەر؛ کە چۆن کوڕێکی بچووک بە شوێن تووتکە سەگەکەدا، وەک تووتکێک لە ناو ئاگر هاتە دەر. کە چۆن منداڵێک لە ناو دووکەڵ و مژ هاتە دەر و خۆی گەیاندە دونیا و ژیان. دۆشداماو بەڵام بە ڕوخسارێکی ئارامەوە. ئەفسەرێکی سمێڵ قیت و کورتەباڵا و هەژار کە خاوەنداریی لە منداڵەکە کرد، دەستی بە سەریدا هێنا، ئاگای لێی بوو و پێکەنی و بە زمانی خۆی کە منداڵەکە هیچی لێ نەدەگەیشت، قسەی ئارامبەخش و خۆشی بۆ کرد...

با بێتەوە یادمان کە ئەم منداڵە باز بوو.

ئێستاش باز دیسان، پاش با بڵێین چل ساڵان هەر لەو هەرێمەدایە، ئەو بەرەو هەمان شوێن و دۆڵ و ئەشکەوت دەڕوات، بەڵام بێ ئەوەی ئاگای لە دوێنێ بێت، بێ ئەوەی بتوانێ دوێنێ بێنێتەوە یاد. بازی دوێنێ؛ منداڵێک کە لە ئاگر، سووتان، چەک و فیشەکدان و مەرگ

ڕزگار بوو و لە ئەشکەوت هاتە دەر. بازی ئەمڕۆ؛ فەرماندای کوشتن، کە ئاگر، سووتان، چەک، فیشەکدان و مەرگی کردۆتە هونەری خۆی بۆ ژیان و بەرەو ئەشکەوتەکان دەڕوات. دوێنێ؛ دایکی ئەمڕۆ کە لە پشت دووکەڵ و دوومان و زەمەنەکانەوەیە. دوێنێ؛ سێبەری ئەمڕۆ، سێبەرێکی بەهێز کە هەمیشە لەگەڵ ئەمڕۆیە. دوێنێ؛ ڕابردوویەکی تاریک، بەڵام کات و زەمەنێک کە لەگەڵ ڕۆژگاری نوێشدا دەژی، لەگەڵیەتی و زیندووە. دوێنێ و ئەمڕۆی باز؛ لە ئەشکەوتەوە بەرەو ئەشکەوت، لە مردن و کوشتنەوە بەرەو مردن و کوشتن.

وەک ئێستا. ئێستا ئێمە دەکەوینە شوێن باز، کۆتر و ئەوانی دی و لەگەڵیان دەڕۆین. ئەوان لە چیای سەرکەشەوە بەرەو خوار، بەرەو هەڵدێر و ڕێچکەکان دەبنەوە. دەستە بە دەستە، یەک بە یەک. لە پێشەوە پێشەنگ و گوندییانی ڕێ بەڵەد و ڕێناس هەن، بە شوێن ئەواندا باز، دوو ئەفسەر و دە سەرباز و بە دوای ئەوانیشدا کۆتر، لە پێش کۆترەوە ئەفسەرێک و بە شوێنیەوە دوو گوندی و پێنج سەرباز. ئەوانی دیش کە ماونەتەوە، لە دەستەی دواییدان. ئێمە جل و بەرگی ئەوان، پۆشاک و بزووتنیان، چەک و ڕەختیان دەناسین. ئەوان سەربازن، ئەندامی ئەرتەش، بەڵام ئێستا هیچیان لە سەرباز ناچێت. ئەوان ئێستا لە گوندیی ناوچەکە، لە سەرهەڵدەران دەچن. سمێڵ و ڕیشیان هاتووە، ڕوخسار نەشۆراو و بەژن و باڵا پتەو، ڕوانین و نیگا تیژ، کەوا و پانتۆڵی کۆن، پێڵاو و پۆتینی قایمی شاخ و داخ. جەستە و بەدەنی نارەقاوی، بۆنگرتوو، چڵکن. دڵ و ڕۆحی سارد وەک بەرد، تاریک وەک ژێر خاکی ڕەشی سارد.

ئەوان دەڕۆن، ئێمەش لەگەڵ ئەوان. لە ناو ڕیزەکاندا ئێمە دێین بۆ لای کۆتر. کۆتر؛ دیل، داڕووخاو، بە هەموو شت ڕازی. ئێستا قژی لە ڕۆژانی زیندان درێژترە، بەدەنی ڕاستتر، نیگای زیندووتر، جموجۆڵی

بەهێزتر. بەڵام ئێستا بێچارەتر، دڕدونگتر، وەها؛ دوای ئەوەی باز لەو شەوە ڕووناکەی گەمەی مەرگدا کۆتری بە ترساوی و بووراوەیی و لە سەر خۆ چوو لە زەوی بەرز کردەوە، دەستی گرت و خستیەوە ناو جیپەکە، لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانی کۆتردا کرایەوە. لاپەڕەی نوێ؛ دانپێدانان، درکاندن، قسەکردن، نیشاندانی شوێن و جێی سەرهەڵدەران. کۆتر یەکەم دێڕی لاپەڕەی نوێی نووسییەوە و ئێستا خەریکی نووسینی دووهەم دێڕە.

لە یەکەم دێڕی لاپەڕەی نوێدا چیرۆکی ژیانی کۆتر هاتە نووسین. ئەو، دانە بە دانە، زۆر ئاشکرا، ڕاست، بێ درۆ، ئەوەندەی دەهاتەوە بیری، بە ڕۆژان باسی ژیان و بەسەرهاتی ژیانی خۆی بۆ باز و دیکەی ئەفسەران لە پادگانی سەربازی، جارێک سەری دادەخست و نیگای لە سەر دەستی کە بە چۆکیەوە بوو، جارجارەش چاوی لە پەنجەرەی ژوورەکە و نیگای لە هەور و ئاسمان کە لە ژوورەکەوە دیار بوون، لە سەر کورسییەکی ڕەق دانیشتوو، دەکرد؛ منداڵی خێزانێکی گەورە و خاوەن ناو و پێگە، خاوەن ماڵ و موڵک، خاوەن گوند. تاقانەی خێزانێکی دەوڵەمەند، نە برایەک، نە خوشکێک، هەر تەنیا خۆی، بەڵام لەگەڵ ئەوەش گەلێک خاڵ، مام، پوور، میمک، کچ مام، کوڕ مام، پوورزا، خاڵۆزا، میمکەزا... باوکی پارێزەر، دایکی گوندی و نەخوێندەوار. باوکێکی زانا، تێگەیشتوو، خاوەن شوێن و پێگە، پێوەندی و دەرفەت، دوور لە سیاسەت، بەڵام دۆستی دەوڵەت، خۆبین، پێوەندیی ئەو و کۆتر سارد بەڵام هەرگیز ڕووی لە کۆتر هەڵنەگێڕاوەتەوە، ڕژد بەڵام بۆ کۆتر جوامێر. باوکی کۆتر؛ پێکەنینەکانی، گاڵتەکانی، هەستان، دانیشتن و قسەکانی زۆر ڕێک و پێک و بەجێ و ڕێ کە هەنووکەش کۆتر حەزی پێ دەکات. باوک؛ باوکێک کە کۆتر پێی دەگوت بابە؛ ترسەنۆک، بێ جەرگ، بەردەوام بە شوێن داهات و دەرفەتی دەوڵەمەندتر بوون،

مرۆڤـی بـا، بـە بـای سیاسـی، کۆمەڵایەتـی جموجۆڵـی دەکـرد و تەدبیـری وەردەگـرت، سـێبوور، جێگیـر، هەڵسـووڕاو، هۆشـمەند، جـل و بەرگـی خاوێـن لـە بـەر، سمێڵ باریـک، قـژ دەق دراو، قـۆز، بێدەنـگ، بـە پارێـز. دایـک کـە کۆتـر پێیدەگـوت دادە. دایکێکـی نەخوێنـدەوار، گونـدی، کچـی گەورەماڵێـک. دایـک، بێدەنـگ، ئـارام، دینـدار و خـاوەن بـاوەڕ، ڕازی بـە حاڵـی خـۆی، بـڕوا بـە قـەدەر، ڕازی بـە چارەنووسـی خـۆی؛ هەمـوو شـت بـە ویسـتی خـودا ڕوو دەدات. هـەر شـتێک بـەو جـۆرەی لـە چارەنووسـدا دیاریکـراوە، ڕوودەدات. خـودا و چارەنـووس؛ سـەرچاوەی ژیـان و هەبوونـی ئـەو، سـەرچاوەی خۆشـحاڵی و بەختەوەریـی ئـەو. ترسـەنۆک، بـەدوور لـە حـاڵ و هەواڵـی دونیـا، بـە دوور لـە شـەڕ و پێکـدادان، قیـڕە و هـاوار، فـڕی بـە کێشـەی ناسـنامە، شـوناس، زمـان، فەرهەنـگ، وڵات و گەلـەوە نییـە و یەکجـار لێـی دوورە. دادە؛ دایکێکـی بێهاوتـا، دایکێکـی بێپایـان مێهرەبـان، کانـی ئەشـقی کۆتـر، دڵسـۆزی، میهرەبانـی، گەرمـی، نەرمـی، نیـگای گـەرم و نەرمـی پـڕ تـرس، باوەشـێکی گـەرم و ڕاموسـانەکانی، ڕوخسـارێکی سپیی کەمێـک خڕ، قـژی سپی، پەلکـەی درێـژ. دادە؛ دایکـی زمانـی زگماکـی، زمانێکـی شـیرین، زمانـی لاواندنـەوە، هۆنینـەوە، زمانـی چیـرۆک، بەسـەرهات، شـینگێڕی، تازیەبـاری، شـایی، هەڵپەڕکێ، سـتران و زەماوەنـد. یەکـەم وشـەکان کـە کۆتر گوێبیسـتی بـووە و لێیان تێگەیشـتووە؛ «بەرخەکـەم، کۆترەکـەم...» و سـترانی لـە ڕادەبـەدەری سـەر کۆتـرەکان بـووە. ئـەو هەمـوو کۆتـرە ڕەنگینـەی ئـەو گونـدەی کۆتـر تێیـدا گـەورە بـووە، تێیـدا فێـری زمانـی دایکـی بـووە و خـۆی ناسـیوە...

ژیانـی سـەردەمی منداڵیـی کۆتـر لـە گونـد. بـەڵام پێـش لـە ژیانـی گونـد، لـە دایـک بـوون و بـە دونیـا هاتنـی کۆتـر. کـۆچ. کۆتـر، ئەوەنـدەی دایکـی بـۆی گێڕاوەتـەوە، لـە بەسـەرهاتی خۆیـدا باسـی کـۆچ و وڵاتـی بیابانیـش دەکات؛ بیابـان، گەرمـا، لـم، تـەپ و تـۆز، تیـن، تیشـک، خـۆر.

بیابان؛ دوور لە وڵات، چیا، دار، دارستان، کوێستان و هەڵدێران. دوور لە دونیا، لە مرۆڤ و مرۆڤایەتی، بێوڵات، بێکەس، نە مرۆڤێک، نە دانیشتوویەک، نە حەشیمەتێک. بە تەنیا سەرباز و بارەگای گەرمی وەک ئاگری سەربازی. نە سێبەر، نە دارستان، نە با، نە باڵدار و باڵندە، نە ئاژەڵ و پەلەوەر، بە تەنیا لم، تۆزی لم، گێژەڵووکە و تۆفانی لم. بیابان، بیابانێکی خۆڵ، بێ ئاو، مردوو، نەزۆک... ئەوەندەی باوک و دایکی بۆیان گێڕاوەتەوە، لەوێ، لە بیابان چاوەکانی بە ژین پشکووت و دوو ساڵی سەرەتای تەمەنی لەوێ بردە سەر. دوو ساڵ، دوو ساڵ، دوو ساڵی ئاگر و گەرما کە دایکی بەردەوام بۆی باس دەکرد.

ژیانی گوند؛ بەڵام سەرەتا کەو و کۆتر لە هەموو شوێنی گوند، قاسپە قاسپی کەو، گمە گمی کۆتران، بێچووی شین، سوور، سپی، ڕەش و هەموو جۆرە کەوێک، خاسەکەو، زڕەکەو، کەوی ناو قەفەس، کەوی ئازاد، کەوی شاخ و دار و درەخت، ماکەو؛ ڕاوە کەوی بە ڕۆژ و بە شەو، ڕاوکەر لە ناو حەشار داو دەنێتەوە. ئەو ماکەوانە بە کڕ دەکەون و دەچنە سەر هێلکە. بە تایبەتیش دەنگی کەوەکان؛ قاسپە قاسپیان، خوێندنیان. ئەو کەو و کۆترە ڕەنگینانەی ژیانی منداڵیی کۆتریان نەخشاند و منداڵییەکەی؛ ئەم کچە شاد و خۆشحاڵە سەیری داری دەکرد و پێدەکەنی، سەیری باڵدار و باڵندەی دەکرد و پێدەکەنی، سەیری مرۆڤانی دەکرد و پێدەکەنی. بەختیار. ڕوخسارێکی ڕۆشن، گەش و شاد. یەکەم وشەکان؛ دادە، بابە، من، ڕۆژ، نان، ئاو، بە زمانی دادە، بە زمانی خەڵکی گوند. دەنگ و سەدای تایبەتیی گوند، واتا یەکەم پەروەردە و ڕاهێنانەکانی کۆتر. دەنگی کۆتر، یەکەم ستران کە کۆتر لەگەڵ دایکی لە سەر کانییەکەی گوند لە ژێر سێبەری سپیدارەکاندا دەیگوت. «من کۆترم...» دەنگێکی ناسک، خۆش و نەرم وەک هەوریشم. کۆتر؛ کچێکی بچووکی خوشحاڵ، دەنگخۆش، چاوجوان.

و سترانی گوندییەکان، ئەو سترانانەی شەوانی ئەویان پڕ دەکرد، ڕۆژەکانیان گەش دەکرد، ئەو سترانانەی بانگی مانگ و ئەستێران، ئاو و ڕووباران، باڵندە و باڵداران، شوان و گاوانی دەکرد، ئەو سترانانەی کە بە نەفەس، هەست و ئاوازی هەموو ئەو شتانە داگیرابوو.

کۆتر بە خۆشحاڵییەوە دانە دانە باسی سەردەمی منداڵیی خۆی و گوند دەکات. لەوانەیە ڕۆژێک و دوو شەو، یانیش دوو شەو و دوو ڕۆژ. کۆتر جارێکی دی باسی ژیانی گوند دەکات؛ کچان و ژنانی گوند؛ سادە، گەرم و گوڕ، خۆماڵی، بووک، خاوەن ماڵ، دایکی ماڵ و هەر شتێک، زەحمەتکێشانی ماڵ و خێزان. لاواندنەوەی گەرم، نەرم، دڵسۆز و خاوێنیان کە ڕۆحی منداڵانی ڕادەهێنا. کاتی سترانی کچ و ژنان؛ بێری، بێریڤان، کاتی دۆشینی پەز، سەر لە ئێواران کاتێک خۆر وەک سینییەکی سووری زێڕین بەرەو ئاوا بوونە و مەڕ لە لەوەڕ دێنەوە، ئەمجار کات، کاتی سترانی بێری و بێریڤانانە. سترانی بێری و بێریڤانان؛ هێز و توانای ژیانێکی تەنیا، هەژار، لە بیرکراو. کچ و ژن؛ بە جل و بەرگی ڕەنگینەوە چۆپی کێشی گۆڤەند و هەڵپەڕکێ، خاوەنی ماڵان و خانەدان. کچان و ژنانی سەردەمی منداڵیی کۆتر؛ دڵگەرمی، دڵپاکی، دڵداری، میهرەبانی، فیداکاری و لە خۆ بردوویی. ئەو کچ و ژنانەی کە ئیدی کۆتر هەرگیز نایانبینێ؛ ساکار، خاوێن، مەعسووم... ژیانی گوند؛ باوک لە شار، ئەم و دایکی لە گوند. لە کۆتایی حەفتەکاندا باوک دەهات و ڕاو، ئەسپ، جوانوو، بەرخ، کاریلە، کەو، کۆتر، باز، هەڵۆ، واشە، پەڕەسێلکە، قۆڵینگ و قاز کە بەهاران دەهاتن... ئەمانە هەر هەمووی ژیانی کۆتر بوو.

دواتریش کۆتر باسی ساڵانی شار، ساڵانی خوێندکاری، دەبستان و خوێندنگای کرد، دیسان دانە بە دانە، بەڵام نەک وەک باسی ژیانی منداڵی؛ ساڵی حەوتەم و سەرەتای خوێندن و دەبستان. کۆچی بەرەو

شار، ژیانێکی نوێی شارنشینی. ماڵی گەورە و خاوەن حەوش و بەر و باخچە و دارەبەری جۆراوجۆری ناو حەوشە، گوڵ و ڕێحان. وەرزەکانی خوێندن لە شاری گەورە و هاوینانیش لە گوندی بچووک. خوێندن. بەڵام سەرەتا ئاشنا بوون بە زمانێکی غەریب. پێش خوێندن لە دەبستان، قسە کردن بە زمانێکی دی بە زمانێک کە کۆتر هەرگیز نەیبیستبوو. نەک بە زمانی دادە، کە بە زمانی بیانی، غەریب. بە وەی مامۆستاکان و باوکیشی؛ بە زمانی مەدەنییەت و شارستانی. فێر بوون و ئاخاوتن بەو زمانە. باوکی ئاوای دەگوت: «کۆترەکەم پێویستە تۆ باش فێری ئەم زمانە بی، لە خۆشیان باشتر فێر بی تاوەکوو لە کۆمەڵگادا، لە ناو مرۆڤەکاندا پێگە و قورساییەکت هەبێ.» و پرسیارەکانی کۆتر؛ «بۆچی بە زمانی دادە نا؟ بە زمانی خۆمان نا؟...» پرسیاری بێ وەڵام. پرسیاری دڵ، مێشک و ڕۆح. ساڵانی خوێندن، بینای ساردی بە بەردی ڕەش سازکراو، دیواری ساردی بە بۆیەی سپی کە بەردی ڕەشی شاردۆتەوە، هۆڵی گەورە و سارد کە چل، پەنجا خوێندکاری تێدایە، مامۆستای سارد کە هەمیشە وەک شمشێرێکی هەڵواسراو بە سەر سەریانەوەیە. «زمانت ڕاست بکەوە، قسەکانت ڕاست بکەوە، لەهجەت ڕاست بکەوە! دەنگت ڕاست بکەوە!...» ساڵێک، دوو ساڵ، سێ ساڵ، چوار ساڵ، پێنج ساڵ، دە ساڵ. فێر بوونی زمانی فەرمیی خوێندن و خوێندنگاکان. زیاتر، قووڵتر فێر بوون، باشتر، خۆشتر فێر بوون. هەر خوێندن. هەر فێر بوون. «کچەکەم ، کۆترەکەم فێر بە، لەوان بەجێ مەمێنە...»

دوای فێر بوونی زمانی فەرمیی وڵاتی مەزن، زمانێکی دیکەش، فەڕەنسی. زمانێک کە بە وتەی باوکی لە زمانی وڵاتی مەزنیش شارستانیترە. زمانێک کە ماوەیەکی درێژە لە وڵاتی مەزن زاڵە. پاش دەبستانی سەرەتایی و ناوەندی، کۆلێژێکی تایبەت کە بە فەڕەنسی

وانــە دەڵێتــەوە. کتێــب و فەرهەنگــی فەرەنســی، خاوەنــی مامۆســتا و بەرێوەبــەری فەرەنســی. "Ma fille, petite fille, il faux appendre...bein ce langue, bein, ma kotr" ســاڵانی پێگەیشــتنی کۆتــر و زمــان و ئەدەبیاتــی فەرەنســی، هۆگــۆ، ســتاندال، باڵــزاک، نووســەر، ڕووناکبیــر و زانایانــی شۆڕشــی فەرەنســی، فلۆبێــر، ڕۆمانەکانــی فلۆبێــر، "L'edication sentimentalle"* و "Madame Bovarry". فلۆبێــر؛ "...Madame bovary? C'est moi"** "تێڕوانینــی نــوێ، هــزری نــوێ، ئــازادی، سەربەســتی، یەکســانی، شۆڕشــگێڕی... شــاعیر و نووســەری ســەرەتاکانی ســەدەی ئێمــە و پێــرس، ڤالێــری، ئێلــوارد، چــار، شــاعیر و نووســەری پســپۆڕ و پێشــەنگ، خۆڕاگــری لــە بەرانبــەر فاشــیزم... ئەمجــار ئــەو ناوانــەی کــە بــاز و ئەفســەرانی دی هەرگیــز نەیانبیســتبوو. و پێــرس Grand age, nous venons de toutersrives de la terre. Notre rase est antique, notre face est sans nom. Et le temps en sait long sur tous les hommes que nous fumes.*** U Eluard, la liberte... Sur les champs sur L'horizon /Sur les ailes des iseaux /Et sur le Moulin des ombres /J'ecris ton num...**** و شــەڕی ئازادیخوازیــی گەلانــی بندەســت لــە ئافریقــا، ئاســیای دوور، ئەمریــکای لاتیــن. و فانــۆن:*****L'es damnes de la terre... و باوکــی ئــەو؛ «کۆترەکــەم، تــۆ پێــت ناکەوێتــە ســەر ڕێگــەی هەڵــە و لــە بەرانبــەر دەوڵــەت ناوەســتی. دەوڵــەت گەورەیــە، کــەس ناتوانــێ ســەر

* کچەکەم، کچە بچکۆلەلەم، ئەم زمانە دەبێ بە باشی فێر بی، باش، بە باشی، کۆترەکەم...

** مادام بوواری؟ ئەوە منم...

*** پیــری، لــە ســەرجەم کەنارەکانی دونیــاوە دێیــن. بنەچەکەمــان کۆنــە، ڕوخســارەکامان بــێ نــاوە. زەمەنیــش لــە کۆنــەوە بــە باشــی دەزانــێ کــە ئێمــە کەسایەتییەکامان چۆنــە.

**** ئازادی... مەزراکان و ئاسۆکان/ ئاسیاوی لە سیبەر/ ناوەکەت دەنووسمەوە...

***** وڵاتی نەفرەت لێکراوەکان.

هەڵدات و سەر بکەوێ، خوێناوییە، گوێ مەدەیە قسەی هەڵە و پووچ و بەس بخوێنە...» و ئێلوارد؛ Sur l'absence sans desir / Sur la soli ...tude nue / Sur les marches de la mort / J'ecris ton nom* باوکی کۆتر؛ «کۆترەکەم، خوێنشیرینەکەم، دەست لەو سەودایە هەڵبگرە، باو باپیرانیشمان جارجارە سەریان هەڵدەدا، بەڵام هیچ ئەنجامێکیان وەرنەگرت، بێ ئەنجامە، بێ سوود...» و هۆگۆ L'hymne, a ceux qui sont morts pour la patrie** باوکی کۆتر؛ «شیرینەکەم بە زانین و بیر و هزرەوە هەنگاو هەڵبگرە، گوێم لێ بگرە، ناحاڵی مەبە، سەرهەڵمەدە...» و هۆگۆ: بایەخ و گەورەیی بە تۆ دەکەوێ/ وڵاتی شیرین و ئەبەدی/ بەها و شەرەف بە ئەوان دەکەوێ/ ئەوانەی بوونە قوربانت/ لە ناو خاک و خوێندا...

کۆتر هەموو ئەم شتانەی جارێک بە زمانی باز و ئەفسەران و جارێک بە زمانی فەرەنسی وت. پاشان هاتە سەر ساڵانی خوێندنی باڵا و زمان و ئەدەبیاتی فەرەنسی لە پایتەخت. ئەو ساڵانەی کە ئێمەش دەیزانین و ئاگامان لێیەتی. کاتێک ئەو بە کاتژمێران باسی شاری پایتەخت و ژیانی خۆی دەکرد، بێگومان ژیری لە یاد نەکرد. بەڵێ ئەو باسی ژیریشی کرد. ژیر؛ گەردەلوولێک کە هات و چوو، گەردەلوولێک کە دڵ، ڕۆح و مێشک و جەستەی کۆتری دایە بەر فێنکایی بای بەهێزی ئەشق و سەودا. گەردەلوولێک کە قژ، ڕوخسار، گەردن و بەدەنی کۆتری بە نەرمی، بە ڕەقی فڕاند. ژیر؛ خاوەن بڕیار، خاوەنی کۆرپەلە، بەڵێ کۆرپەلە، خاوەنی تۆواو، بەڵێ خاوەنی تۆواو و کۆرپەلە. قسەکانی دوا شەوی ژیر کە ئێمە دەیزانین. ڕۆشتنەکەی لە سپێدەی بەیانێکدا، ڕۆشتنی بێ گەڕانەوە، بە چاوی تەڕ و ڕوخسارێکی

* ئارەزووی مەحاڵ/ تەنیاییەکی ڕووت/ پلیکانەی مەرگ/ ناوەکەت دەنووسمەوە...

** شین بۆ ئەوانەی گیانیان لە ڕێگای وەتەن داناوە..

مەلوولەوە. ژیر ڕوخساری لە کۆتر با دەداتەوە و دەڕوا. کۆتر لە بەر دەرگا ڕاوەستاو، تاڵە سەر لێشێواوەکانی قژی بە دەمیەوە، دڵتەنگ، دڵ پڕ، مات، دوودڵ. ژیر وەک سێبەرێکی مەغریبی ئێواران بێدەنگ ون دەبێت و دەڕوا. هاواری کۆتر؛ ژیر مەڕۆ، مەچۆ بۆ ئەو وڵاتە بێبەخت و نامۆبارەکی مردنە.... و بێدەنگی. بێدەنگییەکی بەهێز کە تەواوی جیهان دەگرێتەوە. بەڵام لێدان و ترپەی دڵ، ڕاوەشاندنی دەست و فرمێسک هەڵوەراندن بە شوێن ژیردا.

ژیر؟ چی بە سەر هاتووە؟ ئەو لە کوێیە، چی دەکات؟ خودا دەزانێ لە کوێیە، چی بە سەر هاتووە. ڕۆشتن، ئەو ڕۆشتنە.

کۆرپەلە؟ تۆواو؟ کۆرپەلە تۆواو و گەرمای پێویستە، خۆشەویستی پێویستە، ڕووناکی پێویستە. کۆرپەلە و تۆواو جووتێک دڵی دەوێ. بە تەنیا دڵێکی تەنگی سارد، زیز و شکاو چی لە کۆرپەلە و تۆواو بکات؟

پاشانیش شەوانی خەون و خەیاڵ، هزر و گومان. هزر، فەلسەفە، خواست و ویستی مرۆڤ، مرۆڤایەتی، وڵاتی چیا، جموجۆڵی ئەوێ، ژیر. لەگەڵ ئەو بوون. کۆتر وەهایە. ئینسانێکی وەهایە؛ هەمیشە بە هیوای دەنگێکە کە بتوانێ ڕووناکی بڕژێنێتە سەر ڕۆحی گەڕۆکی، بە هیوای گێڕانەوەی داستانێکە کە بتوانێ مێشکی سەوداسەری وەڵامی ئارام بکاتەوە، دەوڵەمەندی بکات. کۆتر وەهایە.

پاشان لە باربردنی کۆرپەلە، کورت کردنەوەی قژ... و ڕێگە و ڕۆیشتن. بەرەو وڵاتی چیا، بەرەو چیا، بەرەو بزووتنەوەی سەرهەڵدەران. ڕۆژانی ئەو لە چیا و ژیانی شەڕڤانی. کۆتر ئەمەش دیسان دانە بە دانە هەرچی چۆنێک بێت ڕۆژ بە ڕۆژ، هەر هەمووی دەگێڕێتەوە بێ ئەوەی شتێک بشارێتەوە. یەکەم دێڕەکانی لاپەڕەی نوێ وەها نووسرایەوە. بەڵێ نووسرایەوە. باز و ئەفسەرانی دەور و پشتی ، دوای یەک حەفتە گێڕانەوەکانی کۆتر، هەموو ئەو بەسەرهاتانەی کە باسی

کرد، پێیان نووسی. ئەو نووسییەوە، بە هەوەس، بە خواستەوە، وەک بڵێی لە دەفتەرەکەی ژیانی سەر چیادا دەینووسێتەوە، وەها ساکار، گەرم و گوڕ و ڕۆشن هەموو شتێکی نووسی. ئەوەندەی سێ لاپەڕەی دەستنووس بە پێنووسێکی ڕەش و ڕەق کە پەنجەکانی دێشاند. بە زمانی باز، لێ جارجارەش هەندێک دێڕ بە زمانی فەڕەنسی و بە زمانی خەڵکی وڵاتی چیاکانیش. دواتر، ڕۆژێک، کەی بوو ئێستا نایەتەوە بیری کۆتر، سەر لە بەیانی و پاش قاوەڵتی، باز و ئەو دوو ئەفسەرە کە هەمیشە لەگەڵ بازن، هاتن بۆ ژوورەکەی کۆتر. ئەفسەرێکیان سینییەک میوەی بە دەستەوەیە، لە دەوری کۆتر لە سەر کورسییەکانی ناو ژوورەکە دانیشتن. دوای حاڵ و هەواڵپرسین و دوای قسە یەکجار نەرمەکانی باز، باز بە نەرمی وەهای پێ گوت: «کچەکەم ئێستا ئێمە گەیشتینە شوێنێک کە پێویستی بە هەنگاوێکی نوێیە. بە ئاگایی و پارێزەوە، بەڵێنی ئێمە، ژیان و داهاتووی خۆت لە بەر چاو بگرە و وەڵام بدەوە... چەند خودا هەیە؟

کۆتر بێ ڕاوەستان وەڵام دەداتەوە «یەک»

«چەند باوک؟»

کۆتر دووبارەی دەکاتەوە «یەک»

«چەند دایک؟»

«یەک»

«چەند دەوڵەت؟»

کۆتر کەمێک ڕادەوەستێ بەڵام وەلام دەداتەوە «یەک»

«باشە کچی من، چەند سەرۆک؟»

«یەک» کۆتر بی ئەوەی بیر بکاتەوە بەرسڤ دەدات.

«چەند ئاڵا؟» باز خۆشحاڵ لەو وەڵامانە دیسان بە نەرمی دەپرسێ.

«یەک»

«چەند وڵات؟»

«یەک»

«باشە کچی من زۆر باشە...» و پرسیاری دوای وەڵامەکانی کۆتر، بە شوێن یەکدا دێن. سروودی دەوڵەت، میللەت و وڵات چەند دانەیە؟ نامووس و شەرەف، بەها و شەرافەتی دەوڵەت و میللەت چەندن؟ و پرسیاری لەم شێوە...

کۆتر وەڵامەکانی دووبارە دەکاتەوە؛ یەک، یەک...

ئەمجار هەنگاوێکی نوێ دەستی پێکرد. «زۆر زۆر باشە کچی من» بە خۆشحاڵییەوە وتی «کەواتە ئێمە لە سەر بنەماکان پێک هاتین، ئەمجار پێویستمان بە گەشت و سەیرانە. کۆتر تۆ دەبێ شوێن و حەشارگەی جەردەکانمان نیشان بدەی. شوێن، جێگە، حەشارگە و ئەو کەپرانەی خۆیشت لەوێ بووی. گوند و ئاوایی و گوندی و ئەو خەڵکانەی هاوکاریی ئێوەیان دەکرد... پێویستە هەموو ئەو شتانە بکەیت. ئیمتحانێکی باش بدەی تاوەکوو ئێمەش بە تەواوی بڕوات پێ بکەین و لە مردن ڕزگارت بێ... باشە؟»

کۆتر چاوەڕوانی داخوازێکی لەم شێوە بوو. ئەو بەو شتانەدا کە بیستبووی، لە ئەزموونی ژیانی شەڕڤانییەوە دەیزانی کە کاتێک شەڕڤانێک ئەسیر بکرێ، داخوازێکی وەهای لێ دەکرێ. هەر بۆیەش کۆتر بە تەنیا قسەکەی بازی بۆ دووبارە کردەوە «باشە» بە ئاسانی، بە سادەیی، بێ هیچ شک و گومانێک. چونکە یەک لە یاساکانی شەڕڤانی کە کۆتر فێری بوو، جارجارەش پێیان وتبوو ئەمە بوو؛ کاتێک شەڕڤانێک ئەسیر دەبێ، پێویستە ئەوەندەی سێ هەفتە خۆی ڕابگرێ و قسە نەکات، شوێن نیشان نەدات. بەڵام پاش سێ هەفتە، بۆ ڕزگار کردنی خۆی دەتوانێ شوین نیشان بدات. لە ماوەدای ئەو سێ هەفتەدا، هەموو شوێن و حەشارگەکان کە شەڕڤانی دیلکەوتوو

دەیناسێ و شارەزایەتی، چۆڵ دەکرێن. بەڵێنی شەڕڤانان، ژیانی شەڕڤانێتی وەهایە. هەر بۆیەش کۆتر بە ئاسانی وتی «باشە...»

ئێستا ئەوان/ ئێمە، لە ڕێگەداین. بەرەو حەشارگە و بنکەی سەرهەڵدەران. ئەوەندەی هەفتەیەکە کە ئەوان بە شوێن جێ و بنکەی سەرهەڵدەراندا دەگەڕێن. پێش ئەم سەر لە بەیانییە، لە ناو ئەو هەفتەدا ئەوان دایان بە سەر چوار بنکە و حەشارگەی سەرهەڵدەراندا، بەڵام دەست بەتاڵ و بێ ئەنجام، بێ ئەوەی کەسێک لەو شوێنانەدا ببینن. هەر وەک کۆتر مەزندەی دەکرد، هەمو شوێنێک چۆڵ و چۆڵکراو بوون. ئێستا ئەوان بە ڕێگەوەن بەرەو بنکەیەکی نوێ کە کۆتر بۆی باس کردوون. کۆتر بە گشتی دڵنیایە؛ ئەم بنکەیەش وەک ئەوانی پێشوو چۆڵ کرابێت.

کۆتر پێی وایە.

ڕێگەیان زۆر درێژە. ئەوان نیوەشەو کەوتوونەتە ڕێ و هیشتاش بەڕێوەن. سەرەتا بە جیپی سەربازی لە پادگانەوە تا بەر بناری چیا و لەوێشەوە بە پێ، بە قەدپاڵی چیادا بەرەو بنکەی باز و سەربازان کە لە دڵی چیادایە. لەوێشەوە بە سەر چیاکاندا، لە ناو ڕێچکەی درێژ و پڕ پێچدا، بە دڵی دارو دارستاندا، بەرەو خوار، بەرەو شیو و دۆڵی قووڵی چیاکان.

باز دەڕوا- وەک ئەو باو و باپیرانەی کە هەرگیز نەیبینیون و ئاگای لێیان نییە- شاخ، گرد، تەپۆڵکە، قوڵکە، چاڵ، دار و دەوەن، ئاو، جۆگە بەجێ دەهێڵێ و دەڕوا.

کۆتر دەڕوا — وەک ڕۆژانی شەڕڤانێتی — لە سەر شاخەکان، بە ڕێگەی تەنگ و پێچەڵاوپێچدا، بە سەر بەرد، زیخ و چێو و بەرد، ئاستەنگ، دڕک و داڵدا دەڕوا. بەرەو ئەو دۆڵ و هەڵدێرانەی کۆتر لەگەڵ هەڤاڵانی شەڕڤان، چاویان لە یەک بڕیبوو، بە سەر ماندوویەتیی

جەستەیاندا زاڵ دەبوون. بەرەو ئەو شوێن و جێگایانەی باو و باپیرانی باز بە هیوای گەڕانەوە بەرەو ماڵ و گوندی خۆیان، بە هیوای ڕۆشتنی بێگانەکان خۆیان تێیدا شاردبۆوە.

مانگ ئێستا ئاوا بووە، ئەستێرە داچوون. بەڵام خۆر، تیشکی خۆر هێشتا دیار نییە. مژێکی تەنک دەر و دەشتی گرتوەتەوە. شەونمی پاییزی کەوتۆتە زەوی. دونیا ساماڵە. دەنگ نایەت. بێدەنگییەکی قووڵ و پڕسام بە دەوریانەوەیە. بە تەنیا جار جارە هەندێک باڵندە، هەندێک کوندەبەبوو جووکەیان دێت. شنەبایەکی پاییزی بە ئارامی گەڵای داران کە ئێستا لە پاییزی تەمەنی خۆیاندان، دانەدانە دەوەرێنێ.

ئێمە لای کۆترین. کۆتر بێدەنگ لە نێوان ئەفسەر، سەرباز و گوندیی چەکداردا، دەست بەتاڵ، بە جل و بەرگی کۆنی گوندییانەوە کە وەک پیاوان پۆشیویەتی، دەڕوات و بیر لە بێدەنگی، بێدەنگیی ڕۆح و مێشکی خۆی دەکاتەوە. ئەمە چ ژیانێکە؟ ئەو بیر دەکاتەوە: بۆچی وەهایە؟ بۆچی وای لێهات؟... ئەم بێدەنگییە، ئەم هەرا و هوریایە، ئەم ئاڵۆزییە، ئەم شەپۆلی دوودڵ بوونە کە دەروونی ئەو وەک دەریایەکی سەرشێت دەشڵەقێنێ... کۆتر چی لە دەست دا؟ کۆتر چی بە دەست هێنا؟ ئاخ، ئێستا دادە لێرە ببوا! ئاخ ئێستا کەسێک لێرە دەبوو، هەندێک کەس ببونا، ژیر ببوایەت، هاوڕێیانی کتێب و دەرس و خوێندنگا بوایەتن، ئەوان لێرە بوونایە و کۆتر بیتوانیبا لەگەڵیان قسە بکات، حاڵ و هەواڵی خۆی بۆ ئەوان بگێڕێتەوە. سوحبەتێکی لە دڵەوە، گەرم، بە گریان، زیز، ئێستا کۆتر چەندە پێویستی بەمە بوو. خۆزگە ئەو نەدەترسا، خۆزگە چاوی خۆی لە مەرگ نەدەگرت و نەدەکەوتە ئەم دۆخەوە. کۆتایی ئەم دۆخە کەیە؟ کۆتایی ویستی ئەمانە چییە؟ دوای ئەمە چی دەبێ؟ کۆتر چی بکات؟ ئەو کام وانە و هونەری خۆ ڕزگار کردن دەزانێت؟ خۆی بکوژێت؟ هەڵبێت؟ حەشارگەیەک؟ پارێزگەیەک؟

کۆتر ماندوو، هەناسە لێبڕاو، ترساو دەڕوات و بیر دەکاتەوە.

با زوڵفی کۆتر دەشەکێنێتەوە. فێنکاییەک بە دەم و لێو و لووتیدا دەدات. من ناتوانم، کۆتر دەمبەستراو بیر دەکاتەوە. نا، من ناتوانم، دوای ئەم بنکەیەش یەکی نوێ دێتە پێش، دوای ئەویش یەکی دی. پێویستە جموجۆڵێک، بزووتنێک، بزافێکم هەبێ. دەنگێک، هاوارێک، تۆلانێک پێویستە. بەڵام چۆن؟ ئەم چەکدارانە بە شوێنمەوە، ئەوانەی پێشمەوە، چەکەکانیان، لوولەی درێژ و ساردی چەکەکانیان کە بۆ کوشتن و مردنن، کە تەنیا مردن و کوشتن دەخەنەوە بیری مرۆڤ، کە تەنیا تار و تاریکیی مردن بە بیری مرۆڤ دێننەوە. نا، من ناتوانم، نە هێز و توانا، نە تاقەت و هەوەسێکم نەماوە. مردن، تەنیا مردن ماوە...

کاتێک کۆتر، باز و ئەوانی دی خۆیان دەگەیەننە ژێر پێی چیا و سەرەتای شیوەکە، تیرێژی خۆریش هێدی هێدی هەڵدێت. دونیا بە ئارامی ڕووناک دەبێتەوە. کۆمەڵ و دەستە ئێستا گەیشتوونەتە بنەوەی شیوێکی قووڵ، درێژ و پڕ پێچ و خەم کە چەمێکی باریک سەرانسەرەکەی دەبڕێ. دەور و پشت بە شاخی سەرکەش تەنراوەتەوە. قەدپاڵ و داوێنی چیا پڕی دار و درەخت و دارستانە. چەمی بەردەمیان خۆی ڕادەشەکێنێ و بە نەرمی دەڕوات. هەندێک قوژبن و قڵەش لێرە و لەوێ بەر ڕووبارەکە دەگرن و لە ناو شاخ و گردەکاندا ون دەبن. تیرێژ بەرز دەبێتەوە. چیا، دار، دارستان، ئاو، ڕووبار بە ئارامی لەگەڵ شەوقێکی سووکی زێڕین دەست بە بریقانەوە دەکەن. داری کۆنی قایمی بێ بەر، داری بەڕوو کە ئێستا لە ناو مژێکی تەنکدا وەک بینایەک دیارن، بە ڕەنگێکی یەکجار تایبەت کە کۆتر باش بۆی دەرناکەوێ چ ڕەنگێکە، دەبریقێنەوە. دونیا هەنووکە ساماڵ، هێشتا بێدەنگە. ئەو بێدەنگییە، ئەو ئارامییە، ئەو زوڵاڵییە، ئەو جوانییە! ماوەیەک پێش ئێستا، ئەو کاتەی کۆتر لەگەڵ شەڕڤانان لێرە بوو، دەر و دەشت

دیسان هەر بەم شێوە زێڕین، بەم شێوە بەهەشتی بوو. ئێستاش کۆتر سەیری دەور و پشتی خۆی دەکات؛ لە سەر چیاکانەوە چەند باڵندەی گەورە لە شەقەی باڵ دەدەن و دەفڕن. جووتێک کەروێشک، زۆر دوورتر لە کۆمەڵی مرۆڤەکان، دەست بە غار دەکەن و هەڵدێن. چەندە لە مردن، کوشتن، سووتان و ڕووتاندنەوە دوورا لە توندوتیژی، قین، نەفرەت و ڕق چەندە بە دوورا!

بەڵام ئەم ئینسانانە، ئەم شەڕە، ئەم قین و نەفرەتەی ئەم ئینسانانە؟ ئەی ویستی ئەم کین، نەفرەت و توندوتیژییە کە ئەم وڵاتەی گرتۆتەوە؟ ئەو دڵ و ڕۆحانەی کە بە خوێن ئاو دەدرێن و خوێنیان کردۆتە کانیاوی ژیان بۆ خۆیان؟

کۆتر، کۆتر بیر دەکاتەوە، کۆتر ئیدی دەست لەو بیر و گومانانە هەڵبگرە. ئیدی تۆ نە پێویستت بە هزر و گومان و نە بە دوودڵیش هەیە. تۆ ئیدی غەریبی، غەریبێکی بێ نرخی ژیان، هی مرۆڤان، هی کۆمەڵگا، ئیدی نە خۆشی و خراپی، نە باشی و چڵکنی، بە تەنیا غەریبێکی ونبوو، ئەم دیمەن و بەرجەوەنانەی ئەمڕۆ ئیدی خەیاڵێکی وێران و پڕ کەسەری ڕۆحێکی مردوون. ئەوەی تۆ دەتوانی ئێستا بیکەی ئەمەیە؛ بە هیوا بە، حەز بکە، دوعا بکە کە ئەم بنکەیەش چۆڵکرابێ، بە هەڵە کەسێکی تێدا نەمابێ...

کۆتر وا بیر دەکاتەوە، هیوای کۆتر ئەمەیە.

بەڵام؟...

بەڵام؛ دوای ئەوەی هەموو دەستە خۆیان دەگەیەننە ناو دۆڵەکە، باز، ئەفسەر، دوو گوندی و دوو سەرباز کۆ دەبنەوە. ئەوەندەی ماوەیەک ئەوان پێکەوە لە دارستانی پاڵ شاخەکەدا قسە دەکەن. پاشان یەک لە سەربازەکان دێت و کۆتر دەبا بۆ لای ئەوان. باز و ئەوانی دی لەوێ لە سەر بەردان دانیشتوون، باز جگەرەیەک لە ناو لەپی دەستیدا، لە

نزیک خۆی شوێنێک نیشانی کۆتر دەدا. کۆتر دادەنیشێ. باز یەکجار بە وردی، یەکجار بە ماناوە، ئەوەندەی چەند خولەکێک، جگەرەکەی دەکێشێ و سەیری کۆتر دەکات و بێدەنگ بزەی دێت. باز ڕاست لە چاوی کۆتر دەڕوانێ. گەرم، نەرم. وەک ڕوانینی باوکێک یانیش دلّدارێک. تەزوویەک بە دەروونی کۆتردا دێت.

«کچەکەم سەیر کە» باز بە بزەیەکەوە دەلّێ؛ «ئێمە گەیشتینە دۆلّەکە، دۆلّی مردن. وا نییە؟ بەم دۆلّە دەلّێن دۆلّی مردن، وا نییە؟»کۆتر هیچ نالّێ، هەندێک لە ڕوانینی باز شەرم دەیگرێ و سەیری بەردەمی خۆی دەکات. باز جارێکی دی دەپرسێ «وا نییە کچی من؟»

کۆتر دەلّێ؛ «بەلّێ»

نیگای باز لە سەر کۆترە. دیسان چەند خولەکێک لێی دەڕوانێ و جگەرە دەکێشێ. پاشان ڕوو دەکاتە ئەفسەرەکەی تەنیشتی و دەلّێ «هەندیک گۆشتی برژاو بدەنە کۆتر، ئێمە کاتی خواردن و خواردنەوەمان نییە، کەمێک گۆشتی بدەنێ» ئەو دیسان هەلّدەگەڕێتەوە بە لای کۆتردا «کچی من، ئێستا بلّێ حەشارگەکەتان لە کوێدا بوو؟»

کۆتر دەستی ڕاستی هەلّدێنێ و هێما بۆ لای خوارووی دەراوەکە دەکات.

باز سەیری گوندییەکان دەکات، گوندی سەریان بە هێمای بەلّێ دەلەقێنن. «کەواتە بنکە لە دلّی شیوەکەدایە، کەواتە هەستن خۆتان کۆ بکەنەوە، چەک و ڕەخت توند بکەن، لێرە بە دواوە ئیتر دەنگ نەبێت. ئێمە بە هێما و ئاماژە جموجۆلّ دەکەین... دەی هەستن، زووکەن، خێرا کەن، بەر لەوەی خۆرمان لێ هەلّبێت، خۆمان بگەیەنینە ئەو شوێنە. زووکەن، زووکەن...»

ئەوان هەلّدەستن، خۆیان دادەتەکێنن و دەکەونە ڕێ. کە ڕێدەکەون

باز هەڵدەگەڕێتەوە بە لای ئەفسەرەکەی پاڵ خۆی و دەڵێ «کۆتر لای ئێمە دەبێ، ئاگات لێی بێ...»

بە خێرایی برووسک خۆیان کۆ دەکەنەوە، سەیری چەک و ڕەختەکانیان دەکەن و بێدەنگ بە سیستەمێکی بەهێز، دیسان ڕیز بە ڕیز بەرەو خوار، بەرەو دڵی شیوەکە دەڕۆن و لە ماوەیەکی کۆرتدا خۆیان دەگەیەننە دەور و بەری شوێنەکە. باز، ئەفسەرێک، گوندییەک، دوو سەرباز وکۆتر خۆیان دەدەنە پال شاخێک. لێرەوە بنکە ئێستا وەک دەیمەنێکی بەهەشتی دیارە. بنکە، چەند ئەشکەوتێکە، ئەشکەوتێک کە لە ناو دڵی یەک و لە تەنیشتی یەکن، لەو بەر ڕووبارەکەوە، کەمێک دوورتر لە ڕووبار لە بەر پێی شاخ و گردەکاندان. هیچ دەنگ، هیچ سەدایەک لە دەور و بەر نایەت. هیچ جموجۆڵ، هیچ بزووتن و هیچ هێمایەکی ژیان بە دەور و پشتی ئەشکەوتەکانەوە دیار نییە. بێدەنگییەکی قووڵە، جگە لە دەنگی نەرمی ئاوی ڕووبار هیچ دەنگێک نایە. ئەو بێدەنگییە کە هیچ وشەیەک ناتوانێ وەسفی بکات، ئەو ڕەنگی مۆر، وەنەوشەیی، زەرد و سوورە کە پێکەوە ڕەنگیکی نوێی نەبینراو پێک دێنن. ئەو بۆنی تێکەڵی دار، بەرد، چیا، ئاو، گەڵا، گیا و خاکە، ئەوانە هەموو پێکەوە، هەستێکی سەیر، هەستیارییەکی زۆر ناسک بەدی دێنن. لە سەر چیاکانیش خۆر، ڕووناکی، تیرێژ کە هەنگاو بە هەنگاو، شەپۆل بە شەپۆل بەڵام هێدی و ئارام بەرز دەبێتەوە، درەوشانەوەی شەوق لێرە، لەوێ، پێکدێنێ و دەسەڵاتی هەموو ڕەنگەکان، هەموو هەرێمەکان، هەموو دەر و دەشتیان لێ دەستێنێ.

ڕیزەکانی دەستەی باز، بە خێرایی، پسپۆڕانە، بێدەنگ، دەور و بەری ئەشکەوتەکان دەگرن و لە پشت بەرد، کەپر، شاخ و گردەکان، چەک بە دەستەوە، لوولەی چەک بەرەو ئەشکەوت، بە پێوە، دانیشتوو، هەڵترووشکاو، ڕاکشاو، چاوەدێری دەکەن. چاوەدێری، چاوەڕوانی، شەڕ،

پێکدادان و کوشتن. هەر چرکەیەک، هەر خولەکێک بە قەد تەمەنێکە. چاوەڕوانییەکی قورس...

دوای ماوەیەک چاوەڕوانی، شتێکی مەزندەنەکراو ڕوو دەدات. لە دەرگای ئەشکەوتێکەوە کە هێشتا لە ناو مژێکی تەنکدایە تارمایی مرۆڤێک وەک سێبەر دەردەکەوێت. تارمایی هێدی هێدی لە مژ دوور دەکەوێتەوە و بەرەو لای ڕووبار دێت. مرۆڤێک. تارمایی دەبێتە مرۆڤێک. مرۆڤێکی ئەسمەری باڵابەرز، وشیار، بەژن ڕاست، لاو، سمێڵ درێژ. مرۆڤێک بە جل و بەرگی شەڕڤانانەوە. شەڕڤانێک.

لێرە، ئێستا دوێنێ دووبارە دەبێتەوە. دوێنێ؛ لاوێک لە خزم، کەس، ناسیاو، باو و باپیرانی باز- لەوانەیە - باوکی باز- لە بەربانگی بەیانیدا لە ئەشکەوت هاتە دەر هاتە بەر ڕووبارەکە،- بێ ئەوەی ئاگای لە شتێک هەبێ. ئەمڕۆ؛ شەڕڤانێک لە شەڕڤانانی بزووتنەوەی سەرهەڵدەر، لەم بەرە بەیانە ساماڵ و ڕووناکەدا لە ئەشکەوت دێتە دەر و دێتە کەنار ڕووبارەکە- بێ ئەوەی ئاگای لە شتێک بێت. دوێنێ؛ بەسەرهاتی لاوێکی چیایی کە نایەتەوە یادی باز. ئەمڕۆ؛ بەسەرهاتی شەڕڤانێک کە بە فەرمانی باز ئەنجام دەدرێت.

لەگەڵ دەرکەوتنی شەڕڤان کۆتر مات دەمێنێ. هەموو بەدەنی دەلەرزێ، تەزوویەک بە سەریدا دێت. قوڕگی پڕ دەبێت و بە ئارامی دەڵێ «ئەی وای، هەی واخ، نا، نا، نابێ، نا، نا، بۆچی؟ بۆچی؟ بۆچی ئەوە لێرەیە؟ بۆچی وەها بێ تەدبیر، بێ پاسەوان؟ بۆچی؟... نا، نا...

هەرچی بازیشە خۆشحاڵ دەبێت. باز چاوە بچووکەکانی لە سەرهەڵدەر، پێدەکەنێ و دەڵێ «وەرە، وەرە جەردەی بێعەقڵ، وەرە...»

شەڕڤان دێتە بەر ڕووبار، لەوێ بە پێوە ڕادەوەستێ. لە دەور و پشت، لە ئاسمان دەڕوانێ و پاشان دۆخینەکەی دەکاتەوە و ڕوو لە باز،

کۆتر و ئەوانی دی ماوەیەک میز دەکات. دوای میز کردن و چەند جاران خۆ ڕاشەکاندن، دۆخینەکەی دەبەستێتەوە، لە سەر قینچکان دادەنیشێ و دەست و ڕووی خۆی دەشوات، ماوەیەک خەریک دەبێت بێ ئەوەی پەلە بکات. دواییش هەڵدەستێتە سەر پێ و بە قۆڵی کراسەکەی دەم و چاوی وشک دەکاتەوە و بەرەو ئەشکەوتەکان دەگەڕێتەوە تاوەکوو بچێتەوە ناو ئەشکەوت، بەڵام لەم کاتەدا دوێنێ دووبارە دەبێتەوە. لەم کاتەدا دەنگی تەقەیەک دەر و دەشت دەگرێتەوە. لەم کاتەدا دەنگی تەقەیەک بە جاران لە ناو شیو و دۆڵ، شاخ و چیادا ئۆلان دەدات. ئەمجار بە دەنگی تەقە، بێدەنگیی دەر و دەشت دەقڵەشێ و باڵدار و باڵندە لە ناکاو دەفڕن و دوور دەکەونەوە. شەڕڤان دەمەو ڕوو دەکەوێتە زەوی، بەڵام دوای کەمێک هەڵدەستێت و بە هەڵهاتن بەرەو ئەشکەوت دەڕوات. ئەمجار دەبێتە گورمەی چەک، تەقینەوەی ئاگر. شەڕڤان ئەمجار دەکەوێت و ئیدی هەڵناسێت.

لەم کاتەدا کۆتر بە قیڕەوە هەڵدەستێتە سەر پێ و دەیهەوێ بەرەو ڕووبار، بەرەو شەڕڤانی کەوتوو بڕوات. بەڵام ئەفسەر و گوندییەکەی تەنیشتی زۆر توند دەست و پێی دەگرن و بە زۆر لە چاڵی تەنیشتی شاخەکەدا دایدەنێن. کۆتر ئیدی هیچ نابینێ، تەنیا دەبیستێ. لەگەڵ دەستپێکردنی ئەم گورمە سەرلێشێواوە، لە دەرگای ئەشکەوتیش دەنگی تەقە دێت. تەقەیەکی بەهێز، گەورە و تەقە لە هەر دوولاوە. بە هەموو تواناوە دەست پێدەکات. بە ئارپیجی، کلاشینکۆف، بی کەی سی، چەکی قورس، قەناس. بێپشوو، بێڕاوەستان. بە کاتژمێران. خۆر هەڵدێت، سپێدە دەگاتە بەیانی و تەقە درێژەی هەیە. بەیانی دەگاتە نیوەڕۆ و گورمە گورم هەر بەردەوامە. لە لای ئەشکەوتەکانەوە، لە دەرگای ئەشکەوتی گەورەوە ئاگرێکی بەهێز لەگەڵ هاوار و قیڕە دەبارێ.

ئەوان چەند کەسن؟ چۆن دەتوانن ئاوەها بەو توندییە ئاگر ببارێنن؟

بەڵام بەرەو ئێوارە، هەر وەک ئەوەی دوێنێ قەومابوو، کاتێک خۆر بە سەر چیاکاندا لە لای ڕۆژهەڵاتەوە بەرەو ڕۆژئاوا دادەگەڕێ و لە لای ڕۆژئاوای چیاوە بەرەو خوار دەبێتەوە، ئەمجار ئەو سەربازانەی بەرەو ئەشکەوت هاتوون، نارنجۆکێکی بێ ئەژمار هەڵدەهاوێژنە ناو ئەو ئەشکەوتەی ئاگری لێ دەبارێ. نارنجۆک بە شوێن یەکدا، بێ پشوو. پاشانیش لە زۆر نزیکەوە، چەکی قورس کە دەڵێی ئەژدیهایە و ئاگری لە دەم دێتە دەر، دەست بە ئاگر باران دەکەن. ئەمجار ئەو ئاگرەی لە ئەشکەوتەوە دەبارێ، هێدی هێدی دەبڕدرێت.

ئاگر دەبڕدرێت. دەنگ دەبڕدرێت، قیڕە دەبڕدرێت.

ئەمجار ئەو ئاگرەی لە پشت دار، بەرد، بەردەڵان، بەرزایی، تاشەبەرد و شاخ و کەپرەکان دەبارێ، ئارام ئارام دەبڕدرێت و ڕادەوەستێت.

دونیا دیسان ئارام دەبێتەوە، دەر و دەشت کە ببووە جەهەننەم دیسان دەکەوێتە ناو بێدەنگییەکی قووڵ.

باز جگەرەیەک لە پاکەت دەردێنێ، دەیگیرێنێ و چەند مژی قووڵی لێ دەدات. لە پشت ئەو لاپاڵەی ئەوانی تێدان، لە حاڵێکدا کە نیگای بە وردی لە سەر ئەشکەوتی دوورە کە هێشتا دووکەڵی لێ هەڵدەستێ، بێدەنگ جگەرەکەی دەکێشێ. لە ڕواڵەت و ڕوخساری، لە نیگا و جموجۆڵی هیچ شتێک نایەتە تێگەیشتن. ئایا ئەو خوشحاڵە؟ ڕازییە؟ خەمینە؟ بە پەژارەیە؟ باز بیر لە چی دەکاتەوە؟ باز چ هەستێکی هەیە؟ ئەو بەس جگەرە دەکێشێ. هەموو کەس، کۆتر کە ئێستا هەستاوەتە سەر پێ و خۆی داوەتە پاڵێک و بۆ ئەشکەوت دەڕوانێ. ئەفسەر، سەرباز، گوندی، لە شوێنی خۆیانەوە، بێدەنگ، بێجووڵە، ڕاوەستاون و چاوەڕوانی فەرمانی باز دەکەن. باز پەلە ناکات، ئیدی پێویست بە پەلە نییە. دوای جگەرەی یەکەم باز جگەرەیەکی دی دەردێنێ و دەیگیرێنێ.

دەنگێک نییە، قەت نییە. بێدەنگییەکی سەیر قووڵ، سەیر قورس، وەک کفنێک دەر و دەشتی گرتۆتەوە.

دوای ئەوەی باز دووهەم جگەرەش دەکێشێ. لە لاپاڵ دێتە دەر و یەک بە یەک، شوێن بە شوێن، کەپر بە کەپر لە دەر و دەشت دەڕوانێ. نیگای خۆی بە سەر ئەفسەر، سەرباز و گوندییاندا دەگەڕێنێ، پاشان دەستی ڕاستی خۆی بەرەو سەرباز و گوندییەکان کە خۆیان گەیاندۆتە هەر دوو لای ئەشکەوت، هەڵدێنێت و ئاماژە بۆ ئەشکەوت دەکات. سەرباز و گوندی، جووت جووت هەر یەک لە لایەکی دەرگای ئەشکەوتەوە دەچنە ژوورەوە. جووتێک، دوو جووت، سێ جووت... چەند سەربازیش لە بەر دەرگای ئەشکەوتێکی دی ڕادەوەستن. دوای ماوەیەک دوو سەرباز لە نێوانیاندا تەرمێک، سەربازێک دەست و ئەوی دیش لاقی تەرمەکەیان گرتووە، لە دەرگای ئەشکەوت دەردەکەون. ئەوان دێنە دەرەوە، دەچن و تەرم لە شوێنێکی تەختایی لە نێوان ئەشکەوت و ڕووباردا دادەنێن. دواییش دەگەڕێنەوە بەرەو ئەشکەوت. بەر لەوەی ئەوان بچنە ناو ئەشکەوت، دوو سەرباز کە دەست و لاقی دوو تەرمی دیکەیان بە دەستەوەیە، دەردەکەون. و تەرمێکی دی. تەرمێکی دی. تەرمێکی دی. ژمارەی تەرم دەگاتە شەش. باز، کۆتر، ئەفسەر و ئەوانی دی بە دەوریانەوە، بێدەنگ سەیری ئەو جموجۆڵی مردنە دەکەن. شەش تەرم و ئەو شەڕڤانەی لە بەر دەرگای ئەشکەوت کەوتووە، حەوت مردوو، حەوت کوژراو.

ئەفسەر، سەرباز و گوندی لە سەر تەرمەکان کۆ دەبنەوە. ئەفسەرێک لە دەستەی کۆوەبوو دادەبڕێت و دێت بۆ لای باز. ئەو بانگ لە باز دەکات، بە ئارامی، چەند خولەکێک هەندێک شتی پێ دەڵێ. باز گوێی لێ دەگرێت و دواییش بڕێ قسەی بۆ دەکات و دەگەڕێتەوە پاڵ شاخەکە. ئەفسەریش دەگەڕێتەوە بۆ سەر تەرمەکان. ئەفسەر بە سەر

تەرمەکانەوە دەمانچەکەی دەردێنێ، دێتە سەر تەرمێک و سێ گوللە دەنێت بە تەرمەوە. پاشان ئەفسەر هەمان شت لە سەر تەرمێکی دی دووبارە دەکاتەوە.

ئەمجار ئیدی کۆتر خۆی پێ ڕاناگیری، لە شوێنەکەی دێتە دەر، بەرەو تەرمەکان دەڕەوات، سەربازێک دەخوازێ ڕایبگرێ بەڵام باز بە ئارامی دەڵێ «لێیگەڕێ، لێیگەڕێ با بڕوات...». کۆتر بە هەنگاوی قورس، لە سەر هۆش چوو، دۆشداماو، وەک بڵێی لە خەودا بێت، خۆی دەخاتە ناو ئاوەکە و دەپەڕێتەوە ئەو بەری ڕووباری باریک و دەچێتە سەر تەرمەکان. بێدەنگ، چاو پڕ لە فرمێسک، لە دەور و پشتی، لە ئەفسەر و گوندی دەڕوانێ و پاشان لە پاڵ یەکەم تەرم قینچکان دەکات. ئێستا حەوت تەرمی مرۆڤ، لاو و جوان، لە بەهاری تەمەنیاندا، لە پاڵ یەکدا ڕیزکراو، درێژ کراون. حەوت مرۆڤ کە ماوەیەک پێش ئێستا دەژیان. یەکەم تەرم کە کۆتر لە تەنیشتی دانیشتووە کچێکە. ڕۆخساری خوێناوییە، لایەکی چەناگەی پارچە بووە. لای چەپی قژی هەڵپڕووزکاوە. لێوەکانی و سەر چاوانی خوێناوییە. کۆتر بە ئارامی بە قۆڵی کەواکەی خۆی، سەر چاوان، لێو و ڕوخساری دەسڕێت. ئەوەندەی ماوەیەک کۆتر وەک بڵێی هیپنۆتیزم بووبێت، بێدەنگ لە کچی کوژراو دەڕوانێت. پاشان هەڵدەستێتە سەر پێ و سەیری تەرمەکانی دی دەکات، دانە بە دانە. لە تەنیشتی ئەوان، قورس قورس. دووهەم تەرم لاوێکی بەخۆیە کە دەستی ڕاستی لە گرێژەنەوە قرتاوە. تەرمی سێهەم؛ شەڕڤانێکی کورتەباڵای قەڵەوە کە سەری پارچە پارچە بووە، ڕوخسار و سەری پڕژاوە و مێشکی لە کەلەسەری پارچەبوویەوە دیارە. چوارەم تەرم کچێکی باڵاکورتە کە وەک بڵێی لە خەودا بێت و نوستبێ، هیچ شوێنی برین و خوێن بە سەریەوە دیار نییە. پێنجەم تەرم... تەرمی پێنجەم!

پێنجەم تەرم!...

کۆتر دەڵێ «نا» و و دەقیژێنێ «نا، ڕێناس، نا... نا!...»

بەڵێ، ڕاستە، پێنجەم تەرم هی ڕێناسە. ڕێناس کەوتووە، مردووە، کوژراوە. ڕێناس؛ بالابەرز، خۆشسەرنج، مەزن، بڵند. ڕێناس؛ شەڕڤانی فیداکاری ڕۆژانی تەنگانە، قارەمانی بەفر و بۆران، سارد و سەرما. ڕێناس؛ هەڤاڵ و هاوڕێی مان و نەمان، دۆستێک کە دەبوو کۆتر لە شاییەکەیدا سەرچۆپی بکێشایەت. ژانێک، ژانێکی زۆر باریک، زۆر بەهێز هەموو گیانی کۆتر، هەموو دڵ و مێشکی سەرتاسەر، پڕاوپڕ و قووڵ دەبڕێت. «ڕێناس» کۆتر زۆر بە ئارامی بە لاواندنەوە دەڵێت؛ «ڕێناس... ڕێناس...» ڕێناس ئێستا چاو بەستراو، ڕوخسار تۆزاوی، بەڵام ڕێچکەی خوێن بە ڕوخسارەوە نادیار، نوستووە. ڕوخسار و دەم و چاوی هیچی لێنەهاتووە. وەک بڵێی لە خەودا بێت، وەک بڵێی خەونێک دەبینێت، وەها ساکار، سادە، بێتاوان و مەعسووم، بێئاگا و بێگومان، نوستووە. کۆتر لە تەنیشتی دادەنیشێ و بە ئارامی سەری دەخاتە سەر ڕانی خۆی. بێدەنگ، بێهاوار، بێگازندە و بێجووڵە. لەو کاتەدا کۆتر دەبینێ؛ لە کەمەری ڕێناسەوە خوێن دێت. ورگ و ڕیخۆڵەی هاتوونەتە دەر. بۆنی ترشاوی، بۆنی قورسی خوێن، ئارەقو و باڕووت لە تەرمی ڕێناسەوە دێت. کۆتر دەستی ڕاستی خۆی بە سەر ڕوخسار، چاو، کوڵم و تەوێڵی ڕێناسدا دێنێت، بە ئارامی وەک ئەوەی منداڵێک نەوازش بکات. ڕێناس دەخەوێ، ئارام. ئیدی لە دەر و خەم، گومان و پەژارە، پەلە و خێرایی، شەڕ و پێکدادان بە دوور. ئیدی لە هەموو شت بە دوور. ڕێناس دەڕوات، بێدەنگ، بێ سەدا، بێ نەفەس، چاو بەستراو، هەموو شت بەجێ دەهێڵێ و دەڕوات. سەیرە، لەم کاتە بێ پایان زیز، بێ پایان پڕخەم، بێ پایان پڕ ژانەدا مانگ دێتەوە بیری کۆتر. کۆتر بە ئارامی لە ڕوخساری ڕێناس دەڕوانێ و

لە مانگ، لە گێڕانەوەی داستانی کۆن ڕادەمێنێ؛ عەگیدیش، ڕێناسیش وەک مانگن. سەرەتا ئەوان گەورە و مەزن دەبن، شەوق دەدەنەوە، دەبریقێنەوە، پاشان ون دەبن و دەڕۆن...

ڕێناس دەڕوا. وەک مانگێک، وەک ئەو خۆرەی کە ئێستا لەم سەر لە ئێوارەدا بەرەو ئاوابوون دەڕوات.

# ١٣

## نیگا

باز و نیگای باز. جارجاره نەرم، پڕپەژارە، خەمگین، جارجارە تیژ، وشک، سامناک، جارجارەش ڕەش، تاریک وەک مەرگ.

کۆتر و نیگای کۆتر؛ هەمیشە نەرم، مەلوول، تەم و مژاوی وەک خەونێک.

ڕوانین لە یەکی دی، لە یەکی دی ڕوانین؛ زمانی هەست و سەداکان، زمانی دڵ و ڕۆح؛ ڕێگەی بینین، کەشف کردن و ناسینی مرۆڤێکی دی. ڕوانین؛ برووسکەیەک کە لە نێوان دڵی مرۆڤەکاندا لێدەدات.

باسی ئەمجارەمان لە سەر ڕوانینە. ئێمە ئێستا لە بەر دەرگای ماڵێک لە ماڵەکانی گەڕەکی ئاپارتمانە سەربازییەکانین. لە شاری هەرە گەورەی وڵاتی چیا، لە شوققەی سەربازی، لە ئاپارتمانێکی سەربازیی گەڕەکی ئەفسەران. با بڵێین کات ئێستا مانگێک بە سەر سووتان، مردن و کوشتنی دۆڵی مەرگدا تێپەڕیوە. ئێمە ئێستا لە بەر دەرگای ماڵێک لە لای بازین. باز لەم دەرگاوە دەچێتە ژوورەوە. کات شەوە، کات گەشتۆتە نیوەی شەو. لە دەرەوە بارانە. بارانێکی بە لێزمە بە دەنگێکی گوڕ دەبارێ. هەوا ساردە.

باز لە شەوێکی ئاوادا لە کوێوە دێتەوە؟ ئێمە نازانین، بەڵام

جلەکانی، نە جل و بەرگی سەر چیایە و نە جلی فەرمیی ئەفسەری. جل و بەرگ تاقمێکی ڕەشی مەدەنیە. باز کلیل بە دەستێکییەوە، جانتایەکی ڕەشی بچووک بە دەستەکەی دیکەیەوە، لە بەر دەرگای ئاپارتمان لە نهۆمی چوار ڕاوەستاوە و بە ئارامی نەفەس دەگرێ و زۆر بە دیقەت دەچێتە ژوورەوە. بێدەنگ دەرگاکە دادەخات. هاڵاوێکی گەرم، بۆنێکی خۆش دەگاتە لووتی باز. ماڵ، گەرمیی ماڵ، سەرەڕای هەموو شتێک، حزوورێک دەدا بە مرۆڤ. باز پێڵاوی ڕەشی مەدەنی دادەکەنێ، جووتێک نەعلی چەرمی دەکاتە پێی و بەرەو ناو ماڵەکە هەنگاو هەڵدەگرێ. بەڵام لە ناوەوە دەنگ دێت. دەنگێکی خۆش. دەنگی گۆرانی و ستران.

دەنگی کۆتر.

بەڵێ کۆتر لە ژوورەوەیە، لەم ماڵەدایە. کۆتر هێشتا نەخەوتووە. کۆتر دەترسێ، بە زمانی خۆی بە ئاوازێکی زیز، بە ئارامی [گۆرانی] دەڵێت.

باز لە هۆڵەکە ڕادەوەستێ، خۆی دەداتە سووچێکی هاڵ و ژووری نووستن و لەوێوە گوێ لە دەنگ، لە زمانی بێگانە و غەریب کە چەند وشە زیاتری لێ نازانێت، دەگرێ. ئەو دەنگە، ئەو زمانە، ئەو وشە سەیر و غەریبانە، باز تێیان ناگات، بەڵام جارجارە، جار و بار دەیبیستێ و گوێی لێ دەگرێ. دەنگی زمانی مرۆڤانەکانی ئەم وڵاتە نەحلەت کراوە. ئەوە چەند ساڵە کە باز ئەم دەنگە دەبیستێ؟ دە ساڵ؟ بیست ساڵ؟ بیست و پێنج ساڵ؟ لە یەکەم ڕۆژی ئەرکی ئەفسەرییەوە تاوەکوو ئەمڕۆ. زیاتر لە بیست ساڵە. ئەو دەنگە چی دەڵێت؟ باسی چی دەکات؟

دەنگی کۆتر نەرم، زیز دێت؛ بە تەنیا دەنگ. نە ڕوخسار، نە جەستە، نە ڕوانین، ئێستا بە تەنیا دەنگ دێتە بەر گوێی باز. دەنگی ئەو کچە گەنجە، ئەو کچە غەریبە. سترانێکی غەریب، وشەگەلێکی غەریب. ئەو سترانە هی کێیە، هی چییە، باسی چی دەکات؟ ئەو ئاوازە

کە بە ئارامی بێ ئەوەی بەرز یان نزم بێتەوە، هەروا دەڕوات ئێستا زیزە، خەمگینە. ستران باسی خەمگینی دەکات؟ باسی مردن و کوشتن، ئاگر و سووتان دەکات؟ باسی وێرانی و ماڵوێرانی دەکات؟ باسی تینوو و برسییان، بریندار و کەوتووان دەکات؟ ئاوازێکی ئەوەندە نەرم، ئەوەندە زیز وەک بڵێی وشەکان بە ژان و پەژارەوە هاتوونەتە هۆنینەوە.

باز پاڵ دەدات بە دیوارەوە، سەری خۆی بەرز دەکاتەوە، چاوی دەبەستێ و گوێ ڕادێرێ. ئەو ڕۆژەی باز بوو بە ئەفسەر، ئەو ئەم زیزی، ئەم نەرمی و ئەم هەستی غەریبی و دوور بوونەی کە بە هۆی دەنگی گۆرانیی ئەم ئینسانانەوە بڵاو دەبۆوە، بیستبوو. لە سەر چیاکان، لە ناو دۆڵ و هەڵدێران، لە شەوانی تاریک و گورگ و مەڕی کازیوەی بەیانان‌دا، لێرە، لەوێ، ئەمەی بیستبوو. بەڵام ئێستا لە ماڵەکەی خۆی لە شوققەی ئەفسەران، لە پادگانی سەربازیش ئەم دەنگە وێرانە کە هەستێکی سەیر و غەریب دروست دەکات، دەبیستێ. بەڵێ، لە ماڵەکەی خۆی. دەنگ گەشتۆتە ماڵەکەی ئەو! خاوەنی دەنگ؟ ئەو کچە گەنجە کە ئێستا لە ماڵەکەی ئەودایە؟ باز بیر لە ئەو و ڕوخساری دەکاتەوە. ڕوخسارێکی ئەسمەر وەک ڕوخسارێک کە لە داستانە ئەفسانەییەکانەوە هاتبێت، وەک ڕوخساری پەیکەرێکی ئانتیک کە خۆی لە بەرانبەر با و تۆفانی ڕۆژ و ڕۆژگاران ڕاگرتبێ. ڕوخسارێکی ساکار وەک ڕوخساری فریشتە و پەرییە مەعسوومەکان، بەڵام پڕ لە ڕاز و نهێنی، وەک دەمامکێک. دەمی، لێوەکانی و ئەو وشانە کە ئێستا لەو لێوە جوانە پێکەوتانەوە دێنە دەر. ئەو دەنگ و ئەو وشانەی کە باز هەمیشە وەک دەنگ و وشەی دوژمن دیتبووی و بیستبووی ئێستا لە ماڵەکەی خۆیدا بەرز دەبێتەوە!

ئاواز دەلاوێنێتەوە. باز چاوی بەستووە و گوێی لێ دەگرێ. ئەم دەنگە و خاوەنەکەی کە کەوتۆتە ناو قووڵایی ئاواز، هاتنی باز، کرانەوەی دەرگا و هاتنە ژوورەوەی بازی هەرچی چۆنێک بێت نەبیستووە. ئاوازێک

کە هەستی نوێ و شەپۆلی نوێ لە دەروون و ڕۆحی ماندووی بازدا بەدی دێنێت؛ شەپۆلی چ هەستێک؟ ترس؟ غەریبی؟ دوژمنی؟ گەرمی؟ چی؟ باز نازانێ، بەڵام هەست بە ماندوویەتی دەکات. ماندوویەتی، بەتەنیا ماندوویەتی؛ ماندوویەتیی جەستە، ماندوویەتیی مێشک، بیرەوەرییە خوێناوییەکانی ژیانی، ئەو چارەنووسەی بازی خستە سەر ئەو ڕێگە گەووادەی ئەم وڵاتە گەووادە. ڕۆژ، مانگ و ساڵانی [ژیانی] ئەو لە ژێر ئەستێرەی زێڕنەخشی ئەم وڵاتە، لە دەشت و کوێستانی وەحشیی ئەم مرۆڤە وەحشییانە، لە شەوانی تاریک، پڕ فەلاکەت و پڕ مەترسیی ئەم شوێنەوارە وەحشییە لە بیرکراوە. بۆنی سەیری ئەوان، تامی سەیری ئەوان، هەستان و دانیشتن و پۆشاکی سەیریان، بزووتن، هزر، ئاخاوتن و قسەکردنی سەیر و سەمەرەیان، وشە سەیرەکانیان. باز ماندووە.

بەڵام ئەم دەنگە غەریبە کە تەنیا هی ئەم وڵاتەیە چی دەڵێ؟ لەگەڵ ئەوەش کە باز لە مێژ ساڵە لە ناو ئەم شتانەدایە، لە ناو ئەواندا، لە دڵ و ڕۆحی پڕ نهێنیی ئەواندا دەژی، کەچی هێشتا نازانێ کە ئەم ئاوازە، ئەم وشە دڵسۆزانەی ئەم کچە باسی چی دەکات. باز ئەوەندە لەوان بەدوورە! نا، ئەو ئەوەندە نزیکە لێیان تەنانەت دەنگی ئەوان لە ماڵەکەی خۆی دێت، کەچی لەگەڵ ئەوەش ئەوەندە دوورە کە باز ئەو قسانە نازانێت و لە مانایان تێناگات. هەرچەندە بە قووڵایی بە هەر شێوەیەک لە ناو واقیعی چڵکنی ئەم وڵاتەدایە کەچی ئەوەندەش لێی دوورە. هەر وەک ئەم کچە. ئەم کچە کە وەک ئاوی کانیاوی ئەو وڵاتە گەووادە زوڵاڵە، وەک یەکەم تیرێژەکانی خۆری سەر ئەو چیا وێرانانە زیندووە، کێیە، چییە؟ ئەم کچە کە لە قووڵایی چاوانی پڕ حەز و ڕووناکیدا هەمیشە ڕێچکەی ترس و سام ئاشکرایە و ئێستا لە سایەی بازدا هێشتا دەژی، بیر لە چی دەکاتەوە و چ هەستێکی هەیە؟ ڕۆحی ئەم کچەی کە بە زمانی باز زۆر بە باشی، بەڵام بە ڕەنگێکی کەمێک

سەیر، کەمێک غەریب دەدوێ، چی دەڵێ، و دڵی ئەو بۆچی لێدەدات؟

هاڵ، چێشتخانە، بەر دەرگای چێشتخانە و ژووری نووستن تاریکە. لە ناوەوە، لای ژووری دانیشتن، شەوقێکی بێزار دیارە. بەڵام دەنگ خۆی دەپێچێت بە تاریکیی شەوەوە و بڵاو دەبێتەوە. تاریکیی شەو و ماڵەکە قورسایی ئاواز و وشەکان زۆر زیاتر دەکەن. باز بە ئارامی بە هەنگاوی قورس بەرەو ناوەوە دەڕوات. کاتێک بە بەر دەرگای ژووری نووستندا ڕادەبرێ و دەگاتە بەر دەرگای ژووری دانیشتن، ئەمجار کۆتر دەبینێ. کۆتر لە زەوی لە سەر دۆشەکێکی ڕاخراو، کراسێکی سادەی درێژ لە بەردا، لە بەر پەنجەرە دانیشتووە. لە سەر مێزی ژوورەکە کە هەندێک لە کۆتر دوورە و لە بەر پەنجەرەکەش چەند مۆم داگیرساون. مۆمی سوور و سپی سووکە ڕووناکییەک دەڕژێننە ناو ژوورەکە. ئەو پشتی داوە بە دیواری سپیی پەنجەرەوە، سەری ڕوو لە پەنجەرەکەیە، لاقەکانی کۆ کردۆتەوە بەر زگی، دەستی داوەتە بەر ئەژنۆی و لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوە دەکات و هێدی هێدی بە ئاوازی لاواندنەوە، بە دەنگێکی ماندوو [ستران دەڵێت]. دەترسێ، وەک بڵێی لە سەر خۆ چووبێ، وەک بڵێی بە سەر دونیاوە نەبێت، ئاوەها سەیری دەرەوە دەکات. نیگای ئەو؟ حەسرەت؟ ویست؟ خەم، ژان؟ یانیش خۆشحاڵیی ئەوەی کە هەنووکەش دەژی؟

باز بە ئارامی دەڵێ «کۆتر» بەڵام وا دیارە کە کۆتر دەنگ نابیستێ.

باز جارێکی دی کەمێک بەرزتر بانگ دەکات: «کۆتر»

ئەمجار کۆتر ڕادەچڵەکێ و دەنگێکی سەیر کە باز لێی تێناگات لە زاری دێتە دەر. دەستبەجێ گۆرانییەکە دەبڕێت، خۆی کۆ دەکاتەوە و هەڵدەستێتە سەر پێ. بە ڕوخسارییەوە ترسێکی بێپایان قووڵ، دەڵێ «نا» و خۆی دەداتە پاڵ پەنجەرەکە.

باز دەم بە خەندە دەڵێ «مەترسە کۆتر، مەترسە کچەکەم، منم...»

کۆتـر دەترسـێ، بـە پێـوە دەسـتی لـە پێشـەوە لـە نـاو یەکدا، دەلـەرزێ. بـاز هەنگاوێـک، دوو هەنـگاو بـەرەو لای دێـت و دەڵـێ «کۆتـر، چ ناوێکـی خـۆش...» بـەڵام کۆتـر چاوەکانـی بێکۆتـا ماتمـاو، دەرپەڕیـو، چەنـد هەنـگاو بـەرەو دوا، بـە رەو پەنجـەرە دەکشـێتەوە تاوەکـوو خـۆی لـە بـاز دوور بخاتـەوە. «چ ناوێکـی خـۆش» بـاز دووبـارەی دەکاتـەوە، بەڵام ناتوانـێ درێـژە بـە قسـەکانی بـدات. ئـەو پێویسـتی بـەو قسـە نەرمانەیـە کـە ترسـی کۆتـر بڕەوێنێتـەوە. بـەڵام چـی؟ بـە چ وشـەیەک؟ بـە چ زمانێـک؟ نیـگای سـەیری کۆتـر، گەرمایـەک لەوانەشـە چڵدانـی گەرمـای دڵسـۆزییەک- لـە دەروونـی بـازدا پێـک دێنێـت. بـاز هـەروا بێدەنـگ ، کەمێـک دوورتـر لـەو بـە پێـوە ڕادەوەسـتێ و لێـی دەڕوانـێ. خۆزگـە ئـەو نەدەهاتـە ژوورەوە و کۆتـری لـە خەونـی تایبەتیـی خـۆی وەخەبـەر نەدەهێنـا و لـە ئـاوازی سـەیری ئـەو گۆرانییـە سـەیرە دووری نەدەخسـتەوە. ئێسـتا هەرچییەکیـش بڵـێ بێسـوودە. قسـە ئیـدی ناتوانـێ سـیحری ئـەم ژوورە کـە کاریگەریـی لـە سـەر بازیـش دانـاوە، بـۆ خـۆی و بـۆ ئەویـش بگەڕێنێتـەوە، ئـەم کچـە شـیرینە، ئـەم کچـە کێوییـە زانـا و تێگەیشـتووە بـە ترسـەوە ڕاچڵـەکا. قسـە ئیـدی کاریگەریـی لـە سـەر دانانێـت... ئەوەنـدەی چەنـد خولـەک بـاز خەندەیەکـی نـەرم بـە ڕوخسـارەوە و کۆتریـش ترسـێکی گـەورە لـە سـەر ڕوو، هـەروا بـە پێـوە کەمێـک دوور لـە یـەک بـۆ یـەک دەڕوانـن.

پاشـان بـاز بـە هەنـگاوی ئـارام بـە سـەرێکی قورسـەوە، دەگەڕێتـەوە چێشـتخانە، گڵۆپـی چێشـتخانە دادەگیرسـێنێ، دەچـێ و دەرگای سـەلاجە دەکاتـەوە، شووشـەی درێـژی ڤـۆدکا و شووشـەی بچووکـی لیمۆنـی لـێ دەردێنـێ، دەیخاتـە سـەر مێـزی چێشـتخانە. لـە دۆڵابی چێشـتخانە پەرداخێک دەردێنـێ و ڤـۆدکا و لیمۆنـی تێـدەکات. پـەرداخ هەڵدەگرێـت و دەیهـەوێ لـە چێشـتخانە بێتـە دەر، بـەڵام پێـش ئـەوەی بێتە دەرەوە، وەک ئـەوەی لە ناکاو شـتێکی بیـر کەوتبێتـەوە، دەگەڕێتـەوە بـەر سەلاجە، دەرگاکـەی دەکاتـەوە و

چەند کلۆیەک سەهۆڵ هەڵدەگرێت و دەیخاتە ناو پەرداخەکەی. ئەمجار دەگەڕێتەوە بۆ ژووری دانیشتن. کۆتر هێشتا بە پێوە لە شوێنی خۆی ڕاوەستاوە. باز هیچ ناڵێ، بێدەنگ دەڕوات و لە سەر قەنەفەی درێژ و گەورە دادەنیشێت، پەرداخ دادەنێتە سەر مێزەکە، ژاکەتە ڕەشەکەی لە بەر دادەکەنێ و دەڵێ «لە دەرەو بارانێکی سەیر دەبارێ، هاوڕێیان منیان تا بەر دەرگا هێنا، بارانێکی سەیرە» ژاکەت دادەنێتە تەنیشتی خۆی، لە گیرفانی ناوەوەی ژاکەت پاکەتی جگەرە دەردێنێ، جگەرەیەک دەگیرێنێ و بەردەوام دەبێت «ئیدی زستان هات، زستانێکی نوێ، زستانێک لەو زستانە بێ ئەژمار وەک یەکانە، زستانێکی نوێی ئەم وڵاتە گەو...» ئەو قسەی خۆی دەبڕێ، نایەوێ درێژەی پێ بدات و چەند قومێک لە قەدەح دەخواتەوە. ئەمجار دەستەی دەمانچەکەی لە پێشیەوە بە تەنیشتی کەمەری پانتۆڵەکەیەوە بریقەی دێت.

کۆتر هەروا بە پێوە سەیری دەکات. بێدەنگ، بە ڕوخسارێکی سارد، بێ ڕۆح وەک ڕوخساری پەیکەرێک. بەڵام بە نیگایەکی قووڵ، نیگایەکی لێکەڕ، پڕ لە پرسیار، دڕدونگ. بەڵێ بێدەنگ؛ بێدەنگییەک کە ئیدی بووەتە ژیانی کۆتر، ئەو ئیدی لە ڕۆژی مردنی ڕێناس بەملاوە، لە لای مرۆڤان، ئەو مرۆڤانەی ئەویان خستە سەر ئەم ڕێگەیە، هەمیشە بێدەنگە. لە هەندێک جار زیاتر، ئەویش زۆر بە کەمی و مەگەر زۆر پێویست بێت، ئەگینا دڵێکی بێدەنگ، ڕۆحێکی بێدەنگ. وەک خاکی بێدەنگی ئەم وڵاتە. وەک بەربانگی ڕۆژانی ئەو لە گوند، وەک مرۆڤی کەوتوو و کوژراوی ڕۆژانی ڕابردووی، وەک ئەم ماڵە سارد و نامۆبارەکەی شوقەی سەربازی.

باز چەند قومی دی دەخواتەوە، جگەرە دەکێشێ و دەڵێ «ماندووم»، بە هیوایە کۆتریش شتێک بڵێ. بەڵام کۆتر هیچ ناڵێ. باز لێی دەڕوانێ. کۆتر؛ قژی ئێستا درێژتر، نیگایەکی مەعسووم، چاوی ڕەشی ڕووناک،

چاوانـی هیـچ ناتروکێنـێ، چاوانـی قـووڵ، یەکجار جـوان، پڕتـرس، پڕپـەژارە. چاوانـی غەریـب... بـاز قـۆدکا تـەواو دەکات. هەڵدەستێ دەڕوا بۆ چێشـتخانە و پـاش کەمێک بـە قەدەحێکـی پـڕەوە دەگەڕێتـەوە. دوای ئـەوەی لـە سـەر قەنەفـە دادەنیشـێت دەڵـێ «بۆچـی بەخەبـەری؟» کۆتـر کـە هێشـتا بـە پێوەیـە، وەڵام ناداتـەوە. لـە دەرەوە دەنگـی خـوڕەی بـاران دێـت. ڕووناکیـی کەمـی مۆمـەکان بـە سـەر دیـواری ژوورەکـەوە دەشـەکێتەوە. لـە ژوورەکـەدا، لـە قەنەفەیەکـی درێـژ و گـەورە، مێزێکـی درێـژ، دوو کورسـی و دۆشـەکێک کـە کۆتـر لـە بـەر پەنجـەرە ڕایخسـتووە، زیاتـر هەرچـی چۆنێـک بێـت، هیـچ شـتێکی دی نییـە.

بـاز قۆدکاکـەی دەخواتـەوە و دەڵـێ «دانیشـە، مەترسـە، ناتخـۆم، دانیشـە... دەمـەوێ کەمێـک قسـەت لەگـەڵ بکـەم...»

کۆتـر بێدەنـگ لـە سـەر دۆشـەک دادەنیشـێت، چۆکـی کـۆ دەکاتـەوە نـاو زگـی، کراسـە درێژەکـەی بەردەداتـەوە بـە سـەر لاقیـدا، پەنجەکانـی دادەنێتـە سـەر ئەژنـۆی و سـەیری بـاز دەکات. مـۆم لـە بـەر پەنجـەرە و لـە سـەر مێزەکـە لـە هـەر دوولاوە ڕووناکییەکـی دەدەنـێ. ڕوخسـاری هەندێـک درێـژ و شـیرینی، لۆچـی سـەر ڕوخسـار و تەوێڵـی، چاڵـی دەوری چـاوی دیـارن. زوڵفـی ڕەشـی درێـژی، ئێسـتا بـە سـەر شـانیەوە بـە شـەوقی [ڕووناکـی] دەبریقێتـەوە. کۆتـر ئێسـتا زیاتـر لـە هەمیشـە ئەسـمەر دیـارە.

بـاز دەم بـە خەنـدە دوای خواردنـەوەی چەنـد قـوم دەڵـێ: «ئـەو گۆرانییە چـی بـو دەتگـوت؟ دەنگـت یەکجـار زیـز بـوو...»

کۆتـر وەڵام ناداتـەوە. بـاز پیاڵەکـەی دادەنێتـە سـەر مێـز و مژێـک لـە جگـەرە دەدات و جەخـت دەکاتـەوە « مـن بـەس مـەراق دەکـەم...، مەترسـە... سـتران باسـی چـی دەکات؟»

«دادە، دایکـم ئـەو سـترانەی دەگـوت» کۆتـر بـێ ئـەوەی بـۆ بـاز بڕوانـێ، نیـگای لـە سـەر پەنجـەرە درێژەکان وا دەڵێت «باوکـم لـە کۆتایـی هەفتـەدا

دەهات بۆ گوند و هەموو ئێوارانی یەکشەممان دەگەڕایەوە بۆ شار. ئەو ئێوارانە، ئێوارانی یەکشەممان، کاتێک دادە منی دەکردە خەو، ئەم سترانەی دەگوت. ئاوازی ستران یەکجار کۆنە. لەو کاتەدا کە دادە دەیگوت، من لێی تێنەدەگەیشتم. ئەو سەری منی دەخستە سەر ڕانی و بۆ دوور دەیڕوانی، وەک بڵێی لە شوێنێکی دی، لە دونیایەکی دیدا بێت، دەیگوت. من سەیری دەمی و لێوەکانیم دەکرد کە ڕێک و پێک بە ئاهەنگ دەجووڵان. ئەو وشانەی لە زاری ئەو دەهاتنە دەر، ئاوازی گوند و چیاکان بوو. وەک بڵێی فێنکایی شنەی کوێستانان، ڕووناکیی سپێدەی بەیانان لە ناو ئەم وشانەدا شاردرابێتەوە... جارجارە گورانییەکەی دەبڕی و دەیوەستاند، وشەکان دەبڕوسکان. ڕاوەستانی ستران و ئەو بێدەنگییەی لە ڕاوەستان درووست دەبوو، بەشێک لە سترانەکە بوو. ستران باسی کۆچێک دەکات. کۆچی گوندێک. ژنێکی خاوەن منداڵێکی بەرلانکە لە گونددا ماوەتەوە، بە دوای کۆچدا، بە دوای ئەویندار، دایک و خوشک، باو و باپیرانی خۆیدا ئەم سترانە دەڵێتەوە. وشەکان سادە و زیز و بەخەم و پەژارەن. دادە ئەم سترانەی دەگوتەوە، سەرەتا بە ئارامی، دوایی وەک داستانێک و دواتریش بە گریان... ئەوە سترانی دادەیە...»

کۆتر ڕادەوەستێ، وچانێک دەدات و دەڵێ «دادە» بەڵام درێژەی پێنادا و ڕادەوەستێ. بێدەنگییەک دەست پێدەکات. بێدەنگییەکی قووڵ. بازیش ناپەیڤێ، تەنیا ڤۆدکا دەخواتەوە و سەیری کۆتر دەکات. لە دەرەوە خرمەی باران دێت. مۆمەکەی بەر پەنجەرە، پێدەچێ لە بەر هێزی ئەو بایەی لە درزی پەنجەرەوە دێتە ژوورەوە، دەشەکێتەوە. کۆتر بە ئەنگوست و پەنجەکانی دەستی کە داویەتە بەر ئەژنۆی، بێدەنگ یاری دەکات. باز جگەرە دەکێشێ، لاقی خۆی کەمێک درێژ دەکاتەوە و لە کۆتر دەڕوانێ؛ کۆتر، کچێکی نەرمۆڵە، ناسک، کەمێک ترسەنۆک،

کەمێـک شـەرمن کـە لەوانەشـە لـە بـەر ئـەو دۆخـە بێـت کـە تێیدایـە. نەرمۆڵـە بـەڵام لـە هەمـان کاتـدا سـەرکەش، مەغـروور و تێگەیشـتوو. باز بیـر دەکاتـەوە «خۆزگـە ئـەم کچـە چیایـی نەبوایـە، خەڵکـی ئـەم هەرێمانـە نەبووایـە. خۆزگـە ئـەوم لـەم دۆخـەدا نەناسـیایەت.. خۆزگـە نـەک وەک دوژمنێـک کـە وەک دۆسـتێک دەمناسـی...»

«دادە» بـاز پـاش کەمێـک بێدەنگییەکـە دەشـکێنێ و دەڵـێ «کۆتـر بـاش گوێـم لێبگـرە... تـا ماوەیـەک، ماوەیەکـی یەکجـار درێـژ، تـۆ ناتوانـی دایـک، بـاوک، هـاوڕێ، دۆسـتان، ناسـیاو و خزمەکانـت ببینـی، یـان لەگەڵیـان پەیوەنـدی بگـری یانیـش بچیـت بـۆ شـوێنێکی دی. پێویسـتە بـە زووترین کات ئـەم شـتانە لـە سـەرت دەربکـەی و لـە خۆتـی دوور بخەیتـەوە تاوەکـوو بتوانـی هەندێـک ئـارام بیـت. تـا ماوەیەکـی درێـژ، تـۆ، تـۆ نیـت. تـۆ کۆتـر نیـت، تـۆ نیـت... تـا ماوەیەکـی درێـژ ژیانـی تـۆ وەهـا بـە دزی و شـاراوەیی دەبێـت. لـە بیـرت نەچـێ!»

کۆتـر هیـچ ناڵـێ، وەک ئـەوەی لەگـەڵ ئـەوی نەبـێ، وەهـا بـێ جووڵـە، بـێ ڕوانیـن، سـەیری پەنجەکانـی خـۆی دەکات.

«دۆخـی تـۆ هیـچ بـاش نییـە» بـاز دوای قومێـک بـەردەوام دەبـێ؛ «ڕەوشـی منیـش بـاش نییـە... سـەرۆک و فەرماندەکانـی مـن دەیانهـەوێ تـۆ ڕادەسـت بکـەم... سـەدان کەسـی وەک تـۆ هـەن. واتـا ئـەو کەسانەی کـە دەسـتیان لـە سـەودای سـەرهەڵدەریی هەڵگرتـووە و ئێسـتا لەگـەڵ ئێمـەن، لەگـەڵ دەوڵەتـن، کار بـۆ دەوڵـەت دەکـەن و هاریکاریـی بـە ئێمـە دەدەن. زۆربەیـان لـە زینـدانـدان. کاتێـک پێویسـت بـێ، لـە زینـدان دەریـان دێنـن و لەگـەڵ خۆیـان دەیانبـەن بـۆ هێـرش. هەندێکیشـیان بـژاردەن و لەگـەڵ ئێمـەن. بـەڵام ئـەوان شـەو و ڕۆژ لـە نـاو شـەڕدان. هەمـوو ڕۆژێـک دەمـرن و دەکـوژن... ڕەوشـی هیـچ کـەس لـە تـۆ ناچێـت، بـە زانسـتەوە مـن تـۆم هێنـا بـۆ ئێـرە تاوەکـوو بتوانـم بتپارێـزم... لـە مـردن ڕزگارت

بکەم. گەر ڕاستت دەوێ خۆشم نازانم بۆچی بەڵام لە دەروونمدا شتێک وەک گڕی ڕۆشناییەک داگیرسا. دڵم ڕازی نەبوو کە کچێکی خوێنەوار، تێگەیشتوو... و جوان، قەشەنگ و گەنجی وەک تۆ بێتە کوشتن... بەڵام ئێستا فەرماندەکانی من تۆیان دەوێ...بە گریمانەیەکی زۆر بۆ کوشتنە... تۆ بڵێ ئێمە چی بکەین؟...»

کۆتر وەڵام ناداتەوە، لە باتیی وەڵام سەیری مۆمی بەر پەنجەرە دەکات کە خەریکە تەواو دەبێت. «کۆتر» باز هەندێک بە ترسەوە دەڵێ «کۆتر من ماندووم، مێشکم، دڵم، ڕۆحم ماندووە... سەرم ژان ئەکات، ناوچەوانم دێشێ، ماندووم مەکە بڵێ چی بکەین؟؟»

ئەمجار کۆتر ڕوو دەکاتە باز و زۆر بە ئارامی دەڵێ «من نازانم، من نامەوێ ببمە بار، خۆ هیچ شتێک نییە من بیڵێم یانیش بتوانم بیکەم. فەرماندەکانت ڕاست دەکەن، من بە کاری هیچ نایەم، خۆ من مردووم، ئەگەر تۆ حەز دەکەی من ڕادەست بکە...»

«نا، من هەندێک شتم پێیان وتووە. لام وایە تا ماوەیەک قەناعەتم پێ هێنابێتن. تۆ دەمێنی، بەڵام لەوانەیە جارجارە لەگەڵ ئێمە بێیت بۆ هێرش»

دوای قسەکان، باز هەڵدەستێتە سەر پێ، دەڕوات بۆ چێشتخانە و بە قەدەحێکی پڕەوە دەگەڕێتەوە بۆ ژوورەکە و دادەنیشێ. «پێویستە کەس تۆ نەبینێ، تۆ نیت. خۆت فێری ئەمە، فێری هەستێکی وەها بکە... ژیانی تۆ ئێستا کەوتۆتە سەر ڕێگەیەکی نوێ و پێموابێ تا مردن هەروا بەردەوام دەبێت... ناوی تۆ، پاشناوی تۆ، جل و بەرگی تۆ، هەموو شتی تۆ دەگۆڕدرێ،» باز ئەمە دەڵێت و بە وردی بە سەرنجەوە سەیری کۆتر دەکات. ئەو بێدەنگییەی ئەم کچە، ئەو لە خۆبایی بوونەی چییە و لە چییەوە دێت؟ باز جگەرە بە دەمیەوە بیر دەکاتەوە، هۆش و مێشکی، جەستە و ڕۆحی ئەم کچە بە چییەوە سەرقاڵە؟ بیر

لـە چـی دەکاتـەوە و چ هەسـتێکی هەیـە؟ خوێـن، تۆڵـەی خوێـن؟ قیـن، نەفـرەت؟ جـۆش و کوڵـی توندوتیژییـەک کـە مرۆڤـەکان ئەسـیر دەکات؟ شـەڕ، پێکدادان، کوشتن؟ تـۆران و دڕدونگی؟ تـرس و خـەم؟ ماندوویەتـی؟ بەڵـی ماندوویەتـی، پێدەچـی ماندوویەتـی [بێت] لەوانەیـە کچەکـەش مانـدوو بێـت، هـەر وەک بـاز مانـدووە. دڵ جەسـتە و ڕۆحێکـی مانـدوو. کـێ دەزانـێ لەوانەیـە ئـەم ڕۆحـە غەریـب، نەناسیاو و مانـدووە یارمەتیـی ڕۆحـی مانـدووی بازیـش بـدات تاوەکـوو بـاز ئاڵۆزیـی ڕۆح و مێشـکی خـۆی تێپـەڕ بـکات؟ بەڵام خۆزگـە ئـەم کچـە خەڵکـی ئـەم وڵاتـە نەدەبـوو. لـەم کاتـی شـەڕ، پێکدادان و کوشـتنەدا، ئـەم شـتە، زمانـی دایـک، بـاو و باپیرانـی ئـەم کچـە دەبنـە بارێکـی قـورس، دەبنـە کۆسـپێکی گـەورە. بـەڵام هەرچیـش بـێ، پێویسـتیی بـاز بـە کچێـک، ژنێـک، هاوڕێیـەک، دۆستێک کـە ئـەم بتوانـێ قسـەی لەگـەڵ بـکات، بخـوات، بخواتـەوە و بخـەوێ ئێجـگار زۆرە. بـۆ دڵ، مێشـک، ڕۆح ئـەو ناچـارە. بەڵـێ بـازی نـاودار، بەهێـز، فەرمانـدار- بـە وتـەی فەرماندارەکانـی- بازێـک کـە وەک پـۆڵا قایمـە، پێویسـتی بەمـە هەیـە. دڵـی ئـەو کـە هیـچ کـەس لـە دەرەوە ناتوانـێ ببینـێ، ڕۆحـی ئـەو کـە هیـچ کەسـێک ئـاگای لێـی نییـە، موحتاجـە.

«کۆتـر» بـاز چەنـد قومـی دی دەخواتـەوە و دەڵـێ «تـۆ دەتوانـی زەحمـەت بکێشـی جانتاکـەی مـن لـە ماڵەکـە بێنـی؟»

کۆتـر بێدەنـگ هەڵدەسـتێ، دەچێتـە بـەر دەرگای دەرەوە و جانتـا هەڵدەگـرێ و دەیهێنـێ دەیداتـە بـاز. پاشـان دەڕوات و لـە شـوێنەکەی خـۆی دادەنیشـێتەوە. بـاز ئـارام دوگمـەی جانتـا دەکاتـەوە، هەندێـک کاغـەز، دۆسیە و دەفتەرێکـی لـێ دەردێنـێ، دەفتەرێـک لـە نـاو ئەوانـدا دەردەکێشـێ و بـەرەو کۆتـر ڕایدەگـرێ و دەڵـێ: «فەرمـوو دەفتەرەکـەت، دەفتـەری شـیعرەکانت...»

سـەرەتا کۆتـر تێنـاگات کـە بـاز چـی دەڵـێ، چـی دەکات، بـەڵام کـە

سەیری دەفتەرەکەی دەستی باز دەکات، ڕەنگی دەفتەرەکە دەناسێتەوە. دەفتەرەکەی کۆترە!... هەڤاڵ و هاوڕێی سەر چیا، زمانی ژان، خەم، ویست و ئارەزوو، ڕاز، ئێش، کەسەر، حەسرەت، هەز و هیواکانی. ئەو دەفتەرەی کە کۆتر جارجارە بە پێنووسی جودا، بە شێوەی تێکەڵ هەندێک دێڕی سادە وەک شیعرێکی سادەی تێدا دەنووسی. ئەو دێڕانەی لە دڵ و ڕۆحیەوە دەهاتن و ئەو نەیدەتوانی بە هیچ کەسێکی دیکەیان بڵێ. دەفتەرێک کە هەندێک ڕاز و نهێنیی کۆتری تێدا شارابۆوە. دەفتەرێک کە ئارامی و حەسانەوەیەک دەداتە کۆتر و هەناسەی لە بەر براوی دەگەڕێنێتەوە. بەڵێ ئەو دەفتەرەی کۆتر کە کاتی برینداربوونی لەگەڵ جانتاکەی ون بوو. ئێستا دەفتەر لێرەیە، لە ماڵی شوققەی سەربازی، لەم نیوەشەوە شڵێوەدا، لە بەردەمیدایە! و باز، لە ناو هەموو ئینسانەکانی جیهاندا باز، بازە کە پێشکەشی دەکاتەوە!

«فەرموو» باز بە بزەیەکەوە دەڵێ «من سەیرم کرد، سەیری ئەو لاپەڕانەی بە زمانی ئێمە نووسیبووت، ئەوانی دیش کە کەسانی دی خوێندیانەوە، شتێکی مەترسیداری تێدا نەبوو، شیعرەکانت خۆشن. تۆ دەتوانی ئەمە وەربگریت و بەردەوام بیت. لەوانەیە کاتێک دڵتەنگ دەبی، شیعر بتوانێ یارمەتیت بدات.»

کۆتر هەڵدەستێت و دێتە لای باز، دەفتەرەکەی لە دەست وەردەگرێت و دەڵێ «سپاس» هەر ئەوەندە. بەڵام لەوانەیە ئەمە یەکەمجار بێت کە کۆتر بە نیگایەکی دی، بە وردی و ڕوانینێکی دی، لە باز دەڕوانێت. کۆتر دەگەڕێتەوە و لە شوێنەکەی خۆی دادەنیشێت. ئەو دەفتەرەکەی وەک بڵێی منداڵێک لە باوەش دەگرێت، لە ئامێز دەگرێت. جارێکی دیش بە دڵگەرمییەوە دەڵێ سپاس.

باز دەم بە خەندە دەڵێت: «شیعرەکانت خۆشن، منیش هەر وەک تۆ وتووتە وەک ئەوەی لە خەونێکدا بم، خەونێک ببینم، ئەم وڵاتە دەژیم،

دەبینم و دەبیستم، بەڵام تۆ بە ڕاستی زۆر جوان وێنات کردووە.»
ئەمجار کۆتر بە دەنگێکی یەکجار نەرم دەڵێت: «نا، ئەم وڵاتە و مرۆڤەکانی ئەم وڵاتە خەون نین؛ ئەو شتانەی من نووسیومن خەون و خەیاڵ نین. ئەو گوند، دار و دارستانەی کە دەسووتن، ئەو مرۆڤانەی کە دەمرن، ئەو قیڕە و هاوارەی کە دەبیسترێ، ڕاستین، ڕاستیی ئەم وڵاتەن.»
«بەڵام وەک خەونێکە، وا نییە؟» باز بۆ ئەوەی کۆتر بداتە قسە کردن وا دەڵێت.
«نا، نەک وەک خەونێک، وەک کارەساتێک، وەک حەشرێک. ئەوانە هەر هەموو ڕاستن، ڕاستین. ئەم وڵاتە، ئەم مرۆڤانە، ئەم هەرێمانە هەر هەمووی دەژین، ئەوان ڕەگ و ڕیشەیان، ناو و نیشانیان، ئەزموون و مێژوویان هەیە... ئەوانە ڕاستین. مردنەکان لەم وڵاتە ڕاستین، کوشتنەکانیش. ڕاستییەکی وەها کە هەر مردنێک، هەر کوشتنێک ڕاستییە. ڕاستیی ئەم وڵاتە، ڕاستیی وڵاتی مەزن. ڕاستیی ئێمە هەموومان، ڕاستیی مرۆڤایەتیش. هەندێکی دی دەکوژن، ڕاستییەکی وەها کە لەگەڵ کوژراوەکان، کەسانی دەست بە خوێنیش دەکوژرێن...»
«ئەی تۆ پێم نالێی کە ژیر چی بە سەرهات؟» باز بە مەراقەوە بەڵام بە نیگای نەرمی کۆتر و بە درێژە پێدانی قسەکانی خۆشحاڵە، دەپرسێ «ئەو ژیرەی کە تۆ بۆ ئێمەت باس کرد، کە تۆ لە دەفتەرەکەتدا نووسیوتە؟»
«من نازانم» کۆتر لە پڕ وەک لە خەونێک ڕاچڵەکابێت بە کورتی دەڵێت و ڕادەوەستێ.
«تۆ بڵێی ئەویش کوژرابێت؟»
«نازانم»
«هیوات هەیە کە جارێکی دی لەم دونیا ئەو ببینیتەوە؟»

«نازانم» کۆتر کەمێک بێدەنگ دەبێت و دیسان بەردەوام دەبێت «نا، پێم وا نییە...»

«پێم بڵێ تۆ خۆشت دەویست؟»

«بەڵێ» کۆتر بە دەنگێکی بنەبڕ و مسۆگەر وەڵام دەداتەوە.

«تۆ چۆن حەزت لێ دەکرد؟ چیت دەکرد، چیت پێ دەگوت، خۆشەویستییەکەت چۆن بوو؟»

کۆتر وەڵام ناداتەوە. باز لە وتەی خۆی پەشیمان، قەدەحەکەی هەڵدەگرێت، کەمێکی لێ دەخواتەوە و کاغەز و دەفتەر و دۆسیەی سەر مێزەکە دیسان دەخاتەوە ناو جانتا، دەرگاکەی دادەخات و دایدەنێتە بەر پێی قەنەفەکە.

ئەمجار کۆتر بە ئارامی شتێکی چاوەڕوان نەکراو دەڵێت: «بۆچی ئێوە ئێمە وەک هەین، وەک دەژین، قەبووڵ ناکەن؟ بۆچی ناهێڵن ئاسوودە بین و دەتانەوێ هەمیشە بمانکوژن؟...»

باز پێدەکەنێ «کچی من خۆ ئێمە پێک هاتبووین، ئێمە و ئێوە نییە، ئێمە هەیە، بە تەنیا ئێمە، ئێوەش ئێمەن، ئێمەش ئێمەین. وانییە؟»

«بەڵام... « کۆتر لە قسەکەی خۆی پەشیمان، دەڵێ: «بەڵام دانیشتووانی ئەم وڵاتە دەیانەوێ وەک خۆیان بمێننەوە، بە ڕەگ و ڕیشەی خۆیان بە مێژوو و ناسنامەی خۆیان بژین، نەک هیچی دی، نەک ویستێکی دی، مەگەر ئەمە داخوازێکی زۆر گەورەیە؟»

«ئەوانە هەموو گەمەن، گەمەی دوژمن... دەست لەو قسانە هەڵبگرە. پێویستە جارێکی دی قسەی وات لە زار نەیەتە دەر... تۆ ئێستا پێم بڵێ ئێمە پێک هاتبووین وا نییە، بە تەنیا ئێمە هەیە، ئێمە هەین، وا نییە؟»

کۆتر دەڵێ « بەڵێ» و ڕووی خۆی وەردەگێڕێت و لە پەنجەرەوە

سەیری دەرەوە ەکات.

باز لە قەدەحەکەی دەڕوانێ. قەدەح دیسان بەتاڵ بووە. مۆمێکی سەر مێزەکەش بەتاڵ بووە. لە ناو تەپڵەکی ژێر جگەرەدا لە سەر مێزەکە چەن قونجکە جگەرەیەک کۆ بۆتەوە. باز حەز دەکات هەستێت و بچێت بۆ چێشتخانە. بەڵام ناتوانێ، هۆشی ڕۆشتووە. ئەو ماندووە، سەری ئەوەندە دێشێ لەوەدایە بتەقێ، خەوی دێت. دیسان دادەنیشێتەوە، هەستی بە ماندوویەتیی خۆی کردووە، لاقی لە سەر قەنەفەکە ڕادەکێشێت و بیر لە کات، شەو و ڕۆژان دەکاتەوە. ئێستا کاتژمێر چەندی شەوە؟ یەک، دوو؟ کام ڕۆژە؟ ئەو کچە کێیە؟ لە کام لایە؟ دۆست؟ دوژمن؟ نا، من دەبێ نەخەوم. باز بیر دەکاتەوە، من تەنیا هەندێک جار دێم بۆ ئەم ماڵە، بۆ لای ئەم کچە، نابێ بخەوم. من دەبێ ئەو بناسم، قووڵایی دڵ و ڕۆحی بناسم، لە پشت ئەم دەمامکە ساکار، خاوێن، ساف و جوانەدا چی هەیە دەبێ ببینم. نا، خەوتن نا. کەواتە قۆدکا پێویستە، خواردنەوە، جگەرە پێویستە. داوای لێبکەم؟ نا، نابێ. با ماندوویەتی، با خەویش بێت، بەڵام من بازم، نابێ بخەوم. دوژمن یان دۆست، ناسیاو یان نەناس، دەبێ من لە چاوانی ئەم کچە غەریبە، لە لێو، پێکەنین، بەدەن، ڕان، لاق، دڵ و ڕۆحی بڕوانم. گاز لەو مەمکانە بگرم، بیمژم، بکەومە ناو سینگ و بەرۆکی گەش و حەسانەوەی ماندوویەتی چارەی شکست و دەرمان و هەتوانی لاوێتی لەوێدا بدۆزمەوە. من دەزانم ئارامی لەوێ، لە ناو لێو، گەردن، گوێ، سینگ و بەرۆک، لاق و ڕان و جەستە و بەدەنی جوانیدایە. لە ناو دڵی غەریب و ڕۆحی نائاشنایدایە. من دەبێ لەوێ بخەوم...

لە پڕ باز دەڵێ «کۆتر کچی من وەرە، وەرە بۆ لای من، لێرە لە تەنیشتم دانیشە» کۆتر هیچ ناڵێ. باز دیسان وەک ئەوەی بپاڕێتەوە دەڵێ «وەرە لای من، دەستت بدە بە من» بەڵام کۆتر ناچێت، هەر

ناشجوولێ، تەنیا بە ترسەوە، بە چاوی پڕ لە پاڕانەوە سەیری باز دەکات. دیسان ئەو چاوانە، ئەو چاوە ڕەش و ڕۆشنانە کە وەک مۆم شەوق دەدەنەوە! دیسان ئەو ترسە وێرانکەرە کە ئێستا هاتووە لە قووڵایی چاوەکانیدا نیشتۆتەوە!

«مەترسە کچەکەم» باز بە دوا غیرەتی بەڵام کەمێک بە شەرمەوە دەڵێ «من ناتخۆم، مەترسە، وەرە بۆ لام، دەستت بدە بە من، لەم باران و سەرما، شەو و تاریکییەدا، نەرماییەک، گەرماییەک بگەیەنە بە من... کۆتر، ماندووم، سەرم دێشێ، دەستت بدە بە دەستە ساردەکانمەوە، لە ئامێزم بگرە، گەرمای خۆتم بدەیە، بیگەیەنە بە من... تینووم ئاوەکەتم بدەیە، برسیمە خۆتم بدەیە... من دەمەوێ تۆ، بەدەنت، هەموو شتت بناسم، لە ناو مەمکەکانتدا بخەوم، وەخەبەر بێم، تێیدا ون بم... وەرە.»

باز جارێکی دی بەڵام ئەمجار دەقیرپێنێ «وەرە!...»

ئەمجار باز لە پڕ قسەکەی دەبڕێت، باز بیر دەکاتەوە، ئەم قسانە چین؟ من سەرخۆشم. باز تۆ سەرخۆشی، تۆ نازانی کە چی دەڵێی، گوێت قسەکانی خۆت نابیستێ! ئەو بێدەنگ تماشای کۆتر دەکات کە دانیشتووە بە ترسەوە لەم دەڕوانێ. لێوەکانی بە زمان تەڕ دەکات، لێوی دەبزوێنێ و دەخوازێ شتێک بڵێ، لەوانەیە شتێک بپرسێ، بەڵام قسە لە زاری نایەتە دەر. دیسان بێدەنگییەک باڵ بە سەر ژوورەکەدا دەکێشێ، جگە لە دەنگی باران هیچ دەنگێک نایە. بێدەنگی قووڵتر، گەورەتر دەبێت. باز دەڕوانێ؛ ماندوو، سەرخۆش، گێژ. باز دەڕوانێ؛ هیوادار، هەوەسدار، بە ئاوات. باز دەڕوانێ؛ تینوو، برسی. چاوانی باز هێدی هێدی قورس دەبن و لە سەر قەنەفە ڕاکشاو دەست بە پرخە پرخ دەکات.

لەگەڵ خەوتنی باز، کۆتر دەفتەرەکەی هێشتا بە دەستییەوە، خێرا هەڵدەستێتە سەر پێ و دەڕوات بۆ چێشتخانە. ئەوەندەی چەند خولەکێک

هەروا بە پێوە سەیری دەور و پشتی، سەیری مێز و کورسییەکان، سەیری پەنجەرەی چێشتخانە، دۆلاب، ئۆجاخ و سەلاجە دەکات و دەڵێ «ئەمە چ حاڵێکە! خودایە ئەمە چ حاڵێکە منی تێکەوتووم؟» کۆتر دەچێتە بەر ئۆجاخ، سەری مەنجەڵی چێشتی ئێوارە کە بە سەر ئۆجاخەکەوەیە، هەڵدەگرێ، دیسان دایدەنێتەوە، دەچێتە بەر سەلاجە، دەرگاکەی دەکاتەوە، سەیری میوە و سەوزەی ناوی دەکات، دەگەڕێتەوە بەر مێزەکە، تەماشای شووشەکانی باز لە سەر مێزەکە دەکات و دواییش دادەنیشێت. سەری خۆی دەخاتە ناو هەر دوو دەستی و بە دەنگەوە دەڵێ «ئەم چ حاڵێکە؟»... چارەیەک پێویستە، ڕێگەیەک پێویستە... دەفتەرەکەی دێتەوە یادی. دەفتەر... هەڵدەستێ دەچێ دەفتەرەکەی لە تەنیشتی ئۆجاخەکە هەڵدەگرێت و دێت دادەنیشێتەوە. ئەو بە جۆش و خرۆشەوە، بە گەرمییەکی بێپایان، ترساو، دوودڵ، لاپەڕەکانی دەفتەر دەکاتەوە. دەستنووسەکانی لار، جوان بە زمانی وڵاتی مەزن، بە زمانی باز، جارجارەش بە فەڕەنسی. هەندێک دێڕیش بە زمانی دایکیی خۆی. دەفتەرەکەی؛ دێڕی ناتەواو، زمانی هەستی گەرم، جۆش و کەسەری تازە، برینی غەددار، هەست، بیر، گومان و سەودای پەرش و بڵاو، ڕاستەوخۆ بە بێ شێوازێکی پتەو.

ئێستاش دێڕ پێویستە، نووسین پێویستە... هەتوان لە دەفتەرەکەدایە! کۆتر هەڵدەستێ دەچێتە بەر سەلاجە، دەست دەبات و لە سەر سەلاجە سێ پێنووس هەڵدەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای مێزەکە، لە سەر کورسی دادەنیشێت. بە خێرایی لاپەڕەیەک لە لاپەڕە کۆتاییەکانی دەفتەر دەکاتەوە و هەر بەو خێراییە بە پێنووسێکی سوور دەنووسێ «ئەمە چ حاڵێکە!» هەمان ڕستە چەند جاری دیش بە دوای یەکدا دەنووسێتەوە. تۆزێک ڕادەوەستێ، دیسان بە خێرایی برووسکێک هەمان ڕستە دەنووسێتەوە. جارێکی دی، جارێکی دی تاوەکوو لاپەڕە بەهەمان

ڕستە پڕ دەبێت. لاپەڕەیەکی نوێ دەکاتەوە و هەر بەو خێراییەی پێشوو دەنووسێ «من دەمرم، من دەخنکێم، من مردووم، من خنکاوم... خوێن منی کوشتوە، ترس منی خنکاندووە. خوێن، ترس. خوێن و ترس بوونەتە چارەنووسی من... من چی بکەم؟ من لەت لەت بووم، من ون بووم. ژیان کوژاوەتەوە، پارچەکانی ژیانم لە تاریکیدا پەرش و بڵاو بوونەتەوە. هەر کامەو لە شوێنێک. خەوم نییە، خواردنم نییە، دۆست نییە، هاوڕێ نییە، ئیش و کار نییە، ژیان نییە، ڕوو و ڕوخسار نییە. من چۆن بتوانم ئەو پارچانە وەک پارچەی گۆزەیەکی شکاو کە بۆتە هەزار پارچە و بڵاو بۆتەوە بخەمەوە سەر یەک؟ من بەرەو کوێ بچم؟ چی بکەم؟ دەتوانم چی بکەم؟ ئەمە چ حاڵێکە؟ هەموو شوێنێک هەر خوێنە، هەموو شوێنێک مردنە، کوشتنە، بڕینە. هەموو شوێنێک ترسە. من دەترسم، خوێن و ترس من دەکوژن. ئەم وڵاتە من دەکوژێ. ئەم ئینسانە من دەکوژێ، من دەمرم...»

وەک ئەوەی شتێکی بیر بکەویتەوە، کۆتر هەڵدەستێت دەچێتە بەر دۆڵاب، لە دۆڵابێک سینییەک دەردێنێ، دێت و سەری مەنجەڵ لادەبات، بە کەوکەمێک سینی پڕ دەکات لە خواردن و دەچێ دادەنیشێت. دەفتەر کەمێک لە خۆی دوور دەخاتەوە، سینی دادەنێت و بە کەوچک، بێ نان، زۆر بە پەلە خواردنەکە دەخوات، بێ وچان. ئەمجار دوای ئەوەی سینی بەتاڵ دەکات هەر بەو خێراییە سینی دوور دەخاتەوە، دەفتەرەکەی دەکێشێتەوە بەر دەستی خۆی و لەو شوێنەوە ماوە، لە سەر ڕیزێکی نوێ دەنووسێت «من کێم؟ من کێم؟ دوژمن؟ خائین؟ بۆچی من وەها بووم؟ بۆچی کەوتمە ئەم حاڵە؟ من بیر لە ئەو دەکەمەوە، بیر لە ئەوان دەکەمەوە، ئەوان ئیدی منیان خۆش ناوێ. ئیدی من هاوڕێی ئەوان نیم، کۆتری ئەوان نیم. من دەزانم، ئەوان ئێستا لە من نەفرەت دەکەن، بەڵێ نەفرەت، ئەو نەفرەتەی بووەتە چارەنووسی ئەم وڵاتە،

چارەنووسی ئێمە هەموومان. باران دەبارێ، دونیا سارد دەبێ، چیا تەڕ دەبێ، بەفر دەکەوێتەوە زەوی، بەڵام من ئیدی لەگەڵ ئەوان نیم. من کێم؟ خائین؟ خائینی وڵات، دەوڵەت، ئاڵا، ئەرتەش، میللەت، شەڕڤان، بزووتنەوەی سەرهەڵدەران؟ قژم درێژ بۆتەوە، برینەکانم سارێژ بوون، ئێستا، ئەمڕۆ، نا، دوێنێ خوێنم لێ دەهات. من هەم، من دەژیم. من دەزانم ئەو خوێنەی ئێستا لەم من دەڕوا، ژیانە، ژیانی منە. من دەژیم، بەڵام خائین، وەک خائینیک، خائین بە هەموو شتێک، هەموو کەسێک... خائینی ژیان و دونیا...»

کۆتر دەست بە گریان دەکات، دەست لە دەفتەر و پێنووس هەڵدەگرێ، دەست دەباتە سەر ڕوخساری، وەک ئەوەی حەز بکات خۆی بناسێتەوە، کەمێک دەست بە سەر و چاوی خۆیدا دێنێت و دەگری. بە ئارامی ئەسرینی چاوان لە سەر ڕوخساری خۆی بڵاو دەکاتەوە، بە ئەسرینەوە ڕوخساری خۆی دەماڵێ. پاشان دەست دەخاتە سەر دەمی خۆی، ئەنگوستی تەڕی بە سەر لێویدا دەگەڕێنێ، دەستی لەوێوە بەرەو خوار، بەرەو گەردن، شان، پەنجە، مەمک، زگ، ناوزگ و بەر زگی خۆی دەبات و دەگری. ئەوەندەی چەند خولەک هەر دوو دەستی لە سەر بەرزگی لە ناو هەر دوو لنگیدا لە گریان بەردەوام دەبێت. بەڵێ، ئەو خوێنەی ئێستا لێی هاتووە، لێی دەڕوات، وەک خوێنی مردن ناچێت. بە پێچەوانەوە خوێنی ژیانە، سەلمێنەری ژیانە، هێمای ژیانەوەی ژیانە. بەڵام ژیانێکی چۆن؟ ئەو ئیدی هەرچییەکیش بکات، بێ سوودە، جارێک ژیانی ئەو بە فیڕۆ چووە.

ئەو ڕۆژەی بۆ یەکەمجار خوێنی لێ ڕۆشتبوو، ئێستا بە وردی دێتەوە یادی. کۆلێژی فەڕەنسی لە هۆڵی دەرس خوێندن، سەر لە بەیانییەک، لەگەڵ هاوڕێیەکی خۆی دانیشتبوو. گەرمایەک لە ناو لنگیدا درووست بوو. و تەڕییەک. وەک ئەوەی بۆنێکی گەرم و سەیری لێ هەڵبستێ،

وەک ئەوەی چووبێتە حەمامێکەوە، وەک ئەوەی ئاوی گەرمی حەمامی لێ بڕوات، وەک ئەوەی ئەو کورسییەی لە سەری دانیشتووە، دەور و پشت و هەموو پۆل لە ناو ئاوێکی گەرمدا بێت. وەک ئەوەی هەر کەس سەیری ئەم بکات. هەرچەند کۆتر تێدەگات کە چی لێ قەوماوە، بەڵام شەرم دەکات، وەک ئەوەی بچێ بە زەویدا شەرم دەیگرێ... دەرس تەواو دەبێت، هەموو لە پۆل دەچنە دەرەوە، بەڵام ئەم و هاوڕێکەی تەنیشتی کە کۆتر باسی خوێنەکەی بۆ دەکات، لە شوێنی خۆیان هەڵناستن. کۆتر لە بەر شەرم و ترس ناوێرێ هەڵبستێ. مامۆستای فەڕەنسی بە چاوێکی پڕ پرسیار لێیان دەڕوانێ، دێتە بەر دەمیان و ڕادەوەستێ. ئەمجار هاوڕێکەی کۆتر بە بزەوە بە سەر هێما بۆ کۆتر دەکات و بە وشەیەکی کۆن پێی دەڵێت "regles" پاشان درێژە بە قسەکەی دەدات "menstruation, mensture..." مامۆستای پیری چاو شینی قژ درێژ پێدەکەنێ و کۆتر لە باوەش دەگرێ، بە خۆشحاڵی و مێهرەبانییەوە دەڵێ؛ "Mon petite fille..." «تۆ دەبیتە کانی، کانیاوی ژیان، مادەری ژیان. پیرۆز بێت...»

خوێن. خوێنێکی- وەک مامۆستا دەڵێت- پیرۆز، خوێنێکی خەست، کەمێک ڕەش، تاریک، هەموو مانگ، هەموو جار، چەند ڕۆژ... خوێنێک کە خەون و خەیاڵ، هەز و مرازی نوێ پێک دێنێت. خوێنێک کە جموجۆڵێکی گەرم، جۆش و خرۆشێک لە هەموو بەدەندا ساز دەکات. خوێنێک کە نەمامی جوانی ئاو دەدات، دەست نەخواردوویی هار دەکات. سەرەتا تووڕەیی و ماندوویەتی، دواییش خوێن، دواتر خواست، حەز، هیوا... وەک گوڵێکی تازە پشکوتوو، وەک گوڵخونچەی ڕەنگین کە لە سەرەتای بەهاراندا لە ناو بەفر سەر دەردێنێ. هیوای مانگ و ساڵانی کۆتر؛ ڕۆژێک هەستی بێ ئەندازە بەهێز دڵی داگیر دەکەن، دەنگ، قسەی پیاوانی شۆخ و شەنگ و گەش، مێشکی ئەم پڕ دەکەن، دڵ

دەبنە یەک، جەستە دەبنە یەک، بە ئارامی، بە دوور لە پەلە پەل، بە جۆش و خرۆش، بە مەراق، گەرمی و ڕووناکی دەروونی کۆتر پڕ دەکات. لە پەنجەوە تا زوڵف، هەتا تەوقی سەر، مێشک و هەموو جەستەی کۆتر بەو گەرما و ڕووناکییە گەرم دادێت، دەسووتێ. جارێک، دوو جار، دە جار... و ڕۆژێک خوێن ڕادەوەستێ، ئیدی نایە. مانگێک، دوو مانگ... زگی کۆتر گەورە دەبێ، مانگێک، دوو مانگ، تۆواوی تێدا شین دەبێ، کۆرپەڵەیەک دروست دەبێ. کۆرپەڵە بکەوێتە جووڵە، دەست بکات بە لەقە فڕدان. ئیدی خوێن نەیەت. بەڵام کۆرپەڵە گەورە بێت و بێت. منداڵێکی دی. ماڵێکی گەرم، بە دەنگی منداڵان. ژیانێکی بەختیار، سەرفراز... هیواکانی کۆتر هەموو مانگێک پاش خوێنەکە... ئەو هیوایانەی ئێستا هەڵپرووسکاون... و ئەو خوێنەی گوێ بۆ هیچ شل ناکات و ئێستاش لێی دەڕوا، خوێنێک کە هیواکانی ئەو بە تەواوی دەتارێنن.

«ئەمە چ حاڵێکە!» کۆتر هەر دوو دەستی لە ناو لنگیدا وا دەڵێت و دەگری. «لە کوێوە بۆ کوێ!...» بڵێی چ ببێ، کۆتر؟ کۆتر بە دەنگێکەوە وا دەڵێت و لە پڕ وەک ئەوەی لە خەو هەستێ، هەڵدەستێتە سەر پێ و دیسان سینی پڕ دەکات لە خواردن و دێتەوە لای مێزەکە. خواردنەکە وەک ئەوەی لە قاتسالییەوە هاتبێت، زۆر بە پەلە دەداتە بەر کەوچک و بە ماوەیەکی کەم سینی بەتاڵ دەکاتەوە. «بڵێی چ ببێ!» کۆتر جارێکی دی لە خۆی دەپرسێ، ئەم حاڵە، ئەم ئەحواڵە! نە ڕۆژ، نە شەو، ئاوەها دەستبەسەر، لە ناو چواردیواردا، لەگەڵ ترسی مردن و لە دەست چوون، بێ ئاگا لە ڕووداو و جموجۆڵی دونیا. نە ڕۆژنامەیەک، نە ڕادیۆ، نە تیڤی، نە کاتژمێر، نە ئاوێنە. هەر تەنیا چەند کتێب کە چەند ئەفسەر لە سەر مێژووی وڵاتی مەزن و لە سەر ژیانی ژەنەڕاڵ سەردار نووسیویانە و دوو کتێبی بچووکی سروودی

سەربازیی وڵاتی مەزن. هەر تەنیا سەربازێکی باڵابەرز و زۆر هەژار کە جارجارە بە کلیلێک دەرگا دەکاتەوە، دێتە ژوورەوە و هەندێک نان، میوە، سەوزە، گۆشت، ڕۆن و شیری بۆ دێنێ. بە تەنیا لەماڵێکی بێ پەردە، بێ موبیلیات، بێ ڕۆحدا دانیشتن و لە پەنجەرەوە سەیری دەرەوە و ماڵی ئەفسەران کردن و لە ژووری چۆڵی نووستندا لە سەر تەختێکی ڕەق و تەق، بە جل و بەرگی ڕزیوەوە نووستن. هەر تەنیا سترانی دادە و باو و باپیران کە کۆتر لە خۆی دەپرسێ و هزر و گومان، خەم و پەژارە... و لە دەرەوە پاسەوان لە هەموو لایەکی شوققەی سەربازی. باز کە جارجارە ئاوەها لە نیوەشەواندا سەرخۆش، دەمانچە بە کەمەرەوە، دێت دادەنیشێ، چەند قسەی بێ مانا دەکات و — نەک لە ژووری نووستن — لە سەر قەنەفە دەخەوێت و لە بەرە بەیاندا بێ ئەوەی کۆتر خەبەر بکاتەوە، هەڵدەستێ و دەڕوا. بێ هیچ قسە و باس و شیکردنەوەیەک.

بەڵام ئەمشەو؟ بۆچی ئەمشەو وەها بوو؟ بۆچی ئەمشەو ئەوەندە زۆر قسەی کرد، وەها خۆی ئاشکرا کرد، نییەتی خۆی نیشان دا؟ کەواتە ئەوەی ئەو دەیهەوێ، ئەمەیە؟ بەڵام بۆچی ئاوەها؟ بۆچی وا بە هەژاری، کەوتوو، داڕووخاو و ماندوو کە مرۆڤ بەزەیی پێیدا بێتەوە؟ ئەو و باز! ئێستا لە ماڵێکدا! ئەگەر کەسێک ماوەیەک پێشتر لە ئێستا باسی شتی وای بکردا، هەموو کەسێک گاڵتەی پێ دەکرد. کێ بڕوای دەکرد کە ئەو و باز ئاوەها لە ماڵێکدا بن، لە ماڵێکی نووستن!...

کێ بڕوای دەکرد کە کۆتر لە بەر ترسی وێرانکەر، لە بەر ویستی ژیانی وێران، ئەم دۆخە وێرانەی قەبووڵ کردووە؟ «بۆچی کۆتر؟» کۆتر بە گریانەوە کەمێک دەنگی خۆی بەرز دەکاتەوە و دەڵێ «بۆچی ئەمەت پەسەند کرد؟ بۆچی دوا هەنگاو هەڵناگریت و خۆت لەم پیسایییە کە هەر ڕۆژێکی مردنێکە، ڕزگار ناکەی؟ ماسییەک کە بە داوەوە بووە، چی دەبێ، چی بە سەر دێت؟ کۆتایی؟ کۆتایی ئەم تەنیاییە، تەنیایی

ڕۆح و دڵـە، کۆتایـی ئـەم بێدەنگیـی تەنیاییـە، کۆتایـی دەنگـی بـاران، کۆتایـی ئـەم چاوەڕوانییـە بێدەنگـە؟»

کۆتـر هەڵدەستێتە سـەر پـێ، بـە هەنگاوی زۆر ئـارام، هێدی هێدی لـە چێشتخانە دیتـە دەر و دەڕواتـە نـاو سـاڵۆنەکە. باز لـەوێ لـە سـەر قەنەفـە، لـە سـەر شـان، ڕوخسـاری لـە سـەر سـەرینەکە، بە پرخـە پرخـەوە خەوتووە. کۆتـر ئـارام ئـارام دەڕوات و بـە سـەر سـەریەوە دەوەستێ. مۆم کوژاوەتـەوە، بـە تەنیا یـەک لەوانـەی سـەر مێزەکـە کـە بـەرەو تـەواو بوونـە، ڕووناکییەکـی بێـزار دەڕژێتـە سـەر ڕووی بـاز. ئـەو کێیـە؟ کۆتـر بێدەنـگ، بێجووڵـە، بـەڵام بـە وردی و بـە سـەرنجەوە لـە بـاز دەڕوانـێ و بیـر دەکاتـەوە، بـاز؟ کێیە بـاز؟ بـاز: مـردن، کوشـتن، سـووتان، تـرس، قیـن، نەفـرەت، خوێـن... لەمانـە زیاتـر؟ بەڵـێ، خاکـی سـارد، بـەردی ڕەقـی سـارد، مەرگـی سـارد، تاریکیـی ساردی مـەرگ. بەڵـێ، پیـاوی شـەو، پیاوێـک کـە لـە ڕووناکـی و سپێدەی ڕووناکـی یەکجـار دوورە. بـاز: ژان، پـەژارە، ناڵـە، هـاوار... بـەڵام ئـەی جگـە لەمانـە؟

کۆتـر چکێکـی دی دەنووشـتێتەوە و سـەیری ڕوخسـاری بـاز دەکات. ئـەم ڕوخسـارە، کۆتـر بیـر دەکاتـەوە گەڵـۆ ئـەم ڕوخسـارە کـە ئێسـتا ئـارام و هێمـن لـە خەودایـە، ڕوخسـاری پیاوکوژێکـە؟ بۆچـی خـەو ئاوەهـا دەکات و ڕوخسـاری تێکـەڵ، هـی خوێنڕێـژ و بێتـاوان، هـی تاوانبـار و زۆر لێکـراو، هـی هەمـوو جۆرێـک، هەمـوو چەشـنە مرۆڤێـک دەکاتـە ڕوخسـارێکی هێمـن و ئـارام؟ ئێسـتا چ جیاوازییـەک لـە نێـوان ڕوخسـاری ئـەم و ڕوخسـاری ڕێناسـدا کـە کۆتـر بـووە هـۆی کوشـتنی، هەیـە؟ هەمـان تەوێـڵ، هەمـان چـاو، هەمـان ڕەنگـی ئەسـمەر، هەرچـی چۆنیـش بێـت هەمـان سـمێڵ، هەمـان بـێ تاوانـی لـە سـەر ڕوخسـار... بـەڵام ئەمـە بـازە! کۆتـر، ئەمـە بـازە!... کۆتـر دەسـت بجووڵێنـە... خـۆت مەدۆڕێنـە، خـۆت ڕیسـوا مەکـە...

کۆتـر کەمێـک لـە بـاز دوور دەکەوێتـەوە، دەچێتـە ئـەو بـەری مێـزی

سالۆنەکە و بیر دەکاتەوە. هەموو شتێک دەتوانێ لە چرکەساتێکدا ڕوو بدات و تەواو ببێت. تەنیا کەمێک توانا، کەمێک وورەی پێویستە. ئەوەندەی چرکەساتێک. کۆتر کەمێک بەهێز بە... ئێستا دەمانچەی باز کەوتۆتە ژێری. بەڵام مەگەر کۆتر ناتوانێ بە خێرایی برووسکەیەک لەوێ دەریبێنێ و بیخاتە سەر تەوێڵی باز، دەمانچە لە سەریدا بەتاڵ بکاتەوە و دواییش خۆی بکوژێ؟ کۆتر دەزانێ چۆن ئیش بە دەمانچە بکات، ئەو دەتوانێ بە سانایی دەست بە پەلەپیتکەدا بنێت. غیرەت کۆتر، چەندین جار ئەم شتەت هێناوەتە بیری خۆت، چەندین جاران بیرت لە کوشتن و مردن کردۆتەوە. چەندین جار ئەزموونت کردووە. بەڵام ئێستا، ئێستا کاتیەتی، کەمێک وورە... بەڵام بۆچی ئێستا کۆتر ئەوەندە سستە، ترسەنۆکە، بۆچی هەڵگرتنی دەمانچە و دەست پێدانانی ئێستا ئەوەندە دژوارە؟ ئەگەر ئەمە ئەوەندە دژوار بێت، ئەی بۆ ناتوانێ بچێ لە چێشتخانە چەقۆیەکی درێژ هەڵبگرێت و بێت و بیچەقێنێ بە دڵی ئەم پیاوکوژەدا و تا دەتوانێ چەقۆ لە دڵیدا بە قووڵایی بگەڕێنێ؟ جارێک، جارێکی دی، جارێکی دی تاوەکوو جەستە دەبێتە بێژنگ. و دواییش چەقۆ بخاتە سەر شاڕەگی خۆی و چاوی ببەستێ و دەمارەکەی ببڕێ؟ و خوێن، ئەمجارە خوێنی مردنی لێ بڕوات؟ غیرەت، وورە، کۆتر...!

بەڵام کۆتر دەترسێ. کۆتری ترسەنۆک!... بۆچی کۆتر ئەوەندە دەترسێ؟ بۆچی ژیانی وێران ئێستا ئەوەندە شیرینە؟ کۆتر هەوڵ بدە، کۆتر هەڵیبگرە!... چەند هەنگاو بەرەو باز دێت، دیسان دێتە سەر سەری ڕادەوەستێ. چەن خولەکێک هەروا ڕادەوەستێ. دوا مۆمیش تەواو دەبێ، دوا ڕووناکی بە دوا وورەی خۆ دەجووڵێنێ و دەکوژێتەوە.

باز بە ڕوخسارێکی یەکجار هێمن و ئارامەوە پرخەی دێت.

کۆتر ڕووی لە باز هەڵدەگەڕێنێتەوە، دەگەڕێتەوە، کوڵی گریان لە

قوڕگیدا، دیسان دەچێتەوە چێشتخانە، دەچێتە لای مێزەکە، لە سەر کورسی دادەنیشێ، دەفتەر و پێنووس هەڵدەگرێت و لە لاپەڕەیەکی نوێدا بە دەست خەتێکی لار دەنووسێ؛ «من دەترسم... جگە لە ترس بە کاری هیچی دی نایەم...»

## ١٤

# بیرەوەری

باز. کۆتر.

کات. کات دەڕوا؛ کاتژمێر دەڕۆن، ڕۆژ دەڕۆن، حەفتە دەڕۆن، مانگ دەڕۆن، وەرز دەڕۆن.

باز و کۆتر بە ڕێگەی ژیاندا دەڕۆن.

وەک هەموو ئینسانێکی دی، زۆر لایەنی ئاڵۆز، تایبەتمەندیی جیاواز و شتی تایبەتی باز و کۆتر هەیە کە پێویست ناکات ئێمە ئێستا دووبارەیان بکەینەوە. بەڵام سێ چەم، لەگەڵ زۆر شتی دی، سێ چەمی ڕەنگین هەن کە بەردەوام لە ژیانی باز و کۆتردا بەشێوەیەک بوونیان هەیە؛ هەر دوو ڕووباری وڵاتی چیا و ڕووباری پایتەختی وڵاتی مەزن. سێ ڕووبار؛ کە وەک ژیانی باز و کۆتر هەمیشە بە ڕێگەوەن و دەڕۆن، کە بوونەتە هاوبەشی چارەنووسی ئەوان، بەردەوام ئاسەواری ئەو ڕووبارانە لە ژیانی ئەواندا دیارن.

وەک ئێستا.

ئێستا ئێمە لە پایتەختی وڵاتی مەزنین، نزیکی ڕووباری درێژی شار، کە شار لە سەرێکەوە تا سەرێکی دی، سەرانسەر، بە خوڕی دەبڕێ. ئێمە لە لای باز و لەگەڵ ئەوداین. باز لە شاری پایتەختە. باز

لە وڵاتی خوێن و مردن گەڕاوەتەوە و هاتۆتەوە بۆ شارەکەی خۆی، شاری منداڵی و لاویی خۆی، شاری ژیانی خۆی کە ماڵ و منداڵەکانی لەوێ دەژین. کات کۆتایی بەهارە، پاییز و زستان بەجێ ماون، بەهار بەجێ دەمێنن، هاوین دەست پێدەکات و باز لە پایتەختی وڵاتە، بۆ کۆبوونەوە، بۆ ڕاوێژ و پەیوەندی. بۆ بینینی هەر دوو کوڕەکەی. بینینی مادەر- لەوانەشە بۆ بینینی هەندێک کچ و ژنی دی. بۆ دیتنی ژیانی شاری گەورە، شارنشینی. بۆ ژیان، ژیانێکی ئاسایی وەک ژیانی مرۆڤی ئاسایی.

ئێستا لە کاتەکان، بەرقلیانی ڕۆژێکی نوێی یەکجار ڕووناکە، ئێمە لە ماڵێکین کە بۆمان ئاشنایە، ماڵی مادەر. ئێمە لە چێشتخانە ئاشناکەی ئەوداین. مادەر لە چێشتخانە لە بەر مێزی قاپ و کەوچک و لە نزیکی ئۆجاخەکە، بە پێوە ڕاوەستاوە و کەمێک سەوزە، خەیار، باینجان و بیبار ورد دەکات. مادەر کراسێکی ناسکی خەوی لە بەردایە. هەموو بالای کورتی، جەستەی قەڵەو و بەخۆی، مەمکی گەورە و قەڵەوی کە تا ناو زگی داشۆڕاوە، ڕانی زۆر گەورەی، لاقی وەک ئەستوونی، بەز و چەوریی بەدەنی کە چین چین ڕاوەستاوە، دەمارە تاریکەکانی قاچ و لنگ و مووی لاقی کە زۆر ڕەش دەکاتەوە، لە ژێر کراسە ناسکەکەیەوە دیارە. قژی کورتکراوە و بڵاوی ئێستا بە ڕەنگێکی ئەرخەوانی بۆیە کردووە.

مادەر فراوین ئامادە دەکات. لە سەر مێزی چێشتخانە چەند جۆر پەنیر، زەیتوون، مرەبا و دوو سینیی گەورە، دوو فنجانی گەورە، چەقۆ، چەنگاڵ و کەوچکی چا هەیە. مادەر لەگەڵ باز جەژن و ئاهەنگێک ڕێک دەخەن. لە پەنجەرەی چێشتخانەوە ڕووناکییەکی کەمێک سپی خۆی دەخزێنێتە ژوورەوە. لە ڕادیۆی بچووک و پەمەیی ئەشخانەوە کە لە تەنیشت پەنجەرەکەیە، دەنگی گڕ و ئەستووری گۆرانیبێژێکی پیاو

بەرز دەبێتەوە. وشەی قەڵەوی ستران کە لە سەر قارەمانێتی، بەها و شەرەفە، چێشتخانە پڕ دەکات. مادەر بە چەقۆیەکی درێژی چێشتخانە خەیارێکی درێژ قاش قاش دەکات و دەیخاتە سەر سینییەکە لای بیبار و باینجانی ورد کراو.

کاتژمێرێکی بچووکی دیواری کە بە ڕەنگێکی پەمەیی نەخشێنراوە، کات نیشان دەدات؛ سەر لە بەیانی، سەرەتای ڕۆژێکی نوێ. دوای ئەوەی مادەر ئیشی خۆی لە سەر مێزی قاپ و کەوچک تەواو دەکات، سینی هەڵدەگرێت و دەچێتە سەر مێزی نان خواردن. ئەمجار باز خۆی شۆردووە و بە قژی کورتی تەڕەوە، خاولییەکی درێژی بەیانان لە بەر، پێکەنینێک لە سەر ڕوخسار، دێتە ژوورەوە و دەڵێ «ڕۆژباش»، «ڕۆژباش مادەر، دایکی ڕۆژانی خۆشیم...»

مادەر بە خەندەوە دەڵێ «ڕۆژباش، ڕۆژباش کوڕی ڕۆژانی گەشم...»

باز دێت و لە سەر کورسییەک لە کورسییەکانی دەوری مێز لە لای پێشەوە دادەنیشێت و دەڵێ «ڕیشیشم تاشی، ئەمڕۆ ڕۆژێکی گرنگە، دەچم بۆ لای فەرماندەکانم، پێدەچی لەوێ چەند ژەنەڕاڵ و هەندێک ناوی ئەفسانەییش ببینم... لەوانەیە ژەنەڕاڵ سەرداریش، کۆبوونەوەیەکی گرنگ ساز دەکرێت.»

«ناوی ئەفسانەیی، ژەنەڕاڵی ئەفسانەیی کە بە ساڵانە لە ژیانی ئێمە حوکم دەکەن» مادەر بە گەرمی سەیری ڕوخساری ئەسمەری باز دەکات و وا دەڵێ، «ناوی ئەفسانەیی، هەموو هەر وەک یەک، وەک ئەوەی هەموویان لە قاڵبێک هاتبێتنە دەر یەک دەڕوا، یەکی دی دێت. بەڵام هەمیشە لە ماڵی ئێمە تەنانەت لە چێشتخانەکەشمان حوکم دەکەن» مادەر مەبەستی دەنگی ڕادیۆیە و بە ئەنگوست ئاماژەی بۆ دەکات و دەڵێ: «لە بریی چا، نسکافەم درووست کرد».

باز وەڵام ناداتەوە، نانێک لە سەر مێز هەڵدەگرێت، پاروویەکی لێ

دەکاتەوە، پەنیری سپی دەخاتە ناوی و دەیخاتە دەمی. دواییش دوو دانە زەیتوون و کەمێک خەیاریش لەگەڵی دەخاتە دەمییەوە و دەڵێ «نسکافە باشە، تۆ نازانی لەو چیا، کەپر، دۆڵ، باخ و دارستانانە چەندە بیری چایەکی تازە، قاوەیەکی تاڵ دەکەم!... هەموو شت لە لایەک، بیر کردن لە لایەک. بیر کردن، [بیر کردنی] کچی شەنگ، بەدەنێکی نەرم، سۆحبەتێکی خۆش، گەشتێکی خۆش، خەوێکی خۆش، خەونێکی خۆش، گەرمای هەڵمی چایەکی تازە، تامی قاوەیەکی خۆش، بیر کردن...»

مادەر فنجانەکەی باز و خۆی پڕ دەکات لە قاوەی ئامادە، چایدانی قاوە دەبا و لە سەر ئۆجاخەکە دایدەنێت و دەگەڕێتەوە. مادەر، چرچ و لۆچی ڕوخسار، ناوچەوان و گەردنی قووڵتر، کیسەی ژێر چاوی هەڵاوساوتر، دەمارەکانی قورگ و گەردنی تاریکتر دیارن، مادەر تێکچووە، باز سەیری مادەر دەکات و بیر دەکاتەوە. مادەر پیرتر دیارە. بەڵام وەک بڵێی هەر دوویان بیر لە یەک شت دەکەنەوە، مادەر بەر لەوەی باز شتێک بڵێ، سێبەری گومانێک بە ڕوخسارەوە بە باز دەڵێ «تۆ پیر بوویت، تاڵەکانی قژت، مووی سمێڵت ئێستا سپی‌تر دیارە، دوێنێ شەو باش نەمدیت، بەڵام ئێستا لە ڕووناکیدا باش دەیبینم...»

باز دەڵێ «بەڵێ». پارووێکی دی هەڵدەگرێت، لەگەڵ پەنیر و دوو دەنک زەیتوون دەیخاتە دەمی، ئەوەندەی چەند خولەکێک لە ناو هزر و گوماندا نان دەجوێ و دیسان سەیری مادەر دەکات و قسەکەی دووبارە دەکاتەوە «بەڵێ پیر دەبم... ژیانی من لەو وڵاتە گەووادی مردنە ئاسان نییە. من ناتوانم دەردی خۆم بە هیچ کەسێک بڵێم، هەموو کەس لای وایە من لە پۆڵا و ئاسنم، هەر کەس من بە مەکینەیەکی قایم دەزانێت، بەڵام ژیانی من لەو هەرێمانە، لەو وڵاتە جەهەننەمە، سەختە، زەحمەتە... مردن، کوشتن، سووتان، برین هەمیشە بە دەوری

منەوەیە، قین، نەفەرەت، تۆڵە، دژایەتی، بەربەرییەت، هەموو جۆرە پیسییەک، هەمیشە لە پاڵ مندایە... چیا، شاخ، کەپر، دار، درەخت، دارستان، شیو، دۆڵ، هەڵدێر، ئەشکەوت، بەفر، باران، بۆران، با، تین... ژیانی من لە ناو ئەمانەدا تێدەپەڕێ. شەو، ژیانی شەوان، بە دوور لە ڕووناکی کە هەست و سەدا، ویست و هیواکان دەکوژێ... مەیهێنەوە یادم، نامەوێ بیر لەو ژیانە بکەمەوە، قسەی لە بارەوە بکەم، یان باسی بکەم.»

«بەڵام تۆ دەتوانی دەردی خۆت بە من بڵێی، باسی ئەو وڵاتە تاریکە بۆ من بکەی، مەگەر نا؟ مەگەر من مادەری تۆ نیم؟»

«بەڵێ، بەڵێ بەڵام من نامەوێ هەمیشە بیر لەو وڵاتە بکەمەوە، کاتێک من بیر لەو ژیانە، لە زەحمەت و ئاستەنگییەکانی ئەو وڵاتە کە بنەما سەرەکییەکانی ئەو ژیانەن، ناکەمەوە، یاخود باسیان ناکەم، وەک بڵێی ئەو ژیانە زۆر لە من دوور بێت، لێم دوور دەکەوێتەوە، ئەمجار کەمێک ئارام دەگرم... بیرنەکردنەوە و قسە نەکردن، باشترە لە بیر کردنەوە و قسە کردن...»

«کەواتە بڵێ دوێنێ شەو چۆن بوو، ڕازی بوویت؟» مادەر بۆ گۆڕینی بابەتی باسەکە وا دەڵێت. چەند قوم لە فنجانەکە دەخواتەوە، بە خەندەوە سەیری باز دەکات و چاوی ڕاستی دادەگرێت. «چۆن بوو؟ باش بوو؟»

باز بە ئارامی هەندێک بە شەرمەوە بەڵام بە خەندە دەڵێ «بەڵێ، بەڵێ زۆر باش بوو، یەکجار پێویستم پێی بوو...» شەوی ڕابردوو؛ لە ژووری نووستنی مادەر، لە ناو بۆنی تێکەڵی عەتر و کۆلۆنیادا، لە سەر جێگەکەی مادەر کە مەلافە، لێفە و سەرینی ڕەنگینی نەخشێنراوی تێدا بوو، بە سەریەوە، یان لە پاڵ بەدەنی مادەر کە بۆنی قورسی عەتری تێکەڵی لێدەهات. شەوی دوێ؛ باز چاو داخراو، دەستی بە

سـەر جەسـتەی قەڵـەوی مـادەرەوە کـە پێسـتی گامێشـی دەهێنایـەوە یـادی بـاز. بەدەنـی بـاز بـە سـەر بەدەنـی پیـر، چـرچ و لـۆچ و قەڵـەوی مـادەرەوە، بێدەنـگ، بـێ جـۆش و خـرۆش، ئـاگای لـە شـوێنێکی دی، لـە نـاو مـادەردا. هاتنـی پشـتەوە و بەتـاڵ بوونـەوە. شـەپۆل شـەپۆل. بـە هـاوار. وەک ئـەوەی لافاوێکی لێوە هەڵبستێ. بە لەرزینـەوە، بـە خێرایـی. دوێنـێ شـەو؛ هەوڵـدان بـۆ جارێکـی دی، بـەڵام سـەرەڕای هەمـوو شـێوەیەک لـە هەوڵـدان، بـە دەسـت، ئەنگوسـت، پەنجـە و زمـان، بێئەنجـام و ئەمجـار زمانـی مـادەر. زمانـی پسـپۆڕ و خـاوەن ئەزموونـی مـادەر. دەم، لێـو و زمـان. گـەرم، قـووڵ، درێـژ، پـان. بـە سـەر جەسـتەی بـازەوە، بسـت بـە بسـت، ئەنگوسـت بـە ئەنگوسـت، بـێ پەلـە پـەل، بـە ئارامـی، جارنـە جـار. گەرمایـی و قووڵایـی دەمـی مـادەر، ئـەو زمانـەی وەک مارێـک دەخوشـێ و ئەمجـار دوای کار و جموجۆڵێکـی درێـژ، جارێکـی دی بەتـاڵ بـوون. ئەوەنـدەی چرکەسـاتێکی کـورت، لەرزینێکـی سـووک، ئەمجار بێدەنـگ. بـە دوای ئەوەشـدا، سـەر لـە نـاو مەمکـی گـەورەی مـادەردا، هەندێـک مانـدوو، خـەو و پرخـە پـرخ، هـەر ئەوەنـدە.

بـاز کـە ئێسـتا لـەو چێشـتخانە گـەرم و پـڕ لـە بۆنـی قـاوەدا دانیشـتووە، دوێنـێ هاتـەوە. بـە فڕۆکەیـەک لـە شـاری گـەورەی وڵاتـی چیـاوە، بـە بۆینباخێکـی تاریـک، کراسـێکی سـپی و تاقمێکـی مەدەنیـی ڕەشـەوە. سـەرەتا [چـووە] ماڵـی ئەفسـەران، میوانخانـەی ماڵـی ئەفسـەران و لـەوێ [چـووە] ژوورێکـی گـەورەی خۆشڕاخـراو و خاوێـن. پاشـان چەنـد تەلەفـۆن بـۆ ئەفسـەرانی هاوڕێـی بـە مەبەسـتی ئـاگادار بـوون لـە دۆخـی پایتەخـت و یەکتـر بینیـن، بـۆ دوو ژن بـۆ ڕابواردنـی شـەوی پڕ شـەهوەت، بـۆ قەرارگەی ناوەندیـی ئەرتـەش، بـۆ ئـاگاداری لـە کاتـی کۆبوونـەوەی گرنـگ، بـۆ نەخۆشـخانەی سـەربازیی شـار و بـۆ ئـاگاداری لـە کاتـی چاوپێکەوتنـەکان، بـۆ کوڕەکانـی و بـۆ ماڵـی مـادەر. دواییـن تەلەفـۆن بـۆ مـادەر. دوای

خەوتن، خۆ شۆردن، کورت کردنەوەی قژ و لە بەر کردنی جل و بەرگی خاوێن و ئوتووکراوی ئەفسەری و دوو قەدەح جین- تۆنیک، لە خوارەوە، لە چێشتخانەی ماڵی ئەفسەران، شێوی ئێوارە، هاورێ لەگەڵ دوو هەڤاڵی ئەفسەر کە لە پایتەختی وڵات دەوام دەکەن. چەندین قەدەح شەرابی سووری یاقووتی. باسی «ئەو هەرێمانە و ئەو مرۆڤانە»؛ بۆنی خوێن لەوێ دێت، خوێن ئەو وڵاتەی گرتۆتەوە. توندوتیژی ئەو وڵاتەی هیپنۆتیزم کردووە. باشی و خراپی، پاکی و ناپاکی کەوتوونەتە ناو یەک، هیچ پێوەریک نەماوە. خوێن بەرێ کەوتووە، بێپایان، لە هەر لایەکی ئەو وڵاتە کاولەدا. هەڤاڵانی من، ئەفسەر و سەربازەکانم، گوندی و لایەنگرەکانم لە پاڵ منەوە دەکەون و دەمرن. هەر جاریک کە هاورێیەکم دەکەوێ، رق و نەفرەتی من زیاتر دەبێ، بێزاری و کینی من قووڵتر دەبێ. ویستی تۆڵەسەندنەوە، برژاندن زۆر زیاتر دەبێت. کین و نەفرەت یارمەتیت دەدەن، بەڵێ یارمەتیت دەدەن تاوەکوو مرۆڤ ترس و کارەسات نەبینێ، نەبیستێ و نەپەیڤێ. من فێر بووم کە مرۆڤ چۆن خۆی لە کەرِی، کوێری و نەزانی بدات، چۆن مرۆڤ دەتوانێ بە سەر خوێن و بۆنی خوێندا زاڵ بێت. چۆن مرۆڤ دەتوانێ فێری دۆخی هەرە خراپ، هەرە نائینسانی ببێت، لە سایەی کین و نەفرەتدا. ویستی تۆڵە، کوڵی کین و نەفرەت، واتا رێگەی هەرە ئاسان، رێگەی هەرە باشی فێربوونی ژیانی سووتان، مردن و کوشتن. مرۆڤ بەوە فێری کوێر بوون دەبێ... بەڵام لە لایەکی دیکەوە، مردن، کوشتن، نەفرەت، هەموو شتەکان، هەموو مرۆڤەکان دەگۆرِێ. من فێر بووم، من دەزانم کە مرۆڤ چۆن دەتوانێ بە سەر نەفرەت و کوڵی نەفرەتدا زاڵ ببێ. من پێم وایە کە فێر بووم. من گۆرِدرام، من دەگۆرِدرێم، ئەزموونی ساڵان فێری کردم. من حەز ناکەم کە ئێستا باسی ئەوە بکەم، بەڵام بۆچی کەوتۆتە ئەو وڵاتە.

قسە و باسێکی لە شێوەی سەر نان خواردن. سوحبەتی تێکەڵ، پەرش و بڵاو و لنگەوقولووچ، هەست، ڕوانین و ڕای تێکەڵ پێکەڵ و بڵاو. دوای شێویش، لە مەیخانەیەکی کەمێک چۆڵ، کەمێک بێدەنگی کەنار ڕووباری پایتەخت، دوو قەدەح قۆدکا. ئەمجار لێرە لە ژێر ڕووناکیی گڵۆپی بولواری کەنار ڕووبار کە لە ناوەوەی بارێک دەچێت، باسی هیوا و ئاواتی ژن و کچ؛ زۆر جاران کە بە ئاگا دێی، بەدەنت گووشراوە، ڕەپ بوو، تۆ دەرفەت بە جەستەت نادەیت، بەدەن هاوار دەکات، دەخوازێ، شتێک کە هەرچی چۆنێک بێت، لە بەرد نەرمتر دەخوازێ. بەدەن بۆتە بورجێکی زێڕین، لەخۆبایی و بڵند، داوا دەکات. بەدەن بۆتە ئاژەڵێک. بەدەن دەیهەوێ هەموو قەید و بەندێک بشکێنێ، هەموو جل و کراسان بدڕێنێ، وەک ئەسپێکی غارکەر، سەر هەڵبێنێ و بڕوات. بەڵام ڕۆچن هەیە، بەدەن... جەستە بۆتە ئەشکەوتێکی گەنیو کە ژیانی تێدا نییە. بەڵام دووربوون، نەبوون، حەسرەت، ویست و ئاوات جەستە هار دەکات، بەدەن شێت دەبێ و دەکەوێتە چۆڵ و بیابان... دوای مەیخانەش، بە تاکسی [چوون] بۆ ماڵی ئاشنا و گەرمی مادەر و مادەر کە ئیدی شەوانە ناچێتە ڕووسپیخانە. و بەدەنی پیری مادەر کە بەدەنی هار بەڵام زۆر ماندووی باز هەندێک دەحەسێنێتەوە.

«ماڵ؟ ماڵ و منداڵەکانت؟» مادەر کەمێک مرەبا دەخاتە سەر پارووێک نان و دەیداتە باز و بە نەرمی لێی دەپرسێ: «تۆ چی لە ماڵەوە دەکەیت؟ ئایا ناچیتەوە بۆ ماڵی خۆت؟»

باز دەڵێ «نا» نانەکە لە پاڵ دەستی دادەنێ، لە فنجانەکە کەمێک قاوە دەخواتەوە، دەنکێک زەیتوون دەخاتە دەمی و ڕوو دەکات بە لای پەنجەرەکەدا و دەڵێ «نا، ناچم، کوڕەکانم دێن بۆ ماڵی ئەفسەران، [لەوێ] قسەیان لەگەڵ دەکەم. من باوکی ئەوانم، ئاگام لێیان دەبێت، بەخێویان دەکەم... بەڵام چیرۆکی من و ئەو ژنە تەواو

بوو. من ئێستا لە ماڵی ئەفسەران، لە میوانخانە دەمێنمەوە، تاوەکوو ماڵێک پەیدا بکەم و ڕایخەم. من ئیدی نامەوێ ڕوخساری ئەو ژنە نامۆبارەکە کە دونیای لێم کردووە بە زیندان، ببینم. سبەی دووسبەی لەگەڵ پارێزەرێک قسە دەکەم تاوەکوو کارەکانم ئەنجام بدات. من بەرەڵای دەکەم، لێی ڕزگار دەبم... خۆ هیچ پێوەندییەکیشمان نەماوە، من قسەی لەگەڵ ناکەم. قەت. ئیتر بەسە. سەختیی دەرد و ئازارەکانم کەمە، دەردی ئەویشی بکەوێتە سەرا نا، بەسە...»

باز سەیری کاتژمێری سەر دیوار دەکات. لە پڕ هەڵدەستێ و دەڵێ « با جلەکانم لە بەر کەم، نەکەومە درەنگ، ئەمڕۆ کارم زۆرە.» ئەو بەرەو ژوور دەبێتەوە و دەچێتە ناو ژووری نووستنی مادەر کە بۆنێکی قورسی لێدێت و بە گڵۆپێکی کەمێک سوور کەمێک ڕووناک بۆتەوە و پیژامە، گۆرەوەی، ژێرکراس، کراس و پانتۆڵەکەی هێدی هێدی بە وردی، ڕێک و پێک لە بەر دەکات. مادەرلەگەڵی هاتۆتە ناو ژوورەکە، یارمەتیی دەدات. دوای ئەوەی باز بۆینباخە ڕەشە سەربازییەکەی گرێ دەدات، دەچێتە بەر ئاوێنە و قژی کورتی بە شانەیەکی ڕەشی بچووکی مادەر دادەهێنێ. ئەو سەیری خۆی دەکات، بە وردی... گەلۆ ئەو پیر بووە؟ گەلۆ ئەو خەتی قووڵی سەر تەوێڵە، ئەو چرچ و لۆچیی دەوری چاوە، ئەو پێستی ڕوخسارە کە هەندێک خاو بۆتەوە، ئەوانە هەموو هێمای چین؟ ژیان دەڕوا. کات دەڕوا. ئەو ڕووبارە کەونارەی پایتەختی باز ڕێدەکات و دەڕوا.

بەڵام ئەو...

ئەو دێتەوە یادی باز. تەزوویەک دەکەوێتە دەروونی باز. باز پێدەکەنێ، لە وێنەی خۆی لە ناو ئاوێنەکە دەڕوانێ و بە دەنگی بەرز پێدەکەنێ. ئەوەندەی چەند خولەکێک. ئەو ڕێک و پێک سمێڵی خۆی شانە دەکات، برژانگ و برۆشی بە پەنجەی دەست ڕێک و پێک

دەکات و ئەمجار بە سەربەرزی، بە سەرفرازی، لە خۆی دەڕوانێ. باز... فەرماندار، دەسەڵات، وتەکانی فەرمان. باز؛ ژیر، زانا، تێگەیشتوو، سەرەڕای هەموو شت سەرکەوتوو. سەرکەوتوو؟ گەلۆ؟

بەڵام ئەو.

باز لە ئاوێنە دوور دەکەوێتەوە دێت بۆ لای مادەر و دەڵێ «مادەر» دەست دەکاتە ملی و درێژەی پێدەدا « من شتێکت پێ دەڵێم، بەڵام بەهەڵەدا مەچۆ، من دەستم بە خوێندنەوەی شیعر کردووە، شیعری ئەشق و سەوداسەری، شیعرێک کە باسی ئەوین دەکات...»

مادەر هەندێک ماتماو دەڵێ «خێر بێت، ئەمە چ شتێکی نوێیە!... کوڕە هەتیوەکەی من و شیعر!»

«بەڵێ» باز بێ ئەوەی ئەمجار لە وتنی کوڕە هەتیوەکەی من توووڕە ببێ، دەڵێ «بەڵێ، من دەخوێنم و شتێکی دیش، من دەستم بە نووسین کردووە. هەرچەند شیعر نییە، ڕاپۆرتێکە، ڕاپۆرتی سەربازی، بەڵام نووسینە.»

مادەر ژاکەتە سەربازییەکەی باز دێنێ و ڕایدەگرێ و دەڵێ «کوڕەکەم ئەوە هێمای خێر نییە.»

باز قۆڵی دەکات بە ژاکەتی خاکی ڕەنگی خاوێندا و ژاکەت لە بەر دەکات و دەڵێ «شتێکی دی، من دەستم کردوەوە بە گوێ گرتن لە مووسیقا، نەک ئەو مووسیقای ڕادیۆی چێشتخانە، بەڵکوو مووسیقای کلاسیک.»

«ئاخ کوڕەکەم... وا دیارە کە تۆ لە ڕێ دەرکەوتوووی، لەو ڕێگەی کە خۆت دەیزانی و پێی ئاشنایت... ئەم شتانەی کە دەیڵێی هێمای دڵداری و خۆشەویستییە. تۆ لەو ڕێگەی کە خۆشەویستی و دڵداری تێدا نییە، لات داوە...»

«نا» باز دیسان دەچێتەوە بەر ئاوێنە، کراواتەکەی ڕاست دەکاتەوە،

قۆپچە زیوینەکانی ژاکەتەکەی دادەخات. نیگای لە سەر ڕوخساری لە ناو ئاوێنەدا، دەڵێ «نا، من دەکەومە سەر ڕێگەی خۆم، ئێستا، یەکەمجار...»

«نەکا تۆ کەوتبێتیتە خەیاڵی ئەوین؟» مادەر لە دواوە دێت، شانی باز دەگرێت و ڕووی دەکاتە خۆی و دەڵێ «ئەم قسانە، ئەم کردارانە، هێمای نەخۆشینی سەودان، نەکا تۆ لەو چیا و چۆڵانە بە تای خۆشەویستی کەوتبی؟»

باز بە خەندەوە سەیری چاوی هەڵامساوی مادەر دەکات و دەڵێ «من نازانم، ئەم هەستە نوێیە، ناوی چی لێ بنێم، نازانم، بەڵام ئەوە ماوەیەکە کە هەستێکی نوێ لە دەروونمدا شەپۆل دەدات و ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەهێزتر و گەورەتر دەبێت. ئیدی من نازانم کە ئەوینە، کینە، ماندوویەتییە، نەفرەتە، برسی بوونە، سەرگێژییە... نازانم، بەڵام یەکەم جارە کە شتێکی وەهام بە سەردا دێت. پێشتر هەرگیز بە هەستێکی وەها ئاشنا نەبووم. ئێستا ئەمە ڕوو دەدات. پێدەچێ خۆشەویستی نەبێت، نازانم.»

«کوڕی من» مادەر لە باز دوور دەکەوێتەوە و دەچێتە پاڵ تەختی نووستن دادەنیشێ و دەڵێ: «کوڕە بێکەسەکەم، من دەردەکەتم زانی... هەست، هەستی هەرە پێچەوانەی یەکیش، ئێجگار نزیکن لە یەک. من بە ئەزموونەکانی ژیانمدا دەزانم. وەرە، هەست و دەنگ و سەدای هەستەکان لە من بپرسە. تۆ پێت وایە کە من بە ویستی خۆم کەوتمە ڕووسپیخانە؟ بە حەز و ئاوات، هەموو ڕۆژێک لنگی خۆم دەکەمەوە و دە/ پازدە/ بیست پیاوی غەریبە و نائاشنا لە خۆم دەنێم؟ نا، کوڕەکەم نا، هەست بوونە هۆکار. ئەوین چییە؟ نەفرەت چییە؟ شەو و ڕۆژ چین؟ تاریکی و ڕووناکی چین؟ مەگەر یەکیان نەبێ ئەوی دی دەتوانێ ببێ؟ با من پێت بڵێم، نەفرەت و ئەوین، شەو و ڕۆژ،

تاریکی و ڕووناکی جووتن. جیاوازییەکەیان، مەودای نێوانیان ئەوەندەی تاڵە موویەکی نادیارە، هەر ئەوەندەی تاڵێکی سپیی قژی خۆتە...»

مادەر قووڵایی هزر و گومان بە ڕوخسارەوە، ئیدی هەڵدەستێتە سەر پێ، دەچێتە بەر گڵۆپی سوور و دەیکوژێنێتەوە. لەوێوە دەچێتە بەر پەنجەرە و پەردە ڕەنگینەکانی پەنجەرەی داخراو، لادەدات و دەشیکاتەوە. ڕووناکییەکی بەهێز دێتە ژوورەوە، ئەوەندەی چەند خولەک مادەر لە پەنجەرەوە تماشای ناو کۆڵان دەکات و هەر لەوێوە بێ ئەوەی لا بە لای بازدا بکات دەڵێ «با پێت بڵێم من دەمزانی کە تۆ لەو وڵاتی ترسە بە تای ئەوین دەکەوی و بە هیوا بووم کە بە تای ئەوین بکەوی...»

«بۆچی؟» باز دەچێتە بەر تەختی نووستن، دەمانچە بارێتاکەی لە سەر مێزی بچووکی تەنیشت تەخت، هەڵدەگرێت و لە کەمەری خۆی دەبەستێ و بە ئارامی لە سووچی تەختەکە دادەنیشێت و شان و ملی کەمێک دادەنەوێنێت و دەپرسێ «بۆچی؟»

«چونکە ئەوین خەونە، خەیاڵە» مادەر وا دەڵێت و دەگەڕێتەوە دێتە لای باز، هەر بە پێوە دەست دەخاتە سەری باز و پەنجەکانی بە نەرمی بە ناو قژی بازدا دەگەڕێنێ و دەڵێ «چونکە ئەوین خەونی کەسانی هەژار و بێچارەیە. چونکە ئەوین خەیاڵی ئەو مرۆڤانەیە کە لە ناو سەختی، ناخۆشی و دژواریدان. چونکە ئەوین ڕێگەی نوێ و نادیاری کەسانێکە کە دەست لە ڕێگەی خۆیان هەڵدەگرن. چونکە ئەو وڵاتەی کە من هەرگیز نەمدیوە، بەڵام ئەوەندەی دەزانم، وڵاتی هەژار و بێچارەکانە، وڵاتی زەحمەتی، ناخۆشی و دژوارییەکانە. چونکە خەون و خەیاڵ نان و ئاوی مرۆڤی وەهایە. چونکە مرۆڤی وەها، پێویستی بە ڕێگەی نوێ و ڕووناک، خەیاڵی ڕێگەی نوێ و ڕووناک هەیە. چونکە تۆش ئیدی مرۆڤی ئەو وڵاتەی، بوویت بە ئینسانی ئەو وڵاتە، بێ ئەوەی بە خۆت بزانی... دونیا وەهایە کوڕی من، دونیا بە سەرەیە،

بە زۆر نییە».

باز کەمێک سەری هەڵدێنێ، سەیری مادەر دەکات و دەڵێ نا، من لەوان نیم، ڕاستە زیاتر لە بیست ساڵە کە لە ناو ئەواندام، بەڵام لەوان نیم. بیست ساڵ زیاترە کە من بە کار و ئارەقە، مردن و کوشتن، دەخەبتم، هەوڵ دەدەم کە ئەوانە بکەم بە ئینسانێک لە ئێمە، بیانکەم بە ئێمە...»

«من نازانم» مادەر لە پاڵ باز دادەنیشێت و دەڵێ «لەوانەیە ڕاست بکەی، بەڵام ئەوەی من دەیزانم دونیایە، هەڵکەوتە و بە زۆر نییە. زۆر ناتوانێ شوێنی سەرە بگرێ، کوڕە ژیر و تێگەیشتووەکەم. مەگەر تۆ دەتوانی بە زۆر ڕووی بایەکی بەگوڕ بەرەو شوێنێکی دی وەرچەرخێنی، یان شەو بکەی بە ڕۆژ، شوێنەکەیان بگۆڕی، و ئەستێرە و مانگ بکەی بە خۆر؟ ڕۆحی ئینسانیش وەهایە. ڕۆح بە زۆر پەروەردە ناکرێت...»

«من دەبێ هەستم» باز وا دەڵێت و هەڵدەستێتە سەر پێ «با نەکەومە درەنگ»

مادەر: «من قسەکانم تەواو نەکرد».

باز هەڵدەستێتە سەر پێ و دەڵێ «من دەبێ بڕۆم».

«تا خوارەوە لەگەڵت دێم» مادەر ئەمە دەڵێت و دەکەوێتە دوای باز و درێژە بە قسەکانی دەدات «من لێت ناپرسم کە کێیە؟چییە، چۆنە؟ چی ڕوو دەدات؟ بەڵام من زۆر دەمویست کە تۆ تایەکی وەها بەهێز بگری، چون پێویستییەکی زۆرت بە ئەزموونێکی وەها، نا ئەزموون نا، بە نەخۆشییەکی وەها بوو. لە بەر ئەوەی نەخۆشییەکی وەها، ڕۆح، دڵ و هەستی مرۆڤ دەخاتە ڕوو و ئاشکرای دەکات. چون مرۆڤ، بۆ تۆ تا ئێستا مرۆڤ نەبوون، ژنەکەت، منداڵەکانت، منیش لە ناودا، ئەوانە هەموو بۆ تۆ هۆکار بوون، ئامێر بوون. ددانەکانی مەکینەی ڕوانین و ڕێسای تۆ بوون. ئێمە هەر هەموو ددانەکانی چەقۆی سیستەمی مەزن

بووین. ئەو سیستەمەی کە تۆ خزمەتی پێ دەکەی. لە بەر ئەوەی لەو ڕۆژەوە من تۆم ناسیوە، هەرگیز مرۆڤەکان، دڵ و ڕۆح و هەستی مرۆڤەکانت نەدیوە و زەحمەتت بە خۆت نەدا کە بیبینی، بەڵام ئێستا ئیدی دەیبینی. چون تای ئەوین، یاوێکی هەستی، یاوێکی ئینسانییە. بەڵام لە ئێستا بە دواوە ئیدی تۆ ئینسانەکان دەبینی، سەری خۆت بە هەستان و دانیشتنیان، بە هزر و گومانیان، بە قسە و بەسەرهاتیان، بە ویست و ئارەزوویان، بە هەست و هەستیارییان دێشێنی. چونکە ئەوین، نەخۆشینێکی ئینسانییە، ئینسانەکان دەکاتە ئینسان. چونکە...»

بەڵام مادەر ئیدی ناتوانێ درێژە بە قسەکانی بدات. باز ئێستا پێڵاوە ڕەشە بۆیاخ کراوەکانی لە پێ کردووە و لە بەر دەرگایە. باز، جانتا ڕەشەکەی و کڵاوی ئەفسەری بە دەستی ڕاستییەوە، بە دەستی چەپی دەرگا دەکاتەوە و هەنگاوێک دەنێتە دەرەوە. بەڵام پێش چوونە دەرەوەی تەواوەتی و پێش ڕۆشتن، دەگەڕێتەوە بە لای مادەردا و دەڵێ «سپاس».

«من نەمدەویست ئەم قسانە بکەم، بەڵام ئەمڕۆ ئیدی کاتی هاتبوو، بە هیوام تۆم نەشکاندبێتەوە و نەڕەنجابێتی» مادەر دەست دەخاتە سەر شانی باز و ئەمەی پێ دەڵێ.

«نا، من دەڕۆم، بەڵام ئەمشەو یان سبەی ئێوارە دێمەوە، ئەوکات قسە دەکەین.»

باز لە دەرگا دێتە دەرەوە. ڕوو دەکاتە لای ڕۆژئاوای کۆڵانی تەنگ و دەکەوێتە ڕێ. دەنگی دەرگا کە بە دوای ئەمدا دەبەسترێ، دێتە گوێی. بە هەنگاوی ئارام، جانتا بەدەستەوە ڕێگە دەبڕێ. خۆر و تیشکی خۆر، دەور و پشت، کۆڵان، دووکانەکانی سەر کۆڵان و ئاسمانیان خستۆتە ناو جموجۆڵی ڕووناکی. مرۆڤی جۆراوجۆر بە جلوبەرگی جۆراوجۆرەوە، بە هاتن و چوونی جۆراوجۆرەوە، دێن و دەچن. لە بەر

دووکانەکان ڕادەوەستن. بەڵێ ژیانی شار و شارنشینی کە باز ئەوەندە بیری کردبوو.

بەڵام ئەو، کۆتر.

خەونی ئەو، ڕوخساری ئەو لە خەودا. چەندین ڕۆژ پێش ئێستا، دوا جار کاتێک باز شەو درەنگان چووەوە بۆ ماڵ، کۆتر خەوتبوو. لە سەر ئەو قەنەفەی کە باز هەمیشە لە سەری دەخەوت. لە سەر پشت، بەتانییەکی سەوز تا سەر ئەژنۆ بە سەریەوە بوو. لە بەر دوو مۆم کە ئیدی لە تەواو بووندا بوون. خەوی ئەو؛ ئارام، هێمن، خاوێن، بێدەنگ. بە ڕوخسارییەوە نە شوێنی شک و گومان، نە هی ترسیش. نەفەسی سووکی بەئاهەنگ. قژی ڕەشی درێژ کە کەمێک دەبریقایەوە. ڕووناکیی قەڵسی مۆمەکان بە سەر ڕوخساری خاوێنیەوە دەشەکایەوە. چاوانی بێپایان خۆشداخراوی، پێڵووی ڕێک و پێکی، برژۆڵی جوانی داخراو، دەم و لووتی بچووکی ڕێک و پێک، باریک، نەرم وەک هەورێشم کە لە ژێر ڕووناکیی بێزاردا کەمێک شەوقی دەدایەوە. گەندەمووی چەناگە و دەموچاوی. گەردنی بەرز، سینگی کەمێک کراوە، مەمکی لای چەپ کە تا نیوەی دیارە، مەمکی تازەسەرهەڵداو، مەمکێک کە وەک هەرمێیەکی گەورەی گەیشتووە، کە بۆنی هەرمێی لێ دەهات. نێوان مەمکان کە دەبریقێتەوە، کە بانگی ویستی حەز و شەهوەت دەکات. بۆنی تازەی خۆش کە لە سینگ و بەرۆک، لە بەدەن و جەستەی دێت. ئەمجار شەپۆلدانی دەروونی باز، ئەمجار خواستی ڕاموسانی ئەو ڕوخسارە ڕۆشنە. بە ئارامی، بە نەرمی، بە خۆشەویستی. ئەمجار تەزووی ژانێکی باریک لە دەروونی بازدا. بۆچی ئەم کچە، ئەم کچە ونبووە، دۆشداماوە، ئەوەندە لە من، لە مرۆڤەکان، لە دونیا دەترسێ؟ بۆچی ئەو دڵی خۆی، جەستەی خۆی ناکاتەوە، ناتوانێ بیکاتەوە؟ خواستی بانگ کردن، قسەکردن. خواستی دەست بۆ بردن، ماڵین

و ڕامووسان. خواستی ژین و ژیان. سەرەڕای هەر شت. ڕووناکی کە لە سەر ڕوخساری یاری دەکرد، سێبەریک کە بە ڕوخساریەوە دیار بوو. ڕووناکی و سێبەر؛ دوو لایەنی ژیان؟ بێدەنگی، تەنیایی، قووڵایی هەستە بێدەنگەکان. خواستی ڕامووسانی ڕوخسار، چاوان، ناوچەوان، دەم و لێو و لە لێودا ڕاوەستان، ئەوەندەی چەند خولەک، نا، کەمێک زیاتر، ماوەیەکی درێژ، بە کاتژمێران، بە ڕۆژان. لەوێ مان، لەوێ مردن. لە ناو ئەو ماندوویەتی، ترس، خوێن و ئارەقەدا، لە ناو ئەو هەستە قووڵە ڕووناکانە و ئەو خواستە ڕووناکەدا و لە ناو ئەو شەپۆلە ڕۆشنەدا.

ترسی ئەو و جارێکیش کاتێک باز لە سەر ئەو قەنەفە خەوتبوو، قیڕەقیڕی ئەو. وەخەبەرهاتنی باز و ئەو، کۆتر لە سالۆن بە جل و بەرگی ڕزاو و لەوانەشە بۆگەنیو، بە پێوە. بە چاوی دەرپەڕیوەوە، بەو چاوانەی کە برووسکەی ترس تێیدا لێیدەدا. هەناسەی قووڵ، بەرز بوون و داکەوتنی سینگ ومەمکی خڕ سەرهەڵداو. مەمە، مەمک. «چی بوو، چی قەوماوە؟» بێدەنگی. «بچۆ ژوورەکەت بخەوە...» بێدەنگی. «وەرە بۆ لای من...» بێدەنگی. چەند هەنگاو بەرەو پاش. «چی بوو؟» ئەمجار «دەنگ دێت، دەنگی قیڕە دێت...». باز لە سەر قەنەفە دادەنیشێتەوە، جگەرەیەک بە دەمیەوە «کەس ناقیڕێنێ، تۆی دەقیڕێنی، خەوت دیوە، بڕۆ بخەوە» ئەو بە پێوە، یەکجار بێچارە، بێ پایان ترساو «نا، ئەو بریندارانە دەقیڕێنن، ئەو کەسانەی خوێنیان لێ دەڕوات، دەقیڕێنن...» نیگای ئەو؛ چاوانی شێت، سەیر کردنێکی مات، شێت. ئەمجار تەزوویەک، لەوانەیە - میهرەبانییەک لە دەروونی بازدا، دڵنەرمییەک «کچی من، تۆ گوناحی، هیچ شتێک نابێ، کابووست دیوە، بڕۆ بخەوە...»

ئەمجار دوای ڕۆشتنی ئەو بۆ ژوورەکەی، باز جگەرەیەک بە

دەمیـەوە، بیرکردنـەوە، هـەر وەک ئـەوەی مـادەر پێـی وت، لـە نەفـرەت و ئەویـن. لـە توندوتیـژی و میهرەبانـی. بیرکردنـەوە. بەڵـێ لـەو نەفرەتـەی کـە ژیانـی خـواردووە، لـەو توندوتیژییـەی کـە ئەمـی کردۆتـە ئەسیری تاریکیـی شـەوان. قسـەی ناتـەواو و بێتاوانـی کچێکـی ترسـاو، ڕوانینـی ڕوخسـارێکی سـاکار وەک ڕوانینـی منداڵێـک، ڕووت، بـێ دەمامـک، بـێ فـرت و فێـڵ، بـێ غروور. کابـووس... ژیانـی کچێکـی بریـندار کـە ژیانـی بووەتـە کابووسێک؟ گەلـۆ ژیانـی ئـەو خۆیەتـی؟

بـاز کۆڵانـی تەنگـی ماڵـی مـادەر بەجـێ دەهێڵـێ و دێتـە سـەر بولـوارە گەورەکـە. تاکسـی بـێ ئەژمـار، کامیۆنـی بچـووک، گـەورە، جیـپ و هەمـوو جـۆرە ئۆتۆمبیلێـک دێـن و دەڕۆن. قەرەباڵغییەکـی زۆر لـە هـەر دوو لای بولـوار، ئەوانـەی کـە لـە سـەر پیادەڕەوی پانـی بولـوار بـە خێرایـی دەڕۆن. لـەم سـەر لـە بەیانییـە ڕووناکـەدا، ئـەو هەمـوو خەڵکـە! بـاز کەمێـک بـە سـەر پیـادەڕەودا دەڕوات. پاشـان لـە تەنیشـت سـتوونی یـەک لـە گڵۆپەکانـی بولـوار ڕادەوەسـتێ و دەسـت هەڵدێنـێ تاوەکـوو تاکسـییەک ڕایگـرێ. تاکسـیەک لـە بەردەمیـدا دەوەسـتێ. بـاز دەرگای تەنیشـت شـۆفێر دەکاتـەوە و سـوار دەبـێ و دەڵـێ «بـا بچیـن بـۆ نەخۆشـخانەی سـەربازی.»

ئـەوان دەکەونـە ڕێ. ترافیکێکـی خنـکاو و قورسـی ئۆتۆمبیـل و مرۆڤـەکان، وەک بارانـی بەهـاری هەمـوو کۆڵانـان، بولـوار، شـەقام، کووچـە و شـاری گرتۆتـەوە. ئـەو هەمـوو ئینسـانە، جەماوەرێکـی ئەوەنـدە زۆر کـە ئێسـتا لـە هەڵاتـن و پەلـە کردنـدان. بـاز لـە پەنجـەرەی تاکسـییەوە، جانتـا و کڵاو لـە سـەر چۆکـی، بـە مەراقـەوە، کەمێـک ماتمـاو، تماشـای هـەر دوو لای پیـادەڕەو دەکات و بیـر لـە ئەوانـە و ژیانـی ئـەوان و ژیانـی خـۆی دەکاتـەوە. کـێ ئێسـتا ئـاگای لـە بـازە؟ کـێ دەزانـێ بـاز کێیـە و چـی دەکات؟ کـێ نرخێکـی ئاشـکرا دەداتـە ئیـش و کار، هـەڵات هـەڵات، لـە خـۆ بردوویـی، ماندوویەتـی و وەفاداریـی بـاز؟ زیاتـر لـە بیسـت ساڵە

کە ئەو لەو وڵاتە، لەو لایە لە بیرکراوەی جەهەننەم، سەرەڕای مردن، کوشتن، سووتان و ترس، بە شەو و ڕۆژ خەبات دەکات. ئەو ژیانی خۆی بۆ وڵات، دەوڵەت، میللەت، واتا ئەم ئینسانانەی ئێستا لە هەڵات هەڵاتدان، بۆ ئەوەی ئەمان ئاسوودە بن و بە ئارامی و بێترس بژین، بخۆن و بخۆنەوە بە فیڕۆ داوە. نە شەوی ماوە، نە ڕۆژ، نە ژیانێکی کۆمەڵایەتی ماوە، نە ماڵەکەی، نە دۆستێک، نە یارێک. هەموو شتێک، هەموو شتی لە پێناو ئەم ئینسانانەدا فیدا کرد. بەڵام کێ پێی دەزانێ! ئەنجامی ئەو لە خۆ بردووییانە؟ هیچ، هیچ شتێک. بە تەنیا مەعاشێکی مانگانە و داهاتێکی کەم، بە تەنیا دەرفەتی ژیانێکی شاراوەی شەوانە. بە تەنیا ناوێکی ئەفسانەیی لە ترس، سام، ڕق و نەفرەت. بەڵام ئینسان، وەک ئینسانێکی زیندوو، وەک ئینسانی دی، لە ناو پێوەندیی ئینسانیدا؟ وەک ئەم مرۆڤانە بە ڕۆژ دەچن بۆ ئیش و کار و ئێوارانیش بۆ بار، مەیخانە، سینەما، شانۆ، ڕێستورانت، ڕووسپیخانە؟ لە ماڵێکی گەرم لەگەڵ ژن و منداڵ و میوان و شەو ڕابردنێکی گەرم؟ گەشت و پیاسەی ئێوارانی کەناری ڕووباری شار؟ بە جل و بەرگی مەدەنییەوە هاتن و چوون و خواردن و خواردنەوە؟ ئەشق، خۆشەویستی و خەوتن؟ خوێندنەوەی شیعر و گوێ گرتن لە مووسیقای کلاسیک؟ بە خواستی دڵ و ڕۆح کردن، بیستن، بیرکردنەوە و جومجوڵ؟ ئازادییەک بۆ ژیان، سەربەستییەکی ئینسانی؟

نا، ئەم شتانە بۆ باز و ژیانی ئەو نەبوون. بۆ ئەو و ژیانی ئەو، دەمانچە و فیشەک، چەک و ڕەخت، پادگان و شوققەی سەربازی، جل و بەرگی سەربازی و هی سەرهەڵدەران، خواردن و خواردنەوەی ترش، تیژ، سارد، گۆشتی قوتووی گەنیوی سەربازی. شەوانی هێرش و کوشتن، ڕۆژانی نووستن و سووتان، پێوەندیی نهێنیی مردن، چیا، شاخ، گاشەبەرد، شیو و دۆڵ، هەڵدێر، چۆڵ، بەفر، بۆران، با، گەردەلوول،

خۆر، تین، هەڵات هەڵات، پەلە کردن، باڕووت، ئارەقە و تۆز هەبوو. ترس هەیە. توندوتیژی هەیە. سیستەمێکی پتەو، یاسایەکی مسۆگەر هەیە. هەمیشە، هەموو هەنگاوێک، هەموو ڕۆژێک تا مردن. ئەو کچ و ژنانەی تافی لاوی، ئەو ڕۆژ و شەوە پڕشەموەتانەی لەگەڵ ئەوان بە سەری دەبرد، ئێستا لەکوێن، لە کوێ بەجێماون؟ لە دوای ئەو بەدەنە شۆخانە، لە دوای قووڵایی و قڵەشکی بەدەنی ئافەتی ڕۆح و دڵ، ئێستا چی ماوە؟ دەنگ و سەدای شیرین و ناسکی ئەو کچ و ژنانە کە ئاگریان بەردەدایە ڕۆح و جەستەی ئەم، ئێستا لە کوێن؟ ئەو ژیانی تافی لاوی و سەرەتای ئەفسەری کە وەک ئەمڕۆ ڕووناک بوو، ئەو جۆش و خرۆشە، خواستی لاویی ئەو ڕۆژانە کە وەک تیشکی هەتاوی ئەمڕۆ بریقەی دەهات و دەدرەوشایەوە، لە کوێیە، لە کوێن؟

نا، ڕووناکی و شەوق بۆ باز قەدەغەیە. ژیانێکی ڕووناک، کرداری ڕۆشن، جەستەی ڕووناک، قووڵ و قڵەشی نەرم، گەرم و تاریک کە لە ڕووناکیدا شەوق دەدەنەوە و دەدرەوشێنەوە، بۆ باز قەدەغەیە. بۆ ئەو یاسا هەیە، دیسیپلین، پاراستن و سیستەم هەیە. بۆ ئەو ئەرتەش، دەوڵەت، میللەت، ئاڵا، نرخ و شەرەفی ژەنەڕاڵ سەردار هەیە. ژەنەڕاڵ سەردار؛ لە سەرەوە خودا، لە خوارەوە ئەو. ژەنەڕاڵ سەردار؛ قژی ڕەش، سمێڵی بۆر و ڕەش، ڕوخسارێکی خڕ، یۆنیفۆرمی سەربازی، نیگای بازێک و دەسەڵاتی هەموو وڵات، هەموو کەس و کەسایەتی، هەموو شوێن و هەرێمێک. باز هی ژەنەڕاڵ سەردارە. هی خێزانی ژەنەڕاڵ سەردار واتا ئەرتەشە.

هەستێکی وەها بە سەر بازدا دێت و حەز دەکات ئێستا پەنجەرە بکاتەوە و هاوار بکات و بڵێ: «ئێوە، هۆ جەماوەر کە لە هەڵات هەڵاتدان، وەها لەخۆبایی، سەر سارد و بێخەم بێ بەرپرسیاری و دڵتان بەم ژیانە دوور لە مردن و کوشتنە خۆش کردووە و بیر لە

هیچ شت و هیچ کەس ناکەنەوە، من بۆ ئێوە خەبات دەکەم، من بۆ ئێوە ئەو هەمووەم کردووە...» بەڵام لە بریی ئەوەی بقیڕێنێ، لا دەکاتەو بە لای شۆفێری سمێڵ بۆردا، کە بە وردی نیگای لە سەر ئۆتۆمبیلەکانی پێش خۆیەتی و تاکسی لێدەخوڕێ، لێی دەپرسێ: «تۆ دەزانی من کێم؟»

شۆفێر لە بەر ئەم پرسیارە لە ناکاوە، سەرسوڕماو، بە خێرایی چاوێک لە باز دەکات و نیگای دەگەڕێنێتەوە سەر لێخوڕین «من تۆ ناناسم، بەڵام بە جلەکانتا دیارە کە ئەفسەری.»

«تۆ نازانی کە من بۆ تۆ خەبات دەکەم؟»

«بۆ من؟» شۆفێر کەمێک بە تووڕەییەوە، پرسیارەکە بۆ باز دەگێڕێتەوە «بۆچی تۆ بۆ من دەخەبتی؟»

باز وەڵامی ناداتەوە. پێویست بە درێژکردنەوە ناکات. ئەو دیسان بێدەنگ سەیری دەرەوە، سەیری خەڵکانی ناو پیادەڕەو دەکات. ئێستا ڕووبار لە پێشیانەوە دیارە، ئەوان لەو بولوارەوە دەڕۆن کە بە درێژایی چەمەکە ڕاکشاوە. بێسوودە، باز بیر دەکاتەوە و شتی هەرە خراپیش ئەوەیە کە من ناتوانم لەگەڵ کەسێک قسە بکەم. ناتوانم ژیانی خۆم، ئیش و کاری خۆم، کردەوەکانم، بیر و هەستەکانم بە کەسێک بڵێم، لەگەڵ کەسێک ڕاوێژ بکەم. منیش وەک کۆتر ئەسیرم، داڕووخاوم، ونبووم... ئەوەندە تەنیا... ئەوەندە غەریب... غەریب؟ بەڵێ، غەریب، جگە لە چەند ئەفسەر و فەرماندە، جگە لە چەند ئەندامێکی ئەرتەش، کێ دەزانێ کە من کێم؟ بیر لە چی دەکەمەوە، چیم دەوێ؟ بەڵێ، غەریب لە خۆم، لە شاری خۆم، لە ماڵ و منداڵی خۆم، لەم بولوار و کۆڵانانە، لەم ڕووبارە، لەم ژیانە بەهێزەی پایتەخت. پێش بیست/ سی ساڵ وەها نەبوو، بەڵام ئێستا من غەریبم، غەریبی ژیان... وەک ئەو... وەک ئەو کچەی لە مردن، ئاگر و مژ و دووکەڵ هاتە دەر و هات

کەوتە ناو ماڵەکەم، ژیانەکەم. کچی چیایی، کچێکی خوێندەوار کە دەتوانێ بە فەڕەنسی بخوێنێ، بنووسێ و شیعر بڵێ، کە هەنووکەش سەرەڕای هەموو شت بۆنی تازەی ژیانی لێ دێت. کچێک کە بە بێدەنگیی قووڵی خۆی، ڕوانینی زیز و مەلوولی خۆی، دەنگی نەرمی، بەدەنی شۆخ و شەنگی، دڵی پڕ ترسی، ڕۆحی ئەسیر و شاراوەی، قسە نائاشناکانی، کاریگەرییەکی ئەوەندە سەیری دانا. کچێکی بریندار، شکاو و غەریب.

خۆر، تیشکی خۆر، ئێستا بە سەر ئاوی ڕووبارەوە شەوق دەداتەوە. خەڵک، ژن و منداڵ، پیر و بەساڵاچوو، لە قەراخی ڕووبار، لە سەر ڕێگەیەکی تەنگی بە پارک کراودا، دەگەڕێن. ئەوان ئارام ئارام ئێستا هاوتەریبی ڕووبار دەڕۆن. باز بینای سپیی نەخۆشخانەی سەربازی دەبینێ. ئەو چاوی خۆی دادەخات، سەری دەنێت بە پشتی شوێنی دانیشتنەوە و گوێ لە دەنگەکان، دەنگی ڕادیۆی تاکسی، دەنگی ترافیک، هۆڕنی ئۆتۆمبیلێک، خەڵکانی ناو کۆڵانەکان، دەنگی منداڵێک کە دەگری، ڕادێرێ؛ - تاوەکوو تاکسی لە بەر دەرگای نەخۆشخانە ڕادەوەستێ. باز کەمێک پارە دەداتە شۆفێر، لە تاکسی دادەبەزێت، کڵاوەکەی لە سەر دەنێت، خۆی گورج دەکاتەوە و دەچێتە ژوورەوە. لە بەر دەرگا، لە کۆریدۆری درێژی نەخۆشخانەی سپی، خەڵک دیسان لە هەڵات هەڵاتدان، دێن و دەچن. پەلەیان چییە، هەڵات هەڵاتیان بۆ چییە؟ باز دەگەڕێتەوە بەرەو دووکانی گوڵ فرۆشی کە لە لای ناوەوە و لە بەر دەرگای گەورەیە و لەوێ چەپکێکی گەورە گوڵی سووری تازە پشکوتوو دەکڕێ، پاشان دەچێتە بەر ڕێسێپشێن و لە خانمێک پرسیاری بەشی نەخۆشی دڵ دەکات. خانم پێی دەڵێ، بەڵام وەک ئەوەی دڵنیا نەبێت کە باز لێی تێگەیشتووە، لە پەنجەرەی ڕێسێپشێنەوە سەر دەر دێنێ و بە دەست هێما بۆ لای چەپی کریدۆری

درێژ دەکات. باز سپاسی دەکات و نیگای لە سەر خەڵک کە دێن و دەچن، و تابلۆکانی ناو نەخۆشخانە کە بە دیوارەوەن و شوێنەکان نیشان دەدەن، دەڕوات. بە دەستێکیەوە چەپکە گوڵ، بە دەستەکەی دیکەشیەوە جانتا. پاش کەمێک باز بە لای چەپدا دەسووڕێتەوە و دەچێتە ناو ڕێڕەوێکی یەکجار تەنگ تاوەکوو دەگاتە لای ئاسانسۆڕ. بە ئاسانسۆڕ دەچێتە قاتی پێنجەم، لەوێ دادەبەزێت، دەچێتە سالۆنێکی درێژ. هەموو نەخۆشخانەکە، هەموو شوێنێک سپییە. ئەمجار بۆنێکی توند و قورس دەگاتە لووتی باز. بۆنی دەرمان؟ بۆنی نەخۆشخانە؟

باز لە سەرەتای سالۆنەکەدا تووشی پەرستارێک دەبێت و پرسی ژووری دەی لێ دەکات. پەرستاری پیر، قەڵەو و کورت، بە ئەنگوست ژووری دە نیشانی باز دەدات. بە هەنگاوی قورس، زۆر قورس، بەرەو ژوورەکە دەچێت. کاتێک دەگاتە ژوورەکە، چەند خولەکێک لە بەر دەرگای ژوور ڕادەوەستێ، خۆی ڕێک و پێک دەکات، کراواتەکەی ڕاست دەکاتەوە، هەناسەیەکی قووڵ دەگرێ و دەیداتەوە و ئەمجار دەچێتە ناوەوە.

بەڵێ، ئەوە، ئەفسەری سمێڵ قیت. ئەفسەری سمێڵ قیت؛ پیاوێکی پیر، هەژار، کورتە باڵا، ئەوەندەی مشتێکی ماوە. قژی هەڵوەریوە، بەڵام هێشتا سمێڵی هەیە، هێشتا سمێڵ قیتە. چاو نووقاو، لەوانەشە خەوتبێ. بە تەنیا لە سەر دونیا، لە ژوورێکی سپی، ڕووناک و ڕووتی نەخۆشخانەدا. بە دیوارەوە تەنیا تابلۆیەکی ژەنەڕاڵ سەردار. باز بە ئارامی بە هەنگاوی قورس دەچێت و لە سەر کورسییەکی کەناری تەختەکە دادەنیشێت. ئەم مرۆڤە پیر و نەخۆشە کە باوکایەتی دەرحەقی باز کرد، خاوەندارێتی لێ کرد، بەردەوام باشیی ئەمی دەخواست. دواجار، ئەو جارەی باز خۆی پێ ڕانەگیرا و لێیدا. قایم، زۆر قایم، ئەو چرکەساتە. چاوانی ئەم مرۆڤە خۆشەویستە ماتماو و ترساو، و

بەربوونەوەی. تووڕەیی، تووڕەیی و بێزاریی تاریک کە هەموو شتێک بە مرۆڤان، بە باز دەکات. تووڕەیی و بێزاریی وێرانکەر. بەڵام لە بەختی باشەوە، ئەو کات ئەم ئینسانە هەژار و دڵسۆزە نەمرد و باز نەبووە هۆی مردنی. ئەگەر ئەو بمردایە، ئینجا باز لە قیرە قیرەی ئەو دێڵە قەحبەدایکەی کە ژنیەتی، تا کە ژنی بوو، ڕزگاری نەدەبوو تا مردن. لەوانەش بوو کە باز لە ئەرتەش دەر بکرایە و بکەوتایەتە زیندان. مەگەر باز چ خراپییەکی لەم ئینسانە دیوە؟

باز بە ئارامی دەستی ئەفسەری سمێڵ قیت دەگرێ و ڕایدەمووسێ. لەو کاتەدا ئەفسەر چاوەکانی دەکاتەوە. سەرەتا کەمێک سەری سووڕ دەمێنێ، دوایی پێکەنینی دەکەوێتە سەر ڕوخسار. باز کڵاوەکەی دادەگرێ، چەپکە گوڵ دادەنێتە بەر پێی ئەفسەر، دەستەکەی تریشی دەگرێ و هەر دوو دەستی ڕادەمووسێ. ئەفسەر دڵگەرمییەکی بێپایان قووڵ لە سەر ڕوخسار و چاوانی، لە باز دەڕوانێ. پاشان ڕقێک دەکەوێتە چاوی ئەفسەر و چەند فرمێسک لە چاوی بەر دەبنەوە. کوڵی گریان قورگی باز پڕ دەکات، بەڵام خۆی ڕادەگرێ. ئەوەندەی چەند خولەکێک، ئەوان هەروا بێدەنگ، دەستی ئەفسەر لە ناو دەستی بازدا، سەیری یەکدی دەکەن.

باز بێدەنگی دەشکێنێت و دەڵێ «لێم ببوورە، من عەفو بکە... من زۆر بیرم لێ کردیتەوە، بیرت لێ دەکەمەوە هەمیشە...»

ئەفسەر بە دەنگێکی بێزار وەڵام دەداتەوە «منیش لە تۆ... کوڕی من تۆ چۆنی؟ باسی خۆت بکە، من لە ڕۆژنامەدا ڕووداوەکانی ئەو وڵاتە دەخوێنمەوە، ڕەوش چۆنە؟ حاڵی تۆ چۆنە؟»

ئەفسەری سمێڵ قیت قسەکانی ناهێنێتە سەر ڕووداوەکەی قاوەخانەی بەرامبەر ماڵی ئەفسەران. بازیش ئیدی باسی ناکات، بەڵام حەزیش ناکات باسی «ئەو هەرێمانە» بکات. باز لێی دەپرسێ «حاڵی تۆ

چۆنە؟ نەشتەرگەری چۆن تیپەڕ بوو؟»

«ماندووم، چوار لە دەمارەکانیان گۆڕیم، دەرگایەکی نوێیان بۆ دانا. بەڵام ئیدی هیوام نییە... من لێرە، لەم ژوورەدام. ئیدی هیچ هیوایەکم نییە لێرە بیمە دەر... ئەفسەری سمێڵ قیت کە ئێستا سەرینێکی خستۆتە پشتی خۆ، فرمێسکی چاوان بە دەسرەیەک دەسڕێ و بە نیگایەکی باڵکێش سەیری باز دەکات. پاش کەمێک، ئەو دەستی باز دەگرێت، کەمێک بۆ لای خۆی ڕایدەکێشێ، دەست دەخاتە گەردنی و دەڵێ «کوڕی من، من نەمویست وەها بێت، من نەمدەویست ژیانی تۆ وەها بێت، هاوسەرگیرییەکەت وەها بێت، حاڵ و ئەحواڵی تۆ وەها بێت، من تۆم لە مردن ڕزگار کرد، نەک بۆ ئەم ڕەوشە، من حەزم دەکرد تۆ لەگەڵ ئەو کچە زەماوەند بکەی، بەڵام نەک بۆ شەڕ، قیرە و بە گژ یەکدا چوون.»

«من دەزانم» باز سەری خۆی بە خواستەوە بەرەو لای ئەو دەبات و دەڵێ «تۆ هەرگیز خراپیی منت نەویست، بەڵام ژیان وەهایە، نە تۆ هێزت پێی دەشکێ، نە منیش... هەرچی حاڵی منیشە ناتوانم درۆ بکەم و بڵێم باشە، بەڵام من دەژیم. لەو هەرێمانە هەر تەنیا ژیانیش هونەرێکی گەورەیە. من دەژیم.»

«من دەخوێنمەوە، دەبیستم... نا، ناگۆڕدرێ، هیچ شتێک ناگۆڕدرێ. هەر کەس بڵێ کە زەمەن و ڕۆژگار، مرۆڤ و هەستی مرۆڤەکان دەگۆڕێ، ڕاست ناکات. هەموو شتێک وەک خۆیەتی. لە کاتی ئێمەشدا وەها بوو. خوێن بە ڕێکەوتبوو، مرۆڤ دەمردن، گوند دەسووتان، ئاه و ناڵە دەگەیشتە ئاسمان. کین و نەفرەت مرۆڤەکانی توونا دەکرد، هەروەک ڕۆژگاری ئەمڕۆ. ئێمە سەرنەکەوتین کوڕەکەم... من نازانم کە ئاخۆ بە تێر و تەسەل باسی ئەو هەرێمانەم بۆ کردووی؟ منیش لەوێ ئەفسەر بووم. ئێمە بە نیاز بووین ئەو هەریمانە بگۆڕین، شارستانییەت،

زانست و ئینسانییەت ببەینە ئەو شوێنانە، ئەو ژیانە بەربەرییە بگۆڕین بۆ ژیانێکی یەکگرتووی هەموو وڵات. بە نیاز بووین وڵاتیکی مەزن، پێشکەوتوو، دەوڵەمەند و بەهێز پێک بێنین. بەڵام ئێستا من دەزانم کە سەرنەکەوتین. زۆر خوێن ڕژا کوڕەکەم، زۆر ئینسان تێکچوون، زۆر ڕووبار بە ڕەنگێکی یەکجار سوور، زۆر جار خوڕتر بوون، هەر وەک ئەمڕۆ. من نازانم بۆچی بەڵام ئەوان ناگۆڕدرێن، ئێمە ناگۆڕدرێین، خوێن ڕاناوەستێ، مردن و کوشتن تەواو نابێ. شار گۆڕان، جل و بەرگ گۆڕان، تانک و تۆپ، سەیارە و ئۆتۆمبێل گۆڕان، بەڵام مرۆڤ هەر وەک خۆی ما، ڕق و کین و سەرپێچی کردنی ئینسان هەر وەک خۆی ما...»

باز کەمێکی دی کورسییەکەی بەرەو تەختەکە دێنێ و دەستی ئەفسەری سمێڵ قیت دەخاتە ناو دەستی خۆی و جارجارە ماچی دەکات، پاشان بە نیگایەکی پڕ لە پاڕانەوە و تکا، لە چاوانی ئەفسەر کە چووە بە قووڵا، دەڕوانێ و لێی دەپرسێ «تۆ چۆن منت ڕزگار کرد لە کوێ؟ لە کوێ؟»

ئەفسەر چاوی دادەخات، سەری بەرەو ژوور هەڵدێنێت و ئاخێک هەڵدەکێشێت و دەڵێ «مەپرسە کوڕی من، مەپرسە، زەمەنیکی دوور و درێژ تێپەڕیوە، ئیدی نایەتەوە یادم...»

«دەخیلت بم پێم بڵێ، ئەوەندەی کە دێتەوە یادت. ئەم پرسە پرسی ژیانی منە. پرسێک کە لە کەسم نەپرسیوە، بە کەسم نەوتووە و هەمیشە لە خۆم پرسیوە و هیچ وەڵامێکم وەرنەگرتووە. پێم بڵێ، بیهێنەوە بیرت...»

«هۆش سپڵەیە کوڕی من، شتەکان زوو لە یاد دەچن، لەوانەشە هەر بۆیە مرۆڤ ناگۆڕدرێ. نایەتەوە یادم، لەو هەرێمانە، لەناو خوێن و ئاگردا بوو. گەلێک گوند، دار، درەخت، دەوەن، دارستان، شیو، دۆڵ و ئەشکەوت دەسووتان. زۆر دووکەڵ و دوومان لەوانە هەڵدەستا. زۆر ژن

بێوە، منداڵ هەتیو، ئینسان بێ گوند، ئاژەڵ بێ شوێن دەمانەوە. من بەزەییم بە منداڵان، منداڵانی بچووکی هەتیودا دەهاتەوە. بەزەییم بە تۆدا هاتەوە، بەڵام نایەتەوە بیرم...»

«یانی تۆ دەڵێی... واتا من خەڵکی ئەو هەرێمانەم» باز سەیری کاتژمێرەکەی دەکات و بە ئارامی بەڵام بە هەیەجانێکی ئاشکراوە دەپرسێ «یانی باوک و دایکی من لە ڕووداوێکی هات و چۆدا نەمردن؟ لەو هەرێمانە... من هەتیو کەوتم؟ باوک و دایکی من لەوانن؟ من لەوانم؟...»

«نا، نا، من وەها ناڵێم، بەڵام نایەتەوە بیرم. تۆ سەربازی، تۆ لە ئەرتەشی، تۆ کوڕی ئەرتەشی...باوکت، دایکت ئەرتەشە. لە بیرت نەچێ. ئیدی لە من مەپرسە. ئازارم مەدە. مێشکم ماندووە، هۆشم لە دەست داوە و ناتوانێ هیچ وەڵامێک بداتەوە... بەڵام خودا شاهیدە من هەرگیز خراپیی تۆم نەویستووە...»

ئەفسەری سمێڵ قیت چاوەکانی دادەخات و ئیدی قسە ناکات. گەلۆ باز قسە بکات، شتێکی دی لێ بپرسێ؟ نا، دیارە کە ئەفسەر نایهەوێ، پێدەچێ تەندروستیشی ڕێ نەدات. باز دیسان سەیری کاتژمێرەکەی دەستی دەکات، چەند خولەکێکی دی سەیری ئەفسەر دەکات، دیسان هەر دوو دەستی دەگرێ و ماچیان دەکات. بە ئارامی دەڵێ «سپاس بۆ هەموو شتێک، تەمەن درێژ بی.»

ئەفسەر قسە ناکات، چاوەکانی ناکاتەوە. سینگی هەڵدەستێت و دادەکەوێت، وەک بڵێی چووبێتە خەو، بە ئاهەنگ نەفەس دەگرێ و دەیداتەوە.

«من دەبێ بگەمە کۆبوونەوەی گرنگ» باز وا دەڵێت و هەڵدەستێتە سەر پێ «بەڵام من بەیانی دیسان دێمەوە، جارێ کاتێکی خۆش...»

ئەفسەر قسەکانی باز دەبیسێ؟ باز نازانێ. لە بەر دەرگا جارێکی

دی لە ئەفسەر دەڕوانێ، کڵاوەکەی دەکاتە سەری، جانتا بە دەست دێتە دەرەوە، بە خێرایی بێ ئەوەی سەیری دەور و پشتی خۆی بکات، لە ساڵۆن دێتە دەر، دەچێتە قاتی خوارەوە، بە کۆریدۆری درێژدا تێدەپەڕێ و خۆی دەگەیەنێتە دەرەوە بەر ڕووناکیی هەتاو، تینی هەتاو. ئێستا؟ دوای قسەکانی ئەفسەر؟

باز کێیە؟

بڵێ باز، تۆ کێی؟ لە بەر دەرگای گەورەی نەخۆشخانە ڕاوەستاوە و بە دەنگێکی بەرز لە خۆی دەپرسێ. ئەو لە دەور و پشتی خۆی، لەو خەڵکانەی کە دێن و دەچن، لەو ئۆتۆمبیل و تاکسییانەی کە دێن و لە بەر دەرگا ڕادەوەستن، دەڕوانێ. ڕووناکییەکی بەهێز چاوەکانی پێ دادەخات، ئەستێرەی سەر جلەکانی، نیشانەی زێڕینی سەر کڵاوەکەی و قۆپچەکانی ژاکەتەکەی دەبریقێتەوە. لە دەرگا دوور دەکەوێتەوە، بەرەو خوار، بەرەو قەراخی ڕووبار دەڕوات. ئەو شوێنەی ئەم بۆی دەچێ، قەرارگەی گەڕەکی سەربازی، کەمێک لە نەخۆشخانە دوورە. ئەو حەز دەکات بە پیادە، بە کەناری ڕووباردا بڕوات. دەکەوێتە ڕێگە، بەهەنگاوی خێرا، سەری لە پێش خۆی، دەنگی جودای کەسان، زەمەن، شوێن و هەرێمی جودا لە گوێیدا، دڵی لە ناو شەپۆلی دوودڵیدا، ڕۆحی هەر وەک ئەم ڕووبارە ڕۆشنە ئاوێتەی قسە، ڕووداو، زانیاری و پەیوەندی نوێ، ڕێدەکات.

بیرەوەری، ئەو بیر دەکاتەوە، ڕۆژانی ڕابردوو، زەمەن، ڕۆژ و ڕۆژگارانی تێپەڕ بوو، قسەکانی ئەفسەر، ئەو گوندانەی دەسووتان، ئەو ئینسانانەی دەکەوتن، ئەو ژنانەی بێوە دەبوون، منداڵ و کوڕ و کچانێک کە هەتیو دەبوون. هۆش؟ بەڵام ئەم قسانە هی دوێنێن؟ هی بیرەوەرییەکی پیر، هزرێکی ماندوون؟ کەواتە ئەو گوندانەی ئەمڕۆ دەسووتێن، ئەو مرۆڤانەی ئەمڕۆ دەکەون، ئەو ژن و منداڵانەی ئەمڕۆ

بە شوێن مردووەکانیاندا هاوار دەکەن؟ ئەو شتانەی باز هەموو ڕۆژێک دەژی، شاهیدیەتی، تێیدایە، چین؟ بیرەوەریی دوێ؟ ڕاستی و واقیعی ئەمڕۆ؟ یانیش واقیعی دوێنێ، ئەمڕۆ، پێرێ، سبەی؟ ئەو دار و دارستان، شیو و دۆڵانە دێنەوە بیری باز. گەلۆ باز، ڕەگ و ڕیشەی باز لەو شوێنانە شاراوەتەوە؟ نەکا تۆ خەڵکی ئەو شوێنانە نەبی؟ باز دیسان بە دەنگەوە لە خۆی دەپرسێ. بۆچی هیچ شتێک نایەتەوە یادی باز؟ بۆچی بیرەوەریی باز ناتوانێ خۆی بگەیەنێتە لایەنی تاریکی سەردەمی منداڵیی خۆی؟ باز، لە شوێنێکی نەناسیاوی دونیا، شوێنێکی بێ ناوی ئەو وڵاتە هاتۆتە دونیا، باوک و دایکێکی نەناسیاوی هەبووە، بەڵام لە شوێنێکی ناسراو گەورە بووە، لە دەبستان و خوێندنگەیەک کە ئەمڕۆش هەر ماون و لەم شارەن، خوێندوویەتی و پەروەردە بووە. بەڵام ماڵی ئەو؟ ڕیشەی ئەو؟ ئەو شوێنەی لێی هاتووەتە دنیا؟ شوێن و جێگەکەی؟ ماڵی تۆ باز؟ باز دەپرسێ، ماڵەکەت لە کوێی ئەم دونیایەدایە؟

باز ڕادەوەستێ، جگەرەیەک لە پاکەتی گیرفانی ناوەوە لەگەڵ چەرخێک دەردێنێ، جگەرە دەگیرێنێ و زۆر قووڵ دەیکێشێ. ئەو بینایەی ئێستا لە بەرانبەریدا بەرەو ئاسمان بڵند بۆتەوە و پۆرترەیەکی ژەنەڕاڵ سەردار لە سەر جاوێکی* یەکجار گەورە ساز کراوە کە هەرچی چۆنێک بێت دیواری بیناکە بە تەواوی پڕ دەکاتەوە، شوێنی کۆبوونەوەیە. بینا شوێنی ئاشنا بۆ باز، ناوەندی پەیوەندیی سەربازی، پیلان و بەرنامەی سەربازی. بینا؛ دڵی وڵات و ئەرتەش، ڕەگی بنکەیی حوکمداریی ژەنەڕاڵ سەردار. بینا؛ باوک، دایک، ماڵ و وڵاتی باز. هەر ئەوەندە! بەڵام باز جارێکی دیکەش لەگەڵ ئەفسەری سمێڵ قیت قسە دەکات. لەوانەیە باز بتوانێ هەندێک شتی ڕوون و مسۆگەر لە زاری

* قوماش.

بێنێتـە دەر.

بـاز تـا دەگاتـە بـەر دەرگای ئاسـنی بینـا، جگەرەیکـی دیش دەکێشـێ، لـە بـەر دەرگا، ئـەو جارێکـی دی خـۆی ڕێـک و پێـک دەکات. سـەیری جـل و بـەرگ، ئەستێرە، قۆپچـە، پێـڵاو و کراواتەکـەی دەکات و دەچێتـە ژوورەوە. نـاوەوە هەرچـۆن بێـت، ئەوەنـدەی دەرەوە ڕووناکـە. لـە هەمـوو لایـەک ئـاڵای ڕەنگینــی وڵات هەڵواسـراوە. بــە دیوارانــەوە پۆرتــرەی ژەنــەڕاڵ ســەردار بـەدی دەکرێـت. سـەرهەنگێک دێـت بـۆ لای بـاز، لـە بەرانبـەری ڕادەوەسـتێ، بـە تۆنـدی سـڵاوێکی سـەربازی دەداتـێ و دەڵـێ «ئێمـە بـە هیـوای ئێـوە بووین، فەرمـوو» و دەکەوێتـە پێـش بـاز. باز و سـەرهەنگ بـە کۆریدۆرێکـی کورتـدا دەڕۆن، ئەمجـار بـە لای ڕاسـتدا دەسـووڕێنەوە، لەوێشـەوە دیسـان بـە کۆریدۆرێکـی درێـژدا تێدەپـەڕن و لـە کۆتاییـدا لـە درگایەکـی گـەورەوە دەچنــە ژوور. بــاز ســاڵۆنەکە دەناســێ، ســاڵۆنی کۆنفڕانــس، بریفینــگ و کۆبوونــەوە ڕاوێژکارییــەکان. کــە بــاز دەچێتــە ژوورەوە، ئــەو ئەفســەرانەی لـە ژوورەوەن جگـە لـە چەنـد کەسـێک لـە سـەرەوە کـە لـە پلاتفـۆڕم، لـە پشـت مێزێکـی درێـژ و لـە خـوارەوەش لـە یەکـەم ڕیـزی کورسـییەکاندا دانیشـتوون، ئەوانـی دی هـەر هەمـوو هەڵدەسـتنە سـەر پـێ و دەسـت بـە چەپڵـە لێدان دەکـەن بـۆ بـاز، بـۆ فەرماندەی ئەفسـانەیی «ئـەو هەرێمانە»، بـۆ ئەفسـەرێک کـە لـە مـردن و کوشـتن دێتـەوە. بـۆ کـوڕی دڵسـۆز و لەخـۆ بـردووی دەوڵـەت وئەرتـەش کـە گـەورەترین ترسـی «ئـەوان»ە.

بـاز بـە شـەرمنییەوە سـەیری کاتژمێرەکـەی دەسـتی دەکات. کات نـە زۆر، نـە کـەم، وەک هەمـوو جـار باز لـە کاتـی خۆیدا هاتـووە. وەک هەمـوو جـار ڕێـک و پێـک و بەیاسـا و دیسـیپلین. بـە جیددییـەت و هەسـتیاری و قایم. بـاز بـە سـەر، بزەیەکـی بەخـۆ بـڕوا و مەغروورانـە لـە سـەر ڕوخسـار، سـەیری ئەفسـەران دەکات و ڕاسـتەوخۆ بـەرەو پلاتفـۆڕم دەڕوات. کاتێـک لـە پلیکانـەکان سـەردەکەوێ و دێتـە پێـش مێزەکـە، بەژنـی خـۆی ڕاسـت

دەکاتــەوە، ســینگی دەداتــە پێــش و ســڵاوێکی تونــد دەداتــە ئەفســەر و ژەنەڕاڵ و فەرماندەکان کە لە پشت مێز دانیشتوون، دواییش هەر بەو توندی و جیددییەتە سڵاو لە ئەفسەرانی دانیشتووی ناو ساڵۆن دەکات. ئەفسەرێک لە پشت مێزەکە هەڵدەستێ، بە دەست شوێنێک نیشانی باز دەدات. باز یەک بە یەک لەگەڵ ئەفسەر و ژەنەڕاڵەکان تەوقە دەکات و دەچێت لە سەر کورسیی هێما بۆکراو دادەنیشێت.

ساڵۆن کە هەموو پەردەی پەنجەرەکانی دادراونەتەوە و کەمێک تاریکە، سەرەڕای قەرەباڵغی، بێدەنگە. نزیکەی سەدوپەنجا ئەفسەری ڕەسمی بە جل و بەرگی خاوێنی فەرمیی ئەرتەشەوە دانیشتوون، لە ڕیزی پێشەوە، نزیکەی دە ژەنەڕاڵ کە پلەکانیان لە یەک جودایە، دانیشتوون. لەم کاتەدا چەند ئەفسەر دەرگای ساڵۆن دەکەنەوە، بە خێرایی لە دواوە لە تەنیشت دیکەی ئەفسەران دادەنیشن. ژەنەڕاڵێکی بالابەرز بە چاویلکەوە کە لە لای باز دانیشتووە، هەڵدەستێتە سەر پێ و دەچێتە بەر تریبوون و بەخێرهاتنی ئەفسەران دەکات و دەڵێ «کۆبوونەوەی گشتیی ساڵانەمان دەست پێدەکەین»، چاویلکە ڕەشەکان لە چاوی دەردێنێ، سەیرێکی ناو ساڵۆن دەکات و قسەکانی درێژە پێدەدات؛ «هەروەک ئێوەش ئاگادارن کۆبوونەوە دوو ڕۆژ بەردەوام دەبێت، ئەم کۆبوونەوە لەوانەی لە ڕابردوودا گرتوومانە، زۆر گرنگترە، ئێمە ئێستا گەشتووینەتە قۆناغی چارەسەر کردنی ئاریشە و کێشەکانی بەردەممان. ئێمە بەهیوایـن کۆبوونەوە یارمەتیی ئەوە بدات...»

ئەم ژەنەڕاڵە کە بۆ باز نموونەی بەهێزی و لە خۆبردووییە و لە شەوی زەماوەندی بازدا تا کۆتایی شەو لەگەڵی بوو، ماوەیەکی درێژ بەم شێوە لە سەر یاسا، میتۆد، ڕاپۆرت و بڕیارەکان، بە دەنگێکی قووڵ بە درێژی قسە دەکات. پاشان بانگ لە ژەنەڕاڵێکی دی دەکات کە لە پشت مێزەکە دانیشتووە و درێژەی قسە بۆ ژەنەڕاڵێ قەڵەو،

کورتەبالا و قوت بەجێ دەهێڵێ. ژەنەراڵی کورتەبالا دەست بە ئاخاوتن دەکات. گوێیەکی باز لە دەنگی ژەنەراڵ، دەفتەر و کاغەز و دۆسیەکانی ناو جانتاکەی دەردێنێ، لە پێش خۆی دایاندەنێ و بە پێنووسێکی سوور، لە پاڵ هەندێک دێڕدا کە دەینووسێ، ئەستێرەیەک دەکێشێ. ژەنەراڵ دەپەیڤێ، باز بیر دەکاتەوە. قسەکانی ژەنەراڵ کە بە بڵاوی دەگەنە گوێی باز؛ ستراتیژ، پاراستن، یاسا، دەزگا، ئاستەنگ، خاوێنی، یەکیەتی، دوژمن، گەمە، فرت و فێڵ. ئەو دەنگانەی لە مێشکی بازدا ئۆلان دەدەن؛ ئەوێ، ئەوان، دووکەڵ و مژ، ئەشکەوت، بیرەوەری، بیر، زەمان، نۆبە و سەرە — زۆر، بۆچی... و ئەو، کۆتر، دەنگی ئەو، قسەکانی؛ «لە بەر بیر و باوەڕی جودا، زمان و ناسنامەی جودا، دەبێ مرۆڤ نەبێتە دوژمنی مرۆڤی دی... مرۆڤ بە شوناسێک، ئایینێک و زمانێک دێتە دونیا و لە دایک دەبێت و پێوەی دەژی، سووچ و تاوانی مرۆڤەکان لەمەدا چییە؟»

ژەنەراڵ قسە دەکات؛ ئێمە تەدبیری نوێ، چەک و ڕەختی نوێ، یاسای نوێ، مافی نوێی نائاسایی، فڕۆکە و کۆپتەری نوێمان پێویستە...

دوای ئەوەی ژەنەراڵ ئاخاوتنی یەکجار درێژی تەواو دەکات، دەنگی تیژی چەپڵە لە ساڵۆن بەرز دەبێتەوە. ئەوەندەی چەند خولەک هەموو کەس بە پێوە. ژەنەراڵ خۆشحاڵ و سەربڵند لە شوێنەکەی خۆی دادەنیشێت. ئەمجار ناوی باز دەخوێنرێتەوە، باز دەفتەر، کاغەز و دۆسیە بەدەستەوە، هەڵدەستێت و بە ئارامی بەرەو مایکرۆفۆن دەڕوا.، شتەکانی دەستی لە سەر کورسی دادەنێت، مایکرۆفۆن ڕاست دەکاتەوە و سەیری ژەنەراڵ و ئەفسەرانی دانیشتوو دەکات. باز زۆربەیان دەناسێت، لەگەڵ هەندێکیان خوێندوویەتی، لەگەڵ هەندێکیان خەباتی کردووە. بە سەر چاو و ڕوخساری هەموویانەوە، مەراقێک، لە نیگاکانیدا، ڕێز و ڕیزدارییەک دیارە. هەمووان بەژن ڕاست دانیشتوون و بە نیگایەکی بەهێز

و وشک لە باز دەڕوانن و چاوەڕێن. ئەوان چاوەڕێی چین؟ چاوەڕێی باسکردنی مردن و کوشتن؟ چاوەڕێی سەرفرازی و سەرکەوتنی ئەرتەش؟ چاوەڕێی توندوتیژی و پیاوکوژی، خراپی و پیسایی سەرهەڵدان؟ بەڵێ، باز لە نیگاکانیان تێدەگات، ئەوان بە هیوای هەواڵ و مزگێنیی باشن.

باز دەڵێ «من بە هەواڵێکی خۆش دەست بە قسەکانم دەکەم» سەیری کاغەزەکانی پێش خۆی دەکات، سەری هەڵدێنێ و بەردەوام دەبێت: «مزگێنیی من بۆ ئێوە؛ سەردەکەوین، دەوڵەت و ئەرتەش سەردەکەوێ. لە هەموو لایەک دەسەڵات دەکەوێتە دەستی دەوڵەت و ئەرتەش. ئێمە ئەم شەڕە دەبەینەوە. خەڵک دێن بە لای ئێمەدا، سەرهەڵدەر کەم دەبنەوە، هێز و توانایان کەمتر دەبێت، ئەو هەرێم، جێگە و شوێنانەی تێیدا جموجۆڵ دەکەن، تەنگتر دەبێتەوە. هێرشەکانی ئێمە وەک شەپۆلانی دەریایەکی بەهەیبەت، هەمیشە بەسەریانەوە دەبێت. هێز بە دەستی ئێمەوەیە، ئێمە سەردەکەوین.»

بە دوای ئەم قسانەی کۆتایی بازدا، چەپڵەیەک بۆیان توند، هەموو سالۆن پڕ دەکات. ئەوەندەی چەند خولەک. ئەمجار باز بە سەرنجەوە چاوی بە سالۆندا دەگێڕێ، بە دەنگێکی یەکجار نەرم، وەک ئەوەی لە بەر خۆوە قسە بکات، دەڵێ «بەڵام من هەندێک پرسیاریشم هەیە، ئەم پرسانە لە کۆتایی قسەکانمدا دەپرسم» باز دەست بە ئامار و ئەژمار دەکات؛ زیاتر لە دوو سەدهەزار سەرباز، بێ ئەژمار پادگان و بنکەی سەربازی، تانک و تۆپ و چەکی قورسی شەڕی گەورەی بێ ئەژمار، نزیکەی پەنجا کۆپتەری شەڕ، ئەوەندەی حەفتا فڕۆکەی جەنگی، دام و دەزگای بەهێزی پۆلیس، ڕێکخستنی ئاسایش و زانیاری، ئەو سیخوڕانەی لە ناو ڕیزەکانی سەرهەڵدەراندا دەخەبتن، نزیکەی سەدهەزار لە خەڵکی گوندیی «ئەو هەرێمانە» کە چەکیان هەڵگرتووە و لەگەڵ ئەرتەش، لە دژی جەردەکان شەڕ دەکەن. بە سەدان لاو کە

دەستیان لە سەرهەڵدان هەڵگرتووە، دانیان بە تاوانی خۆیاندا ناوە و ئێستا لە ڕیزەکانی ئەرتەشدا شەڕ دەکەن. پەیوەندیی بەهێز، قایم و پتەو... کێ دەتوانێ خۆی لە بەرانبەر ئەم هێزەدا ڕابگری؟

نزیکەی کاتژمێریک بەم شێوە باز دانە بە دانە باسی ستراتیژ، تاکتیک و هێرشەکان لەگەڵ ناوی شوێن، هەرێم، ژمارە، کەس، کۆمەڵ و پەیوەندییەکان دەکات. لە کۆتایی قسەکانیدا، کەمێک ڕادەوەستێ و دیسان بە وردی لە ئەفسەران دەڕوانێ و دەڵێ «بەڵام من بەڵامێکی بچووکم هەیە، ئایا کاتی گۆڕانی ئەم سیاسەتە، ئەم تیڕوانینە نەهاتووە؟ زیاتر لە بیست ساڵە کە من لە ناو ئەواندام، لەگەڵ ئەوانم، لە دژی ئەوان شەڕ دەکەم، ئەوان لە دوژمن دەپارێزم. من دەتوانم بانگەشەی ئەوە بکەم کە ئەوان دەناسم. ئەزموونی من لەم بیست ساڵەدا، بە تایبەتیش لەم ماوەی دواییدا، هەندێک پرسی بۆ ساز کردووم. بێگومان ئێمە لەم شەڕەدا بە سەر دەکەوین.، بێ شک ئێمە ئەمجاریش ئەوان دەشکێنین، بەڵام؟ بەڵام تاکەی؟ ئێمە بە سەر ئەواندا زاڵ دەبین، بەڵام ئایا ئێمە دەتوانن باوەڕییەکی گەرم بدەین بە ئەوان، ئەوان بکەینە دۆستی خۆمان؟ بێگومان ئێمە دەرەقەتی چەک، تفەنگ و شەڕی ئەوان دێین، بەڵام ئایا ئێمە دەتوانین بە سەر ئەو ستران و داستانانەی کە بۆ ئێمە نائاشنایە، زاڵ بین؟ بە سەر ئەو سترانانەدا سەرکەوین؟ بە سەر وشە پڕ لە ڕاز و نهێنییەکانیان، پچەپچە تا دوا ڕادە بەهێزەکانیان، ئەو ئەفسانە و چیرۆکانەیان کە باسی سەرهەڵدان دەکەن، سەرکەوین؟ توانا و هێزی هەرە گەورەیان هەر ئەم شتانەیە؛ زمانەکەیان، وشەکانیان، داستان و چیرۆکەکانیان، ڕۆحیاتی ئەوان —بۆ ئێمە- ئاشکرا نییە. هێزی ئەوان، نە چەک و شەڕ و پێکدادان و مردنە، بەڵکوو ئەم شتانەیە کە من باسیان دەکەم. ئایا ئێمە دەتوانین خۆمان بەم شتانە، بە قووڵایی ئەم شتانە بگەیەنین

و بە سەریاندا زاڵ بین؟ ئێمە دوێنێ کوشتمان، ئێمە ئەمڕۆ دەکوژین، بەڵام ئایا ئێمە دەتوانین ڕۆحی نادیار، سەرکەش و نائاشنایان کە بووەتە شنەی بەیان و ئێوارەیان، کە بووەتە خۆری ڕۆژ و مانگی شەویان، لە ناو ڕووبار، کانی، چیا، شاخ، دار، دارستان، دۆڵ، هەڵدێر و ئاسمانی ئەواندا دەگەڕێت، بکوژین؟... پرسیارەکانم ئەمانەن... زۆر سپاس...»

بەڵام ئێستا دەنگ نایەت، چەپڵە ناتەقێ، هەرچی چۆنێک بێت هەموو بە سەرسووڕمانەوە لە باز دەڕوانن. باز بێدەنگ نیگای لە سەر کاغەز و دۆسیەکان، دەگەڕێتەوە و لە شوێنی خۆی دادەنیشێ. بێدەنگییەکی یەکجار قووڵ باڵ بە سەر ساڵۆندا دەکێشێ. کەس ناپەیڤێ. پاش کەمێک ژەنەڕاڵی باڵابەرز بێ ئەوەی لە شوێنی خۆی هەستێ، ناوبڕێک بە کۆبوونەوەکە دەدات. ژەنەڕاڵ، ئەفسەر لە ساڵۆن دێنە دەر، ساڵۆن چۆڵ دەبێ. بەڵام باز لە شوێنی خۆی ناجووڵێ، ئەو کاغەزەکانی ڕێک و پێک دەکات، دەیانخاتەوە ناو جانتا، لە پەرداخەکەی بەردەمی چەند قوم ئاو دەخواتەوە و دادەنیشێ. ئەمجار ژەنەڕاڵی باڵابەرز دێت بۆ لای ئەو. باز هەڵدەستێتە سەر پێ، بەژن ڕاست ڕادەوەستێ. ژەنەڕاڵ دەڵێ «وەرە، لەگەڵ من وەرە» لە پشت پلاتفۆرمەوە، ئەوان، ژەنەڕاڵ لە پێشەوە و باز بە دوایدا دەچنە ناو کۆریدۆر و لە بەر یەکەم دەرگای کۆریدۆر ڕادەوەستن. ژەنەڕاڵ بە کلیدێک دەرگا دەکاتەوە، ئەوان دەچنە ژوورەوە، ژوورێکی یەکجار ڕووناک. ژوور بە سەر ڕووباردا دەڕوانێ و هەموو پێشەکەی بە پەنجەرە و شووشە دانراوە. لە ژوورەکەوە، دیمەنێکی یەکجار جوانی ڕووبار و ئەوبەری شار دیارە. ژوورەکە زۆر جوان ڕازاوەتەوە، مۆبیلیاتی چەرم، مێزی خڕی شووشەیی، مافوورێکی تاریک لە ناو ژووردا ڕاخراوە. بە دیواری پشت مێزیشەوە ژەنەڕاڵ سەردار. ژەنەڕاڵ دەچێتە پشت مێز و لە سەر کورسی دادەنیشێ. باز

بە پێوە، بەژن ڕاست، چاو لە پێش، هەر دوو دەستی بەرەو خوار بۆ سەر پانتۆڵی خاکی، بێدەنگ ڕادەوەستێ. «تۆ دەزانی» ژەنەڕاڵ چاویلکەکانی دەردێنێ، هەر دوو دەستی دادەنێتە سەر مێزەکە، بە وردی لە باز دەڕوانێ و دەڵێ «تۆ وەک کوڕی من وای، دەبێ لە بیرت بێ من هاتبووم بۆ زەماوەندەکەت. تۆ دەزانی پاش مانگێکی دی، کاتی پلە وەرگرتنی ئەرتەشە، با لە ئێستاوە پێت بڵێم، تۆ دەبێ پلە وەربگری و ئێمەش شوێنەکەت دەگۆڕین. تۆ لەو هەرێمانە زۆر ماندوو بوویت. پێویستت بە حەسانەوەیە. ئێمەش کوڕی وەک تۆ بەڵام زیندوومان پێویستە، با ئاگات لێی بێ، فەرموو بڕۆ.»

باز دەڵێ «سپاس»هەر دوو پێڵاوی ڕەشی خۆی دەدات بە یەکدا و بە شێوەی سڵاو ڕادەوەستێ. پاشان هەڵدەگەڕێتەوە تا لە ژوورەکە بچێتە دەر، بەڵام کە دەگاتە بەر دەرگا، ژەنەڕاڵ لێی دەپرسێ «برا حاڵیماڵەوەتان چۆنە؟ حاڵی ژن و منداڵەکانت؟»

باز ڕادەوەستێ، دەسووڕێتەوە، ساف، سەیری ژەنەڕاڵ دەکات، بەڵام وەڵام ناداتەوە. ژەنەڕاڵ دیسان دەپرسێ «دەڵێن تۆ ناچیتەوە بۆ ماڵی خۆت، ئایا ڕاستە؟»

باز بە کورتی دەڵێ «ڕاستە»

ژەنەڕاڵ بە دەنگێکی وەک فەرمان دەڵێ «بچۆرەوە بۆ ماڵی خۆت، بڕۆ ناو منداڵەکانت، بگەڕێوە بۆ ماڵەکەت و لە ئێستاوە ئامادەکاریی گەڕانەوە بکە، تۆ ئەو هەرێمانە بەجێ دەهێڵی. فەرموو»

باز دەست دەبات بۆ دەستگیرەی دەرگا کە بێتە دەرەوە،، ئەمجار ژەنەڕاڵ دیسان قسە دەکات «برا لە بیرت نەچێ، ئەو کچە کە لە لاتە، ڕادەستی فەرماندەی پادگانی شاری بکە. هەر ئێستا بە زووترین کات.»

ئەمجار باز وەک ئەوەی برووسکێک لە دڵی دابێت، لە جێی خۆی

ڕادەوەستێ، تەزوویەک بە سەریدا دێت. هەر وا بێ جووڵە دەمێنێتەوە، هەڵناگەڕێتەوە، ڕووی باناداتەوە، هەروا ڕادەوەستێ.

ژەنەڕاڵ قسەکەی دووبارە دەکاتەوە «لە بیرت نەچێ»

باز دەڵێ «بەڵام...» لێ ئیدی قسەیەکی لە زار نایەتە دەر. ئەو دیسان دەڵێ «بەڵام...»

«ئێمە گوێمان لە بەڵامەکەشت گرت. بەڵام نییە. تۆ دەبێ ئەو کچە ڕادەست بکەی... هەر ئەوەندە...»

## ١٥

# سەفەر

باز و کۆتر پێکەوە لە ناو ترێنێکی شەودا.

بـاز و کۆتـر هـەر وەک زۆر جـاری دی، بەرێکـەوە، لـە نـاو ڤاگۆنێکـی بچووکـی ترێنـدا.

بەسـەرهاتی بـاز وکۆتـر؛ لـە سـەفەر بـە ترێنێکـی سـەربازییەوە بـۆ سـەفەر بـە ترێنێکـی ڕەشـی شـەوان. بـەڵام نـە بـاز ئەمـەی دەزانـی نـە کۆتریـش. دوێنـێ؛ سـەفەرێکی درێـژ بـە ترێـن، بیسـت و چەند سـاڵ پێش ئێسـتا، ڕێگەی دوور خسـتنەوەیەکی جەمـاوەری و درێـژ، بـەرەو وڵاتـی بیابـان. ئـەو کات بـاز ئەفسـەرێک بـوو تـازە دەسـتی بـە کارکردبـوو و بەرپرسـیاری ڤاگۆنێکـی گەورە و گـەرم و داخـراوی ترێـن بـوو. لـە ڤاگۆنـدا مرۆڤـی جۆراوجـۆری وڵاتـی چیـا، لـە ڕێگـەی دوورخسـتنەوەدا بـوون. لـە نـاو ئـەو مرۆڤانـەدا بـاوک و دایکـی کۆتریـش هەبـوون. ئێسـتا بـاز نازانـێ کـە ئـەو کەسـەی لـە نـاو گەرمـای ترێنـی دوور خسـتنەوەدا هـات و داوای ئـاوی لێکـرد، باوکـی کۆتـر و ژنـە دوو گیانەکـەی، دایکـی کۆتـر بـوون. ئیسـتا کۆتـر نازانـێ فەرمانـدەی کۆچـی دایک و باوکـی – بـەر لـە لەدایک بوونـی ئـەو – بـاز بـووە. ئەمڕۆ؛ دیسـان ترێـن و سـەفەرێکی درێـژ.

بـاز و کۆتـر؛ دوو ناسـیاوی یـەک، بـەر لـەوەی کە ئەوان وەک دوو ئینسـانی

تێگەیشتوو لە دۆخێکی ناخۆشدا تووشی یەک بێن. ترێن؛ پەیوەندییەکی نادیاری ژیان و بەسەرهاتی ژیانی ئەوان.

باز و کۆتر؛ دوو ئینسان، پیاوێک و ژنێک. بەڵام دوو دوژمن؟ دوو دۆست؟ بەڵێ، پەیوەندییەکی نادیار لە نێوان ژیانی ئەواندا. بەڵام چۆن پەیوەندییەک؟

بەڵێ ئێمە لە ترێنێکی درێژ، لە ڤاگۆنێکی بچووکی چوار کەسیدا، بە نیوەشەو دەڕۆین، لەگەڵ باز و کۆتر. لە سەر ڕێگەی پەیوەندی و ژیانی ئەوان. نیوەشەوە. کات، کاتی خەوتن و نوستن و خەونان. بەڵام شەو ڕۆشنە، شەوێکی ڕووناکی هاوین. ئەستێرەیەکی بێژومار لە لای پەنجەرەی ڤاگۆن، لە دەرەوە، بە ئاسمانەوە دەدرەوشێنەوە. نیوە مانگێک وەک ئەوەی سەری دانەواندبێت و پاسەوانی لە ئەستێرەکان بکات، دەبریقێتەوە. هەندێک هەور وەک چارشێوێکی تاریک، وەک پینەی سەر جلێک، بە هەندێک شوێنی ئاسمانەوە دیارن. ترێن بە دەنگێکی ترسناکەوە، لە ئامێزی شەودا، ئەو شەوەی کە وەک مافوورێکی هەوریشمی دەدرەوشێتەوە، بە هاژە هاژ دەڕوات. بە تەنیا دەنگی ترێن دەبیسترێ، جگە لەوە، نە دەنگ و نە سەدایەک.

ترێن دەڕوا، شەو دەڕوا، باز و کۆتر دەڕۆن. باز و کۆتر لە بەرانبەر یەک لە پاڵ پەنجەرەی گەورەی ترێن دانیشتوون. لە ڤاگۆنی چوار کەسیدا تەنیا ئەوان هەن. ڕووناکیی بێزاری شەوخەفێک لە سەر سەری کۆترەوە، کەمێک ناو ڤاگۆن ڕووناک دەکاتەوە. جل و بەرگ و پۆشاکیان مەدەنییە. باز، پانتۆڵی بێژ، کراسێکی زەرد و جووتێک پێڵاوی سووکی هاوینیش لە پێدا. کراسەکەی بە سەر پانتۆڵەکەیدا بەر داوەتەوە تاوەکوو دەمانچەی پشتی — بارێتای کوشتن — دیار نەبێت. کۆتر کراسێکی درێژی ڕەنگینی کەتانی لە بەرە، لەگەڵ جووتێک پێڵاوی سووکی وەرزشی لە پێدا. ئەوان بەخەبەرن بەڵام قسە ناکەن. هیچ دەنگێک لە ڤاگۆندا نییە.

باز چاوی بەستووە، لاقی کەمێک ڕاکێشاوە، سەری خستۆتە سەر بالیفی ئەو کورسییەی لە سەری دانیشتووە و بیر دەکاتەوە. هەرچی کۆتریشە لە ڕووبەڕووی باز لاقی خۆی کێشاوەتە سەر کورسی، دەستێکی ناوەتە بەر پەنجەرە، دەفتەرەکەی لە ئامێزیدا، سەیری دەرەوە، سەیری ئەستێرە، مانگ، هەور و ئاسمان دەکات. باز و کۆتر لە بەرانبەر یەک دانیشتوون، لە یەک ناڕوانن، هەر یەک لە دونیای خۆیاندا، بیر لە خۆیان، دەنگ، ڕووداو، هەست، لێقەومان و پەیوەندییەکانیان دەکەنەوە. ئێستا کات، کاتی بیرکردنەوە و هزرانە. وا دیارە ئێستا لەم شەوە بێدەنگ و ڕووناکەی هاویندا، بیر کردنەوە لە پەیوەندییەکان، تیڕوانین و قسەکان زۆر باشتر دەبێت. گەلۆ ئەوان بیر لە چی دەکەنەوە؟ هەست بە چی دەکەن؟ گوێ بۆ کام لە دەنگەکان ڕادەگرن؟ دڵیان بۆچی لێ دەدات؟ ئەوان لە کوێوە دێن و بەرەو کوێ دەڕۆن؟... ئێمە ئێستا چۆن وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە؟

پێدەچێت ئاوەها یەکڕاست، کەمێک پەرش و بڵاو، کەمێک ئاڵۆزکاو؛

باز، ئێمە لە لای بازین؛ بەڵێ وەها، من دەڕۆم، ئێمە دەڕۆین، من و ئەو. کچێکی پڕ نهێنی کە هاتۆتە سەر ڕێگەی من و ڕێگەکەمی بەرەو شوێنێکی نادیار گەڕاندۆتەوە. ئیدی کێ چ دەکات، کێ چ دەڵێ، بە لامەوە گرنگ نییە. ئیدی تەواوە ، ئیدی کۆتایی هات، هەموو شتێک تەواو بوو. بەڵێ وەها، هەر وەک ئەوەی مادەر وتبووی؛ «بۆ ژین و ژیان، هەنگاو پێویستە» نوێبوونەوە، گۆڕان، ویست و ژیانێکی بەختەوەر، هەنگاوی نوێ، جموجۆڵی نوێ پێویستە. کەمێک بەهێزی، کەمێک ورە، کەمێک جەسارەت پێویستە. ئەسیر، ترسەنۆک، کۆیلە، ددانی چەرخێکی ترسێنەر، ناتوانن هەنگاوی نوێ هەڵبگرن. جموجۆڵی نوی ئەنجام بدەن، ناتوانن خۆیان لە کۆت و زنجیری ترس، سام، شەرم، پێوەر و خووەکان ڕزگار بکەن و ڕزگار ببن. «تا نەکێشی جەفا نابینی سەفا». مادەر،

خۆزگە تۆش ئێستا لێرە دەبوویت و کوڕە هەتیوەکەی خۆت دەدیت. ئیدی نە ئەو خوو و پێوەرانەی کە منی دیل کردبوو، نە ئەو ترس و نیرەی* کە لە گەردنمدا بوو، نەماون، تەواو بوو. من ئازادم، ڕزگارم، سەربەستم، وەک ئەستێرەیەک لەو ئەستێرانە، وەک ئەو مانگەی لە دەرەوە بریقەی دێت. ئیدی تەواو، هەر ئەوەندە. من سنوور، یاسا و پێوەرەکانم خستە ژێر پێ. من سنوورە نادیارە زۆر پتەو و یەکجار وشکەکانم نایە ژێر پێ. ئەو سنوورانەی دڵ و مێشکی منیان خستبووە ناو قاڵبێک، ئیدی نین، من ئەوانەم لابرد، هەڵموەشاندنەوە. مادەر خۆزگە تۆش لێرە دەبووی. مادەر لێم ببورە کە هەواڵی هەڵاتنی خۆم پێ نەگوتی، بەڵام من تەلەفۆنت بۆ دەکەم، دانە دانە هەموو شتێکت پێ دەڵێم، من دەزانم ئەو کاتە تۆ خۆشحاڵ دەبی. بەڵام ئێستا نا. ئێستا پڕ مەترسییە. پاش ئەوەی من/ ئێمە سنوورە مەترسیدارەکانیشمان بەزاند. سنوورە نادیارەکان، دوژمنەکانی من، دوژمنەکانی ژیانی من. سنوورە نادیارەکان، وەک سنوورە نادیارەکانی ئەم وڵاتە، وەک چیا و شاخ، دۆڵ و شیوەکانی ئەم وڵاتە. بەزاندنی سنوورە نادیارەکان؟ کاری هەرە دژواری ژیانی من کە پڕ لە دژوارییە، لە بەزاندنی سنووری شیو، دۆڵ، ڕێچکە، هەڵدێر، سەرچاوە، ئاو و ڕووباری ئەم وڵاتەش دژوارتر. بەزاندن، هەنگاو بە هەنگاو، بست بە بست، بە شەو و ڕۆژ، مانگ و ساڵ، زستان و هاوین، تەمەن و ژیان- تاوەکوو مرۆڤ بتوانێ- لە ناکاو خۆی لەو دیوی سنوورەکاندا ببینێتەوە. وەک ئێستا. ئێستا من ئیدی لەو دیوی سنوورە نادیارییەکانم.

مادەر، من بە تۆم نەگوت، من پێت دەڵێم، بەڵام مەگەر تۆ دەزانی کە سەرۆک و فەرماندەکانم چییان لە من دەخواست؟ ئەم کچەی کە ئێستا لە بەرانبەرم دانیشتووە و سەیری دەرەوە دەکات، ئەو کچەی کە

* ئەو دارەی لە کاتی کێڵانی زەویدا دەخرێتە ملی گاجووت.

من ناویم نەبرد، بەڵام بۆ تۆم باس کرد، ئەوان دەیانگوت: «تۆ دەبێ ئەو ڕادەست بکەی». بنەبڕ، لە یاسا بنەبڕتر. ئەوان حەزیان دەکرد من لەم وڵاتە دوور بخەنەوە. دوای بیست و چەند ساڵان، دوای ئەو هەموو خوێن، ئارەقە، ژان، ئازار، کەسەر و خەباتە. دوای ئەو هەموو وانە و ئەزموونانە. ڕاستە، من ماندووم، ژیانم ئاڵۆزکاوە. ڕاستە، هیوا، مراز و هەستەکانی من تێک شکاون. بەڵام هۆکار چییە، هۆکار کێیە؟ وەک ئەوەی هیچ شتێک نەبووە، نەقەوماوە، ئەوان دێن و دەڵێن «سپاس» و من لێرە، لەو گەردەلوول، بەفر و بۆران، خۆر و تین، باڵندە و باز، جۆگە و ڕووبار، دار و درەخت، شیو و دۆڵ، مانگ و ئەستێرە، دەنگ و سەدا، نان و ئاو، ژن و پیاوی ئەو هەرێمانە دوور دەخەنەوە. بیست و چەند ساڵی من لەو هەرێمانە؟ ژیان، خوێن، ئارەقە، ژان، پەژارە، خەم، خەیاڵ و ئەزموونەکانی من لەو هەرێمانە؟ ئەو ژیانەی من لەو هەرێمانە ڕامبردووە، سازم کردوە؟ پەیوەندییەکانم؟ ئەو کەسانەی بڕوایان بە وتە و کردەوەکانی من هەیە و بە وتەی من ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە، بەرەو مەرگ دەڕۆن؟ نا، من مافم نییە کە ئەم شتانە بپرسم، هەست بکەم، من تەنیا مافێکم هەیە؛ پێمل بوون و گوێڕایەڵی. من کچەکە بدەم بە دەستەوە، تەمەنی خۆم، ژیانی بیست ساڵەم بخەمە ژێر پێ و بێدەنگ لە شەوێکی تاریکدا وەک دزێک، وەک چەتەیەک، ئەو هەرێمانە بەجێ بهێڵم و بڕۆم!... نا ئیدی قەت، ئیدی بەسە!

کۆتر، با ئێمە بێین بۆ لای کۆتر؛ ئێمە ئاوەها بەرەو کوێ دەڕۆین؟ ئەم پیاوە کە ئاوەها لە پڕ گۆڕا، من بەرەو کوێ دەبات؟ هیچ شتێک بە من ناڵێ، بە تەنیا دەڵێ «قەت، بەسە، ئیدی بەسە». ئێمە دەڕۆین، ئەوە حەفتەیەکە ئێمە بە ڕێگەوەین. سەرەتا شاری گەورەی وڵاتی چیا. نیوەشەوێک. دیسان ئەو، باز لە ناکاو لە ماڵەوە. ئەم پیاوە کە ئێستا چاوی خۆی بەستووە و خودا دەزانێ بیر لە چی دەکاتەوە، لە ماڵەوە،

سەرسووڕماو، ماندوو، جگەرەیەک بە دەمیەوە، جانتایەک بە دەستییەوە، دەمانچە بە کەمەرییەوە، وەک هەمیشە سەرخۆش، بەڵام بە ڕوانینێکی نەرمەوە. «زووکە، زوو خۆت کۆ بکەوە، با بڕۆین» بەرەو کوێ؟ هیچ وەڵامێک نییە، «ئێمە دەڕۆین، من دەبێ تۆ لە مردن ڕزگار بکەم، من دەبێ خۆم لە مردن ڕزگار بکەم. زووکە با بڕۆین، خێراکە». ئامادە کردنی جانتایەکی بچووک، بەڕێکەوتن لە تاریکیی شەودا. بە جیپێکی سەربازی تا شارێکی نزیک، هەر وەک ئێستا لە دڵی شەودا. لەوێش لە هۆتێلێک لە ژووری جودادا، هەندێک لە پەیوەندییە نهێنییەکان، هەندێک تەلەفۆن، داکەندن و گۆڕینی جل و بەرگ و دیسان سەفەر. لەو شارەوە بۆ شارێکی دی، دیسان هۆتێل، لەوێشەوە بۆ یەکی دی، بەمجۆرەهەنگاو بە هەنگاو، شار بە شار، شوێن بە شوێن وەک بڵێی دەیهەوێ شوێن پێی خۆی ون بکات، ڕێگەی پاش خۆ، ون کردن. بە جیپێکی سەربازی، ئۆتۆبوسی مەدەنی و ترێنێکی درێژ. بەڵام بۆچی؟ چی لەم مرۆڤە شێتە، لەم دڵە شێتە قەوماوە؟

باز؛ مادەر، خۆزگە تۆ دەتزانی کە ئەفسەری سمێڵ قیت لە نەخۆشخانە چی دەگوت، قسەکانی ئەفسەری سمێڵ قیت؛ «خوێنێکی یەکجار زۆر ڕژا، کوڕی من لەو هەرێمانە زۆر ژن بێوە، منداڵ هەتیو دەبوون... من بەزەییم بە تۆدا هات...»، زمانم ناگەڕێ کە چۆن بڵێم. من، ئەوان، من خەڵکی ئەو هەرێمانەم؟ من لە ئەوانم؟ کەواتە ئەی ئەم ژیانەم؟ ئەو کردە، جموجۆڵ، خوێن وئارەقەیە کە من دەیڕێژم؟ هەمووی درۆیە؟ هەمووی پووچە؟ ژیانی من، تەمەنی من، ژیان و تەمەنێکی درۆ و پووچە؟ لەوانەیە من بتوانم لەگەڵ تۆ قسە بکەم، بەڵام ئەی بە منداڵەکانم چی بڵێم؟ من کێم؟ هی کێم؟ ئەم هەستە وێرانکەرە، ئەم دوو دڵی و دڕدونگییە کە منی تێکەوتووم، تێکی شکاندووم. ئێستاش، لەم شەوە ڕووناکەشدا، هەناسەم لە بەر دەبڕێ. بەم هەستانەوە من ئیدی ناتوانم

هەڵگری هیچ شتێک بم، خۆم بە شتیک بێنمە ئەژمار، قەت ناتوانم بخەوم، ئیدی ناتوانم دەست بدەمە هیچ کارێک. بەڵام ئیدی بەسە، بەسە... ئیدی ماڵئاوا لە هەموو شت، ئیدی چاوەڕوانی، ڕاوەستان و بیر کردنەوە ئەوەندەی یەک چرکەش هەر زۆرە. بە هاتنەوەم بۆ پایتەخت، پیاڵەکەش بە دوا دڵۆپ پڕی ئاو بوو. من ئێستاش وەک پیاڵەیەکی پڕ، سەرڕێژ دەکەم. من دەڕۆم، دەڵێم ماڵئاوا و دەڕۆم؛ ماڵئاوا ژیانی سەربازی و هەموو تەمەنم تا بە ئەمڕۆ؛ ماڵئاوا پادگان و مەفرەزە، گەڕەک و ماڵی سەربازی، ماڵئاوا هیوای ڕۆژانی سەرەتا، مرازەکانی ژیانی سەربازیم ، خەیاڵەکانی ڕۆژانی داهاتووم، ئەوەی پاش ژیانێکی درێژی سەربازی؛ بەڵێ ماڵتان ئاوا، سەرباز، ئەفسەر، ژەنەڕاڵ، فەرماندار، دیسیپلین، یاسا، بەرنامە، فەرمان، نرخ، شەرەف، مردن، کوشتن، سووتان، دوژمن، ئەشکەنجە، زوڵم، زۆرداری، توندوتیژی؛ ماڵئاوا ژیانی شەو، ژیانی تاریک، چوون، ڕێکردن، هێرش. ماڵئاوا هەموو ژیانی من تا بە ئەمڕۆ... مادەر خۆزگە تۆ لێرە دەبووی. ئەو شتانەی کە ئێستا بیری لێدەکەمەوە، ئەم قسانەی کە ئێستا دەیکەم، بۆ تۆن، من ئەگەر هیچم بە سەر نەیەت و بتوانم بە ساخی لەم هەڵاتنە ڕزگار بم، ڕۆژێک ئەوانەت گشت پێ دەڵێم؛ ئێستا من تێدەگەم، بە ئەزموونەکانم، بە ڕووداوە نوێیەکان، دەتوانم ڕێگە، ئامانج و مەبەستی باش و خراپ لێک جودا بکەمەوە، من باوەڕم هەیە کە دەتوانم، من دەتوانم ئێستا تێبگەم لە پشت کام ئامانجەوە چ ویست و خواستێک هەیە، ئێستا من لە ڕێگەیەکی نوێ دەگەڕم، بە جەسارەتەوە، ئەو جەسارەتەی کە تۆ هەمیشە باست دەکرد، دەکەومە سەر ڕێگەیەکی کەمێک ڕووناک کە کۆتاییەکەی دەتوانێ مردن بێ، بەڵام با وەها بێت. سەرەڕای هەر شت من ئێستا کەوتوومەتە سەر ڕێگەیەکی نوێ، یەکجار نوێ. من ڕێگە کۆنەکان بەجێ دەهێڵم، پردە کۆنەکان دەسووتێنم. ترێن من دەبا، لە ڕێگە و لە پردە کۆنەکان دوورم دەخاتەوە. با پێت بڵێم

گەر ئەمەم نەکردبا، هەنووکەش تا ئێستا لە ناو گۆمی خوێندا دەبووم. مەگەر تۆ هەمیشە نەتدەگوت «کوڕی من، تۆ شێتی» با پێت بڵێم من شێتم و شێتییەکەشم ئەمجار سوودی بوو، بۆ ئەم هەنگاوە نوێیە، ئەم ڕێگە نوێیە شێتی پێویست بوو.

کۆتر: ئەم ڕێگەی کە ئێمەی تێیداین بەرەو کوێ دەڕوا؟ کۆتاییەکەی چۆن تەواو دەبێ؟ کۆترا تۆ بۆچی مەراقی ئەوەت هەیە؟ ڕێگە بۆ کوێ دەڕوا با بڕوا، چی دەقەومێ با بقەومێ. بە تۆ چی؟ تۆ چیت لەوە داوە؟ مەگەر هەموو شتێک بۆ تۆ تەواو نەبووە؟ مەگەر تۆ هەنووکە هیوات هەیە شتێک بەرەو باش بوون بڕوات؟ نا، خۆت مەخڵەتێنە. ڕاستی بڵێ، بڵێ کە تۆ ون بووی، تۆ مردوویت و تۆ نەفرەت دەکەی. بەڵێ، کۆتر لە وتنی نەفرەت نەفرەتی دەکرد، ئێستا لە هەموو شت نەفرەت دەکات. وەهایە. نەفرەت لەو ئینسانانە، لە هەموو ئینسانێک، قسەکانیان، پێکەنین و گەمەکانیان، هەستان و دانیشتنیان، هزر و گومانەکانیان، کین و نەفرەتەکانیان، بەربەرییەت و چاو پێ هەڵنەهاتنیان، درۆ و فێڵەکانیان، شەڕ و پێکدادانەکانیان، چەک و ڕەختەکانیان، مردن و کوشتنەکانیان، بۆسە و کەمینەکانیان، فڕت و فێڵەکانیان. نەفرەت لەم وڵاتە، لەم وڵاتە، لە دیمەنی بەیانیان، لە مەغریبی ئێواران، لە نیوەشەوان، لە چیا سەرکەشەکان، هەڵدێری بن لە جەهەننەم، بەفری فریوکار، باران و تۆفان، خۆر و گەرمای بیابان، ڕەنگ، تام، خۆشی و ناخۆشی، دەر و دەشت. نەفرەت لە ئەم، لە ئەو، لە ئەمان، لە هەمووان، لە هەر کەسێک. نەفرەت زیاترە لە ترس، لە خەم، لە پەژارە، لە دڕدونگی، تۆراوی، کابووس، سام. بەڵام ترس، ئێجگار زۆر ترسی وێرانکەر. کەواتە؟ دەی بڵێ کەواتە کۆتر تۆ بۆچی مەراقت هەیە؟

باز: ئەو کاتە، ئەو ڕۆژەی کۆنفڕانسی گرنگی سەرەکیی ئەرتەش لە پایتەخت. ئەو کات، مادەر، ئەو کات ، بڕیار، ئەو کات هەژان، لەرزین،

سەرەڕای تین و تیشکی خۆر، سارد، نا جارجارە سارد وەک سەرمای زستان، جارجارەش گەرم وەک تینی ئەم خۆرە گەرمە، جگەرە، بۆن و تامی جگەرە، دووکەڵی جگەرە، ئاخاوتن، قسە کردن، دەنگ، شەپۆلانی دەنگ لە مێشک و ڕۆحدا. بەڵام، بەڵام، بەڵام... بکوژە، بکوژە، بکوژە... نە جارێک، نە دوو جار، نە دە جار. نە سەد و نە هەزار جار... بکوژە، بەس بکوژە. بەڵام دوایی، بەڵام دوای کوشتن؟ بەڵام مەگەر ئێمە ناتوانین ئەم پرسە کە بووەتە کانیاوی خوێن، بە ڕێگەیەکی دی، بە شێوەیەکی دی چارەسەر بکەین؟ نا، نا، نا... «تۆ دەست لەو هەرێمانە، لە ئەوان، لە ئەو هەڵدەگری». هەر ئەوەندە. «تۆ دەبێ ئەو ڕادەست بکەی». هەر ئەوەندە. من کێم؟ هیچ کەس، هیچ شتێک، هەر تەنیا ددانێکی چەرخی گەورە. باز، فەرماندە، دەسەڵات، وتەکانی یاسا، بەڵام لە ناو چەرخەکەدا تەنها ددانێک. دەردەکانی من، هەست و هزرەکانم، ویستەکانم، کەس و کەسایەتیی من؟ کێ خەمیەتی؟ خەمی هیچ کەسێک نییە. ئەمجار بڕیار، ئەمجار تێگەیشتن، بەڵام درەنگ، دوای تەمەنێک، سەر لە ئێوارە، دوای یەکەم ڕۆژی کۆنفرانس، لە بەر ڕووبار. شەوق دانەوەی ئاوی ڕووبار، تیشکی سووری خۆر، ئاسمانی ساماڵ، گوڵ و گیا درەوشاوەکانی باخچەی قەراخ ڕووبار، بەردی ڕەشی ڕاخراوی پیادەڕەو و ڕوخساری تێکەڵ و جودای مرۆڤەکان. هزر و گومان؛ ئێمە چیمان کرد، چی دەکەین؟ من چیم کرد، من چی دەکەم و من چی بکەم؟ قسەکانی ئەفسەری سمێڵ قیت و مادەر، قسەکانی تۆ و کۆتر لە گوێ و لە مێشکدا. کوڵی گریان. کوڵی تووڕەیی و بێزارییەکی سەیر قورس. کوڵی هەستێکی نائاشنا. نایەتەوە یادم بەڵام لەوانەیە چەند دڵۆپ فرمێسکیش. هەنگاوی قورس لە کەناری ڕووبار. هەنگاو، هەنگاوی نوێ. بەڵێ هەنگاوی نوێ. لە سەر ڕێگەیەکی نوێ. هەنگاو هەڵگرە! مەترسە! جەسارەت! ئەمجار بڕیار. ئەمجار ئارامی و حوزوورێکی نائاشنا. ئەمجاریش تووڕەیی، خەم و

گومان کە بوونەتە داوی جاڵجاڵووکەیەک و ژیانی منیان بە دیل گرتووە، دوور، یەکەمجار، پاش ماوەیەکی یەکجار درێژ.

کۆتر: من ئیدی بە کێ بڵێم، من چۆن باسی خۆم، ژیانی خۆم، ژیر، ڕۆشتنەکەم، ژیانی خۆم لەو هەرێمانە، مردن و کوشتن، هەڤاڵان، ڕێناس، کە لە بەر من، لە بەر ترسی من کوژران، ژینی نوێی خۆم بکەم؟ چۆن، بە چ زمانێک، کەی؟ کێ گوێ لە من دەگرێ؟ ئاگر بکەوێتە شوێنێک دەسووتێنێ. کێ خەمی ئاگر، سووتان، مردن و کوشتنی هەیە؟ کوشتنی کچ و کوڕان، سووتانی درەخت و گوندان، مردنی ڕۆح و مێشکی من کێشەی کێیە؟ ئەو خەم، ژان، پەژارە و خەمگینییەی من دەکوژێ، دەمخنکێنێ، کێ بە خەمی دەکات؟ ئەو ئاگرەی کەوتۆتە ئەم دڵە نائارام و شکاوەی من، ئەو شەپۆلانەی کە لە هەموو جەستەی ماندوو، مێشکی ئاڵۆز، سەری گێژمدا دەتەقێنەوە، کێ بە خەمی دەکات؟ ئەم ترسە کە منی ئەسیر کردووە، ئەم سامە کە منی ڕیسوا کردووە، ئێستا کێ بە خەمی دەکات؟ من ئێستا وەک خەوێک، وەک خەونێک لەم شەوە ڕۆشنە سیحراوییەدا دەڕۆم، بەرەو شوێنی نائاشنا، لەوانەشە بەرەو مردن. کێ دابڕان و ڕۆشتن بە خەم دەکات؟ جگە لە دادە، کەس، هیچ کەسێک... من دەبێ بنووسم. نووسین، دێڕ، لاپەڕە، بە تەنیا ئەوانە هاوڕێی منن، بە تەنیا ئەوانە حاڵ و هەواڵی من تێدەگەن.

باز: مردن، مادەر، مردن. مردن و کوشتن. کەڵک وەرگرتن لە مردن و کوشتن بۆ ئامانج و مەبەستان. بۆ پاراستنی وڵات، دەوڵەت، میللەت، ئاڵا، بەها، شەرەف و سەربەرزی. بۆ نیشاندانی هێز و توانا، دەسەڵات و حوکمداری. بۆ درووستکردنی یەکدەنگی، بۆ سەرکوتکردنی دەنگ، ویست و ئامانجە جوداکانی دی. ئەو خوێنەی لە مردوو و کوژراوان دەڕوا، ئەو قیڕە و هاوارەی لەوان بەرز دەبێتەوە، لە کۆڵان و شەقامەکان، کووچەی تەنگەبەر و بولوارە گەورەکان، لە چیا و شاخ، دەشت و کوێستان، لە ژێر

دیوار و بنار، شیو و دۆڵ، لە ناو دار و دارستان، ئەشکەوت و موغارەکاندا، بە شەو و بە ڕۆژ، لە بەفر و سەرما، گەرما و خۆردا. ئەو ژیانەی لە سەر مردن و کوشتن ساز کراوە. ژیانی من، ژیانی هاوڕێیانی من، ژیانی «خێزانە گەورەکەی من» کە لە هەموو کەس جودایە. پارێزگار و پاسەوانی هەموو شتێکە، حاکمی هەموو شوێنێکە، نەک لە دڵی هەموو کەسێکدا، بەڵام بە سەر هەموو کەسێکەوەیە. مردن و کوشتن لەوانەیە ڕێگەی هەرە ئاسان [بێت]. بەڵام ڕوو وەرگەڕان لە مردن و کوشتن؟ دژوارترین ڕێگە، من ئێستا تێدەگەم، پێی دەزانم، دژوارترین هەنگاو. ئەوان، سەرۆک و فەرماندەکانی من، داوای ڕاپۆرتی شەڕ، پێکدادان، مردن و کوشتنم لێ دەکەن، نەک هی پاراستنی ژین و ژیان. بەڵێ کوشتن، بەڵێ بکوژە، بکوژە، بکوژە. بەڵام تا کەی، تا چ ڕادەیەک؟

کۆتر؛ بەڵام من دەژیم، من دانیشتووم، بیر دەکەمەوە. ئەو مانگە ڕووناکە، ئەو ئەستێرانە دەبینم، گەرمای ئەوان، شەوق دانەوەیان هەست پێ دەکەم. نا، درووست نییە کە من نەفرەت لە هەموو شتێک دەکەم. نا، من لەو ئەستێرانە، لەو مانگە نەفرەت بکەم؟ نا، من نەفرەت ناکەم، بەڵام من دەنووسم، نەفرەتیش دەنووسم؛ نەفرەتێک کە لە دڵی تاریکیدا داوی خۆی ناوەتەوە و وەک ڕاوچییەکی لێزان، مرۆڤەکان و ڕۆحی مرۆڤەکان دەگرێت، مرۆڤەکان دەکاتە نێچیر و نێچیرڤان. مرۆڤایەتی دەکاتە گەمەی ڕاو و ڕاوچییەتی. دەنووسمەوە؛ ئەو مرۆڤانەی لە ناو نەفرەتدا دەژین، دونیاکەیان بە تەنیا ئەوەیە، حەز لە نەفرەت، کین، مردن، کوشتن، زۆرداری و توندوتیژی دەکەن. دەنووسمەوە؛ ئەم مرۆڤانەی ژیانیان بۆتە دونیایەکی میکانیکی، دەستوور و یاسا دەنووسمەوە. من ئەگەر کۆتایی ئەم سەفەرە مردن نەبێت، ڕۆژێک ئەم دەفتەرەم دادەنێمە پێش خۆم، بە پەنجە لاپەڕەیەکی نوێ دەکەمەوە، پێنووسێکی سوور دەخەمە سەر لاپەڕەی سپی و دەست بەنووسین دەکەم. بە وشەی «ساکار و گەرم،

کـورت و زولاڵ» بـەو وشـانەی کـە بـە ژان و خـەم تەنراونەتـەوە. ڕسـتە درووسـت دەبـن، لاپـەڕە پـڕ دەبێـت، دەفتـەر دەئاخنـرێ. دەفتەرێکـی نـوێ، یەکـی دیکـە. بـەو وشـانەی کـە لـە ئاگـر و سـووتان ڕزگار بـوون، شـاهیدی مـردن و کوشـتنن. بەڵـێ مـن دەنووسـمەوە، جارێـک بـە زمانـی دادە، جارێـک بـە زمانـی دی. ئـەم زمانـە، دڵـی غەریـب، شـپرزە و نائاشـنای ئـەم وڵاتـە، وڵاتـی دادەی بەخـتڕەش دەنووسـمەوە. تۆڵـە، مـن تۆڵـە، ئـەو تۆڵـەی کـە ژیـر باسـی دەکـرد، ئـەو تۆڵـەی کـە بۆتـە نیـری گەردنـی ئـەم وڵاتـە، ئـەو تۆڵـەی کـە وەک ژەهرێـک هەمـوو ڕەگ و دەمارەکانـی وڵات و ئینسـانەکانی ئـەم وڵاتـەی تەنیوەتـەوە، دەنووسـمەوە. مـن تـرس، ترسـی خـۆم، ترسـی ئەم وڵاتـە، ئـەو وڵاتـە، ئـەو ئینسـانە ترسـەنۆکانەی هەمـوو ڕۆژێـک بـە جۆرێـک دەجووڵێنـەوە و جمەیـان دێـت، دەنووسـمەوە. بـۆ ئـەوەی لـە بیـرم نەچێـت و هەمیشـە لـە یـادم بێـت، دەنووسـمەوە. بـۆ سـەبر، ئـەو سـەبرەی دادە، قسـەکانی دادە، سـترانەکانی دادە فێـری کـردم، بـۆ سـەبووریی دڵـی خـۆم، دەنووسـمەوە. مـن ناپەیڤـم، بێدەنـگ دەبـم، هـەر وەک ئـەم شـەوە، بـەڵام مـن دەنووسـم، وشـەکان دەڕژێنمـە سـەر کاغـەز، هـەروەک ئـەو ڕووناکییـەی لـەم شـەوەوە دەڕژێ. مـن ڕووناکـی، ڕووناکیـی ئـەم مانـگ و ئەسـتێرانە، ڕووناکیـی خۆشەویسـتی و ئەویـن، ئـەو ڕووناکییـەی لـە قووڵایـی ڕۆحـی مرۆڤەکاندایـە، دەنووسـمەوە. مـن تاریکـی، تاریکیـی شـەو و پیاوانـی شـەو، تاریکیـی کیـن و نەفـرەت، ئـەو تاریکییـەی کـە لـە قووڵایـی ڕۆحـی مرۆڤەکانـدا شـاردراوەتەوە، دەنووسـمەوە. وەک گلگامێش، وەک داسـتانی گلگامێش. وەک شـەڕی ڕووناکـی و تاریکـی کـە لـە داسـتانی گلگامێشـدا بـاس دەکرێـت.

بـاز: لاپەڕەییەکـی نـوێ، ژیانێکـی نـوێ، ڕۆژگارێکـی نـوێ. بەڵـێ مـن ئێسـتا لـەو ڕێگەیـەدام. مـن ئیـدی هەمـوو شـتێک لـە بیـر دەکـەم، نـە وڵات، دەوڵـەت، میللـەت، خەڵـک، ئـاڵا، ئەرتـەش، ژەنـەڕاڵ، ئەفسـەر، ژەنـەڕاڵ سـەردار، نـە بەهـا و شـەرەفی هەمـوو ئەوانـەش ئیـدی نایەتـەوە یـادم. ئیـدی

هەموو ئەوانە لە بیر دەکرێن. ئەم ترێنەی ئێستا من دەبات، دەزانم کە لە هەمان کاتدا من دەکاتە ئینسانێکی دی. ئینسانێکی نوێ لە ژیان، کات و ڕۆژگارێکی نوێدا. ئەمڕۆ، پێدەچێ ئەمڕۆ، ئەمشەو، ڕۆژێکی هەرە گرنگی ژیانی من بێت. ئەم ڕێگەیە. ئەم ڕێگەیە ئیدی گەڕانەوەی نییە. گەڕانەوەی ئەم ڕێگەیە تەنیا مردنە. با بزانین چۆن دەبێ. هەستەکانی من لە ئێستادا؟ ئەوانە چین؟ ئارامییەک کە من ژیانێکی خوێناوی، خوێن خۆری بەجێ دەهێڵم؟ پەردەی نەزانی و لە بیر کردن کە من دەمهەوێ و حەز دەکەم؟ شەپۆلی خەو کە دێت بە سەرمدا؟ خۆشحاڵی، بەختەوەری، بەختەوەر بوون؟ خەون، خەیاڵ؟ هەتوانی نەبینراوی دەردی هەتیوی و تەنیایی، برینی ژان و پەژارە؟ گەلۆ ئەوانەش دەکەونە ژیانی من؟... وەک ئەو کچەی کە دەفتەرەکەی، بە تەنیا دەفتەرەکەی لە ئامێز دەگرێت و حەزی لێدەکات. ئەم کچەی کە هەمیشە بە شەرمنی، بە ترس و سام تەماشای من دەکات. بڵێی کەمێک خۆشحاڵی و بەختەوەری بگەیەنێتە من؟ ئەو ژن و کچانەی کە من بە ویست و داخوازێکی بێکۆتایی و گەورەوە دیتوومن، ناسیومن، بێ ئەژمارن. من جەستە و بەدەنی ئەوان، ڕۆح و دڵی ئەوانم ناسی. بەڵام هیچ کامیان وەک ئەم کچە هەستێکی وەها قووڵیان، کە من نازانم چییە، لە دڵ و ڕۆحی مندا پێک نەهێناوە. هیچ کامیان، جەستەی منیان ئەوەندە بە جۆش نەهێناوە. بەڵام نهێنی، نهێنیی ئەم کچە چییە؟ من دەبێ لێی بپرسم، یەک بە یەک لەگەڵی قسە بکەم، لێی تێبگەم... بەڵام قسەکانی مادەر...» ئەوین، هەستێکی گەرمی ئەوین، حەشارگەیەک، هەلاتنێکە، خەیاڵێکی خۆشی دڵبرین، دڕدونگی، ڕێ لێ ونبوو و سەرلێشێواو و موسافیرانە» مادەر، نەکا قسەکانت ڕاست نەبێ؟ نەکا ئەم کچەی کە ناپەیڤێ، بەڵام دەنووسێ، کەم دەخوات و دەخواتەوە، بە نازەنینی دەجووڵێتەوە، ئەو قژە درێژەی شانە دەکات، بە ڕوخساری ئارامی کاریگەریی مەزن دەخاتە سەر مرۆڤان، بە نیگای پڕ

ترس بەڵام لە خۆبایی سەیر دەکات، جارجارە دەبێتە منداڵێک، جارجارە دەبێتە زانایەک، جارجارەش دەبێتە ئەوانێک (یەک لە ئەوان)، خەونێک، خەیاڵێک بێت؟

کۆتر؛ دادە خەوم دێت، من ماندووم. «دادە من بیری تۆم کردووە. دادە من دیسان تۆ دەبینمەوە؟»

باز؛ بەڵێ وەها بێ خەبەر، لە پڕ ون بوون. مادەر من لە ڕێگەدام. من موسافیرم، سەفەری ژیانە، خۆ تەمەنی من وەها دەستی پێ نەکرد، خۆ ژیانی من سەفەر کردن نییە؟ من لە ڕێگەی هەڵهاتنێکی بێ گەڕانەوەدام. لە سەر ڕێگەی مەترسی، ڕێگەی ڕیسک و تیاچوون. بەڵام من بۆت دەگێڕمەوە، دەتبینمەوە، کێ دەزانێ تۆ ئێستا بیر لە چی دەکەیتەوە؟ کوڕەکان چۆن بیر دەکەنەوە؟ ئەفسەری سمێڵ قیت کە من بڕیارم دابوو دیسان بیبینمەوە، بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئەرتەش، ئەفسەر، ژەنەڕاڵ، هاوڕێ و دۆستانی کاتی شەڕ و پێکدادانمان، بیر لە چی دەکەنەوە؟ من دەزانم هەندێک دەڵێن «باز خائینە، هەڵهات و ڕۆیشت، لە ئەرتەش، دەوڵەت، ئەرکداری و بەرپرسیارێتییەکانی خۆی خەیانەتی کرد و هەڵهات.» هەندێک دەڵێن «باز مردووە، هاتووەتە کوشتن، شەهیدە» هەندێک دەڵێن «حەیف». هەندێک دەڵێن «باش بوو». ڕاستە من نان و ئاوی ئەرتەشم خوارد و خواردەوە، ڕاستە دەوڵەت و ئەرتەش منیان بەخێو کرد، گەورەیان کردم، ڕاستە دەوڵەت و ئەرتەش بوونەماڵی من، خێزانی من. بەڵام تا بە ئێرە، ئیدی ئەوەندە بەسە. کێ چی دەڵێ، چۆن بیر دەکاتەوە ئیدی گرنگ نییە. بەڵام کوڕەکانم، بە تەنیا کوڕە بێ تاوانەکانم چۆن بیر دەکەنەوە؟ خائین؟ باوکێکی خائین؟ باوکێکی هەڵهاتوو، نەوێر و ترسەنۆک؟

## ١٦

# ڕووناکی

باز و کۆتر لە هەرێمی ڕووناکی، لە ناو ڕووناکیدا.

بەڵام سەرەتا زانیارییەکی پێویست. زانیارییەک کە هەرچی چۆنێک بێت ڕێگەی نووسینی ئەم ڕۆمانەی خۆش کرد. (پێدەچێ لە سایەی ئەم زانیارییانەش بە نیازی ئەوە، من، بێژەری ئەم ڕۆمانە بیرم لە نووسینی ئەم ڕۆمانە کردەوە) زانیارییەکی ئاوەها؛ کاتێکی زۆر بە سەر ڕۆشتنی من بۆ وڵاتی مەزن و پایتەختەکەی – کە من لە یەک لە بەشە پێشووەکاندا، باسم کرد- تیپەڕ ببوو. ئەو وڵاتە، ڕووداوەکانی ئەو وڵاتە، نووسەرە گیراوەکان، مرۆڤە ترساوەکانی ئەو وڵاتە و ئەو کچە جوان و دڵڕفێنەی کە من لە پایتەختی ئەو وڵاتە بینیبووم، جارجارە دەهاتنەوە یادم و مەراقی ئەوانم دەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەش من لە سەر ڕێگەیەکی دی بووم، بە قەولی وتەیەکی کۆن، سەرم لە سەر سەرینێکی دیکە بوو. من ڕۆمانێکم دەنووسی کە باسی سەد ساڵێکی خوێنخۆر، پیاوێکی دڕدونگ و تێکشکاو، ئەوینێکی هەڵپروسکاو، ڕۆژ و ڕۆژگارێکی نازوڵاڵ، شار و وڵاتیکی ئاڵۆزی دەکرد. سەختییەکانی نووسین تەنگیان پێ هەڵچنیبووم. ڕۆژێکی گەرم لە ڕۆژانی هەرە ماندوو و بێ سوودم کە بە تەنیا دەتلامەوە، سەر لەبەیانی تەلەفۆنی ژووری کارەکەم

لێیدا. خانمی سکرتێری ناوەندی یەکیەتیی نووسەران بوو. نامەیەک بە ناونیشانی یەکیەتیی نووسەران بۆ من هاتبوو. پرسیاری کرد کە ئایا ئەوان نامەکە بە ناونیشانی من بنێرن یان من دەچمە ناو شار و لە ناوەند نامەکە وەردەگرم؟ لە خۆوە ڕۆژێکی نەزۆک بوو. شتێکی گرنگ نەبوو کە من لە ژووری کارەکەم بمنووسیبا یان ئەنجامم دابا. چوومە ناو شار، ڕۆشتم بۆ یەکیەتیی نووسەران و نامەم وەرگرت. لە سەر پاکەتی بچووکی سپی، بە ڕێزمانی فەرەنسی، یەکەم پیتی ناو، و پاشناوەکەم، بە تەواوی بە پیتی گەورە نووسرابوو. لە پێشەوەش بە فەرەنسی Mr. لە ژێر ناوی مندا، بە تەنیا ناوی یەکیەتیی نووسەران نووسرابوو. هەر هەمووی بە دەستخەتێکی خوار، بەڵام جوان و بە پێنووسێکی ڕەش. من سپاسم کردن و لە ناوەند هاتمە دەر، چوومە کافتریای تەنیشت ناوەند. فنجانێکی گەورە قاوەی تاڵم وەرگرت و لە سەر مێزێکی بچووک دانیشتم و پاکەتم هەڵپچڕی. کارت پۆستاڵێکی توورِیستی تێدا بوو. لە لای پشتەوەی کارت پۆستاڵ بە پێنووسێکی سوور بە فەرەنسی هەندێک شت نووسرابوو. پیت و دێڕی یەکجار ورد لە ناو یەکدا، جگە لە چەند کەوانە، نە پاراگرافێک، نە نوختەیەک و نە ویرگوولێکیش هەبوو. وا دیار بوو کە کارت پۆستاڵ بە پەلە نووسراوە. سەرەتا هیچ لە نووسین و کارت پۆستاڵ تێنەگەیشتم. لە سەرەتاوە نە ناوی من و نە هیچ ناوێکی دی نەبوو. لە ژێریشەوە هیچ ناوێک نەبوو. بە ڕاست ئەم کارت پۆستاڵە بۆ من نێردرابوو؟ کێ ناردبووی؟ و لە کوێوە؟ وەڵامی دوا پرسیار بە سەر پاکەتەکەوە بوو. سەیری مۆری سەر پاکەتەکەم کرد. کارت پۆستاڵ دە ڕۆژێک پێش ئەم ڕۆژە نەزۆکەی من، لە وڵاتی مەزنەوە بەڕێ کرابوو. بەڵام ئەمە کێ و بۆچی ناردبووی؟

سێ دانە شەکرم خستە ناو قاوەکە، تێکم وەردا، کەمێکم لێ خواردەوە. تام و بۆنی قاوە کەمێک هێنامیەوە سەر خۆ. دوای چەند

قومی دی، دیسان گەڕامەوە سەر کارت پۆستاڵ. دێڕە لار و گێڕەکانی کارت پۆستاڵم دانە بە دانە زۆر بە ئارامی خوێندەوە. ئەمجار پەیم پێ برد. دێڕەکان بە گریمانەیەکی گەورە، دێڕی داستانی گلگامێش بوون. لە پشت کارت پۆستاڵەکە کە هێشتا بە دەستمەوە بوو، ئاوەها نووسرابوو:

"Lorsque Gilga(mes) Eut oui cette (adresse) Obtemperant Aux paroles (de l'Homme-Scorpion) Il prit Le Chemin du Soleil Quand il eut parcouru Dix kilometres Profounde etait l'obscurite Sans la moindre lumiere Il n'y pouvait rien (voir) Devant lui ni derriere Quand... Quand il eut parcouru cent dix kilometres Apparut un rayon de soleil Quand il eut parcouru cent vingt kilometres Ce fut le plein jour...(Je suis le chemin du Soleil J'ai besion de votre aid Est-que vous vouliez nous aider Je vais vous ecrire encore...)"*

بەڵێ کارت پۆستاڵێکی وەها ئاڵۆز، بەڵام من تێگەیشتم کە دێڕەکانی داستانی گلگامێشە. L'homme scorpion کە لەم داستانەدا هاتووە و واتای دووپشک- مرۆڤ دەدات. کێ لەو وڵاتە پڕ ترس و سامەوە، کارت پۆستاڵێکی وەها کە تیایدا باسی داستانی گلگامێش هەیە، بۆ من دەنێرێت؟ نووسەرێکی گیراو و بەندکراو؟ یەک لەو هاوڕێ و ناسیاوانەی لە پایتەخت بینییانم؟ یەک لە دۆست و ئاشناکانم لەو وڵاتە؟ نا هیچ کام لەوان نەبوون. ئەو بوو، بێگومان ئەو کچەی کە دوا شەو لە پایتەخت تووشی من هات، ئەم کارت پۆستاڵەی نووسیوە. تەنیا ئەو باسی گلگامێش و ڕووناکی و تاریکی کردبوو کە لە داستانی گلگامێشدا هەیە. بەڵێ ئەو بوو، کچی قژ درێژ، چاو جوان، باڵا جوان، بەژن ڕێک و پێک و خەمگین. بەڵام بۆچی لە ئێستادا کارت پۆستاڵێکی وەها

* بڕوانە لاپەڕەی ١٥-١٦، داستانی گلگامێش.

سەیری بێ ناونیشانی ناردبوو؟

دوای خواردنەوەی قاوە، هەستام لە قاوەخانە هاتمە دەر و ڕووم کردە کتێبخانەی گەورەی پاشایەتی تاوەکوو ئەو دێڕانە بدۆزمەوە. لە کتێبخانەی یەکجار گەورە و دەوڵەمەند، چوار جۆر دەقی داستانی گلگامێشم بە زمانی فەرەنسی دیتەوە. ئەوانەم لە خانمی ڕێسێپشێن کە لە دۆزینەوەی دەقەکاندا یارمەتی دام، وەرگرت و چوومە سالۆنی بێدەنگی خوێندنەوە. کچە چاو جوانەکەی ئەو وڵاتە لە کارت پۆستاڵدا باسی l'homme scorpion کردبوو. من دەبوو سەیری ئەو بەشەی داستان بکەم. یەک بە یەک و دانە بە دانە سەیری هەموو دەقەکانم کرد. لە دواییدا دێڕەکانم دیتەوە. هەروەک ئەوەی کە کچەکە نووسیبووی لە دەقی نەینەوای داستانەکەدا بوو. دەقی نەینەوا کە لە سەر ناوی "L'epopee de Gilgames" چاپ کرابوو، لە زمانی ئاکەدی هاتبووە وەرگێڕان. ئەو دێڕانەی کە کچە کەمێک شپرز نووسیبووی لە تەبلێتی نۆهەمی داستاندا بوون کە باسی ڕووناکی و تاریکی دەکرد. وا دیار بوو کە کچە ئەو دێڕانەی لە بەر بوو، یانیش لە کاتی نووسیندا کتێبەکە لە بە ر دەستیدا بووبێت.

من تێگەیشتم کە کچە دەیهەوێ بەم دێڕانە، باسە سەرنجڕاکێشەکەی پایتەخت بێنێتەوە یادم و لەم ڕێگەشەوە خۆیم بیر بخاتەوە. بەڵام بۆچی؟ وەڵام لە کەوانەی کۆتایی دێڕەکاندا بوو. چونکە کەوانەی کۆتایی لە دێڕەکانی داستان نەبوو. هەڵبەت ڕستەکانی ناو کەوانە لە دێڕەکانی داستان نەدەچوو. بەڵی ڕستەکانی کۆتایی هی کچەکە بوون (Je suis sur le chemin du Soleil J'ai besion de votre aid Est-que vous vouliez nous aider Je vais vous ecrire encore...) واتا، من لە سەر ڕێگەی ڕووناکیم. پێویستم بە هاوکاریی ئێوە هەیە. ئایا ئێوە حەز دەکەن یارمەتیی من بدەن؟ من جارێکی دی بۆ ئێوەی

دەنووسم...

دیار بوو کە پێویستی بە یارمەتیی من هەیە، هەر بۆیەش ئەم کارت پۆستاڵەی بەم شێوەیە نووسیبوو. دۆخی ئەو هیچ باش نەبوو. هەروەها ئەو تەنیا خۆی نەبوو، چونکە نووسیبوی (nous) واتا ئێمە. ئەمجار دوای ئەوەی نهێنیی کارت پۆستالم دۆزییەوە، لەم ساڵۆنە گەورەدا، لە سەر مێز و دەقەکانی گلگامێش ژانێکی باریک بە سەرمدا هات. خەم دایگرتم. بۆ حاڵی ئەو خەم دایگرتم. بەڵام لەم کارت پۆستاڵەدا نە ناونیشانێک، نە ژمارە تەلەفۆنێک هەبوو تاوەکوو بتوانم لەگەڵی پەیوەندیی بگرم. شتێک نەبوو من بتوانم بیکەم. من دەبوو بێچارە، بە هیوای هەواڵی ئەو ببوایەتم.

هەر بەو ژانە باریکەوە دەستم کرد بە سەیر کردنی دیمەنی ناو کارت پۆستاڵ. دەریایەکی کەمێک شین بە گشتی تەواوی ناو کارت پۆستاڵەکەی گرتبۆوە. لە سووچێکی دەریادا شەپۆلێکی گەورە کونێکی لە دەریادا کردۆتەوەو ئەشکەوتێکی لە گەمی و پاپۆڕ ساز کردووە. شەپۆلانی زەردی دەریا تا چاو هەتەر دەکات درێژ بوونەتەوە و دەڕۆن. دوورگەیەکی شینی بچووک، کەمێک دوور لە شەپۆلەکان دیارە. چەند پاپۆڕی بارهەڵگر و بەلەمی بچووکی جوان لە نێوان دوورگە و شەپۆلەکاندا لە باریکە ئاوێکدا دەگەڕێن. کارت پۆستاڵ ڕووناک بوو، بە ئاسمانەوە نە ڕەشاییەک، نە پەڵە هەورێک نەبوو. بەڵێ زانیارییە پێویستەکە ئەمە بوو.

ئێستاش ئێمە زانیاری، کارت پۆستاڵ، دێڕەکانی ناوی و دیمەنی جوانی ڕووبەری کارت پۆستاڵ لە لایەک دادەنێین و دگەڕێینەوە سەر بەسەرهاتی باز و کۆتر. با بگەڕێینەوە هەرێمی ناو کارت پۆستاڵ، بۆ لای باز و کۆتر.

باز و کۆتر، لە وڵاتی مەزن، لە لای دەریاکان، لە کەناری دەریایەکی کەمێک شین، لە هاوینەهەوارێکی گەورەی کەمێک لە کەنار بە دوور.

با بڵێین سێ حەفتە پاش سەفەر کردن بە ترێنەکە. کات ئێوارەیە. باز و کۆتر لە شانشینی گەورەی هاوینەهەوار دانیشتوون. هاوینەهەوار کە بە ڕەنگێکی سپی سواخ دراوە، دوو قاتە. شانشین لە سەرەوە، لە قاتی دووهەمی خانوودا وەک دەنووکی بازێک بەرەو خوار بەرەو دەریا چەماوەتەوە. هاوینەهەوار لە سەر گردێک لە گردەکانی کەناری دەریایە. بە دەوریەوە هیچ بینایەکی دی نییە. لە لای ڕاستەوە، کەمێک دوورتر لە هاوینەهەوار باخچەیەک و لە تەنیشت باخچەکەشداناوچەیەکی هاوینەهەواران هەیە. لە خوارەوە لە لای چەپی هاوینە هەوار، کۆمەڵێکی بچووک، نیوە گوندێک، شارۆچکەیەک کە خەڵکەکەی بە کار و باری ماسی و ماسیگرییەوە سەرقاڵن، ئێستا لە ژێر ڕووناکیی گڵۆپەکاندا، شەوق دەداتەوە. لە پێشەوەی هاوینەهەوار، لە سەر دەریا، کە ئێستا بە ئارامی جمەی دێت و شەوق دەداتەوە، گەمی و بەلەمی جۆربە جۆر دەدرەوشێنەوە. کەنداو و کەنار بە گشتی پڕە لە گەمی.

بەڵێ ئێمە لە وڵاتی مەزن لە هەرێمێکین کە لە هەرێمی وڵاتی چیا و وڵاتی بیابان یەکجار جودایە. وڵاتی مەزن؛ لەلایەک وڵاتی چیا، لە لایەک وڵاتی بیابان، لە دوو لای دیش دەریا و لە لایەکیش دەشت و بەرێکی بێپایان. وڵاتی مەزن؛ وڵاتێکی گەورە، فرە ڕەهەند، زۆر ڕەنگین. ئێمە ئێستا لە کەناری دەریا لەو هاوینەهەوارەین کە باز و کۆتری لێیە.

ئێوارەی گەرم تازە دەست پێدەکات، ئێوارە ئێستا باڵ دەکێشێ بە سەر دەر و دەشتدا. خۆری گەرمی ڕووناک داچووە و ئەستێرە بێ ئەژمارەکانی ئەم وڵاتە هێشتا هەڵنەهاتوون. ئەو مانگەی کە دونیا دەخاتە ناو جموجۆڵی ڕووناکی هێشتا دیار نییە. بەڵام ئێوارە هاتووە. ڕۆژێکی دی لە ڕۆژانی گەرمی باز و کۆتر کە هەرچی چۆنێک بێت، بە گشتی یەک ئاهەنگیان هەیە، دەگاتە شەو و ڕۆژێکی نوێ. پاش ڕۆژێکی

پڕ چالاکی و خەبات، دونیا ماندووە، کۆمەڵەی کۆنی خوارەوە ماندووە، گەمی و گەمیوان ماندوون. باز و کۆتر، کە هەر ماندوون. دونیای ماندوو و هەناسەلێبڕاو، ئێستا بێدەنگە. نە دەنگی مەکینەی گەمی و پاپۆڕە گەورەکان، نە دەنگی ئۆتۆمبیل و سەیارە کە بێ وچان بە ڕێگەی گەورەی تەنیشت گونددا دێن و دەڕۆن. نە دەنگی خەڵک و قەرەباڵغیی زۆر کە بۆ هاوین هاتوون بۆ ئەم شوێنانە، ئێستا نایەت. بە تەنیا لە دوورەوە، لە لای شارۆچکەوە دەنگی چەند منداڵێک، لە لای سایتیش دەنگی مێلۆدیی پیانۆیەک کە جارێک بەرز و جارێک نزم و ناسک دەبێتەوە، لە لای دەریاشەوە دەنگی ئارامی مەکینەی گەمیی ماسیگران و دەنگی خرمەخرمی جموجۆڵی بەلەم و گەمی دێت. لە دەور و بەریش دەنگی مێش، مێشوولە، بۆق و ئاژەڵی شەو دێت. دەنگی مێش و مێشوولە، باڵندە و پەلەوەر، وەک گۆرانیی شەو، پەردە بە پەردە خۆی دەگەیەنێتە دەور و بەر. دەنگ، دەنگی تێکەڵی ئارامین، دەنگی هار و هاجی ژیانی ڕۆژانە هاتۆتە بڕین.

باز و کۆتر لە بەرانبەر یەک لە پشت مێزێکی درێژ دانیشتوون و بێدەنگ سەیری دەریا، ئەو ڕووناکی و شەوقەی کە لە سەر ئاو و دەور و پشتی گوند دەبریقێتەوە، دەکەن. هەر دوو بێدەنگن. ئەو شێوەی کۆتر سازی کردبوو لە شانشیندا خوراوە، سینی و کاسە کۆ کراونەتەوە. لە سەر مێزەکە چەند جۆر میوە لە ناو سینییەکی گەورە، دوو پەرداخ، دوو شووشە، یەک ڤۆدکا و ئەویدی جین، دوو سۆراحی، یەکیان ئاو و ئەوەی دیکە ئاو پرتەقاڵ، دوو پاکەت جگەرە، تەپڵەکێکی ژێرجگەرەی نیوە پڕ و هەندێک کتێب دانراوە. شووشە لە سەر مێزەکەیە بەڵام باز ناتوانێ بخواتەوە، باز نەخۆشە، سەری دێشێ، نەخۆشی میگرێن وەک سێبەر بە شوێنیەوەیە، توانای لێبڕیوە، خرقەیەکی ناسک بە سەر شانیەوە، دەستێکی لە سەر شووشەی دیواری بەرهەیوان، بە ڕوانینیکی

لێل کە پێدەچی دەرەنجامی نەخۆشینەکەی بێت، بۆدەنگی سەیری گەمیی ماسیگران کە لە دوورایی و قووڵایی دەریاوە دێن و دەچنە ناو کەنداو، دەست پێدەکات. بەڵێ، کات کاتی بۆدەنگییە. باز هەموو شتە پێویستەکانی بە کۆتر وتووە؛ هەلات هەلاتی شەو و پێکدادان. ئەو، ماڵ و منداڵ، خێزان و ئەرتەش، شەڕ و پێکدادان، ئەفسەری و فەرمانداری بەجێهێشتووە و کەوتۆتە ڕێگەیەکی بێ گەڕانەوە. ئەوان پێکەوە وڵات بەجێدەهێڵن، بە زووترین کات لە یەکەم دەرفەتدا، چونکە ئەویش ئیدی دوژمنە، خائینە. دوژمن و خائین بە هەموو کەسێک، هەموو کەس دوژمنی ئەوە، هەروەک کۆتر. نە ئەو و نە کۆتریش ئیدی ناتوانن لەم وڵاتە بحەوێنەوە، ئەوان هەڵدێن. هەر کەس بە شوێن ئەمانەوەیە، ئەرتەش، ڕێکخراوەیەکی بێ ئەژماری ئەرتەش و دەوڵەت، سیخوڕ، پۆلیس، ڕاوێژکاری مەدەنی، شار بە شار، شوێن بە شوێن، ماڵ بە ماڵ، بە شوێن ئەو، بە شوین ئەواندا دەگەڕێن. هەموو ڕێگەکان بڕاون، هەموو پردەکان سووتان، تەنیا ڕێگەیەک ماوە، ڕۆشتن، بەجێهێشتن. بەلام تاوەکوو ڕێگەیەک، دەرفەتێک بدۆزنەوە، لێرە لەم هاوینەهەوارە کە هی هاوڕێیەکی بازە و باز کاتی خۆی پیاوەتی زۆری لەگەڵ کردووە، بە دزییەوە، بە شاراوەیی دەمێننەوە تاوەکوو پاسپۆرتی ساختەیان بۆ دروست بکرێ، بلیتەکانیان ئامادە ببن و ئەم وڵاتە بەجێ بهێڵن بەرەو وڵاتی غەریب و نەناسراو. کۆتر ئیدی ئاگای لە هەموو شتێک هەیە، ئیدی ئەو و کۆتر وەک یەکن، ئیدی نە نێچیر و نە نێچیرڤانێک ماوە.

باز باسی هەموو شت و هەموو کەسی بۆ کۆتر کردووە؛ ئەفسەری سمێڵ قیت کە باوکایەتی دەرحەق کرد، مادەری ڕان گەورە و سمت پان، کە بۆ ئەم هەم دایک و هەم یاریش بوو، ژنە چاوبرسی و لووت بەرزەکەی کە دونیای لێ تاڵ کردبوو، منداڵە مل کزەکانی کە خۆشەویستییەکی گەرمیان لە باوکیان نەدیوە، ژن، کچ و سۆزانیی شۆخ

کە باز لێرە و لەوێ جارجارە هەموو بەدەنی تەڕ و ڕووتیانی دەست لێداوە، ئەفسەر، تێکۆشەر و عەگیدی نەترس کە هەمیشە لەگەڵ باز بوون و لە سەر فەرمانی باز بەرەو مەرگ دەڕۆشتن. شەرڤانی کۆن کە دەستیان لە سەرهەڵدان هەڵگرتووە، دانیان بە تاوانی خۆیاندا ناوە، باز پشتگیریی لێکردوون، خاوەندارێتیی لێیان کردووە، باوکیەتی بۆیان کردووە، چەند ئەفسەری هاوڕێی کە ئێستا بە دراو پارە یارمەتیی ئەم دەدەن، پوول و پارەی کەمی خۆی کە ئەم لە دەمی خۆی گرتۆتەوە و کۆی کردۆتەوە، و هەموو تەمەنی خۆی کە تەنیا بە یاسای سەربازی بە ژیانێکی پڕ دیسیپلنی سەربازی تەنراوەتەوە. بەڵێ باز دانە بە دانە باسی هەموو شتێکی کردووە- بێجگە لە دوو شت؛ جموجۆڵ و پەیوەندییە نهێنییەکانی خۆی بۆ مردن و کوشتن، و [سەردەمی] منداڵی و لاویی با بڵێین سەرنجڕاکێشی.

ئەوان ئێستا لێرەن، بە شەو و ڕۆژ، هەمیشە لە ناوەوە، لە ژووری جودا، جارجارە لە قاتی خوارەوە، سالۆنی هاوینەهەوار، زۆر جاریش لە سەرەوە، لە چێشتخانە، ژووری نووستن و لە شانشینی گەورە و پان، لە بەر دەریا و ئاسمانی بێکۆتایی، لە گەرما و هەوای قورسی هاویندا. تەنیا جارجارە، کاتێک زۆر پێویست بێت، کۆتر دەچێتە دەرەوە، دەڕوا لە گوند پێویستیی ژیانی ڕۆژانەیان دەکڕێ و دێتەوە سەرێ، شوێنی هەڵاتووەکان. بەلام خراپترین شت کە ئێستا ڕوویداوە؛ باز نەخۆشە. باز کە ئێستا لە بەر نەخۆشین لە ڕووناکی، شەوق، گڵۆپ و چراکان هەڵدێت، باش نابینێت و دەیشارێتەوە. ناتوانێ بخواتەوە بەلام خواردەنەوە و جگەرەکێشان؛ بۆ باز ڕێگەیەکی دیکەی هەڵاتن لە بیر و هۆش، بیرەوەرییەکان، لە هزر و گومانەکان، دوور دەکەوێتەوە. لە بیستنی دەنگی ڕۆژ و ڕۆژگاری ڕابردووی تەمەنێکی کاول، لە دڕدونگی و گومانی ژیانێک کە لە ناکاو کەوتۆتە سەر ڕێگەیەکی نوێ، هەڵهاتن لە

گومان، هەوڵ، ترس و سام، لە ئێش و ژان، پەژارە و خەمی بەسەرهاتی خوێنخۆر. بەڵێ، خواردەنەوەی ڤۆدکا، جین و تۆنیک، پیاڵە بە پیاڵە، شووشە بە شووشە، کاتژمێر بە کاتژمێر، ڕۆژ بە ڕۆژ تاوەکوو خوێن، شەڕ و پێکدادان، چەک و دیکەی ڕاستییەکان کە ژیانێکی ئاڵۆزیان داڵدە داوە، لە پشت تەم و مژی خواردەنەوەدا بشارێتەوە.

بەڵام ئێستا لە پێویستترین کاتدا، ناتوانێ بخواتەوە، ئێستا کاتی بێدەنگی، هزر و خەیاڵەکانە. بۆچی وای لێهات؟ باز بێدەنگ بیر دەکاتەوە. لە کوێوە تا بە کوێ! لە نێوان یەک دوو ساڵدا، لە پڕ لە سەر ڕێگەیەکی دی کە لە هەموو تەمەنی چل و چەند ساڵەی جودایە. ئێستا جموجۆڵ نییە، بیرکردنەوە، هزراندن هەیە، ترس و گومان هەیە، خۆشاردنەوە، خۆ چاوەدێری هەیە، ڕەو هەیە. هەموو ئەو شتانەی کە پێشتر باز قەت نەیدەناسین. شتێک کە بۆ کەسانی دی هەبوو، ئێستا کەوتۆتە ژیانی ئەم. بۆتە هاوبەشی ژیانی ئەم. ژیانی ئەم کە هەمیشە لە ڕێگەی مردن، دابڕان، شەڕ و پێکدادان بوو، ئێستا کەوتۆتە سەر ڕێگای ترس. باز دەترسێ! بازێک کە شەوی کردبووە شێوەی ژیانی خۆی، شەڕی دەکرد، فەرماندەیی شەڕ، پێکدادان، سووتان، تێکدان، مردن و کوشتنی دەکرد، ئێستا دەترسێ. بازێک کە ترسێکی بێکۆتایی دەخستە دەر و دەشت، هەر بە تەنیا ناوەکەی و قسەکانی ترسی دەخستە دڵ و ڕۆحی مرۆڤەکان، ئێستا لە ڕێگەی ڕەودا، نەخۆش، داڕووخاو و تەنیا، دەترسێ!

باز هەڵدەگەڕێتەوە بە لای مێزەکەدا، جگەرەیەک لە پاکەت دەردێنێ، دەیگیرێنێ و مژێکی لێدەدات.

«جگەرەش باش نییە» لەو کاتەدا کۆترە کە ئەمە دەڵێت: «جگەرە ئازارت دەدات»

وەک بڵێی لەم کاتەدا باز هەست بە بوونی کۆتر دەکات، دێتەوە

سەر خۆ و بە وردی لێی دەڕوانێ و دەڵێ «ئەگەر من جگەرە نەکێشم، دەتەقم، تۆ نازانی من چ هەستێکم هەیە، ناچارم جگەرە بکێشم.»

کۆتر هیچ ناڵێت، نیگای لە سەر ئەو لادەبات، قەدەحەکەی دەبا بۆ لای دەمی و لە دوور لە دەریا دەڕوانێ. بازیش لەو، لە پرۆفایلی ئەو کە ئێستا لە تەنیشتەوە دیارە و دیسان بووەتە پرۆفایلی منداڵێک، دەڕوانێ. کاتێک کۆتر ڕوو وەردەسووڕێنێ، قژی بڵاو دەبێتەوە، وەک ئەسپێکی توندڕەو، وەک شەپۆلێکی دەریای بەرانبەر. باز بیر دەکاتەوە، سەیرە ئەم کچەی کە هەمیشە دەترسا، بەردەوام بە ڕوخسارییەوە ڕێچکەی ترسێک دیار بوو، ئێستا ئارامە، یانیش ئارام و هێمن دیارە. قژی کە ئێستا تەواو درێژ بۆتەوە، بریقەی دێت. ڕوخساری کە تێکەڵی گومان ببوو، ئێستا ئارامە، ئەو لێوانەی کە بە ترسەوە دەبزووتن، ئێستا پێدەکەنن. پێکەنین، سەیرە، پێکەنینیش ڕۆژێک خۆی لە سەر ئەم ڕوخسارە جوان بەڵام پڕ پەژارەدا نیشان دا! ئەم کچەی کە هەرچی چۆنێک بێت هیچ قسەی نەدەکرد، ئێستا ڕۆژ بە ڕۆژ دەکرێتەوە و دەپشکوێ؛ هەرچەندە ناچێتە دەرەو و کەس نابینێ، قژی شانە دەکات، خۆی دەشوات، کل لە چاوانی دەکات، کراسی جوان لە بەر دەکات، بۆنی خۆشی لێدێت و زیاتر بە سەربەستی، ئازا و شۆخ خۆی دەلەنگێنێ، بە جۆش و خرۆش، وەک ئەوەی شیاوییەتی هەبێ؛ پێنووسەکەی هەڵدەگرێ و دەنووسێ. بەژن و باڵای ئێستا زۆر پێکەوتە و ڕێک و پێکتر دیارە، ڕوخسار و نیگای شیرینتر، مەمک و ڕانی جوانتر دیارن. ملوانکەی زیوینی کە لە ملیەوە بەرەو ناو مەمکی بەر بۆتەوە، ئەوی کردۆتە ژنێکی خەونی ئەبەدی و تاهەتایی.

و سەیرە، ئەو ئێستا باشتر سەرنجی باز دەدات و بیر لە نەخۆشینەکەی ئەم دەکاتەوە.

باز لە ناکاو بێ ئەوەی ڕوو لە کۆتر بکات، دەڵێ: «تۆ نازانی کە

من لە منداڵی و لاویی خۆمدا چیم کێشاوە.»

کۆتر لێی دەپرسێ «کەمێک ئاوت دەوێ؟» و بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێت پەرداخەکەی بۆ پڕ دەکات و دەیداتێ. کۆتر حەز دەکات باز قسە بکات.

«نە دایکێک، نە باوکێکم هەبوو...» باز پەرداخ وەردەگرێت، چەند قومی لێدەخواتەوە و دایدەنێتە سەر مێزەکە، مژێکی قووڵ دەدات لە جگەرە و بە ئارامی وەک ئەوەی بیر بکاتەوە، دەڵێ: «نە برا و نە خوشکێک، نە مامە و خاڵۆیەک، نە میمک و پوورێکم هەبوو. نە ماڵێک و شوێنێک، هیچ شتێک، هیچ کەسێکم نەبوو...»

«بۆچی؟ «کۆتر بە سەرنجەوە لێی دەڕوانێ و دەپرسێ «بۆچی، چی بووە، چییان لێهاتووە؟»

«من نازانم، لێم مەپرسە، هۆشی تەرەسم، زاکیرە و بیرەوەریی سپڵەم، من ناگەیەننەوە بە وەڵامی ئەو پرسیارەی کە هەمیشە لە خۆم پرسیوە. دایک و باوکم، ڕەگ و ڕیشەم لە پشت پەردەی تاریکی نەزانی، نەناسیاویدا دەمێنێتەوە. بەڵام من تەنیا بووم، نە کەسێکم هەبوو، نە ئەسڵ و بنەچەیەک، نە مێژوو و شوناسێک. کاتێک منداڵ بووم، نەمدەزانی کە مێژوو، شوناس و شتی لەم چەشنە چییە، بەڵام من دایکێک، باوکێک و گەرمیی ئەوانم دەویست، پڕ بە دڵ ئەوەم بە ئاوات دەخواست. دایکێکی قژ درێژ و دڵگەرم، باوکێکی سمێڵ درێژ و ڕووگەش هەمیشە دەهاتنە خەونی شەوانی هەتیویم. دایکێک کە من بمتوانیبا سەرم بخەمە سەر سینگ و بۆنی مەمک و جەستەی ئەو، منی سەرمەست کردبا و لە ناو گەرمای باوەشیدا خەوم لێ کەوتبا. باوکێک کە دەستی بگرتبام و ڕێ، شوێن، کەس و کۆمەڵی نیشان دابام بە تێڕوانینی خۆی کاریگەریی خستبایەتە سەرم و ڕێز و ڕێزدارییەکی گەورەی درووست بکردبا. بەڵام ئەوان نەبوون. دایکم، باوکم، هەموو

شتێکم ماڵی منداڵانی هەتیو بوو. سەرەتا ئەوێ، دواتریش ئەرتەش. ئەرتەش و ڕاهێنانی ئەرتەش بوو بە باوک و دایکم، بوو بە هەموو شتێکم. لە ساڵانی دەبستان، خوێندنگە و ئاکادیمیای سەربازیدا، هەر کەسێک، کۆتایی حەفتە دەڕۆشتەوە بۆ ماڵی خۆی، بۆ لای دایک و باوکی، بۆ لای خۆشەویست و ئەویندارى خۆی. بەڵام من نا. خوێندنگە، ئاکادیمیا چۆڵ دەبوون، بەڵام من دەمامەوە. هەر کەسێک نامەی بۆ دڵ و دڵسۆزی خۆی دەنووسی، بەڵام من نا. هەڤاڵ و دۆست و خزم و ناسیاوی هەر کەسێک دەهاتن بۆ سەردانی هەڤاڵانی من لە خوێندنگە و ئاکادیمیا، بەڵام بۆ سەردانی من نا.»

باز بە خەمەوە جگەرە دەکێشێ، کەمێک کورسییەکەی ڕاست دەکاتەوە، سەرنج دەداتە سەر گەمی و گڵۆپی گەمییەکانی ناو دەریا کە بە شەوقدانەوە دەلەرێتەوە. کەمێک بێدەنگ دەبێت و دیسان لە پڕ ئارام، درێژە بە قسەکانی دەدات: «من تەنیا بووم، پێریش، دوێنێش، ئەمڕۆش، ڕۆحم، مێشکم، دڵم بە تەنیا بوو. لە ناو ژوور و پارک و باخچەی شینی منداڵی، شەوانی زیزی لاوی، ڕۆژانی فێر بوون و پەروەردەی دەبستان، شەوانی پڕ ئاخ و ناڵەی جەستەی تازە بە هەست هاتووی کاتی خوێندنگە، لە دەرسی شەڕ و پێکدادان و هێرشی دوژمن و پاراستنی وڵات لە ئاکادیمیای سەربازی، تەنانەت لە ئامێزی ژن و کچی جیلوەبازی ساڵانی ئەفسەریمدا، من تەنیا بووم. لە سەرەتای ئەفسەری و کاتی هاوسەرگیریشمدا من تەنیا بووم. ژنەکەم هیچ ڕۆژێک تەنانەت لەو کاتانەشدا کە بە ئاگری شەهوەت لە سەر خۆ دەچوو، بۆ نەبووە ژن، نەبووە هاوڕێ و دۆست. هیچ کەسێکم نییە جگە لە هەر دوو کوڕە دڵپاکەکەم، هیچ کەسم لەم دونیایەدا نییە.»

باز ڕادەوەستێ، جگەرە دەکێشێ و بیر دەکاتەوە: ئەو هەموو زیزی، کوڵی گریان، زەحمەتی دۆزینەوەی وشەی پەژارە، دژواریی ئاخاوتن

و قسەکردن، پەیڤین و گێڕانەوە. سەیرە، ئەمە بە سەر بازدا دێت کە هەمیشە دەیزانی کە چی، چۆن و بە چ وشەیەک بڵێ. ئایا لە نەخۆشییەکە ئەو وەها سست بووە، بە سەختی قسە دەکات و خۆی دێنێتە زمان؟ باز قەدەحەکە هەڵدەگرێ، ئاوەکەی دەخواتەوە، جگەرەیەکی نوێ دەگیرێنێ، کورسییەکەی کەمێک بەرەو بەرهەیوان دەبا، هەر دوو دەستی دەخاتە سەر دیواری بەرهەیوان و دەڵێ «لە ئاکادیمیاش بەر لەوەی ببمە ئەفسەر، ئەو کات، کاتێک باران دونیای دەشۆردەوە، یانیش بەفر بە پەردەی سپی دونیای دادەپۆشی، ئەمجار من لە پشت پەنجەرەی ژووری وانە، یانیش لە پەنجەرەی سالۆنی نووستنەوە سەیری دەرەوە، سەیری باران و یاخود بەفرم دەکرد و دەمگوت؛ «دوای ئەمە بەهارە» بەهار لە ڕێدایە، دەمگوت؛ «خۆر، هەتاو، تیرێژ، چرۆ، گوڵ، بۆن، خۆشی، گەشی، جۆش و خرۆش، ژیانەوە لە ڕێدایە. ئەو بەهارەی کە من بە هیوای بووم، خەون، خەیاڵی بەهار کە بە گەرمای هیوایەک دەروونی منی پڕ دەکرد، ویست و مرازی ژیانی من بوو. پاش ئاکادیمیا و خوێندن و دەرس من دەبوومە ئەفسەر و بەهار دەهات. بەڵام بەهار نەهات من بووم بە ئەفسەر، بەهار نەهات. من دەستم بە کار و ئەرکی گرنگ کرد و بەهار نەهات. من لەو وڵاتی مەرگەی تۆ بوومە فەرماندار و سەرۆک، بەهار نەهات. من بۆ خزمەتی دەوڵەت و ئەرتەش هەموو شتێکم کرد، هەر شتێک کە مرۆڤێک دەتوانێ ئەنجامی بدات، کردم و بەهار نەهات. نە باران ڕاوەستا، نە بەفریش تەواو بوو. بەفر و باران لە دەرگا و پەنجەرەی ماڵ و شوێنی منەوە، لە ڕێ و ڕێچکەی ئەو وڵاتەدا، لە درز و کەلەبەری دیواری کەپر و حەشارگەکانمەوە هەموو جارێ خۆیان گەیاندە من. هەمیشە، بەتایبەت ئەم چەند ساڵەی دوایی کە بە خێرایی برووسکێک [تێپەڕی]. لە باتیی بەهار، بارانی بەلێزمەتر، بەفری قورستر کرد. حەسار لە من تەنگتر بوو. هاوڕێ، دۆست، پێوەندی، ژیانێکی

ئاسایی ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر بوو، من کەوتمە ناو ئاڵۆزییەکی وەها کە نە خۆم دەمتوانی باسی بکەم، نە کەسیش ئاگای لێ بوو، نە کەسیش بە خەمی دەکرد. ڕۆژەکانم بێ مانا بوون، ڕۆژەکان ناوی خۆیان لە دەستدا، ڕۆژەکانم بوون بە شەوێکی بێکۆتایی. من ماندوو بووم، زۆر ماندوو بووم، بە تەواوی تەنیا کەوتم، وەک ناوەکەی خۆم بوومە باڵندە، بازێکی تەنیا...»

باز ڕادەوەستێ، چەند مژی دی لە جگەرە دەکێشێ، قونچکی جگەرە لە تەپڵەکی ژێر جگەرەدا دەکوژێنێتەوە، هەڵدەستێتە سەر پێ بۆ ئەوەی تماشای کۆتر بکات، دێتە بەر دیواری هەیوان ڕادەوەستێ و دەڵێ «من ئێستا تێدەگەم و هەست بە زۆر شت دەکەم، بەڵام ئیدی هیچ شتێکی باش نییە کە من بتوانم لەو وڵاتە بیکەم.»

پاشان ئەوەندەی چەند خولەک بێدەنگ سەیری دەریا، گوند، گەمی و دەر و دەشت دەکات. شەوق لە چاوی دەدات، ئەو دەستی ڕاستی دەبا بۆ لای چەپی تەوێڵی، کەمێک دەیگووشێ و دەگەڕێتەوە و دەڵێ «سەرم زۆر دێشێ، دەچم ڕادەکشم» و بە هەنگاوی قورس لە شانشین دێتە دەر. بەڵام بەر لەوەی بچێتە ژوورەوە و بەرەو ژووری نووستنەکەی بچێت، سەر هەڵدەگەڕێنێتەوە، زۆر بە نەرمی لە کۆتر دەڕوانێ و دەڵێ «بەیانی بە ناچار دەبێ بچم بۆ گوند، من پێویستم بە دەرمانێکی قورستر هەیە و پێدەچێ پاسپۆرتەکانمان ئامادە بووبێت، ئەگەر تۆیش شتێکت دەوێ لە ئێستاوە بیری لێ بکەوە.»

باز دەڕوا، کۆتر دەمێنێتەوە، ئێوارەی هاوین هێدی هێدی دەڕوا. ئێستا ئەستێرە دانە دانە، جار جارە پێکەوە، جارجارەش بە شوێن یەکدا بە شەوقێکی سوور هەڵدێن. نوێ، تازە، جوان، زیندوو. وەک هەموو جارێک. هەموو شەو هەمان شت؛ لە دایک بوون، ژین و مردن. شەوێکی دی دیسان. دیسان، دیسان ڕێک وەک ژیانی مرۆڤەکان. ئەستێرە؛ شاهیدی

ژیانی مرۆڤ، هی هەموو مرۆڤان، هەموو مرۆڤایەتی. ئەوەندە دوور، ئەوەندە نزیک. ئەوەندە شیرین، ئەوەندە پڕ نهێنی. ئەستێرە، ئەو شەوق و ڕووناکییەی ئەوان دەیڕژێننە سەر دونیا و مرۆڤ، حوزوور و ئارامییەک کە ئەوان دەیکەنە دیاریی دونیا و مرۆڤەکان. شەوقی ئەستێران؛ هیوا.

هیوا؟ کۆتر نیگای لە ئاسمان، بیر لە هیوا دەکاتەوە. ئەو ئەمڕۆ سەر لە بەیانی لە سەر هیوا هەندێک ڕستەی پەرش و بڵاوی لە دەفتەرەکەیدا نووسیبوو. مەبەستی ئەستێرە و شەوقەکەیان نەبوو، مەبەستی شتێکی دی بوو. کۆتر هەڵدەستێتە سەر پێ، دەچێتە ناوەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، دەفتەر و پێنووسی سەر مێزی بچووکی تەنیشت تەختی نووستن هەڵدەگرێت، دەگەڕێتەوە بۆ شانشین. بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە دونیا ڕووناکە و ئەستێرە بە درەوشانەوە هەڵدێن، شانشین کەمێک تاریکە. کۆتر دەست بە پلاکی گڵۆپی شانشین کە لە پاڵ دەرگایە، دەنێت، شانشین ڕووناک دەبێتەوە. کۆتر لاپەڕەکانی دەفتەر دەکاتەوە. ئەو دەفتەرە کە بووەتە سەبری بەر دڵی، پڕ دەبێت. کۆتر پێویستی بە دەفتەرێکی نوێ، هاوڕێیەکی نوێ هەیە. ئەگەر باز بەیانی بچێتە شار، دەتوانێ دەفتەرێکی خەتداری گەورە و دوو پێنووسی سووری بۆ بکڕێ. کۆتر یەک لە لاپەڕە کۆتاییەکانی دەفتەر کە سەر لە بەیانی چەند ڕستەیەکی تێدا نووسیبوو، دەکاتەوە و لەو ڕستانە دەڕوانێ؛ ئێش، ژان، کەسەر، بێزاری و هیوا. ئەدەبیات؛ کات، زەمان، ڕۆژ و ڕۆژگاری ئینسانی. ئەدەبیات؛ لە بەرانبەر لە بیرکردندا، بە بیرهێنانەوە، ئەدەبیات؛ تاریکی و ڕووناکی. ئەدەبیات؛ گلگامێش. ئەدەبیات؛ گیای نەمر، واتا هیوا.

هیوا؟ گەلۆ هیوا ماوە؟ شەو، خەو، خەوتن. ئەو دەنگانەی ئێستا لەو شەوەدا دێنە بیستن، دەنگێک کە شەو دەگرنەوە. دەنگێک کە خەونی ئینسانەکان بە ژان و پەژارە، خۆشحاڵی و بەختەوەری، گومان و دڕدۆنگی

دەنەخشێنن. دەنگێک کە هیوا دەڕژێنێتە سەر خەون و خەیاڵ، ویست و ئاواتەکان پێک دێنێ. بەڵام کوا، بۆچی دەنگێکی وەها ئێستا ناگاتە گوێی کۆتر، نابێتە خەو و خەیاڵەکانی کۆتر؟ بۆچی ئەو لەم هاوینە گەرمەدا، لە کەناری دەریادا ناتوانێ لە ماڵ بچێتە دەر، ناتوانێ بچێتە ناو ئاو، ناتوانێ بچێ بۆ گوند، هەر تەنیا وەها لە ژوورەوە دادەنیشێ، دەخەوێ، دەخوا، دەخواتەوە، جار جارەش دەنووسێ، دەخوێنێتەوە و خەونی خراپ دەبینێ؟ بۆچی خەون، ئازادییەک، هیوایەک بە ئەم نابەخشێ؟ بۆچی خەون ژیانی وەها شاراوە، نهێنی و بەندکراوی، زۆر زیاتر دەخاتە ناو زیندانی ژێر زەوی؟

کوا هیوا؟ هەرە گرینگیش مەگەر کۆتر هەنووکەش ماف، توانا و هەوەسی هەیە کە بە شوێن هیواوە بێت؟

نا، کۆتر بەرز دەڵێت نا. خاک و وڵاتی من، هیوای من ئیدی وشەیە، وشەی دادە، وشەی ئەدەبیات، قسەیەک کە لە هێلانەی هیواوە دەکەوێتە فڕین. کۆتر لاپەڕەکانی کۆتایی دەفتەر دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو چەند ڕستەی لەم چەند ڕۆژەی دواییدا نووسیویەتی، بە گشتی لە سەر ئەدەبیاتن، وتەی ئەدەبین. لە شوێنێک ئەو وەهای نووسیوە؛ «ئەدەبیات؛ هێلانەی هیوایە...» بەڵێ کۆتر خۆی سپاردۆتە نووسین و نووسینی ئەدەبی. ئەو لاپەڕەی هەرە دوایی دەفتەر کە سپییە، دەیکاتەوە، بە پێنووس، بە پیتی بچووک دەنووسێ «مردن، ئازادی و ئەدەبیات». کەمێک ڕادەوەستێ، بیر دەکاتەوە و دیسان درێژەی دەدات؛ «مردن؛ کەسەر و پەژارەی هەرە کۆن و هەرە نوێی مرۆڤ و مرۆڤایەتی. ئازادی؛ مرازی هەرە کۆن و هەرە نوێی مرۆڤ و مرۆڤایەتی. ئەدەبیات؛ حەشارگەی هەرە کۆن و هەرە نوێی مرۆڤ و مرۆڤایەتی...»

کۆتر حەز دەکات درێژەی پێبدا، بەڵام پێنووس ئیدی نانووسێ. کۆتر دەکا و ناکا پێنووس نانووسێ. ئەو هەڵدەستێ چەند دەنک ترێ لە

بۆڵە ترێی سەر سینیی میوەکان لێدەکاتەوە، دەیخاتە دەمی و دەچێتە ژوورەوە. کۆتر سەرەتا دەچێتە چێشتخانە، گلۆپەکەی دادەگیرسێنێ، سەیری سەر مێز و ناو چێشتخانە دەکات، بەڵام دەست بە تاڵ لە چێشتخانە دەگەڕێتەوە. ئەمجار کاتێک بە بەر دەرگای ژووری بازدا تێدەپەڕێ، بە گۆشەی چاو لە دەرگای کراوە و ناو ژوور دەڕوانێ. باز بە جل و بەرگەوە لە سەر تەختی نووستن ڕاکشاوە و خەوتووە. ڕووناکیی ناو چێشتخانە وەک تیشکی خۆر، یەکسەر دەکەوێتە ناو ژوور و خۆی دەگەیەنێتە سەر ڕوخساری باز. کۆتر لە بەر دەرگا ڕادەوەستێ و لە باز دەڕوانێ. باز، سەری لە سەر سەرین، لە سەر شان ڕاکشاوە و لاقەکانی کۆ کردۆتەوە ناو زگی و ئارام خەوتووە. ڕوخسار زۆر بچووکتر، چرچ و لۆچی سەر ڕوخسار و تەوێڵی زۆر قووڵتر دیارن. گەلۆ باز، ئەو ناوە ئەفسانەییەی ترس، ئێستا ئەمەیە؟ کۆتر دڵی بۆی دەسووتێ. گەلۆ باز لە بەر کۆتر نەکەوتبێتە سەر ئەم ڕێگە مەترسیدارە؟ گەلۆ ئەو گومان و هەوڵەی کە هاتووە و لە سەر ڕوخساری نیشتۆتەوە، ئەو ترس و سامەی کە جار جارە بە ڕوخساریەوە دیارە لە بەر کۆتر نییە؟

کۆتر دەچێتە ژوورەکەی، بەر مێزی بچووکی تەنیشت تەختی نووستن، چاوەی مێزەکە دەکاتەوە، پێنووسێک و کتێبێکی بچووکی لێدەردێنێ و دەگەڕێتەوە شانشین. کتێبێکی بچووکی بۆدلێرە "les fleurs du mal'i"* کۆتر ئەم کتێبەی بە ڕێکەوت لە دووکانی سەوزە و میوەی گوند بینی. پێدەچی کە تووریستێک ئەوەی لە دووکانەکە لە بیر کردبێت. بەڵام هەر چییەکیش بێت، ئەم کتێبە وەک هەتوانێک بە کەڵکی کۆتر دێت. ئەمە جاری چەندەمە کە کۆتر شیعرەکانی ناوی دەخوێنێتەوە، کۆتر لە سەر کورسییەکی نەرم دادەنیشێ، چەند دەنکی دی ترێ دەخاتە دەمی و لە پشت بەرگی کتێبەکە دەڕوانێ. لە سەر بەرگی پشتەوە دێڕی گەورە

* ناوی کتێبێکی بودلێرە.

هەن، بەڵام دێر، بە تایبەتیش ڕستەی یەکەم: "moi, mon ame est*
felee" وەک ئەوەی بۆدلێر نەک باسی ڕۆحی شێتی خۆی کە [باسی ڕۆحی] کۆتر دەکات.

کۆتر پێنووس بە دەستەوە دەگرێ تاوەکوو دێڕێکی نوێ لەو شوێنەی ماوە لە دەفتەردا بنووسێت. بەڵام لەم کاتەدا دەنگی قیڕەیەک لە ناوەوە دێت. کۆتر بە پرتاو هەڵدەستێت و هەڵدێتە ناوەوە بۆ ژووری باز. باز لە ناو ژووردا، بە پێوە، دەمانچە بە دەستەوە، سەر سووڕماو، خەواڵوو ڕاوەستاوە. ترس و گومانێکی ئاشکرا بە ڕوخسارییەوە دیارە. کۆتر گڵۆپی ژوورەکە دادەگیرسێنێ و دێتە لای باز، باز ئارەقەی کردووە. «من دەنگێک، دەنگێکی ناخۆشم بیست» باز مات بوو بە دەنگێکی دەرنەهاتوو، بە خەمگینی وا دەڵێت.

«نا» کۆتر بە نەرمی دەڵێ «دەنگ نەبوو، کەس نییە، دەرگاکان هەموو داخراو و قوفڵ کراون، لەوانەیە تۆ خەونێکی ناخۆشت بینیبێت.»

«لەوانەشە» باز وا دەڵێت و دەستی چەپی کە بەتاڵە دەگرێ بە بەر چاوییەوە «گڵۆپەکە بکوژێنەوە...»

کۆتر خێرا دەچێت گڵۆپ دەکوژێنێتەوە، دەگەڕێتەوە لای باز، دەست دەبا بۆ دەستی و دەڵێ «بخەوە، هیچ نییە، دەروونییە، تۆ ماندوویت» کۆتر بە ئارامی هەنگاو بە هەنگاو باز بەرەو تەختی نووستن دەبات و یارمەتیی ڕاکشانی دەدات. دوای ئەوەی باز لە سر جێگە ڕادەکشێ، کۆتر بە ئارامی مەلافە دەدات بە سەریدا، دەمانچەکەی لە دەست دەگرێت و دایدەنێتە سەر مێزی بچووکی تەنیشت. کۆتر چەند خولەک بە سەر بازەوە ڕادەوەستێ و لێی دەڕوانێ. ئەو ڕووناکییەی لە دەرگاوە خۆی دەگەیەنێتە ژوورەوە، دیسان بە سەر ڕوخساری بازەوەیە و ڕوخساری نائارام، ماندوو و ترساوی ڕۆشن دەکاتەوە. گەرمایەک کە مرۆڤ دەتوانێ

* پەسەندم بکە، ڕۆحم ماندووە.

ناوی بنێ میهرەبانی، لە دەروونی کۆتردا درووست دەبێت.

کۆتر لێی دەپرسێ «تۆ هیچت دەوێ؟»

باز بە چاوی بەستراوەوە دەڵێ «کەمێک ئاو، تۆ دەتوانی قومێک ئاوم بدەیتێ.»

کۆتر لە شانشین پەرداخەکەی باز پڕ لە ئاو دەکات و دەیهێنێ، دەیداتێ. باز کەمێک خۆی ڕاست دەکاتەوە، پەرداخ وەردەگرێ و چەند قومی لێ دەخواتەوە. کاتێک کۆتر پەرداخ وەردەگرێ و دایدەنێتە سەر مێزی تەنیشت، ئەمجار باز بە ئارامی دەستی چەپی دەگرێ، کۆتر دەستی لێ نادزێتەوە. دەست، لە ناو بێدەنگییەکدا ئەوەندەی چەند خولەک هەر بەو شێوە [دەمێنێتەوە] و گەرمایەکی سەیر ڕاگوێزی هەر دوویان دەکات. دوایی باز بێ ئەوەی دەستی بەر دات، دەستی کۆتر بەرەو خوار دەکێشێ. کۆتر بێدەنگ لە تەنیشت تەختی نووستن لە سەر زەوی بە ئەژنۆوە دادەنیشێت. باز بێدەنگ، چاو بەستراو، دەستی کۆتر بە ئەنگوست و پەنجەی خۆی زۆر بە نەرمی ماساژ دەدات. ئارام ئارام. کۆتر کە ئێستا لە تەنیشت باز دانیشتووە، هەڵم و بۆنێکی کەمێک ترشاو و قورسی باز هەست پێدەکات. کۆتر سەری خۆی کەمێک هەڵدێنێ و لە باز دەڕوانێ. نیگا و ڕوانینی کۆتر لەم ئێوارە هاوینییەی کەناری دەریای وڵاتی مەزن؛ دڵ پڕ نەفرەت، تووڕە، گومان، خەمگینی، میهرەبانی، دڵ گەرمی، لێوەکانی کۆتر دەبزوون، چاو دەڕوانن. لە چاواندا ئاسەواری پەژارە. لە چاواندا پرس، ویست، چاوەڕوانی. پرسی چی؟ ویستی چی؟ چاوەڕوانیی چی؟ ئێستا ڕوخساری جوانی کۆتر، بێپایان ئارام دیارە. بەڵام بە ڕوخساریشیەوە ئاسەوارێکی بێئەژمار. پێکەنین؟ گەلۆ پێکەنینیش دیارە؟ بەڵام سەرەڕای هەموو شوێن پێیەک، لەگەڵ هەموو هەستە تێکەڵەکان، ڕوانینێکی زیندوو و ژیانبەخش، جوان و ڕۆشن.

باز چاوەکانی ناکاتەوە، هەروا چاو نووقاو، دەست، ئەنگوست و پەنجەی خۆی لە سەر دەستی کۆتر، بە ناو قامک و پەنجەیدا دەگەڕێنێ. دوای کەمێک، ئەو دەستی خۆی بەرەو ژوور، بەرەو مەچەکی دەستی کۆتر دەبات. لە مەچەکی دەستیدا، نیشانەیەک، نیشانەی سکوما*ی کۆتر؛ بیست و چەند ساڵ پێش ئێستا لە وڵاتی بیابان، دوور خستنەوە، کۆچی خەڵکی چیایی لە بیابانی سووتاو، لە بیابان ئەفسەرێکی لاوی تازە پێگەیشتووی پڕ هیوا، لە جەماوەری کۆچبەرانیش پیاوێکی سمێڵ باریک و ژنەکەی، منداڵەکەیان کە تازە هاتۆتە دونیا، بەیانییەکی ڕووناک و ئەفسەری تازە دەست بەکار بوو، سەرسووڕماو، سەیری کۆرپەی تازە لە دایک بوو دەکات کە لە باوەشی باوکیدایە. «منداڵێک، بەشێکی گیان... چاوە بچووکەکانی هێشتا باش نەپشکوتوون، «ڕوخسارێکی بچووکی خڕ و ڕووناک، لووتی وەک لووتی کەروێشکێک دەلەرزێ. دەستە بچووکەکانی دەجووڵێنەوە، دەست و پەنجەکانی یاری دەکەن، بۆنێکی گەرم، ترشاو و تایبەتی لێدێت کە ئەفسەری لاو هەرگیز نەیبیستووە. ئەفسەر قامکە گەورەی دەستی ڕاستی دەبا بۆ دەستی منداڵ. منداڵ توند قامکی دەگرێ و دەیخاتە دەستی چەپی کە لە مەچەکیدا نیشانەیەکی بچووکی ڕەش دیارە...» منداڵی دوێنێ؛ کۆتری ئەمڕۆ. ئەفسەری لاوی دوێنێ؛ بازی ئەمڕۆ. دەست و پەنجەی باز ئێستا بە سەر دەست، مەچەک و نیشانەی سەر مەچەکدا دەگەڕێن. بەڵام نە ئاگای بازی چاو نووقاو، لە بەسەرهاتی پێشوو هەیە، نە کۆتریش. ژیان بە ڕێچکە نادیاری و نەناسراوەکانییەوە، کە زۆربەی جاران مرۆڤ ئاگاشی لێیان نییە، بەردەوامە.

باز وەک ئەوەی لە سەر خۆ چووبێت، هەر خەریکە، دەست و پەنجەی دەجووڵێن و لە مەچەک و نیشانەوە بەرەو ژوور، بەرەو شان و گەردن

---

* هەر شتێک کە لە کاتی لەدایکبوونەوە لەگەڵ مرۆڤ بێت.

دەبنەوە. کۆتر نە خۆی دەجوولێنێ و نە هیچیش دەڵێ. بە پێچەوانەوە کەمێکی دیش لە تەخت نزیک دەبێتەوە. ملوانکەکەی گەردنی کە لە ناو ڕووناکییەکی تاردا کەمێک دەبریقێتەوە، دەنگێکی ناسک دەردێنێ. دەمی دەکرێتەوە، لێوی دەبزوون، بەڵام ئەو هیچ ناڵێ. دەستی باز بەرەو ژوور، بەرەو مل و گەردن دەبێتەوە. شان، باسک، گەردن، گوێ لە ژێر قژی درێژەوە. جار جارە بە نەرمی، ڕێک و پێک بە ئارامی. پاش ژێر باڵ، باڵ و ئەو شوێنانە؛ دەم و لێو، دەمی ڕێک و پێک و لێوی درێژ و قەڵەو، وشک. بەڵام ئارام ئارام تەڕ. دەست و پەنجە لە سەر لێوان، وەک ئەوەی کەسێکی کوێر بیهەوێ لە بەردەلانێکدا ڕێگە بدۆزێتەوە. لێو دەکرێنەوە، پەنجە بە سەر لێودا دەگەڕێن. هەناسەیەکی قووڵی باز، یەکی دی. دەست، ئەنگوست، پەنجە. لێوی سەرەوە، لووت، گۆنا، ژێر چاو، برژانگ، برۆ، سەر چاو، تەوێڵ، قژ، قژی شەنگ و بەبریسکەی وەک شەپۆلی دەریا. لەوێوە بەرەو خوار، دیسان مل، گەردن، بەدەنێکی نەرم، بەدەنێکی شۆخ و جوان. هێڵە کشاوەکانی بەدەنی کچە، جوان. دیسان تەوێڵ هەرچی چۆنێک بێت، بێ چین، بێ لۆچ. دیسان دەم، لێو؛ نەرم، تەڕ. لووت، لووت باریک، درێژ. چاو، کانی ژین و ژیان؛ ژیانەوە و گەشانەوە، کانییەک کە دونیا لەوێوە دەزێ و لێی هەڵدەقوڵێ.

تەواو ئەم جموجۆڵانە بە بێدەنگی لە ژووری...

کۆتر بێدەنگ لە باز دەڕوانێ، باز بێدەنگ دەگری. ئەمجار کوڵی گریان بەسەر کۆتریشدا زاڵ دەبێت. کۆتر بێدەنگ دەگری.

# ١٧

# مردن

باز.

کۆتر.

بەسەرهاتی باز و کۆتر. ڕۆمانی ئەوان، گێڕانەوەی چارەنووسی ئەوان. ڕۆمان ئیدی تەواو دەبێت، ئیدی کۆتایی گێڕانەوەیە. گێڕانەوەی بەسەرهاتی باز و کۆتر کە بە مردن دەستی پێکرد، ئێستا بە مردن تەواو دەبێت. کۆتر لە یەکەم بەشی ڕۆماندا مرد. ئێستاش لە بەشی کۆتایی ڕۆماندا نۆبەی بازە. ئێمە ئێستا دیسان دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتا. بۆ ساڵڕۆژی حوکمداریی ژەنەڕاڵ سەردار و ئەو ئێوارەی کە کۆتر کوژرا. ئێمە بە بیری دێنینەوە؛ کۆتر لە دەرەوەی پایتەختی وڵاتی مەزن، لە زەوییەکی چۆڵ لە کەنار ڕووباری شار، لە ژێر ڕووناکیی ئەستێرە و مانگدا، بە سێ فیشەک هاتە کوشتن. ئەوانەی کۆتریان کوشت، بازی لە پشتەوە کەلەبچەکراویشیان هەڵگرت و لەوێ، لەو خاکەی بوو بە گۆڕ و مەزاری کۆتر، دوور کەوتنەوە.

ئێستا دوای ئەم گەشتە درێژەمان، لە سەر ڕێگەی بەسەرهاتی باز و کۆتر، دیسان دەگەڕێینەوە بۆ سەرەتای ڕۆمان. بۆ لای باز و پیاوکوژەکان کە بازیان هەڵگرتووە و دەیبەن. باز لە نێوان بکوژانی

کۆتردا دەڕوات. منداڵی مردن کە بووە وەستای مردن و کوشتن، ئێستا دیسان بەرەو مردن، بەرەو ئەو شوێنەی لێوەی هاتبوو، دەڕوات. باز کە میری مردن و کوشتن بوو، ئێستا بووەتە ئەسیری مردن. بەڵێ باز کە بێ ترس بە سەر مردندا دەچوو، ئێستا دوای مردنی کۆتر، لە مردن دەترسێ، زۆر دەترسێ.

ئێستا ئێمە لە بەری دیکەی شارین. کۆتر لە بەری سەرەوەی شار هاتە کوشتن. بازیش لە بەری خواروو [دەکوژرێ] و دوو هۆگری چارەنووسێک، هەر یەک لە بەرێکی شار کە کاریگەریی لە سەر چارەنووسیان داناوە، دەمرن.

بەڵام پێش ئەوەی بکەوینە شوێن باز و کاتەکانی کۆتایی مردن، من، بێژەری ئەم ڕۆمانە، دەبێ زانیارییەکی کۆتایی بدەم؛ دوای کارت پۆستاڵی کۆتر، ئیدی هەواڵێکم لە کۆتر وەرنەگرت. من بە هیوای هەواڵێک بووم، جارجارە دەچووم بۆ ناوەندی یەکیەتیی نووسەران، جارجارە تەلەفۆنم دەکرد تاوەکوو بزانم کە نامەیەک، کار پۆستاڵێک، هەواڵێک بۆ من نەهاتووە. بەڵام نە نامە، نە هەواڵێک نەهات. کارت پۆستاڵ بووە دوا پەیوەندیی من و ئەو کچە چاو جوانە. هەرچەندە من هەواڵێکم لێ نەزانی، هەواڵی مردنی ئەوم لە ڕۆژنامەیەکی ئەو وڵاتەدا خوێندەوە. ڕۆژێک، با بڵێین ئەوەندەی مانگێک دوای کارت پۆستاڵی ئەو کچە خوێندکارەی ئەدەبیاتی فەڕەنسی، من بۆ کارێک چووم بۆ کتێبخانەی ئەو گەڕەکەی لێی دەژیام. دەبوو ستافی کتێبخانە ببینم. من کەمێک زووتر لە کاتی دیدار، چوومە کتێبخانە بۆ ئەوەی سەیری برێک ڕۆژنامە و گۆڤار بکەم. لەو کاتەدا، لە سالۆنی خوێندنەوەی کتێب و ڕۆژنامە، بە ڕێکەوت، لە ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی ئەو وڵاتی کوشتن و مردنەدا، وەک هەواڵێکی زۆر بچووک، مردنی ئەو و بازم خوێندەوە. هەواڵێک لەگەڵ وێنەی هەردووکیان کە ناویانی هەڵدابوو و باسی مردنی

هەردووکیانی کردبوو. هەر کام، لە بەرێکی شار، لە کەناری ڕووبار. لەو کاتەدا، بەڵێ، دەتوانم بڵێمترووسکەی نووسینی ئەم ڕۆمانە داگیرسا. زانیاریی هەر ئەوەندەیە.

ئێستا چەند ساڵ دوای داگیرسانی ترووسکەی ڕۆمان، ئێمە گەیشتینە کۆتایی ڕۆمان و هەر وەها کۆتایی بەسەرهاتی باز. باز دەڕوا، بێ ئەوەی ئاگای لە ڕێکردنی خۆی و هەنگاوەکانی بێت. سەرگێژ، سەری داخستووە و ڕێدەکات. دوای کوشتنی کۆتر، پیاوکوژەکان ئەویان سواری مینی بوس کرد، ماوەیەک بە دەور و بەری شاردا گەڕان، دواتریش هاتن بۆ ئەم شوێنەی ئێستا پێیدا ڕێدەکەن. ئێستا ئەوان دەڕۆن. هەر وەک ڕۆشتنیان لە بەری ژووروروی شار. باز و چوار کەس لەگەڵی، پێکەوە. قورس، ئارام، بە بێدەنگی، لە ناو ئارامییەکی بێپایاندا. ئەو دووکەسەی فەرماندەی دەستەن، دیسان لە لای مینی بوس ڕاوەستاون. دونیا بێدەنگە. باز بێدەنگە. بکوژان بێدەنگن. شەو ڕۆشتووە، بەڵام مانگ و ئەستێرە هێشتاش بە ڕەنگێکی مەیلەو سوور دەدرەوشێنەوە. ئێستا لە دەنگی هەنگاوەکانیان، دەنگی ئاوی ڕووبار و دەنگی مێش و مێشوولە زیاتر، دەنگێکی دی نابیسترێ. دەنگی قووڵی شاریش ئێستا هاتۆتە برین. بەڵام گڵۆپەکانی شار، ئەو شەوقەی لە شار بەرز دەبێتەوە، هێشتاش وەک ئەوەی گوڤەندیان گرتبێ، دەدرەوشێنەوە. بەڵام باز نە سەیری ئەستێرە و مانگ و نە سەیری شەوقەکانی شار دەکات و نە دەنگەکانی شەو دەبیستێ.

هەموو شتێک پارچە بووە، بڵاو بووە، هیچ شتێک بە مسۆگەری، بە تەواوی دیار نییە و ئاگاتە گوێی باز و باز نابیستێ. وەک ئەوەی هەموو شتێک، هەموو ژیان ئێستا لە ناو خەوێک، لە ناو خەونێکدا بێت. سەرنجی ئەو لە سەر هیچ شتێک نییە. ئەو تەنیا بە سەختی، بە دوا وزەی خۆی ڕێدەکات. بە ترسەوە، ترسێکی ئاشکرا، دیار و

یەکجار گەورە. ترسێک کە تا ئێستا قەت پێی ئاشنا نەبوو، لە هیچ شتێکی دی ناچێت.

ڕووبار، ڕووبارێک کە لە ژیانی بازدا جار جارە بە باشی، جارجارەش بە خراپی شوێنێکی پتەوی گرتووە، لە بەری خوارووی شارەوەش، کەمێک دوورتر لە باز و ئەوانی دی، بە شەوقێکی بێپایانەوە دیارە. وەک بڵێی مانگ و ئەستێرە نیشتوونەتە سەر ئاوی ڕووبار، وەک بڵێی ئاو و مانگ و ئەستێرە پێکەوە بوونەتە یەک. دونیا گەرمە، بۆنێکی تێکەڵی گیا و پووش و خاک لە دەر و دەشت هەڵدەستێ.

باز چی بڵێ، چی بکات؟ باز لاقەکانی سست و بڵاو هەڵدەگرێت و بیر دەکاتەوە. باز دەتوانێ چی بکات؟ ژیانێکی ئەوەندە ڕەنگین، قایم و تێکۆشەرانە تا بە ئێرە هات. لێرە بە دواوە ئیدی تاریکە، وەک ئەو پەردە تاریکەی بە سەر منداڵیدا کشاوە. باز چیهای دیت، چی ژیا، چی نەژیا! بەڵام دوایی، دوای ئەو هەموو دیتن و ژیانە، ئیدی پەردەی نەدیتن و ون بوونە. ئیدی هەموو شت، هیواکانی منداڵی و لاوی، فێربوونی گەنجی، جۆش و خرۆشی ژیانی تازە، تەمەنی لاوی، ویست و مرازی لاوی، درۆ، فێڵ، فریو، گەمە، پەسن، سوور بوون و ئاواتی بڵند بوون، گەیشتن بە دەسەڵات و بەڕێوەبەرایەتی، هەر هەمووی دەبێتە چڵەپووشێک کە ئێستا پێی پێدا دەنێت. کێ دەیزانی کە هەموو شتێک ئاوەها تەواو دەبێت؟ شەڕ، تێکۆشان ماندوویەتی، ورە، سەختی، ئاڵۆزی، خەبات، خوێن، ئارەقە، توندوتیژی و لێگەڕانێکی بە ساڵان. بە ساڵان لێگەڕان ئیدی ئێستا دەبێتە شتێکی هیچ و پووچ، وەک پووش و پەلاشی سەر زەوی. لە دوای باز چی دەمێنێ؟ بڵێ باز. باز بێدەنگ، ماندوو، دڵ پڕ بیر دەکاتەوە. بڵێ جگە لە هەر دوو کوڕەکەت لە دوای تۆ چی دەمێنێ؟ بڵێ لە دوای ئەو هەیەجان، جۆش، کوڵ، حەز، ئەشق، خۆشەویستی، تووڕەیی، چاوچنۆکی، کین، نەفرەت،

توندوتیـژی، زۆرداری، بەربەرییـەت، دژایەتـی و دوژمنایەتـی کـە تەمەنێکـی تێکەڵیـان سـاز کـرد، چـی دەمێنـێ؟ بەڵـێ، پیاسـەی تەمەنێکی بێکـەس، بـەڵام بەهێـز، جوامێـر، دڵسـۆز و هەنـگاوی سـاڵانێکی درێـژ، مرۆڤێکـی هەتیو، بـەڵام بەوەفـا، لـە خـۆ بـردوو، ئێسـتا لێـرە کۆتایی پێدێت. بەڵـێ، تەمەنێکـی بێکـەس، بـە بێکەسـی دەسـتی پێکـرد و بـە بێکەسـی تـەواو دەبـێ. بەڵـێ وەهایـە، قوربانییـەک کـە بـووە جەلـلاد، ئێسـتا دیسـان وەک قوربانـی، دڵ پـڕ، زیـز، مانـدوو، سـەر و دڵ ئـازاراوی، داشـکاو دەڕوا. هیـچ شـتێک نییـە کـە بتوانێ بیـکات، بتوانـێ بیڵـێ، هیـچ شـتێک نییـە.

ئـەو کچـە شـیرینەی لـە کۆتاییەکانـی بـازدا هاتـە نـاو ژیانـی، دێتـەوە یـادی. چاوەکانـی بـەر لـەوەی فیشـەک بـە سـەریەوە بنـرێ، دێنـەوە یـادی باز. چـاو، چاوەکانـی کۆتـر لـە دوا چرکەسـاتەکاندا؛ چـاوی کـراوە، بریقاوە، وەک دەنکـە ئەڵمـاس، چاوانـی کەسـێکی سەرسـووڕماو، ڕازی بـوو، شـێت. چاوانـی کەسـێک کـە شـتە هـەرە بنەڕەتییەکانـی ژیانێـک، مـان و مـردن، پێکـەوە دەژی. چاوانێـک کـە مـردن و ترسـی مـردن یەکڕاسـت زۆر بـە ئاشـکراو و کـراوە دەگوێزێتـەوە نـاو دڵ و ڕۆحـی بـاز. چاوانـی لەخـۆ بایـی، سـەربڵند، بـەڵام ترسـاو، بێهیـوای بـە شـەپۆلانی لافـاوی مـەرگ، کـە بـاز هەرگیـز بـەو سـەیرییە نەیدیتبـوون.

کۆتر کەوت. ئەسـتێرە و مانگ بوونە شـایەتی کەوتنی.

بازیـش دەکـەوێ. ئـەو دەزانـێ. ئێسـتا لەوانەیـە پـاش کەمێکـی دی، نـە زۆر، بـەڵام پـاش ماوەیـەک. ئـەو مردنـەی لـە ئەمـی تێدا دەژیا، بـەڵام زۆر لێـی دوور بـوو، ئێسـتا بـە دەورییـەوە، ئەوەنـدە نزیکـە لێـی. هـەر وەک کۆتـر ئەمیـش دەکـەوێ، بـە دەسـتی هـاوڕێ و دۆسـتانی مـان و نەمانـی. ئەسـتێرە ومانـگ دەبنـە شـایەتی کەوتنـی ئەمیـش. ئەسـتیرە و مانـگ؛ وەهـا لێـرە، لـەوێ، لـە ئاسـمانان، لـە سـەر هەمـوو کات، ڕۆژ، ڕۆژگار و زەمەنـەکان، لـە سـەر هەمـوو تـاک و کۆمەڵێـک، لـە سـەر هەمـوو شـەوق

و تاریکییەک. وەها ڕووناک، درەوشاوە، تاهەتایی و نەمر. ئەستێرە و مانگ؛ شایەتی بێلایەن، بێدەنگ، بێزار و بێزمانی هەموو ژیانی ئەو. نەک هەر شایەت، دۆست، هەڤاڵ، هاوڕێی ڕووگەش و ڕووناکی هەموو ژیانی ئەو، بوونەوەرە هەرە بێ زیانەکانی ناو ژیانی ئەو.

لە ناکاو ئێستا باز کە لە ناو شەپۆلەکانی دڵ و مێشکی خۆیدا وەک جۆلانەوەیەک دێت و دەڕوا، گلۆر دەبێتەوە و دەکەوێتە سەر زەوی. لاقی لە بەردێک کە نایبینێ هەڵدەکەوێت و دەمەو ڕوو دەکەوێت. بێ پارێز ناڵەیەکی لێ بەرز دەبێتەوە. لووت و تەوێڵی دەکزێنێتەوە، بەڵام شتی سەیر، لە زەویدا بۆنی گیا و پووش و خاک دەگاتە لووتی. ئەو هێز لە خۆی دەکات کە هەڵستێ، بەڵام ناتوانێ. دەستە کەلەبچەکراوەکانی ناهێڵن کە خۆی بجووڵێنێ. ئەوەندەی چەند خولەک لە زەوی هەروا بە ئازارەوە لە سەر شان ڕاکشاو دەمێنێتەوە. پاشان دووان لەو کەسانەی لەگەڵین دێن، شانی دەگرن و بەرزی دەکەنەوە، ناوچەوانی دێشێ، شتێکی خەست و گەرم لە لووتی بەرەو خوار بە ناو تاڵەکانی سمێڵیدا، بەرەو لێوی دێت. باز بە زمان، ئاوی خەستی سەر لێوی سەرەوە و سمێڵی تام دەکات، خوێنە، تامی ترشاوی خوێنە.

باز خۆی کۆ دەکاتەوە، سەرەتا بە بێدەنگی سەیری کەسانی دەور و پشتی دەکات، دواییش بۆ دوور، بۆ ڕووبار، بۆ ڕووناکیی ئاوی ڕووبار، بۆ شار و ئەو شەوقانەی لە سەر شار دەدرەوشێنەوە، دەڕوانێ. دواتریش تماشای ئاسمان و مانگ و ئەستێرە دەکات. سەرەڕای ئێشی ڕوخسار و ناوچەوان، هیچ ناڵێ، هەروا کەمێک سەر بەرز دەڕوانێ. فێنکاییەکی یەکجار سووکی شنەبایەکی ئارام و نادیار، ئەوەندەی چەند خولەک بە ڕوخساریدا دەگەڕێ. لە دوورەوە، یەکجار دوور قرووسکە قرووسکی سەگێک دەگاتە گوێی. باز ئارام ڕادەوەستێ. سەیرە! کەوتنەکەی، ئێشی ناوچەوان و تەوێڵ و ڕوخساری، خوێن و گەرمای خوێن ئەو هێور

دەکاتـەوە. سـەیرە ئـەو ئێسـتا دەزانێت؛ کـە تینـووە. «جگەرەیـەک بدەنـە مـن» باز ئارام و هێور چەنـد جـاران خۆزگەکـەی دەخواتـەوە، زمانـی بـە سـەر لێوی وشـکیدا دەگەڕێنـێ و ئەمـە دەڵـێ. بـەڵام کەسانی دەور و پشـت هیـچ ناڵێـن، کـەس هیـچ نـاکات. دوای ماوەیـەک بێدەنگی، بـاز دووبـارەی دەکاتـەوە؛ «جگەرەیـەک بدەنـە مـن...» بـاز دەپەیڤـێ! ئـەو لـە دەنگـی خـۆی سـەیر دەمێنـێ. دەنـگ وەک تۆلانێکـی یەکجـار بـەرز دەگاتـە گوێـی ئـەو. دەنـگ لـە مێشـک، ڕۆح و دڵـی ئـەودا ئـۆلان دەدات. ئـەو دەنگـەی دوای مردنـی کۆتـر هاتبـووە بڕیـن، دەنگێـک کـە دوای کەمێکـی دی دێتـە بڕیـن، ئێسـتا بانـگ دەکات، گازنـدە دەکات. گازنـدە؟ نـا، تـکا و ڕجـا؟ نـا، فەرمـان و ئەمـر؟ نـا. تۆلانـی دەنـگ، نـەک لـە بـەر ئـەو جـۆرە دەنگانەیـە، ئـۆلان لـە بـەر ماندوویەتیـی دڵ، مێشـک و ڕۆحـی بـازە.

«جگەرەیەک بدەنە من...»

ئێسـتا بـاز دەمانچـەکان، دەمانچەکانـی دەسـتی ئـەوان؛ دوو دانـە سـمیت - ویلسـۆن، ڤاڵتیرێکـی ئەڵمانـی و بارێتایـەک هاوشـێوەی دەمانچەکـەی خـۆی، دەبینـێ. دەمانچـە بـە دەسـتەوەن. ئێسـتا ئـەو دەمانچـە ڕووتانـە، دەمانچەکـەی بـاز کـە هەمیشـە فیشـەکی لـە بـەردا بـوو، دەستبەسـەرکردنەکەی ئـەو سـەر لـە بەیانییـەی کەنـاری دەریـا دێنێتـەوە یـادی. هەمـوو شـتێک بـە خێرایـی برووسـکەیەک ڕوویـدا. هەمـوو شـتیک لـە بـەر ئـەو ئازارەی کـە سـەری بـازی تەزاندبـوو، ئـەوی گێـژ کردبـوو، لـە نـاو تـەم و مژێکـدا بـوو. هەمـوو شـت لـە بـەر دەرگای هاوینـە هـەوارەوە دەسـتی پێکـرد، یانیـش بـە پێچەوانـەوە هەمـوو شـت هـەر لەوێـدا کۆتایـی پێهـات. بـەڵام حەیـف کاتێـک ئـەو پێنـج کەسـەی کـە لـە بـەر دەرگای ئـەو هاوینەهـەوارەی بـاز و کۆتـر خۆیـان تێـدا شـاردبۆوە، هێرشـیان کـردە سـەر بـاز، ئـەو دەرفەتـی هەڵگرتـن و کێشـانی دەمانچەکـەی بـە دەسـت نەهێنـا. ئەگـەر ئـەو ئەوەنـدەی چرکەسـاتێک دەرفەتـی دەسـت کەوتبـا،

بێگومـان دەسـتی دەکـردەوە . بەڵـێ ئـەو دەکـوژرا، بـەڵام هەندێک لەوانیشـی دەکوشـت و پێدەچـوو ئـەوکات کۆتـر ڕزگار بوویـا، لەوانـەش بـوو لـە نـاو ئـەو ئاڵۆزییـەدا ئـەو هەلـی هەڵاتنـی دەسـت کەوتبـا . بـەڵام نەبـوو. ژانـە سـەر، میگرێنـی وێرانکـەر بـە سـەریدا زاڵ بـوو. بـاز بـووە هـۆکار، گـەر ئـەو بـۆ هەتـوان و دەرمانفرۆشـی و پرسـیاری پاسـپۆرتەکان نەدەچـووە گونـد، ئـەوان بازیـان نەدەدیـت و نەدەکەوتنـە شـوێنی و لـە بـەر دەرگای هاوینەهـەوار دەستبەسـەریان نەدەکـرد. بـاز بـوو بـە هـۆکاری هـەم مردنـی کۆتـر و هـەم خۆشـی. ئـەو دەمانچـە بێهاوتایـە، کـە ئـەو وەک یـاری خـۆی هەمیشـە لەگـەڵ خـۆی دەیگەڕانـد و هەمیشـە هەسـتێکی بـڕوا [بەخۆبـوون]، بەهێـزی، مەغـروری، دەسـەڵات و وریایـی دەدایـە ئـەو، ئێسـتا لـە کوێیـە، لـە دەسـتی کێدایـە؟ ئـەوان گیـران و هەمـوو شـتەکانیش لەگەڵیـان. لـە گونـد کاتێـک ئـەو چـوو بـۆ گونـد، دەفتەرێکـی نوێـی گـەورەی خـەت دار و بـەرگ سـووریشـی کـڕێ تاکـوو کۆتـر شـیعری نوێـی ئەویـن و ئەوینـداری تێـدا بنووسـیبا . کاتێـک ئـەو دەسـتگیر کـرا، دەفتـەر و دوو پێنووسـیش لـە ژێـر باڵیـدا بـوون. بـە دەسـتێکەوە زەرفـی میـوە، سـەوزە، خـواردن و خواردنـەوە، لـە ژێـر باڵـی دەسـتەکەی دیکەشـیدا زەرفێکی باریکـی پێنـووس و دەفتـەر، دەرمـان، پاکـەت و کاغـەزی نامـە. بـار سـووک بـوو، بـەڵام هـەر ئەوانـە بـازی لـە دەسـت [و پـێ] خسـت. لەوانەشـە هـەر لـە بـەر ئەوانـە بـاز نەیتوانـی دەسـت بکاتـەوە.

یـەک لـە کەسـانی دەوری، جگەرەیەکـی داگیرسـاو بـە دەسـتەوە دێتـە پێـش بـاز ڕادەوسـتێ. بـە ڕێـز و ڕێـزداری، بـە ئارامـی جگـەرە دەخاتـە سـەر لێوی باز کە بـە خوێـن و تـف تـەڕ بـووە. لـەم کاتـەدا چـاوی باز بە چاوی ئـەو کەسـە بـاڵا بـەرزە قەڵـەوە دەکـەوێ. چاوانـی بـاز؛ ئـارام، ترسـاو، زیـز، مانـدوو، لەوانەشـە وەک چـاوی کۆتـر. چاوانـی ئـەو کەسـە؛ بەتـاڵ، کەمێـک بەتـاڵ، نـە گەرمـا و ڕووناکییـەک، نـە تووڕەیـی، کیـن، نەفـرەت، تـرس،

گومان یانیش شتێکی دی. هەر تەنیا بەتاڵ. گەلۆ چاوانی منیش لەو وڵاتە وەها بوون؟ باز بیر دەکاتەوە، گەلۆ کەسانی پیاو کوژ، خوێنڕێژ هەروەها بەتاڵ، بێهەست، بێجمەن؟

باز چەند مژ لە جگەرە دەکێشێ. سەری خۆی کەمێک بەرز دەکاتەوە، قاڵیچەی ئەستێران، سینیی زێڕینی مانگ لەوێ لە سەرەوەن. هەر چەندە شەوە نە هەورێک، نە ڕەشاییەک ناکەوێتە بەر چاوی باز، لە کەناریشیدا چەند ئەستێرەی دی، گەورە و مەیلەو سوور. ئەستێرە لە دوورەوە زیندار وەک برووسکەیەک، پڕ شەوق چەخماخە دەدات.

ئایا باز بپەیڤێ؟ ئەو بپارێتەوە؟ ستران بڵێ وەک کۆتر بەلام بە ئاوازی خۆی، لە بەر خۆوە دەریببڕێ؟ بقیرێنێ و بڵێ «نا، وەها نابێ، پێویستە ژیانی من وەها تەواو نەبێ!... وەها بێ شۆپ ون نەبێ!...»

نا، ئەو هیچ ناڵێ و هیچ ناکات، تەنیا جگەرە دەکێشێت. ئەو هەست پێدەکات: دووکەڵی جگەرە شەپۆل شەپۆل بەرەو دەروونی دەڕوات، شەپۆل شەپۆل دڵ و مێشکی هێور دەکاتەوە. مژێکی دی، ئارام چاو لە ئەستێران، و پێدەچی کەمێک خۆشحاڵ... ئەم ئارامییە، ئەم بێدەنگییە. نە دەنگ، نە سەدا. لە هەموو جۆرە جموجۆڵ، هەر شێوە هات و چۆ بە دوور، یەکجار دوور. نەفەس، دووکەڵ لە دەروونی ئەودا، لە پێش چاوانی، شەپۆل شەپۆل، ئارامییەک دەڕژێنێ بە سەر ئەو و دەور و بەریدا.

بەلام لەم کاتەدا دەنگ بەرز دەبێتەوە، ئەمجار دەنگی تەقەیەک ئارامیی دەر و دەشت دەشڵەقێنێ. ئەمجار شەپۆلێکی ئاگر لە پشت بازەوە دادەگیرسێ و بێدەنگی تێک دەدات. لەم کاتەدا ئاگرێک لە گەردنی بازدا دادەگیرسێ، ئێستا باز بە هێزی ئاگر دەهەژێ، دەنووشتێتەوە و دەکەوێتە سەر چۆک. ئەمجار ئاگر شەپۆل شەپۆل لە دەروون، دڵ، مێشک و بەدەنی بازدا بڵاو دەبێتەوە.

بەڵام سەیرە جگەرە دانەکەوتووە، هەنووکەش بە دەمی بازەوەیە. باز لە سەر چۆک ڕادەوەستێ، ئەوەندەی کەمێک بۆ ئەوەی بزانێ چی بووە، شتێکی خەست، خوێن، خوێنی گەرم لە ژێر کراسە هاوینییەکەیەوە بەرەو خوار دەبێتەوە. کراس و پانتۆڵی کەتان تەڕ دەبن. بەڵێ باز تێدەگات، خوێنێکی زۆری لێ دەڕوات. بەڵام جگەرە... ئەو نیگای لە ئاسمانان. مژێکی یەکجار قووڵ لە جگەرە دەدات، دووکەڵ شەپۆل شەپۆل دەڕوا، خوێن دەڕوا، باز توانای نامێنێ، هەناسەی لە بەر دەبڕێ. باز سەیری ڕووبار دەکات کە ئێستا لە بەرانبەریدا بریقەی دێت. ڕووبار شەپۆل شەپۆل شەوق دەداتەوە. نا، وەها نابێ، باز دەبێ خۆی بگەیەنێتە ڕووبار. باز تینووە، دەبێ لە ئاوی چەم بخواتەوە. دەبێ خۆی بەر بداتەوە ئامێزی چەمی درەوشاوە. دەبێ ڕووبار باز لە ئامێزی خۆیدا ببات بەرەو دەریای نائاشنا.

باز بە هەموو توانا و وورەی خۆیەوە هەوڵی هەستان دەدات، بەڵام سەختە، دەستەکانی لە پشتەوە کەلەبچە کراون. بەڵام ئەو دەبێ هەڵستێت. وورە، جارێکی دی. ئەو لاقی خۆی هەڵدێنێ. وورە. بە ئارامی ئەوی دیش پاش کەمێک هەڵدێنێ. ئێستا بە پێوە ڕاوەستاوە. دەیهەوێ بڕوات، یەکڕاست بەرەو ڕووبار، بەرەو ئاو، بەرەو شەوق و ڕووناکی. ژانێکی بێکۆتایی بە سەریدا دێت، چەند جاران بە توندی دەهەژێ، بەڵام بە پێوەیە، دەبێ بڕوات. بێ ئەوەی سەیری دەور و بەر و کەسانی دەور و بەری بکات، یان هەڵگەڕێتەوە، هەنگاوێک بەرەو پێش هەڵدەگرێ، هەنگاوێکی دی، یەکی دی، یەکی دی. بەڵام لەم کاتەدا دەنگی تەقەیەکی دی دەر و دەشت دەگرێتەوە. ئەمجار باز ڕادەوەستێ. هەموو جەستەی باز وەک ئەوەی کەوتبێتە بەر شەپۆلی لافاوێکی بەهار، دێت و دەچێت. بەڵام ناکەوێ، بە پێوە، توند پێ بە زەویدا دەنێ. جگەرەش داناکەوێ. نەفەسێکی دی، دووکەڵ شەپۆل شەپۆل.

ژان شەپۆل شەپۆل. ئاو شەپۆل شەپۆل. ڕۆشتن، دیسان، جارێکی دی، هەنگاو بە هەنگاو. ڕووبار، بەرەو ڕووبار. ئەمجار چەخماخەیەکی دی. تەقەیەکی دی زگی بێدەنگی سرووشت و شەو دەقڵەشێنێ. ئەمجار باز دەکەوێ، ئەمجار...

ئەمجار باز، هەر وەک کۆتر لە سەر خاکی دایک، لە هاوینی گەرمدا، ئیدی لە زەوی هەڵناستێ.